

# له ديدگاى قورئان و فەرموده

## ئامادەكردنى

مامۆستا اسماعیل سوسەیی

## ناوه‌ڕۆك

## پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين اللهم طهر قلوبنا من الشبهات والشهوات وأعمالنا من الرياء يا رب العالمين، موسڵمانانی بەڕێز و سەنگین السلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

خۆشحاڵ و بەختەوەرین الله تعالی تەمەنی داین بگەڕێینەوە خزمەتتان لە ماڵی الله تعالی لە سەرەتای ئەو مانگە بەرز و پیرۆز و بەڕێزە کە مانگی ڕەمەزانە لە ڕۆژی یەکەمەکەی ڕەمەزانی (١٤٣٥) کۆچی ڕۆژی یەکشەمە لەدوای نوێژی عەسر بەڕێزان و خۆشەویستان بۆ ئەوەی ئەمساڵیش بتوانین خزمەتی ئاینی ئیسلام بکەین و تۆزێک لەوەی کەوا پێویست دەکا ئەدای سەر شانمان بکەین ئەرکەکەی و ئێوە حاڵی بکەین و تێبگەیەنین، لە ساڵانی ڕابردو زۆرجار باسی (لا إله إلا الله)مان دەکرد باسی الله بەیەکگرتنمان دەکرد بەڵام ئەوەی ئەمساڵ بۆمان ئامادە کردون تەواوکەری ئەوانە واتە زنجیرەی (محمد رسول الله (ﷺ) لە دیدگای قورئان و فەرمودە) با بزانین محمد رسول الله مەعنای چیە، محمد رسول الله (ﷺ) لەو چەند خاڵەدا پێتان دەڵێین لەبەرچی ئەو بابەتەمان هەڵبژارد بۆ ئەمساڵ.

یەکەمیان لەبەر ئەوەیە چونکە شاهێدومانی کە پێی دەبیتە موسڵمان بەختەوەری دونیای پێوەیە و لە مەیدانی حەشر و حیساب و قیامەتیشدا ئیلا ئەوانەی شاهێدومانیان بە تەواوی هێناوە و تێیگەیشتونە و کاریان پێکردوە ڕزگاریان دەبێ دەچنە بەهەشتی پڕ ناو و نیعمەت دور دەکەونەوە لە دۆزەخی سوتێن، لەبەر ئەوە ئەوەمان بۆ هەڵبژاردن کە تەواوکەری شاهێدومانی (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمد رسول الله)یە، (محمد رسول الله) پلە و پایە و گەورایەتیەکەی لەوەیە کە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) سوێند بەزاتی الله هیچ کەسێک نیە گوێچکەی لەمن بێ و گوێبیستی ناو و دەنگی من بوبێ لە دیان و نەسڕانیەکان لە جولەکەکانیش تەنانەت عیسا و موساش ئەگەر بژیابان لەسەر ڕوی زەوی

ئێستا ئیلا دەبێ ئیمانیان بە من هێنابا و شوێنی من کەوتبان[١]، کەواتە لەبەر ئەوە محمد رسول اللهمان هەڵبژاردوه (ﷺ).

وه یەکێکیش لەو سوئاله زۆر گرنگانەی ناو گۆڕ و قەبر کە هەمومان بەڕێزان بە دڵنیاییەوە دەبێ بمرین بە تایبەت لە دونیای ئەمڕۆی پڕ لە موسیبەت مردنی هەریەکەمان ڕەنگە زۆر نزیک بێ یەکەم پرسیاریش لەو پرسیارانەی لەناو گۆڕ لێت دەکرێ (من ربك)؟ ئەومان شیکردەوە لە ساڵەکانی ڕابردو خوات کێیە؟، لە پاشان دوەم پرسیار لێت دەکرێ لەبەر ئەوە ئەو بابەتەمان ئەمساڵ بۆتان دانا لەبەر ئەوەی چونکە مەلائیکەتەکان پێت دەڵێن (من نبيك)؟ پێغەمبەرت کێ بوو (ﷺ)؟ ئەگەر لە دونیادا نەیناسی پێیەوە ئاشنا نەبی نەزانی بنەماڵە و ڕەچەڵەکی پێغەمبەر چیبوه (ﷺ) وه ناوەکانی وه سیفەتەکانی منداڵەکانی خاو و خێزانی عائیلەکەی ئایە پێغەمبەر چۆن بوه و کێبوه و ڕەوشتی چیبوه وه شێوه و شکڵی ئەگەر نەناسی بە دڵنیاییەوە وه ئیمانیشی پێ نەهێنی و کردەوەش نەکەی بەو کردەوانەی کە ئەو فەرمویەتی ئەوه ئەو کات وەڵامی قەبرت پێ نادرێتەوە، لەبەر ئەوه ئەوەمان هەڵبژارد بۆتان کە بەڵکو ئێمە حاڵی بین و تێبگەین (محمد رسول الله (ﷺ)) مانای چیە؟ پێغەمبەر کێبوه (ﷺ)؟ وه بنەماڵەکەی و وه خاو و خێزانەکەی و ڕەچەڵەکەکەی و وه ئەخلاق و ڕەوشت و سیفەتەکانی بەڵکو وەڵامی ناو گۆڕمان پێ بدرێتەوە، کە مەلائیکەتەکان پێیان گوتی (من نبيك)؟ تۆش بە زمانێکی پاراو و ڕاشکاو بڵێی (محمد بن عبد الله بن عبد المطلب بن هاشم وهاشم من قريش وقريش من العرب رسول الله (ﷺ)) بۆ ئەوەی پێت بکرێ ئاوا وەڵام بدەیتەوە.

لە پاشان لەبەر خاڵێکی تریش ئەو بابەتەمان هەڵبژارد بە داخەوه و جێی نیگەرانیە کە لەناو ئێمەی میلەتی کوردیش ئەمڕۆ خەڵکانێک پەیدابونە عەقیدەیان مونحەریف بوه و لایانداوه لە ئەهلی سونە و جەماعە کە دەڵێن قورئان بەسە و وازبێنن لە سونەتی

[١] **صحيح مسلم** (١٥٣)، **مسند أحمد** (٨٢٠٣) (٨٦٠٩).

پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، جا دەیسەلمێنین هەر قورئان بەس نیە دەبێ محمدیش بناسرێ (ﷺ) وە ئیقتیداشی پێوە بکەی و سونەتەکانیشی جێبەجێ بکەی ئەگەرنا خوای رب العالمین بە تەنها قورئان لێت قبوڵ ناکا، ئەمڕۆ ئەو بیروبۆچونانەش هاتوەتە ناو ئێمە زۆرێک لە حەدیسەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕەتدەکرێتەوە، تەنانەت موعتەزیلە لەناومان شینبونەوە (پەنا بە خوای رب العالمین) کە ئەمڕۆ ئەو بۆچونانە پەیدا بوە لەلای هەندێک لە خوێندەوارەکان بە حیساب، تەنانەت هەندێک خەڵک هەیە ڕەنگە خۆی پێ داعیش بێ ئیدیعای ئەوە دەکا کە عەزابی قەبر و نیعمەتی قەبر بە بەڵگەی سەحیح و ڕاست وجودی نیە مەهدی نایەت لە ئاخیری زەمان و دەجالیش شەڕ و ئاژاوەیە و حەقیقەتی وجودی نیە یەئجوج و مەئجوجیش دەڵێن نەبوە و یان هاتوە و ڕۆیوە ئەوانە هەموی ڕەتدەکەنەوە کە ئەوە هەموی پێچەوانەیە لەگەڵ عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە، لەو پێناوە ئەوەمان هەڵبژارد کە بزانین (محمد رسول الله (ﷺ)) بیناسین و بزانین زۆریش گرینگە ئەوەی شوێنی ئەو نەکەوێ ئیمانیشی پێ نەهێنێ بە دڵنیاییەوە چونە بەهەشتی نابێ، کە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) «كلُّكُمْ يَدْخُلُنَ الْجَنَّةَ» فەرموی هەموتان دەچنە بەهەشت «إلّا مَنْ أبى» فەرموی ئیلا کەسێک بەخۆی نەیەوێ و پشت لە بەهەشت بکا «قالوا: ومَنْ يَأْبى يا رسول الله (ﷺ)» کێ هەیە بە خۆی نەیەوێت بچێتە بەهەشت ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)؟ فەرموی «مَنْ أَطاعَنِي دخلَ الجنةَ، ومَنْ عَصانِي فقد أبى[1]» فەرموی ئەوەی گوێڕایەڵی ئەمرەکانی من بکا دەچێتە بەهەشت ئەوەی پێچەوانەی ئەمرەکانی من بکا ئەو کەسە نایهەوێ بچێتە بەهەشت، کەواتە کلیلی بەهەشت لە دوای (لا إله إلا الله) (محمد رسول الله)یە دەبێ ئەوانە بە دەست بێنی و تێی بگەی و کار و کردەوەی پێ بکەی ئینجا دەچیتە بەهەشت برای بەڕێزم.

[1] صحيح البخاري (٧٢٨٠)، مسند أحمد (٨٧٢٨).

لە پێناو ئەوەشدا بزانن پێغەمبەر چ پایە و پلەیەکی نایابی هەبوە (ﷺ) لەلای الله تعالی پێغەمبەر ئەو پێغەمبەرەیە (ﷺ) کە خوای رب العالمین هەڵیبژاردوە لەناو هەموو گەل و نەتەوەکان ڕێزی لێناوە، تەماشا بکەن زنجیرەیەک ئایەتی قورئان هەموی لە پێدا هەڵگوتن و ڕێز لێنان و پلە و پایە بەرز کردنەوەی پێغەمبەرە (ﷺ) کەسێک ئەگەر الله خۆشی نەوێ جێی ئەوەندە بایەخ و گرنگی نەبێ چۆن خوای رب العالمین کەلامی خۆی کە قورئانی پیرۆزە ئەو هەموو ئایەتەی دەربارە دادەبەزێنێ؟ کاتێک کە دەفەرموێت: ﴿مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ﴾ [النجم: ٢] لەگەڵ پێغەمبەرێتی (ﷺ): ﴿مَا كَذَبَ ٱلۡفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ﴾ [النجم: ١١] لە پاشان دەفەرموێ: ﴿مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ﴾ [النجم: ١٧] لە پاشان دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ﴾ [الشرح: ١] دڵی تۆمان فراوان کرد ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، یان دەفەرموێ: ﴿وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ﴾ [الشرح: ٢] هەمومان لەسەر تۆ لادا هەڵە و کەم و کورتیەکان مەعسومان کردی ئەی پێغەمبەر (ﷺ): ﴿وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ﴾ [الشرح: ٤] یاد و پلە و پایەی تۆ لە دونیا و قیامەتدا لە ڕیزی خوای رب العالمین لەدوای خوای رب العالمین ناوت دێ ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەوەیە پلە بەرز کردنەوەی خوای رب العالمین، وە دەش فەرموێ: ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ﴾ [النجم: ٥] ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ﴾ [النجم: ٣] قسەکانیشی هەروا نەبوە هەموی وەحی بوە دوایە دەفەرموێ: ﴿بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ [التوبة: ١٢٨] بەڵێ ئەو پێغەمبەرەی کە ڕەئفەتی هەبوە لەگەڵ ئێمە لەوپەڕی ڕەئفەت سینە فراوانی ڕەحم و بەزەیی پێویستە ئێمە زنجیرەیەک دانێین و لە خزمەتیدا بین و وە بیناسێنین بە خەڵکەکەی خۆمان.

تەنانەت خوای رب العالمین سوێندی بە تەمەنی پێغەمبەر خواردوە (ﷺ)، دەزانن لەبەرچی؟ موفەسیرین دەفەرمون زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەڵێن چونکە خوای رب العالمین سەدا سەد زانیوێتی کە پێغەمبەری بە دیهێناوە (ﷺ) هەموو ژیانەکەی ئەوپەڕی عیبادەت

و تاعەتی خوای رب العالمین ە هەموی لەوپەڕی خێرایەتی و چاکایەتیە لەبەر ئەوە الله سوێند بە تەمەنی دەخوا و دەفەرموێ: ﴿لَعَمرُكَ إِنَّهُم لَفِي سَكرَتِهِم يَعمَهُونَ﴾ [الحجر: ٧٢] واتە سوێند بە تەمەنی تۆ ئەی موحەممەد (ﷺ) هەر شتێک الله سوێندی پێ بخوا دیارە زۆر گرنگە لەلای خوای رب العالمین وە زۆریش گرنگە لەبەر ئەوە سوێندی پێ خواردوە.

قاضي عیاض دەفەرموێ -رحمه الله-: (اتفق أهل التفسير في هذا أنه قسم من الله سبحانه وتعالى، بمدة حياة محمد (ﷺ)) دەفەرموێ هەموو زانایانی تەفسیر یەکدەنگن لەو ئایەتەی سورەتی حیجر الله سوێندی بە ماوە و تەمەنی پێغەمبەر خواردوە (ﷺ) (وهذه نهاية التعظيم وغاية البر والتشريف[1]) ئەوە ئەوپەڕی بەڕاستی ڕێزلێگرتن و بە گەورە دانانی پێغەمبەرە (ﷺ) وە لەوپەڕی پلە و پایەدانێتی.

بەڕێزان و خۆشەویستان خوای رب العالمین ڕێزەکانی زۆرە بۆ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لەبەر ئەوە ئەو بابەتەمان بۆ هەڵبژاردن، تەماشا بکەن پێغەمبەر (ﷺ) ئەو زاتە بەرز و بەڕێزەیە کەوا هەمومان ئیش و کاری ئەوەمان پێیە ئەگەر هەندێک جار گوناحکاریش بین شەفاعەت و تکامان بۆ بکا نەک تەنها هەر ئێمە، گەورەیی پێغەمبەر لەوەدایە (ﷺ) هەموو ئومەتەکان حەدیسی سەحیحی پێغەمبەرە (ﷺ) لە مەیدانی حەشر و حیسابدا (شفاعة العظمى) تکای هەرە مەزن و گەورە بۆ پێغەمبەری پێشەوایە (ﷺ)، خەڵکەکە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا بێزاری دایان دەگرێت دەچنە لای ئادەم پێغەمبەر (ﷺ) ڕەتیان دەکاتەوە و هیچی لە دەست نایە دێنە لای نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا (عليهم الصلاة والسلام) ئینجا هەمویان ئاماژە دەکەن بۆ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) محمد المصطفى ئەو دەفەرموێ دەڕۆم هەتا بن عەرشی خوای رب العالمین خەڵکەکە ڕەت ناکەمەوە زیکر و

[1] الشوكاني. ص٨٦ - كتاب الشفا بتعريف حقوق المصطفى محذوف الأسانيد - الفصل الرابع في قسمه تعالى بعظيم قدره.

یادی الله دەکەم کڕنۆش و سوجدە دەبەم ئینجا خوای رب العالمین دەفەرموێ «ارْفَعْ رَأْسَكَ محمد (ﷺ)» ، وَسەرت بەرزکەوە ئەی موحەمەد لە سوجدە و کڕنۆشەکەت هەموو خەڵکی قەرزاری موحەمەدە (ﷺ) بۆ ئەو مەیدانە جولەکەکان دیانەکان ئومەتەکانی هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئێمەشی لەگەڵدابێ هەمومان قەرزاری محمد المصطفی ین کە ئەو کلیلی دەستپێکردنی مەیدان و مەحکەمە و حەشر و حیسابە، دەفەرموێ الله دەفەرموێ سەرت بەرزکەوە «سَلْ تُعْطَهُ، اشْفَعْ تُشَفَّعْ[1]» ئەی موحەمەد (ﷺ) داوا بکە پێت بدەم تکا بکە تکات ڕابگرم ئینجا مەحکەمەکە دەست پێدەکا و خەڵکەکە ڕزگاری دەبێ.

لەبەر ئەوە ئەوەمان بۆ هەڵبژاردون پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «فُضِّلْتُ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ بِسِتٍ» دەفەرموێ من بە شەش خاڵ بەرزتر کرامەوە پلە و پایەی زیاترم پێدراوە لەسەر هەموو پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاة والسلام) ئەوەی دراوەتە من لەو شەش خاڵە نەدراوەتە پێغەمبەرەکانی تر (علیهم الصلاة والسلام)، یەکەمیان دەفەرموێ «أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ» خوای رب العالمین کۆکەرەوەی وشە و وتە زۆرەکانی داوەتە من لە دەربڕینێکی کەمدا مانایەکی زۆر ببەخشێ، هەندێک جار یەک فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) چەندەها موجەلەد کیتابی لەسەر دەنوسرێ هێشتا مانا و واتای تێداماوە ئەوەیە جەوامیعول کەلیم بە چەند دێڕێکی کورت پێغەمبەر (ﷺ) مانا و واتای زۆر زەخم و گەورە و دور و درێژی دەبەخشی و خەڵکی تێدەگەیاند، دەفەرموێ «وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ» وە من سەرخراوم لەلای الله بەسەر دوژمنەکانم بەوەی ترسی خستوەتە دڵی دوژمنەکانم، ئەوە بۆ ئومەتەکانی پێشتر نەبوە بۆ پێغەمبەرانی پێشتر نەبوە (علیهم الصلاة والسلام) «وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ» دەستکەوتەکانی جەنگ و شەڕ بۆ من حەڵاڵ بوە بەڵام بۆ پێغەمبەران و ئومەتەکانی تر وانەبوە «وَجُعِلَتْ لِيَ

[1] **صحيح البخاري** (٣٣٤٠) (٣٣٦١) (٤٧١٢)، **صحيح مسلم** (١٩٤) (١٩٥) (٢٢٧٨)، **سنن الترمذي** (٢٤٣٤).

الْأَرْضُ طَهُورًا وَمَسْجِدًا» وە زەوی هەر هەموی بۆ من بە پاك دانراوە لە هەر شوێنێک ویستت کڕنۆش ببە و نوێژ بکە پاک و خاوێنە لێت قبوڵە مەگەر پیسیەکی زاهیری پێوەبێ لای بدەی ئەگەرنا لە هەر شوێنێک بێ تۆ سوجدە و کڕنۆش بۆ الله ببە و ئومەتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) الله ئەو ڕێزەی لە پێغەمبەر ناوە پاکە و خاوێنە «وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً» بۆ هەموو خەڵکیش من هاتومە ئەوە نەبێ بۆ چینێکی دیاریکراو بۆ گەل و نەتەوەیەکی دیاریکراو: ﴿وَمَا أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَـٰلَمِينَ﴾ [الأنبياء:١٠٧] هاتنەکەشی بەزەییە بۆ هەر هەموو خەڵکی ئەوەی بەدوای بکەوێ ڕەحم و بەزەییەکەی توش دەبێ و خەنی دەبێ «وَخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ[١]» وە پێغەمبەران بە من کۆتاییان پێهات خاتەمول ئەنبیائم لەبەر ئەوە ئێمە باسی پێغەمبەر دەکەین (ﷺ).

پێغەمبەر ئەو زاتەیە (ﷺ) کە ابن القيم الجوزية دەفەرموێ -رحمه الله- لە (زاد المعاد) دا دەفەرموێ لە بنەماڵەدا کەس نایگاتێ، لە هەموو عەشیرەتەکان و گەل و نەتەوەکانی سەر ڕوی زەوی باشترین نەوەکان نەوەی ئیسماعیل پێغەمبەرە (ﷺ) پێغەمبەریش لەوانە، وە لەنێو ئەواندا عەرەبەکان، لەنێو عەرەبەکاندا کینانە، لەنێو کینانەشدا قورەیش، لەنێو قورەیشیشدا هاشمیەکان، لەنێو هاشمیەکانیش بەنی عبد المطلب کە پێغەمبەر لەوانە (ﷺ)، لەنێو پێغەمبەرانیش (عليهم الصلاة والسلام) پێغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ) لەنێو هەمویان هەڵبژێردراوە، چونکە ڕەسولەکان لە نەبیەکان گەورەترن پێغەمبەر (ﷺ) هەم ڕەسولە و هەم نەبیە، وە لە پاشان لەنێو ڕەسولەکان ئولول عەزم کە پێنج پێغەمبەرەکەن لە هەمویان گەورەترن ئەویشیان بۆچونی ڕاجیح و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە نوح (ﷺ) ئیبراهیم موسا عیسا محمد المصطفى (ﷺ) ئەو پێنجەیان لە هەموو ڕەسولەکان گەورەترن، لەنێو ئەو پێنجەشدا ابن القيم دەفەرموێ بەڵگەی سەحیح هەیە دوانیان لە

[١] صحيح مسلم (٥٢٣) (١٧٤٧)، صحيح البخاري (٢٩٧٧) (٣١٢٤) (٦٩٩٨)، سنن الترمذي (١٥٥٣) (٣٠٨٥).

هەمویان گەورەترن لە پێنجەکەی تر ئیبراهیم (ﷺ) ئینجا پێغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ)، لە کۆتایەکەشدا موحەمەد لە ئیبراهیمی باپیرەشی گەورەترە (ﷺ) لەبەر ئەوەی سیفەتە باش و گەورە و پلە و پایەکانی ئەوانی هەموی تێدا هاتوەتەجێ سەرەڕای ئەوەی (سید المرسلین)ە و خاتەمول ئەنبیائیشە، لەبەر ئەوە ئیبراهیم لە هەمویان گەورەترە باپیری پێغەمبەرانە (ﷺ) وە خەلیلی خوای ڕەحمانە، بەڵام پێغەمبەریش (ﷺ) (سید المرسلین)ە و خاتەمو نەبیینە وە لە پاشان دوبارە ئەویش خەلیلی خوای ڕەحمانە، کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) وەکو موسا (كَلِيمُ اللَّهِ)یە لە شەوی (ئیسڕاء و میعڕاج)دا ڕاستەوخۆ لەگەڵ الله تعالی قسەی کردوە، موسا لەبەر ئەوە گەورەیە چونکە الله ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ کردوە، بەڵێ موحەمەدیش (ﷺ) لە شەوی (ئیسڕاء و میعڕاج) ڕاستەوخۆ الله تعالی قسەی لەگەڵ کرد کەواتە (كَلِيمُ اللَّهِ)یە، ئیبراهیم (ﷺ) خوای رب العالمین تاقی کردوەتەوە بەوەی کە ڕوبەڕوی طاغوتەکانی سەردەمی خۆی بۆتەوە بەهەمان شێوە پێغەمبەری ئێمەش وایە (ﷺ)، وە لە پاشان ئیبراهیم (خَلِيلِ اللَّهِ)یە، خەلیل دەزانن یانی چی؟ زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون بە چەند مانایەک دێت، یەک لەو مانایانە ئەگەر بۆ ئینسانەکان بێ کە ئینسان ناتوانێ ئەو نەوعە خۆشەویستیەی هەبێ و دەربڕێ کەلێنی دڵت هەموی پڕ بکاتەوە هیچ بۆشاییەکی بە خاڵی نەهێڵێتەوە تەواو دڵت لێی پڕ بێ لەوپەڕی خۆشەویستی ئا ئەوەیان خەلیلایەتیە، ئەو کاتە خوای رب العالمین سەدا سەد کەواتە پشتگیری ئەو پێغەمبەرە دەکا کە خەلیلی خۆیەتی سەدا سەدیش خۆشیدەوێ هیچ نوقسانی و کەم و کورتیەک نیە لەوپەڕی خۆشویستن کەسێکی تری بە ئاستی ئەو و لە ئاستی ئەو خۆشناوێ و ئاوا پشتی ناگرێ[١].

---

[١] کتاب مختصر زاد المعاد.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «مَنْ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَه» واتە: هەریەک شاهێدومانی بدا واتە لە دڵی جێگیر بکا و ئیمانی وابێ بە زمانیش دانی پێدابێنێ کردەوەکانیشی ئەوەی زمانی گوتویەتی و لەناو دڵیەتی بیسەلمێنێ ئەوە شاهێدومانی ڕاستەقینەیە چونکە شەهادە لە بینینەوە هاتوە کە دەڵێی (لا إله إلا الله) وەکو ئەوە وایە وەکو ئەو ڕۆژەی ڕوناکە لەبەرچاوت کە هیچ پەرستراوێکی حەق و ڕەوا نیە جگە لە الله ئینجا دەفەرموێ بە تاک و تەنهایی و شەریک بۆ الله پەیدا نەکا «وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ» وە دانیشبنێ و شاهێدی بێنێ لە دڵەوە و بە زمان و بە کردەوە بیسەلمێنێ کە موحەمەد بەندەی ڕاستەقینەی خوای رب العالمین ە وە ڕەسول و ڕەوانەکراو و پێغەمبەری ئەوە «وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَابن أَمَتِه» وە بشڵێ عیسا بەندەی خوایە و ڕەسولی اللەیە نەک کوڕی اللەیە (پەنا بە الله) «وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ» وە وشە و دەربڕین و فەرمانی اللەیە کە ڕەوانەی کرد ئاراستەی کرد بۆ مەریەم و بەدیهێنا «وَرُوحٌ مِنْهُ» کە لە خوای رب العالمین وە ڕۆح و گیانی عیسا دروستبوو بێ باوک «وَأَنَّ الْجَنَّةَ حَقٌّ» بڵێ بەهەشتیش حەق و ڕەوایە و دێ «وَأَنَّ النَّارَ حَقٌّ» ئاگری دۆزەخیش حەق و ڕەوایە دێ نەک وەکو هەندێک خەڵکی ئەو سەردەمە وەکو جەهمی و موعتەزیلەکان دەڵێن ڕۆژێک دادێ بەهەشت و جەهەنەم لەناو دەچێ (پەنا بە الله)، خەڵکێک ئەمڕۆ پەیدا بوە وەکو ئامۆژگاری بۆ خەڵکە داعیەکە و مامۆستایەکانیش ئەوانەی خۆیان پێ زانایە و یان نامێلکە و نوسین دەردەکەن لە الله بترسن وەرنەوە سەر ڕێڕەوی ئەهلی سونە و جەماعە بەهەشت و جەهەنەم بەوەی لێتان هەڵەبوە نامێلکەیەک یان لە شوێنێک خوێندوتانەوە و پێتان وایە ابن تیمیة و یان ابن القیم الجوزیةش بۆچونی وابوە کاتێک دادێ کۆتاییان پێ دێ، ئەو بۆچونانە پوچەڵن سەحیح و ڕاست و دروستی ئەهلی سونە و جەماعە بە ئایەت و حەدیس ئەوە دەسەلمێنێ کە بەهەشت و جەهەنەم هەتا هەتاین بەبێ کۆتا خوای رب العالمین ئێستاش بەدیهێناون و بون و وجودیان هەیە «أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنَ الْعَمَلِ» ئێمە ئەوەمان دەوێ ئەمڕۆ

بۆ خەڵکی خۆمان لەبەر ئەوە ئەو زنجیرامان هەڵبژاردوە بەڵکو خوای رب العالمین من و ئێوەی بەڕێز و تێکڕای موسڵمانان حاڵی بکا و تێ بگەیەنێ لە محمد رسول الله ئاوا ئیمانێکمان هەبێ کە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئینجا الله تعالی دەفەرموێ بڕۆ هەر کردارێکت هەبوە بڕۆ بۆ بەهەشت واتە ئەگەر گوناحیشت هەبێ ئەو بابەتە ئیمانەت هەبێ بە (لا إله إلا الله) و بە (محمد رسول الله) و بە عیسا کە عەبدی اللەیە و ڕەوانەکراوی اللەیە (علیهما الصلاة والسلام) ئینجا بەهەشت حەق و ڕەوایە و هەتا هەتاییە جەهەنەم حەق و ڕەوایە هەیە و هەتا هەتاییە هەر کار و کردەوەیەکی خراپیشت هەبێ ئەوە تکات بۆ دەکا و دەتباتە بەهەشت، وەلید دەفەرموێ جابری کوڕی عومەر لە جونادەوە ئەوەندەی بۆ زیادکردوە: «مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ أَيِّهَا شَاءَ[١]» بەڵکو نەک هەر ئەوە بڕۆ بۆ بەهەشت لە هەرهەشت دەرگاکەی بەهەشت لە کامەت دەوێ خوای رب العالمین دەفەرموێ فەرموو لەوەوە بچۆ نێو بەهەشت (الله بە نسیبمان بکا).

بەوە هانتان دەدەین لەسەر ئەوەی ئێمە پێغەمبەر بناسین (ﷺ) تەفسیری هەموو قورئان حاڵی دەبین، زانایان دەفەرمون چونکە گوتیان ئەخلاقی پێغەمبەر چۆن بوە دایکە عائیشە (ﷺ) دایکە عائیشە -رضي الله عنها- فەرموی «وكان خلقه القرآن[٢]» فەرموی ئەخلاق و ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) هەر قورئانێک بوە لەو گۆڕە، واتە هەموو ئایەتەکانی قورئانی جێبەجێ دەکرد هەڵسوکەوتەکانی هەموی بە عەمەلی و کرداری تەفسیر کردنەوەی ئایەتەکانی قورئان بوو، هەریەکێک پێغەمبەری تەواو ناسی (ﷺ) وەکو ئەویکرد بزانە قورئانی سەدا سەد هەموی تەتبیق کردوە و جێبەجێکردوە.

تخوا حەیف و مخابن نیە تۆ لاعیبێک و فڵانێک و فیسارێک کە بۆ دونیاتە یان شتێکی دونیەوی کە دەتەوێ یان لایەنێکت یان عەشیرەتێکت یان کەسێکت لەپێناو دونیا خۆشت

[١] صحيح البخاري (٣٤٣٥)، صحيح مسلم (٢٨)، مسند أحمد (٢٢٦٧٥).
[٢] الألباني، صحيح الأدب المفرد (٢٣٤)، صحيح لغيره أخرجه البخاري في ((الأدب المفرد)) (٣٠٨).

دەوێ شێوە و شکڵ و وێنەی بزانی وە بزانی وەسفی بکەی وە ژیاننامەی بخوێنیتەوە و هەوڵی بۆ بدەی یان گوێ ڕابگری لە خەڵکی پێت بناسێنێ بەڵام هی پێغەمبەری پێشەوات نەزانی (ﷺ)؟ بە پشتیوانی الله لە تەوقی سەری پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) گیانمان فیداییێ هەتا نەعلەکان و بنی پێی هەر هەموی دەخەینە بەر گوێچکەتان بە پشتیوانی خوای رب العالمین لە شێوە و شکڵ و ڕەنگیەوە لە قەد و قیافەیەوە وە لە قسە و وتە شیرینەکانیەوە لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ عائیلە و هاوسەران و منداڵەکانیەوە لەگەڵ دەر و دراوسێ و جیرانیەوە هەر جاری و بە نمونەیەک، وە تەنانەت لە شەڕ و جەنگەکان چۆن هەڵسوکەوتی کردوە پێغەمبەرمان (ﷺ)؟ هەر هەموی (إن شاء الله) بە پشتوانی الله لە کۆتاییەکەش ئەوکاتە باسی ئەوەشتان بۆ دەکەین ئەرکی ئەو لەسەر ئێمە چیە و ئێمە دەبێ چیبکەین هەتا لە ژیاندا ماوین بۆ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ).

## خانەوادە و بنەماڵەی پێغەمبەری پێشەوا (صلى الله عليه وسلم)

گەر سەرنجی مێژوی باسی ڕەچەڵەکی پێغەمبەر بکەین (ﷺ) یان هەر هەموو سیرەش، ئەوەی وەرمانگرتوە و باسی دەکەین بە پشتیوانی الله هەموی لە ڕیوایەتە سەحیحەکانە وەرمانگرتوە هەموی لە فەرمودەکان و ئەسەرەکان هاتوە.

لێرەدا ئیمامی بوخاری دەفەرموێ موحەمەد کێ بوە؟ دەفەرموێ (هو أبو القاسم) کونیەکەی ئەبو لقاسم بوە (مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ) ناوی محمد کوڕی عەبدوڵای کوڕی عبد المطلب بوە عبد المطلبیش کوڕی هاشم بوە هاشمیش کوڕی عبد مناف بوە وە ئەویش کوڕی قوصەی بوە ئەویش کوڕی کیلاب بوە ئەویش کوڕی موڕەی بوە ئەویش کوڕی کەعب بوە ئەویش کوڕی لوئەی بوە ئەویش کوڕی غالیب بوە ئەویش کوڕی فەهرە فەهریش کوڕی مالیکە ئەویشیان کوڕی نەضرە ئەویشیان کوڕی کینانەیە وە ئەویشیان کوڕی خوزەیمەیە دوایە کوڕی  مودریکەیە کوڕی ئیلیاسە کوڕی موضرە وە لە پاشان کوڕی نیزارە و ئەویش کوڕی مەعدە و مەعدیش کوڕی عەدنانە.

هەتا ئێرە زانایانی ئیسلام یەکدەنگن لەسەر ئەوە، ئیمامی زەهەبی دەفەرموێ (وَعَدْنَانُ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ (عليهما الصلاة والسلام) بِإِجْمَاعِ النَّاسِ[١]) بە یەکدەنگی هەموو مێژوو نوس و زانا و موسڵمانان ئەو کابرایە عەدنان یەکێکە لە نەوەکانی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەر (عليهما الصلاة والسلام).

لە پاشان هاتا ئێرە ابن حەزمی ئەندەلوسی -رحمه الله-  دەفەرموێ لە پێغەمبەر (ﷺ) هەتا سەر عەدنان هیچ ئیختیلاف و جیاوازیەک نیە لە ناوی باوک و باپیرەکان ابن حەزمی ئەندەلوسی دەفەرموێ -رحمه الله-: (وعدنان بلا شك من ولد إسماعيل الذبيح رسول الله

[١] كتاب تاريخ الإسلام - ت تدمري [شمس الدين الذهبي] ج: ١ ص: ١٧.

(ﷺ)، ابن إبراهيم خليل الله ورسوله (ﷺ)[1] وە دەش فەرمویێت هەتا ئەویّ ڕاست و دروستە هیچ ئیختیلافێکی لەسەر نیە هەموو ناوەکان تەواوە.

ابن القيم الجوزية له (زاد المعاد) دەفەرمویّ هەتا دەگاتە سەر ئیسماعیل و ئیبراهیم ئیختیلاف و جیاوازی زۆر هەیە تەنها لە ناوەکان، ئەگەرنا پێغەمبەر (ﷺ) نەوەی ئیبراهیم پێغەمبەرە (ﷺ)، وە لەنەوەکانی ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ) دوو کوڕی لە پشتی هەبوە نەوەکان لەو دوو کوڕە پەیدابونە، ئیسماعیلی هەبوە لەگەڵ ئیسحاق، ئیسماعیل لە هاجەرە بوە ئیسحاقیش لە سارا خاتونی هاوسەری بوە، لە ئیسماعیل هیچ پێغەمبەرێک پەیدا نەبوو (ﷺ) هەتا دەگاتە سەر محمد المصطفى بەڵام لە ئیسحاق یەعقوب پەیدابوو لە یەعقوبیش هەتاوەکو سەر عیسا پێغەمبەر (ﷺ) هەموو پێغەمبەرەکانی بەنو ئیسرائیل لەنەوەی یەعقوب و ئیسحاقن ئەوانیش نەوەی ئیبراهیم پێغەمبەرن (ﷺ) وە (عليهم الصلاة والسلام).

## پلە و پایەی پێغەمبەر لەناو گەل و نەتەوەکەی

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویّ: «بُعِثْتُ مِنْ خَيْرِ قُرُونِ بَنِي آدَمَ قَرْنًا فَقَرْنًا» « دەفەرمویّ من لە باشترین سەدەکانی نەوەکانی ئادەم هاتوم سەدە بە سەدە من لە باشترین سەدەکانی نەوەکانی ئادەم هاتوم سەدە بە سەدە حَتَّى بُعِثْتُ مِنَ الْقَرْنِ الَّذِي كُنْتُ فِيهِ[2]» هەتاوەکو ئەو سەدە هات کە منی تێدا بە بون و وجود هات باشترین سەدەبوو کە خوای رب العالمين منی لێدانا.

ئینجا لە پاشان دەفەرمویّ لێیان پرسیوە لە پێغەمبەر (ﷺ) عەبدولموتەڵیبی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموتەڵیب دەفەرمویّ: «أَتَى نَاسٌ مِنَ الْأَنْصَارِ النَّبِيَّ (ﷺ)،

[1] جوامع السيرة ط العلمية [ابن حزم] ص: ٤.

[2] صحيح البخاري (٣٥٥٧)، مسند أحمد (٨٨٥٧) (٩٣٩٢).

فَقَالُوا: إِنَّا لَنَسْمَعُ مِنْ قَوْمِكَ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ مِنْهُمْ: إِنَّمَا مَثَلُ مُحَمَّدٍ مَثَلُ نَخْلَةٍ نَبَتَتْ فِي كِبًا» دەڵێ ئێمە لە ئەنصاریەکانمان بیستوە کەوا خەڵکانێک دەهاتن پرسیاریان دەکرد دەیانگوت ئەی موحەمەد (ﷺ) ئێمە بیستومانە دەڵێن نمونەی پێغەمبەر (ﷺ) موحەمەدی لە دایکبوە لە خەڵکێک وەکو ئەوەی دار خورمایەک لەسەر کوفەکێک شین بوبێ ئەویش واتە ڕەچەڵەکی نیە بنەماڵەکەی بێ ڕێزن و تەواو نین، پێغەمبەریش توڕەبوو (ﷺ) بەسەر میمبەر کەوت «أَيُّهَا النَّاسُ، مَنْ أَنَا؟» خەڵکینە تەماشا بکەن من کێم لە ناوتان ئایە فیعلەن وایە من وەکو دار خورمایەک لە گوفەکی شین بوبێ؟ یان بنەماڵەکەم دیارە «قَالُوا: أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ» گوتیان تۆ پێغەمبەری اللەی «قَالَ: أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ» پێغەمبەر فەرموی من کوڕی عەبدوڵام ئەویش کوڕی عەبدولموتەڵیبە، گوتیان بەڵێ ئێمە وامان زانیوە و بنەماڵەکەت زۆر بەرز و بەڕێزە کەوابێ هیچ گومانمان تێدا نیە، کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆتاییەکەی فەرموی خوای رب العالمین مرۆڤەکانی هەموی دروستکرد و بەدیهێنان «فَجَعَلَنِي مِنْ خَيْرِ خَلْقِهِ» منی کردە باشترین بەدیهێنراوەکان «ثُمَّ فَرَّقَهُمْ فِرْقَتَيْنِ» لە پاشان مەردوم و بەدیهێنراوەکانی کردە دوو تیرە و تاقمە «فَجَعَلَنِي مِنْ خَيْرِ الْفِرْقَتَيْنِ» منیشی لەناو ئەو دوو تاقم و کۆمەڵە لە باشەکەی دانا و هەڵبژارد «ثُمَّ جَعَلَهُمْ قَبَائِلَ» ئەوانیکردە تیرە تیرە «فَجَعَلَنِي مِنْ خَيْرِهِمْ قَبِيلَةً» منی کردە باشترین تیرە و هۆزەکان «ثُمَّ جَعَلَهُمْ بُيُوتًا» هەریەک لەو تیرانەشی کردە چەند بنەماڵەیەک منیشی کردە باشترین لەو بنەماڵانە «وَأَنَا خَيْرُكُمْ بَيْتًا وَخَيْرُكُمْ نَفْسًا[١]» فەرموی ئینجا بزانن خەڵکینە من لە بنەماڵە لە هەر هەموتان بەرز و بەڕێزتر و گەورەتر و پاکترم وە لە پاشانیش وەکو خودی خۆشم لە هەموتان گەورەتر و بەرز و بەڕێزترم.

[١] مسند أحمد (١٧٥١٧).

کەواتە خەڵکە باشەکە هەموی شاهێدی ئەوە دەدەن ڕەچەڵەک و بنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ) باشترین بنەماڵەیە، تەنانەت بەردەکانی مەککەش دەیانزانی، فەرمودەی سەحیح و دروستە کە جابری کوڕی سەمورە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): «إِنِّي لَأَعْرِفُ حَجَرًا بِمَكَّةَ كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ، إِنِّي لَأَعْرِفُهُ الْآنَ[1]» فەرموی بەردێک هەبوو لە مەککە ئێستاش پێ دەناسمەوە و دەیزانمەوە و دەیناسم پێشی پێغەمبەرایەتیم ئەو بەردە منی دەناسی سەلامی لێم دەکرد کە بەلایدا دەچوم.

ئەو پێغەمبەرە پێشەوایە (ﷺ) هات و بەدیارکەوت لەو بنەماڵەیەدا کە دەفەرموێ: «مَثَلِي وَمَثَلُ الْأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي، كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بُنْيَانًا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ» دەفەرموێ نمونەی من لەگەڵ نمونەی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) وەکو ئەوە وایە هاتبن ئاوان دیوار و بینایەکیان دروست کردبێ بە جوانی و زۆر بە ڕێک و پێکی «إِلَّا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ مِنْ زَوَايَاهُ» ئیلا لە یەک لا کەلێنەکان و لە یەک لا دیوارەکان و لە یەک لا غوڕفەکان بۆشاییەکی بچوک مابێ بە قەدەر خشتێک یان بلۆکێک، دەفەرموێ «فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ وَيَعْجَبُونَ لَهُ» خەڵکی بە دەورەی ئەو بینایەدا بسوڕێتەوە بڵێن (ما شاء الله) بینایەکی چەند جوانە سەریان سوڕ بمێنێ ئای چەند دڵگرە دوایە ببینن ئەو کەلێنەی تێدا ماوە، وە دەڵێن «هَلَّا وُضِعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَةُ؟» ئای ئەو کەلێنەش پڕکرابۆوە بە جوانی بیناکە هیچ کەم و کورتی نەدەما، جا پێغەمبەر دەفەرموێ «فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ[2]» ئا من ئەو خشتەم خوای رب العالمين بینا و دیواری پێغەمبەرانی پێ پڕکردەوە من کۆتای هەموو پێغەمبەرانم (عليهم الصلاة والسلام).

[1] صحيح مسلم (٢٢٧٧)، سنن الترمذي (٣٦٢٤)، سنن الدارمي (٢٠).

[2] صحيح البخاري (٣٥٣٥)، صحيح مسلم (٢٢٨٦)، مسند أحمد (٧٣٢٢) (٧٤٨٥) (٨١١٦).

## ناوەکانی پێغەمبەری پێشەوا (صلى الله عليه وسلم)

ناوەکانی یەکجار زۆرن هەندێکیان دەژمێرین کە لە فەرمودەی سەحیح هاتوە بەو ئیعتیبارەی ئەگەر لە هەر سیفەتێکی پێغەمبەر (ﷺ) ناوێکی بۆ دابتاشین ناوەکان زۆر زیاد دەکات و چەند سەد ناوێکی دەبێت ابن القیم دەفەرموێ بەڵام ئەو ناوانەی لە حەدیسی سەحیح هاتوە هەموشی پڕ مانان بۆتان دەڵێینەوە و گوێی لێ ڕابگرن با ناوی پێغەمبەری خۆمان هەموو ناوەکانی بزانین (ﷺ).

موحەمەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موطعیم لە باوکیەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «إِنَّ لِي أَسْمَاءً» ، من چەند ناوێکم هەیە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) «أَنَا مُحَمَّدٌ» من ناوم موحەمەدە، موحەمەد دەزانن یەعنی چی؟ سیغەی موبالەغەیە واتە لەبەر خەسڵەت و سیفەت و ئاکاری زۆر جوان هەندەی هەیە زۆر ڕێزی لێ بنرێ و زۆر پێیدا هەڵبگوترێ و زۆر سوپاس بکرێ بەڵێ وابوو پێغەمبەر (ﷺ) «وَأَنَا أَحْمَدُ» دەفەرموێ من ناوم ئەحمەدیشە، کە ئەحمەد لەسەر وەزنی ئەفعەلەیە لەبەر ئەوەش (ممنوع من الصرف)ە چونکە لەسەر وەزنی فیعلە و عەلەمیشە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەڕوی نەحوییەوە واتە من هەردەم شوکرانەبژێر و حەمد و سوپاسی اللەش دەکەم و کردومە «وَأَنَا الْمَاحِي» من ناوم ماحیە و ڕەشکەرەوەم «الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ بِيَ الْكُفْرَ» بەو مانایەی پێغەمبەر دەفەرموێ کە الله بە من کوفری ڕەشکردەوە کوفری هێنایە لەرزین و ڕەشیکردەوە لە مەککە و لە مەدینە «وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمَيَّ» دەفەرموێ منیش کۆکەرەوەی خەڵکەکەم حاشیرم ئەو ناوەشم هەیە کە خەڵکی کۆدەکەمەوە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا یان خەڵکی شوێن پێی من هەڵدەگرن بە هەردو ماناکەی «وَأَنَا الْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ أَحَدٌ» من ناویشم عاقیبە لەپاش من هیچ پێغەمبەرێک نایە کەواتە کۆتایی

پێ دێ، وه‌ ده‌ش فه‌رموێ «وَقَدْ سَمَّاهُ اللَّهُ رَءُوفًا رَحِيمًا[١]» واته‌ ئه‌و دوا كاروانه‌م كه‌ كه‌سی تری به‌دوادا نایه‌ت، جا زانایان له‌ ته‌علیق له‌سه‌ر ئه‌وه‌ ده‌فه‌رمون اللهیش له‌ قورئان ناوی بردوه‌ به‌ (رءوف رحیم).

یه‌كێكی تر له‌ ناوه‌كانی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌فه‌رموێ «الْمُقَفِّي، وَنَبِيُّ التَّوْبَةِ، وَنَبِيُّ المرحمة، وَنَبِيُّ الرَّحْمَةِ، وَنَبِيُّ الْمَلْحَمَةِ» ئه‌وانه‌ هه‌موو ناون بۆ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) كه‌ له‌ ڕیوایه‌تێكی تری سه‌حیحی موسلیم ده‌فه‌رموێ «أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَحْمَدُ، وَالْمُقَفِّي، وَالْحَاشِرُ، وَنَبِيُّ التَّوْبَةِ، وَنَبِيُّ الرَّحْمَةِ[٢]»، ئیمامی نه‌وه‌وی ده‌فه‌رموێ (نَبِيُّ التَّوْبَةِ، وَنَبِيُّ الرَّحْمَةِ، وَنَبِيُّ الْمَلْحَمَةِ) ئه‌وانه‌ هه‌موویان مانایان لێک نزیكه‌، واته‌ من ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌م كه‌وا وامكردوه‌ ته‌وبه‌ی قبوڵ بێ ئه‌وه‌ی ئیمانم پێ بێنێ هه‌ر گوناح و تاوانێكی كردبێ و شیركیشی ئه‌نجام دابێت كه‌ خوای رب العالمین لێی قبوڵ بكا، وه‌ پێغه‌مبه‌ری نیعمه‌ت و به‌زه‌یم بۆ ئه‌و خه‌ڵكه‌م هێناوه‌ وه‌ هی ئه‌وه‌م كه‌ به‌زه‌ییه‌كان به‌ فیعلی و كردار بگاته‌ خه‌ڵكی[٣]، وه‌ له‌ پاشان له‌ فه‌رموده‌یه‌كی تر ده‌فه‌رموێ «وأنا نبي الملاحم» یان «الملحمة[٤]» من پێغه‌مبه‌ری شه‌ڕ و جه‌نگه‌كانم واته‌ جه‌نگ و جیهادیش له‌ دینی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) كوشتار له‌گه‌ڵ كافره‌كان یه‌كێكه‌ له‌وه‌ی شیعار و دروشمه‌ و به‌رنامه‌ی بۆ دانراوه‌ له‌ ئیسلامدا به‌و مانایه‌ دێ زانایان ده‌فه‌رمون.

ئیمامی ابن القیم الجوزیة ده‌فه‌رموێ: (وأسماؤه (ﷺ) نوعان) ناوه‌كانی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) دوو جۆرن، جۆری یه‌كه‌میان (خاص: لا يشاركه فيه غيره من الرسل) جۆری یه‌كه‌م له‌ ناوه‌كانی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) كه‌س هاوبه‌شی پێغه‌مبه‌ر نه‌بوه‌ هه‌تا له‌ پێغه‌مبه‌رانیش (علیهم الصلاة والسلام) هاو وێنه‌ی نه‌بوه‌ و تاك بوه‌ و بۆ پێغه‌مبه‌ر بوه‌ (كمحمد، وأحمد، والعاقب،

[١] صحيح البخاري (٤٨٩٦) (٣٥٣٢)، صحيح مسلم (٢٣٥٤)، سنن الترمذي (٢٨٤٠).
[٢] صحيح مسلم (٢٣٥٥)، مسند أحمد (١٩٥٢٥) (١٩٦٢١) (١٩٦٥١).
[٣] ذكره النووي في شرحه لصحيح مسلم (١٧ / ٢٧).
[٤] الألباني، مختصر الشمائل (٣١٦)، حسن.

والحاشر، والمُقَفِّي، ونبي الرحمة) دەفەرموێ ئەوە تایبەتەکانە (والثاني) دووەمیان (ما يشاركه في معناه غيره من الرسل) ماناکەی لە پێغەمبەرەکانی تریش هاتووەتەجێ (ولكن له منه كماله) بەڵام هی پێغەمبەر تەواوتر و بەرزترە لە هی پێغەمبەرەکانی تر (عليهم الصلاة والسلام) (فهو مختص بكماله دون أصله، كرسول الله، ونبيه، وعبده، والشاهد، والمبشر، والنذير، ونبي الرحمة، ونبي التوبة[١]).

## هاوسەرەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

یەکەمیان بە ئیتیفاقی هەموو زانایان بەبێ ئیختیلاف دایکە خەدیجە بوە -رضي الله عنها- کە پێغەمبەر (ﷺ) لە هەر هەموویانی خۆشتر ویستوە زۆریشی ڕێز لێگرتوە، لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە تەنها ئیختیلاف و جیاوازی هەیە ئایە ئەویان خۆشەویستر بوە لە دایکە عائیشە یان دایکە عائیشە؟ ئەوەشیان (والله أعلم) بۆچونی ڕاجیح و پەسەند لە ژیانیدا پێغەمبەر (ﷺ) عائیشە چونکە خەدیجە نەمابوە لە هەموانی خۆشتر ویستوە بەڵام خەدیجە لەلای پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویستر بوە لەوانەی کە نەماون لە دایکە عائیشەش -رضي الله عنهن-.

ئینجا لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) سەودەی کچی زەمعەی هێنا لە دوای دایکە خەدیجە -رضي الله عنها- وەفاتی کرد زەمعەی کچی ئەسوەدی هێنا بوە خێزانی ئەویش قورەیشیە بوو.

لە پاشان دایکی عەبدوڵا کە عائیشە خاتونی کچی ئەبو بەکری سدیقە -رضي الله عنهم- ئەوی خواست و ئەوی هێنا، کە دایکە عائیشە ئەوەندە پلە و پایەی هەیە لە هیچێک لەنێو سەرجێ و لێفەکان کە پێغەمبەر (ﷺ) خەوتبێ لەگەڵ هاوسەرەکانی وەحی بۆ دانەبەزیوە ئیلا لەگەڵ عائیشە ئەوە ڕویداوە، لەسەرجێ پێکەوە خەوتون و لەبن یەک لێفە پێغەمبەر

[١] زاد المعاد لابن القيم (١/ ٨٦).

(ﷺ) لەبن یەک پۆشاک وەحی بۆ هاتوەتە خوارەوە، کەواتە ئەوەش پلە و پایەیەکە الله تعالی داویەتیە دایکە عائیشە و نەیداوەتە دایکەکانی تری ئیماندارانی.

وە لە پاشان حەفسەی هێنا پێغەمبەر (ﷺ)، حەفسەش کەوا کچی عومەری کوڕی خەتاب بوو -رضي الله عنها-.

لە پاشان زەینەبی کچی خوزەیمەی هێنا ئەویش کوڕی حاریسی قەیسییە کە لە بەنو هیلال بوو بەناو بانگ بون.

لە پاشان ئوم سەلەمەی هێنا کە ناوی هیند بوو کچی ئەبی ئومەیەی قورەیشی مەخزومیەبوو.

وە لە پاشان زەینەبی کچی جەحشی کچە پلکی خۆی هێنا پێغەمبەر (ﷺ)، کە زەینەبیش بەوە شانازی دەکرد دەیگوت ئێوەی هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر زەوی وەلی ئەمرتان هەبوە و مارە کراون بەڵام وەلی ئەمری من الله بوو لە ئاسمان منی مارە کرد کە خوای رب العالمین فەرموی: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا﴾ [الأحزاب: ٣٧].

لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) جوەیریەی هێنا جوەیریەی کچی حاریسی کوڕی ئەبی ضیراری موستەڵیقیە.

لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئوم حەبیبەی خوشکی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیانی هێنا -رضي الله عنهم- کە ناوی ڕەملەی کچی ئەبو سوفیان بوو.

وە لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) سەفیەی هێنا سەفیەی کچی حویەی کچی ئەخطەب کە یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی بەنو نەزیری جولەکەکان کچەکەی ئەوی مارە کرد[١].

[١] ئیمامی نەوەوی لە کتێبەکەی خۆی (تهذيب الأسماء واللغات) تۆماری کردوە.

وە ئیمامی نەوەوی دەش فەرموێ قەتادە فەرمویەتی پێغەمبەر (ﷺ) پازدە هاوسەر و خێزانی هەبوە تەنها سێ سزدەیانی پێغەمبەر (ﷺ) لە ژێر نیکاحی بوە بەردەوام کە وەفاتیشی کردوە پێغەمبەر (ﷺ) تەنها نۆی لە ژێر نیکاح بوە وە ئەوانەی تریش ئیختیلافی زۆری لەسەرە ئایە بێجگە لەو پازدانە پێغەمبەر (ﷺ) هەیە مارەی کردوە و دوایە دەستی لێ کردوەتەوە و یان هەیە مارەی کردوە و ئافرەتەکە وەفاتی کردوە نەگەیشتوەتە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ).

لەوانە ئیمامی زەهابی لە (سیر أعلام النبلاء) ناوی ئافرەتێک دەهێنێ بەناوی عاریە لە کوردەواری خۆمان ئەو ناوە زۆرە هەیە ناوی عاریەیە، دەفەرموێ عاریە یەکێک بوە لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) مارەی کرد بەڵام پێش ئەوەی بیگوازێتەوە وەفاتی کرد ئافرەتەکە و نەهاتە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ).

### حیکمەتی فرە هاوسەرگیری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

زۆر خەڵک هەیە لە دوژمنان و ناحەزانی ئیسلام شوبوهات دروستدەکەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) چۆن دەبێ ئەو هەموو خێزان و هاوسەرەی هەبوبێ؟ یان ئەگەر هەیبوە لە پێناو ئەوە هەیبوە ئارەزوەکانی خۆی دابمرکێنێتەوە و حەزی بە شەهوەت بازی و ئارەزوو بازی بوە (پەنا بە خوای رب العالمین) کە پێغەمبەر دوربوە لەو شتانە (ﷺ) ، باشترین کیتاب کە دیراسەی ئەو بابەتەی کردبێ ئەوەی خوێندەوارە و موسڵمانە پێویستە بیخوێنێتەوە کتێبەکەی شێخ صابونیە (الله پاداشتی بداتەوە) کە بە ناوی (شبهات وأباطیل حول تعدد الزوجات الرسول - دەفەرموێ ئەو گومان و پوچەڵیانەی دروستکراوە بەرامبەر ئەو فرە ژنایەتیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە هەیبوە) ئەوانە هەموی وەڵام دەداتەوە یەک بە یەک.

یەکەم خاڵ ئێمە دەڵێین لە وەڵامی ئەوانە پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی موراهیقایەتیدا ژن و هاوسەری نەهێنا کە بە صادیق الأمینیش ناسرابوو، خەڵکی مەککە لە منداڵایەتیدا هەر

خۆشیشیان دەویست توانی هەتا تەمەنی (٢٥)ساڵی خۆی ڕابگرێ، کەسی شەهوانی ئارەزوباز ناتوانێ هەتا تەمەنی (٢٥) ساڵی خۆی ڕابگرێ یان هاوسەر و ژن دەهێنێ و خۆی دەپارێزێ یان ئەوەیە توشی تاوان و گوناح و داوێن پیسی دەبێ (پەنا بە الله)، پێغەمبەر (ﷺ) لەوپەڕی ئەخلاق و ڕەوشت توانی هەتا (٢٥) ساڵی خۆی بپارێزێ بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی بێتە سەر لەڕوی ئەوەی چاوی لە ناموسی کەس بوبێ لەوە زۆر پاک و بەرزتر بوە.

دوەم خاڵ لە وەڵامی ئەوانە کاتێک دایکە خەدیجەی هێنا -رضي الله عنها- دایکە خەدیجە بزانن چ ئافرەتێک بوە؟ ئایە گەنج و کچ بوە پێغەمبەر هێنای تەماحی (ﷺ) تێبکا؟ ئەگەر کەسێکی شەهوانیبا (پەنا بە خوای رب العالمین) دەچوو لە دوای جوانترین کچەکانی مەککە دەگەڕا و ئەویان دەدایە، بەڵکو چوو دایکە خەدیجە -رضي الله عنها- بۆخۆی داوای لێکرد بچێتە داخوازی کە موعجەب بوو بە ئەخلاق و ڕەوشت و بەها بەرزەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر تەمەنی (٢٥) ساڵ بوو دایکە خەدیجە تەمەنی (٤٠) ساڵ بوو، (١٥) ساڵ لە پێغەمبەر گەورتربوو (ﷺ) سەرەڕای ئەوەی لەپێش پێغەمبەریش (ﷺ) دوجار شوی کردبوو بە دوو پیاوی تر، کەواتە ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی شەهوەتبا نەدەچوو ئەو ئافرەتە بێوەژنە کە دوو شوی کردوە و (١٥) ساڵیش لە خۆی گەورەترە مارەی بکا.

ئینجا بزانن تەمەنی گەنجایەتی و کامڵایەتی کە پیاو لەسەر شنگ و توانایە و حەزی بە هاوسەر و خێزان و ئەو بابەتە شتانەیە هەموی بەڕێکرد لەگەڵ ئەو ئافرەتە کە دایکە خەدیجە بوو -رضي الله عنها-. تەماشا بکەن پێغەمبەر (ﷺ) (٢٥) ساڵ لەگەڵ دایکە خەدیجە ژییا کە لە تەمەنی (٢٥) بوە (٥٠) ساڵ ئینجا دایکە خەدیجە -رضي الله عنها- وەفاتی کرد و گەڕایەوە لای خوای رب العالمین، کەواتە (٢٥) ساڵ لەگەڵ یەک ئافرەتی بێوەژنی (١٥) لە خۆی گەورەتر پێغەمبەر (ﷺ) مایەوە، ئینجا لەپاش دایکە خەدیجە -رضي

الله عنها- پێغەمبەر (ﷺ) سێ ساڵیش مایەوە ژنی نەهێنایەوە تەمەنی بوە (٥٣) ساڵ، ئەوانە هەموی وەڵامە بۆ ئەو کەسانەی کەوا گومان دەبەن (پەنا بە خوای رب العالمین) کە پێغەمبەر (ﷺ) کەسێکی ئارەزو باز بوە لەبەر ئەوە ئەوەندە ژنەی هێناوە، بەڕاستی ئەوانە هیچی ڕاست نین، لە پاشان تەمەنی چوە (٥٣) ساڵ ئینجا چ ئافرەتێکی هێنا یەکەمجار لە دوای دایکە خەدیجە؟ ئەو ئافرەتەی هێنا سەودەی کچی زەمعە، سەودەی کچی زەمعەش بێوەژن بوو ئافرەتێک بوو لە ئافرەتەکانی مەککە ئەوی مارەکرد و هێنای و خواستی ئەو خێزان و هاوسەری بوو ئینجا چوو دایکە عائیشەی هێنا و لەپاش هیجرەتی بۆ مەدینە گواستیەوە.

کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) لە پاش تەمەنی (٥٣) ساڵیدا دەستیکرد بە هاوسەرگیریەکان ئەوانەش هەریەکەیان سەبەب و هۆکارێک هەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) وای لێهات ژنەکان بێنێ:

یەکەم ئەو ژن هێنانانەی پێغەمبەر (ﷺ) کەسی موسڵمان بۆی نیە قسەی لێبکا، لەبەر چی؟ لەبەر ئەوەی ئەمر و فەرمانی اللەیە، الله دەتوانێ هەموو شتێک حەڵاڵ بکا و هەرشتێکیشی بوێ حەرامی بکا چونکە ئەو اللەیە ئەگەر تۆ خۆت بە عەبدی ئەو دەزانی دەبێ ئاوا تەسلیمی فەرمان و ئەمرەکانی ببی، الله دەفەرموێتە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿إِنَّا أَحۡلَلۡنَا لَكَ أَزۡوَٰجَكَ﴾ [الأحزاب: ٥٠] کەس بۆی نیە قسە بکا ئەی موحەمەد (ﷺ) ئێمە ئەو فەرمانەماندا هاوسەرەکانمان بۆ تۆ حەڵاڵ کرد چەند هاوسەرت هەیە.

واتە الله ئەو ڕێگایەی بە پێغەمبەردا (ﷺ) کەسی موسڵمان قسەی نامێنێ بەڵام مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکان ئەوانەی بێدینن و شوبهە و گومان دروستدەکەن وەڵامی ئەوانیش لەو چوار خاڵە سەرەکیە دەدەینەوە کە دەڵێین پێغەمبەر (ﷺ):

یەکەمیان لە پێناو چەند حیکمەتێکی تەعلیمی و فێرکردن هاوسەرەکانی هێنا، تەعلیمی و فێرکردن یەعنی چی؟ لەبەر ئەوە هێنای هەتا چەند هاوسەرێکی هەبن زیرەک و دانابن بۆ ئەوەی دین وەرگرن لە پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵەوە لە هەموو حاڵەتەکان لەگەڵی بژین ببینن چی دەکا بۆ دینداری ئەوە بە ئومەتەکەی بڵێنەوە و بە ئافرەتەکانیش بڵێنەوە و دەرزیان پێ بڵێن چونکە پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەری اللەیە و قدوە بوە و سەرمەشق بوە دەبێ هەموو هەڵسوکەوت و قسەکانی وە گوتنەکانی بگوترێتەوە بۆ ئومەت هەتا چاوی لێبکەن و ئەوە دینداریيە، یەک لەوان دایکە عائیشەی لەپێناو ئەوە هێنا و ئەو حیکمەتەی تێدا هەبوە چونکە دایکە عائیشە ئافرەتێکی زیرەک بوو بەڵێ دینی لە پێغەمبەر وەرگرت (ﷺ)، هەموو ئومەت بە پیاو و بە ژنەکانەوە موحتاجی ئەوەبون زۆرجار دەچون لە دەرگای دایکە عائیشەیان دەدا و دەیانگوت دینمان فێربکە و پێغەمبەر چیبوە و چیکردوە و چۆن بوە لەو بوارەدا فێرمان بکە ئەی دایکە عائیشە -رضي الله عنها-، وە ئوم سەلەمەش بە هەمان شێوە، وە چەندین ئافرەتی تریشی ئاوا پێغەمبەر (ﷺ) لەو پێناوەدا هەتا دەرز و وانە فێری ئومەتەکەی بکەن ئەوە حیکمەتی لێزانین و فێرکردن.

حیکمەتی دوەم ئەوە بوە لە هەندێک لە هاوسەرەکانی هەڵوەشاندنەوەی عورفێکی جاهیلی و نەفامی، عورفێکی جاهیلی و نەفامی هەبوو لەنێوان خەڵکەکەدا قورەیشیەکانیشی گرتبوەوە دەیانگوت ئەگەر پیاوێک منداڵێک و کەسێک بەخێو بکا ئەوە ببێتە منداڵی ئەو کاتە وەکو منداڵی ئەو تەواو حیساب دەبێ بۆی نیە هاوسەر و خێزانەکەی ئەویش بخوازێ و بێنێ دەبێتە باوکی حەقیقی میراتیشی لێدەگرێ، خوای رب العالمین کە زەیدی کوڕی حاریسە یەکێک بوو لە کۆیلەکان دایکە خەدیجە -رضي الله عنها- بە دیاری دایە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش زۆری خۆشدەویست (ﷺ) لەبەر ئەوە ناوی دەرکردبوو بە کوڕی موحەمەد (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) زەینەبی کچی جەحشی کچە پوری خۆی بۆ زەید هێنا و

هاوسەری بوو، لە پاشان خوای رب العالمین فەرمانی ئەوەبوو زەینەب تەڵاق بدرێ لەلای زەید بۆ ئەوەی ئەو بنەما بێشەرعیە جاهیلیە هەڵبوەشێننەوە خوای رب العالمین لەبەرچاویان بە دیاری بخات کە کەس نابێتە کوڕی کەس بە حەقیقی تەنها بە بەخێو کردنێک نابێ پێشی بڵێ باوکە و بە کوڕی ئەو ناو دەربکا، ئەوەبوو زەید زەینەبی تەڵاقدا پێغەمبەر (ﷺ) خوای رب العالمین لەسەروی حەوت ئاسمانانەوە بڕیاریدا و هەموو جارێک دایکە زەینەب بەوە شانازی دەکرد بەسەر خێزانەکانی تری پێغەمبەر (ﷺ) دەی فەرموو ئێوە لە زەوی مارەکراون و من لە ئاسمان ئێوە وەلی ئەمرتان پیاو و ئینسانەکان بونە لەکاتی مارەکردن وەلی ئەمری من اللەی ڕەحمان، کەواتە لەپێناو شەریعەت دانان و ڕاستکردنەوەی عورفێکی جەهالەت و نەفامی هەندێک لەو ژنانەی پێغەمبەر (ﷺ) الله تعالی ڕێگایدا بیخوازێ و بیهێنێ و مارەی بکا.

خاڵێکی تر لە حیکمەتەکانی هێنانی ئەو فرە ژنیەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش لایەنی ئیجتیماعی و کۆمەڵایەتی بوە، پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەری الله بوو هەم سەرکردەیەکی زۆر دیاربوو دەبا دەوڵەتی ئیسلامی دابمەزرێنێ، دەوڵەتداری و سیاسەت و دەوڵەت دامەزراندنیش بەبێ جەماوەر نابێ لە هیچ وڵات و شوێنک لەوەتەی دونیا دونیایە و هەتا قیامەتیش دادێ هیچ گروپێک هیچ لایەنێک هیچ کۆمەڵە کەس و تاقمێک ئەگەر جەماوەری لەگەڵدا نەبێ دەوڵەتی پێ دانامەزرێ و ئەگەر داشی بمەزرێنێ زۆر لەقۆق دەبێ زۆر بە ئاسانی دەڕوخێ، پێغەمبەر (ﷺ) لەو پێناوەدا بە تۆکمەیی زۆر بە ڕێک و پێکی هەستا لایەنە ئیجتیماعیەکەی خۆی زۆر بەهێز کرد لەگەڵ قورەیشیەکان و عەشایەریەکان، لەوانە دایکە عائیشە -رضي الله عنها- خوای رب العالمین هێنایە خەونی کە شتێکی بینی دیاری بوو مەلۆتکەبوو لەناو پارچە قوماشێک ئاڵابوو جوبرائیل لە خەوندا فەرموی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەوە دیاری اللەیە بۆ تۆ، دەڵێ هەرکە سەرم

هەڵداوە لە خەونەکە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) عائیشەی کچی ئیمامی ئەبو بەکر بوو مەلۆتکەکە بوو لەناو قوماشەکە ئاڵێنرابوو، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) چوە داخوازی و کە لێی مارەکرا ئەبو بەکری سدیق ئەو پلە و پایەی پێ بەخشرا بوە خەزوری پێغەمبەر (ﷺ)، هەم پاداشتێک بوو بۆ ئەبو بەکر ئەو هەموو چاکیانەی بۆ ئیسلام دەکرد وە هەم لایەنی ئیجتیماعی و کۆمەڵایەتیشی پێ بەهێزبوو، ئەبو بەکر پیاوێکی زۆر بەرز و بەڕێز و دیاری ناو قوڕەیشیەکان بوو، وە حەفسەشی هێنا کچی ئیمامی عومەر عەینەن ئەوەی پێ بەهێزکرا، وە زۆرێکی تریش لە ئافرەتەکانی لایەنی ئیجتیماعی و کۆمەڵایەتی.

خاڵی کۆتایی لە حیکمەتەکانی هێنانی هاوسەرگیرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەو هەموو ئافرەتانە هەندێک جار هەبوە لایەنی سیاسی بوە، بزانن پێغەمبەر (ﷺ) یەک لە ئافرەتەکان کە بەناوی جوەیریەی کچی حاریس بوو کە (بنو المصطلق) حاریث سەرکردەیان بوو گەورەیان بوو خۆیان کۆکردەوە هێرش بکەنە سەر پێغەمبەر (ﷺ) مەدینە بگرن، هێزێکی زۆریان هەبو عەشایەرێکی زۆر بون، بەڵام پێغەمبەر هەواڵی پێ گەیشت (ﷺ) لە ناکاو دەستپێشخەری کرد، لەشکر کێشی کرد پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئەوەی حاریث و ئەوان بتوانن هێرش بکەن ئەو شەو لەناکاو بەسەریدادان، کە بەسەریدادان پیاوەکانی (بنو المصطلق) هەر هەمویان هەڵهاتن و ڕایان کرد، بەخۆیان نەکەوتن و لەناکاو بوو ئافرەتەکان و ماڵ و حاڵیان هەموی مایەوە، جوەیریە کچی ئەو حاریثە بوو سەرکردەی (بنو المصطلق) پێغەمبەر (ﷺ) هێنای لەگەڵ خۆی، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) کە ڕێزی لێنا هیچی لەگەڵدا نەکرد، ئیختیاری دایە دەستخۆی ئایە ئازادی بکا؟ یان شوو دەکا بە پێغەمبەر (ﷺ)؟ هەر ئازاد دەبێ هەتا بە کۆیلایەتی نەمێنێتەوە، کە حاریثی باوکی سەرکردەیەکی گەورەی ئەو زەمانە بوو ئەو هەواڵەی زانی گوتی وەڵاهی ئەو پیاوە پێ ناچێ پیاوی دونیا بێ ئەگەرنا ناموسی منی کەوتە بەردەست من دامنابوو هێرشی بکەمە سەر دەبا ئێستا ناموسی بردبام

دەبا ئێستا ئابڕوی بردبام ئەو پیاوە شتێکی هەیە و ڕەنگە پێغەمبەری اللەیە (ﷺ)، بەخۆی و هەموو عەشیرەتەکەی هاتنەوە لەسەر ئەو ڕوداوە موسڵمان بون و بەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کەوتن، ئا ئەو هەموو حیکمەتانەی تێدا بوە.

صەفیەی کچی خەیبەری جولەکەکان، کاتێ کەوا صەفیە ئەویش گیرا لە جەنگی خەیبەردا پێغەمبەر (ﷺ) صەفیەیان بانگکرد، هەندێک لە موستەشریقەکان لە عەلمانی و بێدینەکان قسە لەسەر صەفیە زۆر دەکەن کە گوایە پێغەمبەر (ﷺ) کە کەوتە بەرچاوی ڕیوایەتێکی مەوزوع و دانراو دەهێننەوە دەڵێن لەناو لەشکرەکە کەوتە بەرچاوی یەک لە سەحابەکان بە بەری کەوتبوو صەفیە زۆر ڕەونەقدار و جوان بوو فەرمویە سەحابەکە (پەنا بە الله) ئەوە درۆیە گوتی بەولادا بنێن ئەو ئافرەتە بزانم ئەوە کێیە و لێی دەپرسمەوە، دەڵێن دوایە ئیختیصابی کرد و لەگەڵ خۆی برد (پەنا بە الله)، ئەوانە هەموی درۆ و دەلەسەیە هەموی ڕق و دوژمنانی ئیسلامە ڕیوایەتی سەحیح ئەوەیە گوێ لە صەفیە بگرن بزانن صەفیە چی دەڵێ، صەفیە دەفەرموێ سوێند بە الله کاتێک پێغەمبەر هێرشی هێنا (ﷺ) بۆ سەر خەیبەر هیچ کەسێک نەبوو ئەوەندەی موحەمەد ڕقم لێی بێتەوە لەبەر ئەوەی باوکم سەرکردەبوو مامم سەرکردەبوو مێردیشم یەکێک بوو لەسەر لەشکرەکان لەو بنەماڵەدا بوین و هەموو دەمێ باوکم و مامم ئێمەیان تیژ دەکردەوە لەسەر ئەوەی دوژمنداری پێغەمبەر بکەین (ﷺ)، دەڵێ هەرکە گیراشم هەر ئەو ڕقەم لێیبوو دەڵێ هەرکە بینیم گوتیان ئەوە موحەمەدە (ﷺ) هەر ڕقەقەم لێیبوو، دەڵێ هەرکە گوتیان ئەوە صەفیەیە کچی سەرکردەکەیانە ئەی موحەمەد (ﷺ) سەحابەکان هێنایان، دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) لەوپەڕی ئەدەب و ئەخلاق بەرزیەوە صەفیە دەگێڕێتەوە دەڵێ تەماشای منی کرد و پێی گوتم صەفیە سوێند بە الله من بۆ ئەوە نەهاتم خەڵک بکوژم بەڵام هەرکەسێک دەبێتە لەمپەر و کۆسپ لە ژێر پێی دەعوە و بانگەوازی بەرەو لای خوای رب العالمین و (لا إله إلا الله) الله ئەمری پێم کردوە

ئەوەی عینادی بکا دەبێ یان تەسلیم بێ و یان بیکوژم ئەمری اللەم جێبەجێ کردوە، تۆ خۆت باشتر لەمن دەزانی صەفیە مامت و بابت و مێردت و دار و دەستەکەی ئێوە چیان بە من کردوە تۆ لەناویان ژیای هەر وازیان نەهێنا لەبەر ئەوەبوو تەسلیم نەبون من هاتم لێرە بە مەجبووری لێیان دەین و بیانکەینە موسڵمان ئەوەی بەربەرەکانێی کرد و عینادی کرد بیکوژین، صەفیە دەڵێ ئەوەندەی عوزر بۆ هێنامەوە ئەوەندە جوانی بۆ ڕونکردنەوە سوێند بە الله هێشتا نەبوبومە هاوسەری هەر لە مەیدانی شەڕبوو بەرامبەرم پێغەمبەر قسەکانی دەکرد (ﷺ) دەڵێ بوە خۆشەویسترین کەس لەلام، وا مەیتی باوکم لەوێش کەوتوە مەیتی مێردم لەوێ کەوتوە مەیتی مامم لەوێ کەوتوە بۆی ڕونکردمەوە باوکم و مامم و مێردم چەند زاڵم بونە بەرامبەر بە پێغەمبەر (ﷺ) بە حەق ئەوانی کوشتوە، دەڵێ ئینجا فەرموی صەفیە دڵ لە دڵ مەدە ئێمە بێڕێزیت لەگەڵ ناکەین تۆ خانەوادەیەکی هەر لەناو ئەو وەزعە باش و ڕێک و پێکە ژیای لە ڕوی دونیاوە باوکت سەرکردە بوە و مامت سەرکردە بوە و وە مێردت سەرکردە بوە ئەگەر دەڵێی ئازادت دەکەین بڕۆرەوە لای خزم و کەست کێنە و لەکوێنە، ئەگەر دەشڵێی دەمێنێیتەوە حەزناکەم بە جاریایەتی بمێنێیتەوە حەزدەکەم ڕێزت لێبگیرێ ئەگەر ئەوەش هەڵدەبژێری ببیتە هاوسەری پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دایکی ئیمانداران بۆ دڵدانەوەی خۆت ئەو ڕێزەت لێ دەنێم و ئەو مافەت پێ دەدەم، صەفیە دەڵێ دڵم زۆر زۆر خۆشبوو ئەوەندەی تر زانیم ئەو پیاوە چەند بەرز و بەڕێز و گەورەیە چەند خاوەن ئەخلاقە دەیتوانی هەرچی خراپە لەگەڵم بیکا نەک خۆی هەریەک لە سەربازەکانی سەحابەکان، دەڵێ زانیم ئەوە کەسێکی خواییە دڵم نەرمبوو گوتم ئەوە هەڵدەبژێرم لە خزمەت تۆدا بژیم ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)، دەڵێ گوتم (أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أنك رسول الله) (لا إله إلا الله) هیچ پەرستراوێکی حەق و ڕەوا نیە جگە لە الله تۆش ڕەوانەکراو و پێغەمبەری اللەی ئینجا صەفیەی مارەکرد پێغەمبەر (ﷺ).

صەفیە چی دەفەرموێ؟ سەرنجی کیتابەکانی سیره بدەن صەفیە دەفەرموێ من لە بنەماڵە سەرکردەکان ژیاوم زۆر پیاوی مەعقولیشم لە ژیانم بینیبوو پێش ئەوەی شو بکەم بە پێغەمبەر (ﷺ) بەس دەڵێ سوێند بە الله ئەوەندەی لەگەڵ پێغەمبەر ژیام (ﷺ) هیچ کەسێکم نەبینیوە ئەخلاق و ڕەوشت و ڕێز و ئیحتیڕامی وەکو پێغەمبەر بوبێ (ﷺ) لە هەموو کەسێک بە ئەخلاقتر و بە ڕەوشتر بوە، ئەوە وەڵامە بۆ ئەو کەسانەی کە بێدینن لە زمانی صەفیەیەوە کە لە ئاوی لێڵ مەلەوانی دەکەن و لە ئاوی لێڵ دەیانەوێ ڕاوبکەن چاویان هەڵنایە بە پێغەمبەر (ﷺ) و بە ئاینی ئیسلام.

## منداڵەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: (كان لە (ﷺ) ثلاثة بنين) پێغەمبەر (ﷺ) سێ کوڕی هەبوو (القاسم وبه كان يُكَنَّي) یەکەم کوڕ و نۆبەرەی قاسم بوو هەر کونیەشی بەوە دەرکردبوو پێیان دەگوت باوکی قاسم بە پێغەمبەر (ﷺ) (وُلِدَ قبل النبوة، وتوفي وهو ابن سنتين[1]) دەفەرموێ پێشی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر لە دایکبوو (ﷺ) وە عومری بوە دوو ساڵ و وەفاتی کرد ئەو قاسمەی نۆبەری پێغەمبەر (ﷺ)، وە دوەم کوڕی ناوی عەبدوڵا بوو کە طەیب و طاهیریان پێگوتوە وەکو لەقەب بەو کوڕەیان کە ناوی عەبدوڵا بوە، وە سێیەم کوڕی پێغەمبەریش (ﷺ) ناوی ئیبراهیم بوە.

هەموو منداڵەکانی لەو سێ کوڕانە دوانیان هی خەدیجە بونە کە یەکەمیان قاسم و دوەمیان عەبدوڵا. سێیەمیان ئیبراهیم لە ماریەی قیبتی بوە کە لە مەدینە پەیدا بوو پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی هەبوو کە باسی لێوە دەکەین لە دواتر.

[1] (تهذيب الأسماء واللغات) ج: ١ ص: ٢٦.

وە دەشڵێن کوڕەکانی لە بچوکیدا مردون ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ ئیبراهیمیش تەنها حەڤدە مانگ یان هەژدە مانگ ژیاوە تەمەنی حەڤدە مانگ یان هەژدە مانگ بوە نەبوەتە دوو ساڵ ئیبراهیم وەفاتی کردوە.

وە چوار کچیشی هەبوە پێغەمبەر (ﷺ)، یەکەمیان زەینەب کە کچە گەورەکەی بوە لە کچان بۆچونی ڕاجیح و پەسەند قاسم لە زەینەب گەورەتربوە نۆبەرەکەی کوڕ بوە، لە دوای ئەو زەینەب بوە، ئینجا لە دوای زەینەبیش دیارە ڕوقیە بوە، وە لە دوای ڕوقیە ئوم کەلثوم بوە، لە دوای ئوم کەلثومیش فاطیمەی کچە بچوکەکەی پێغەمبەر بوە (ﷺ) ئەوانیش - رضي الله عنهن.

جا زەینەب پیاوەکەی ناوی أبو العاص کوڕی الربیع کوڕی عبد العزی کوڕی عبد شمس بوە کە کوڕی پوری زەینەب بوە واتە پورێکی هەبوو بەناوی هالە کە خوشکی خدیجة الکبری بوە هالە ئەوەشیان کوڕی ئەو بوە و زەینەبی مارەکرد، و کە زەینەب لە دوای هیجرەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە گەیشتەوە باوکی چوو هیجرەتی کردەوە بۆ مەدینە أبو العاص هەر بە کافری مایەوە لە کۆتایەکەیدا لە جەنگی بەدر گیرا و شەفاعەت و تکای بۆ کرا و فیدیەی بۆ درا و گەڕایەوە بەڵام جارێکی تر لە ڕێگا دوبارە گیرا و هات لە ماڵی زەینەب پەنا درا ئینجا لە پاشان هات أبو العاص لە مەدینە بوە موسڵمان و پێغەمبەر (ﷺ) زەینەبی پێ دایەوە.

ئەوە ئیختیلافێکی فیقهی دروستکردوە زانایانی فیقهی دەفەرمون ئایە ئەگەر کافرێک بە کافری مایەوە لە پیاوان ژنەکەشی کافیرەبوو هات بوە موسڵمان و هیجرەتیکرد بۆ (دار الإسلام) لە پاشان ژنەکەی شوی نەکردەوە لە دوای ئەوەی عیدەشی تەواو بوو ئایە ئەگەر مێردەکەی هات بوە موسڵمان لە دوای ماوەیەکی زۆربێ و پاش عیدەش بێ بەبێ مارەکردن دەیدرێتەوە لە نوێ مارە ناکرێتەوە؟ بەڵێ ئەوە بۆچونێکی کۆمەڵێک لە زانایانی ئەهلی

سونە و جەماعەیە دەفەرمون بەبێ مارەکردن دەیدرێتەوە مادەم لە سەردەمی کافرایەتی مارەکرابێ چونکە هەندێک لە مارەیەکانی سەردەمی کافرایەتی شەرعیە و موافقە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام و جارێکی تر مارە ناکرێتەوە، و کۆمەڵی دوەمیش دەڵێن مارە دەکرێتەوە و ئەولاترە ئەوە بکرێ.

وە ڕوقیە و ئوم کەلثومیش هەردوکیان هاوسەری عوسمانی کوڕی عەففان بون -رضي الله عنە- کە ڕوقیە لە جەنگی بەدر پێغەمبەر (ﷺ) دائیمەن ئاوا تاقیکراوەتەوە بە قەدەر ئیمانی ئەو پێغەمبەری اللەیە (ﷺ) خۆشی سەرکەوتنی بەدری بینی کە لەشکرەکەی گەڕایەوە بەرەو مەدینە عوسمانی کوڕی عەفان کە بەشداری جەنگی نەکرد لە جەنگی بەدر چونکە ڕوقیە نەخۆشبوو لەسەر جێبوو، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) بڕۆ ئاگات لە هاوسەرت لە کچەکەم بێ لە ڕوقیە بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) بەو دڵخۆشیە لە جەنگی بەدر گەڕایەوە لە دەروازەی مەدینە پێشوازیان لێکرد فەرمویان ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) ڕوقیەی کچت وەفاتی کرد و گەڕایەوە لای خوای رب العالمین پێغەمبەر (ﷺ) چاوی فرمێسکی کرد و تەسلیمی قەزا و قەدەری خوای رب العالمین بوو.

لە پاشان چوو ئوم کەلثومی هێنا کە کچەکەی لە ڕوقیە بچوکتربوو لە عوسمانی مارەکرد فەرموی ئەی عوسمان تۆ شایستەی ئەوەی بێ هاوسەر و ژن نەبی وە شایستەی ئەوەشی هەردەم تۆ زاوای پێغەمبەربی (ﷺ) ئوم کەلثومی پێ بەخشی و وە پێیدا، وە لە پاشان کە ئوم کەلثومیش وەفات دەکا پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر گۆڕستان توند دەستی عوسمان دەگرێت عوسمان دەگریە و پێغەمبەر دەگریە (ﷺ) دەفەرموێ ئەی عوسمان دڵی خۆت غەمگین مەکە سوێند بە الله ئەگەر دە کچم هەبان یەک لە دوای یەک هەریەکەیان لەلای تۆ مردبان هەر دەبا تۆ زاوامبای و پێم بدابای، ئەو عوسمانەی کە شیعەکان بەربەرەکانێی دەکەن بێدینەکان ڕقیام لێیە خەڵکێکی نەزانی ئێمەش ژیاننامەی تەواو نەخوێندوەتەوە

هەندێک جار دەڵێ عوسمان لاواز بوە لەڕوی سیاسەت و ئیدارە! کەس ئەوەندەی عوسمان بەهێز و بەقوەت نەبوە بەڵام خاوەن حەیا و شەرم بوە، ئەو بەڵایەی لە سەردەمی ئەویش پەیدابوو گوناحی عوسمان نەبوو ئەمری خوای رب العالمين بوو تاقیکردنەوەیەک بوو بۆ ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر ئاوا موژدەی پێدابوو، ئینجا لەبەر ئەوەیە پێی دەڵێن (ذو النورين) خاوەنی دوو ڕوناکی دوو کچەکەی پێغەمبەری لەلابوو (ﷺ)، یەکەمجار ڕوقیە کە وەفاتیکرد ڕوقیە ئینجا ئوم کەلثوم.

فاتیمەش درایە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب کە بوە زاوای پێغەمبەر (ﷺ)، لە هەر هەموو منداڵەکان زیاتر پێغەمبەر (ﷺ) فاتیمەی خۆشویستوە فاتیمەش زۆر باوکی خۆی خۆشدەویست، هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەردەمی ژیانی پێغەمبەر وەفاتیان کرد هەمویان -رضي الله عنهم- بەڵام تەنها فاتیمە خاتون نەبێ لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) بە شەش مانگ علی ئەسەحی وەئەشهەری ڕیوایات ئیمامی نەوەوی و ابن القيم الجوزية و زانایان دەفەرمون.

## مامەکان و پورەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕیوایەتێکدا دەڵێن یازدە مامی هەبوە و لە ڕیواتێکدا دەڵێن دوازدە مامی هەبوە، ناوەکانیشیان ئەوانە بوە: (حمزة کوڕی عبد المطلب کە شیریشی لەگەڵ پێغەمبەر خواردوە (ﷺ) هەم برای شیری بوە هەم مامیشی بوە، دوەمیان عەباس ئەویشیان باوکی عەبدوڵا کە سەحابی پێغەمبەریش بوە (ﷺ) خۆی و کوڕەکەی وە لە پاشان مامی پێغەمبەریش بوە (ﷺ)، وأبو طالب باوکی ئیمامی عەلی -رضي الله عنه- وە ناوی عبد المناف بوە، وأبو لهب ناوی عبد العزى، والزبير، وعبد الكعبة، والمقويم، وضرار، وقثم، موغیرە کە لەقەبەکەی حجل بوە، والفيداق کە ناوی موسعەب بوە ئاوانە هەموو مامی پێغەمبەر

بونە (ﷺ) وە هەندێکیش دەڵێن ناوی نەوفەل بوە موسعەب، وە هەندێکیش دەڵێن عەوام ئەویش مامی بوە و زیادکراوە پێی دەبێتە دوازدە).

ئەوانە هەموی مامی پێغەمبەر بون (ﷺ) تەنها دوانیان لەو دوازدە مامەی پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمان بونە و لەسەر ئیسلام مردون ئەویشیان حەمزەی پاڵەوان و وە ئیمامی عەباس -رضي الله عنهما-.

وە پورەکانی پێغەمبەر (ﷺ): (صەفیە کە دایکی زوبەیری کوڕی عەوام بوە، وە عاتیکە، وبرة، وأروی، وأمیمة، وأم حکیم البیضاء).

لەوانە تەنها صەفیە بۆچونی تەواو و بەبێ ئیختیلاف موسڵمان بوە هەندێکیش دەڵێن بۆچونی دروست لەگەڵ ئەوەشدایە کە ئوڕواش موسڵمان بوە واتە ئەوانی تر بە کافری مردونە.

لە هەموو مامەکانی تەمەن گەورەتر حارث بوە، حارث برا گەورەی هەموو مامەکانی پێغەمبەر بوە (ﷺ) وە لە هەمویان تەمەن بچوکتر عەباس بوە ابن القیم الجوزیة لە زاد المعاد دەفەرموێ.

## سەراری و کۆیلەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):

وە پێشەوا عوبەیدە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) سەراریەکانی چوار بوە، سەراریمان هەیە جاریەمان هەیە ئیمائمان هەیە، با بزانین ئەو وشانە مانای چیە.

سەراری بەو ئافرەتانە دەگوترێ کە کڕین و فرۆشتنیان پێ دەکرا و جاریە بون وە پیاوەکە کە گەورەیان بوە لەگەڵیان جوت دەبوو جەمع دەبوو ئەوەش ڕێ و شوێنی شەرعی لە ئیسلامدا بۆ دانراوە و بە ئەمر و فەرمانی خوای رب العالمین بەو بابەتە جاریانە دەگوترا سەراری جەمعەکەی، وە لە پاشان ئیماء ئەو بابەتە جاریانەیە کە گەورەکەی لەگەڵیان کۆ نەدەبۆوە و جەمع نەدەبوو لەبەر ئەوە دەڵێن سەراری لە سرِیەت و نهێنی هاتوە واتە بە

نهێنی دەیهێنا چونکە جەمع و جیاکردن لە نێوان هاوسەرەکانیش لە کاتێکی نهێنیە و بە نهێنیە تەنها لە بەینی ژن و مێردەکانە (والله أعلم بالصواب).

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دیارە لە پیاوانیش چەند کەسێک هەبونە وەکو کۆیلە کڕاون و فرۆشراون بۆی دیاریکراوە و هەیبوە لەوانە زەیدی کوڕی حاریثەی کەلبی کە باوکی ئوسامەیە کە هەردوکیان زۆر خۆشویست بونە لەلای پێغەمبەر (ﷺ) وا ناسرابون خۆشەویستەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئوسامەش وا ناسرابوو خۆشەویستی کوڕی خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ)، کە زەید لە دوای ئەوەی زەینەبی کچی جەحشی تەڵاقدا لەسەر فەرمانی الله ئەوەبوو ئوم ئەیمەن کە یەکێک بوو لە بەخێوکەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە ماڵی پێغەمبەر ژیابوو جاریەیەک بوو لە باوکی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ پێغەمبەر مابۆوە (ﷺ) ئەویشیان موسڵمان بوو بوو شوی کرد بە زەید، زەید کوڕێکی لێبوو ناویان لێنا ئوسامە پێشتریش ئوم ئەیمەن خێزانی ئەبو ئەیمەن بوو کوڕێکی هەبوو بەناوی ئەیمەن، کەواتە هەردوکیان لە دایکەوە ئوسامە و ئەیمەن برا بونە بەڵام ئەیمەن بە تەمەن گەورەتر بوە و ئوسامە بە تەمەن بچوکتر، ثەوبانیش کە باوکی عەبدوڵایان پێدەگوت ئەوەشیان هەر کۆیلەی پێغەمبەر بوە (ﷺ)، وە شەقڕان و ئەبو ڕافیع و سەلمانی فارسیش ئا ئەوانە ئەو کۆیلانە بون کە پێغەمبەر (ﷺ) هەندێک هی خۆی بوو هەندێکیش کۆیلەبون لەلای خەڵکانی تر هەموشی لەڕاهی خوای رب العالمین ئازاد کردن، وە سەفینەش بە هەمان شێوە وە ئەنەسە و ئەبو کەبشە و وە ڕووەیفیع و ڕەباحول ئەسوەد و مودعیم و ئەبو ضومەیرە و یەسار و مەهڕان و حونەین و زەیدی کوڕی ئەبو یەساریش ئەوانە هەموو پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانی خۆی هەندێکیان هی خۆی بوە هەندێکیان هی خەڵکی تر پێغەمبەر ئازادی کردونە.

لەبەر چی ئەوەمان هێنایەوە؟ ئەوە وەڵامە بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن ئاینی ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ) جاریە و کۆیلایەتیان پەرە پێداوە و هەبوە و بەردەوام بونە لەسەری لە وەڵامدا دەڵێین نەخێر، ئاینی ئیسلام کە هات کۆیلایەتی هەبوو جاریایەتی هەبوو سەرتا سەری زەوی داگرتبوو ئینجا ئیسلام هات سیستەمی بۆ دانا، ئینجا هات خوای رب العالمين لە ئایەتەکانی قورئان وە پێغەمبەری پێشەواش (ﷺ) لە فەرمودەکانی خۆیان و موسڵمانانی هاندا لەسەر ئەوەی هەتا پێتان بکرێ کۆیلەکان و جاریەکان ئازاد بکەن وای لێهات کە لە کۆتایی دەوڵەتی ئیسلام جاریەیەکی ئەوتۆ نەمایەوە وە کۆیلەیەکی ئەوتۆ نەمایەوە زۆربەی هەرە زۆریان ئازاد کران، هەندێکیان خوای رب العالمين کردیە کەفارەت بۆ هەندێک لە تاوان و گوناحەکان بۆ ئەوەی بە مەجبوری خەڵکەکان هەستن بە ئازادکردنی کۆیلەکان، پێغەمبەریش (ﷺ) لە ژیانیدا ماوە ماوە بە شێوازی جیاواز موسڵمانانی هاندەدا و دەیفەرموو ئەوەی کەوا کۆیلەیەک ئازادکا ئەوەندە خێر و چاکەی هەیە و الله گەردنی ئازاد دەکا لە ئاگری دۆزەخ و ڕزگاری دەکا ئا ئەوانە وایلێهات کەوا کۆیلایەتی و جاریایەتی کەمبێتەوە لە ژێر چەتری دەوڵەتی ئیسلامی چونکە هیچ دەوڵەتێک نەبوە لە مێژودا عەدالەت و دادپەروەری بگاتە دەوڵەتی ئیسلامی چونکە قورئان عەدالەت و دادپەروەرە سیفەتی خوای رب العالمين ە (کلام الله)یە قورئان لەبەر ئەوە ئەوەی قورئان مەنهەج بێ عەدالەت و دادپەروەری پێ دەکرێ.

## ئەوانەی کە کاتبی پێغەمبەر بون (صلى الله عليه وسلم)

زۆر بون لەوانە چوار خەلیفە ڕاشیدەکە ئەبو بەکر و عوسمان و عەلی هەموویان دەست و خەتیان هەبوە و نوسەری زۆر چاک بونە و زانا بونە، خەڵکێک وا تێدەگا لەناو ئێمەدا کاتێک باسی ئیمامی ئەبو بەکر دەکرێ ئیمامی ئەبو بەکر پیرەمێردێکی نەخوێندەواری زۆر بە تەقوا بوە یان ئیمامی عومەر لە کۆتاییەکەیدا پیرێکی نەخوێندەواری زۆر لە الله ترس

بوه، ئەوانە هیچیان ڕاست نین بەڵکو ئیمامی ئەبو بەکر و ئیمامی عومەر لەپێشی هاتنی ئیسلامیش لەناو قوڕەیشیەکان لە هەرە زاناکان بون خوێندەوارییەکی زۆر چاکیان هەبوو وە زۆریش زانا بون حیسابیان بۆ دەکرا لەناو قوڕەیشیەکان بڕوانامەی ئەو کات لە ڕوی خوێندەواری هەر بڕوانامەیەک بەرز بوە ئەوان هەیان بوە و بە دەستیان هێناوە و زۆر چاک شارەزا بونە و ئاستی خوێندەوارییان بەرز بوە، لە پاشان خالیدی کوڕی سەعید و ئەبانی کوڕی سەعید و عەلائی حەضڕەمی وە ئوبەی کوڕی کەعب کە ئوبەی کوڕی کەعب لە مەدینە یەکەم کەس بوو لەوانەی پێغەمبەر هەڵیبژارد (ﷺ) لە شاری مەدینەدا ببێتە نوسەری پێغەمبەر (ﷺ)، وە زەیدی کوڕی ثابیتیش بە هەمان شێوە کە زەید پێغەمبەر فەرمانی پێدا (ﷺ) فەرموی بڕۆ عیبڕانیش فێربە واتە زمانی جولەکەکان و عیبرانی کە جگە لە عەرەبی و فارسی و تورکی و کوردییە ئەویش فێربە لێی ببە خوێندەوار ئیشمان پێی دەبێ بۆ نامە نوسین و نامە هاتن و تەرجومە کردن و تێگەیشتن، دەوڵەتی ئیسلام دەوڵەتێکە کە پێغەمبەر دایمەزراند (ﷺ) لە سەرەتا و بۆ یەکەمجار لەوپەڕی ثەقافەت و وە لەوپەڕی تێگەیشتن وە لەوپەڕی ڕێک و پێکیدا بوە.

لەبەر ئەوەیە لێرەش ئەگەر خەڵکانێک لە نێو ئێمەدا موسڵمان بچن زمانی بێدینەکان و وە ئینگلیزی و وە تورکی و وە لە پاشان یان ئەڵمانی و فەڕەنسی و هەریەک لەو زمانانە ڕوسی فێر ببن بە نیازی ئەوەی بەرگری بکەن لە ئیسلام و خزمەتی ئاینی ئیسلامی پێ بکەن ئەوە هیچ جیاوازیەکی نیە وەکو ئەو فەرمانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە زەید جێبەجێی کرد ئەویش جێبەجێی کردبێ بەڵام هەر بۆ هەواو هەوەس و ئارەزوی خۆت بچی تۆ ئەو زمانانە فێربی و دوایش لەولاوە ئیمانت دانەمەزرابێ و کاریگەری خراپی لەسەرت هەبێ ئا ئەوەیان دروست نیە و شەرعی نیە.

ئینجا له پاشان موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانیش دەمەوێ لێرەدا هەڵوێستەیەک بکەم موعاویە له دیدگای ئەهلی سونه و جەماعەدا، مەعاویه ئەو شێره پیاوه بوو که پێغەمبەر بایەخی پێداوه (ﷺ) دۆعای خەیری بۆ کردوه وه بشزانن مەعاویه خاڵی ئومەتی پێغەمبەره (ﷺ)، لەبەر ئەوەی خوشکەکەی ئوم حەبیبه ڕەملەی کچی ئەبو سوفیان هاوسەری پێغەمبەر بوو (ﷺ) کەواته مەعاویه خاڵی موسڵمانان و ئومەتی پێغەمبەره (ﷺ)، ئەو پیاوه هیچ عەیب و عار و کەم و کورتیەکی لێ نەبینراوه و دۆزرابێتەوه که ببێته تانه و تەشەره له عەدالایەتی سەحابیایەتی تەنها مرۆڤ بوه وەکو باقی مرۆڤەکانی تر و سەحابەکانی تر، وه ئەهلی سونه و جەماعه دەفەرمون له سەحابه گەورەکانه مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان لەبەر ئەوەیه دەبێ ئێمه که ناوی دێنین وەکو باقی سەحابه گەورەکانی تر خۆشمان بوێ وه پێشی بڵێین (رضي الله عنه) الله لێی ڕازی بێ هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ سەحابەکانی تر نیه ئەوەی ڕوشیدا له نێوان مەعاویه و له نێوان عەلی -رضي الله عنهما- تەنها ئەوه بوه ئەهلی سونه و جەماعه دەفەرمون مەعاویه ئیجتیهادی کرد و له ئیجتیهادەکەی خەتەئی کرد بەس چونکه موجتەهید بوو دڵسۆز بوو خەتەئی کرد یەک ئەجری بۆ دەنوسرێ، ئیمامی عەلی ئیجتیهادی کرد چونکه موجتەهید بوو صەوابی کرد دوو ئەجری بۆ دەنوسرێ زیاترت بۆ نیه به مەعاویه بڵێی -رضي الله عنه-، ئەو شێره پیاوه بوو بۆ یەکەمجار ئەو لەشکرەی پێغەمبەر مەدحی دەکا (ﷺ) که دەفەرموێ جەنگایەتی و وه کوشتارکردن و جەنگ و جیهادی بەحری خێر و پله و پایەی هێنده هێندەیه و وه زیاتره له هی بەڕی و وشکانی یەکەمجار ئەو ئاڵایه و ئەو لەشکرایەتیه و ئەو بابەته جیهاده معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان کردی -رضي الله عنهما-، وه موغیرەی کوڕی شوعبەش ئەویش کاتبی پێغەمبەر بوه (ﷺ).

## بانگبێژەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

چوار بانگ بێژی هەبوه كه بانگیان دەدا: (یەكەمیان بیلالی كوڕی ڕەباحی حەبەشی -رضي الله عنه- یەكەم كەس بوو كه پێغەمبەر مۆڵەتی پێدا (ﷺ) بانگ بدا، ئینجا ئەوەی بانگ دەدا هەتا قیامەت ئەو خێرە هەموی بۆ بیلالی حەبەشی دەڕوا و ئەو هەموو پاداشته وەردەگرێتەوە -رضي الله عنه-، وە عەمری كوڕی ئوم مەكتومی قورەیشی عامیری نابیناكه كه هەندێك دەڵێن ناوی عەبدولا بوە، وە سەعدی قەرەظ كه مەولای عەماری كوڕی یاسر بوە، وە ئەبو مەحذورەش كه ناوی ئەوسی كوڕی موغیرەی جەمەحی بوە، وە ئەبو مەحذورەیەكێك لەوانە بوە كەوا بە تەرجیح بانگی دەدا واته چەند جارێك دەیگوتەوە و وە لە پاشان لە قامەتیش دوجار دوجار دەیگوتەوە وشەكان و دەربڕینەكان، وە بیلالیش وەكو ئەو نەبو بەڵكو بانگەكەی جیاوازتربوو).

ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل دەفەرموێ من بانگم وەرگرتوە و زۆربەی ئەهلی حەدیسیش لە ئەهلی مەدینە بە بانگی بیلال بانگ دەدەن بە قامەتی بیلالیش، وە ئیمامی مالیك دەفەرموێ دوبارە كردنەوەكەی (الله أكبر)ەكانی ئێمە وە لەگەڵ دوجار گوتنی لەفزی ئیقامە قامەتەكەشی بەبێ تیكرار كردنەوە دەفەرموێ من ئاوام پێ پەسندتر و تەواوترە، وە ئیمامی شافیعیش دەفەرموێ لەگەڵ ئەهلی مەككە ئێمە بانگ دەدەین بە بانگی ئەبو مەحذورە كه تەرجیح بكەین لە بانگەكەدا و وە دوجار دوجار قامەتەكان بڵێینەوە، وە ئەبو حەنیفە و ئەهلی عێڕاقیش تەنها بە بانگی بیلال بانگیان دەدا و بە قامەتی ئەبو مەحذورە، ئەو هەموە ئەجر و پاداشتەیان هەبوە هەرچوار بانگبێژەكەی پێغەمبەر (ﷺ).

## پاسه‌وانه‌كانی پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم)

پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) هه‌تا الله تعالی فه‌رمانی پێدا چیتر پاسه‌وانت نه‌بێ پاسه‌وانی بۆخۆی دانابو حه‌ره‌س، ئه‌و پاسه‌وانه‌ تایبه‌ته‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) یه‌كیان سه‌عدی كوڕی موعاذ بوو، كه‌ له‌ جه‌نگی به‌در له‌لای باره‌گا تایبه‌ته‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌و سه‌رپه‌رشتیاری حیمایه‌كانی تر بوو، وه‌ موحه‌مه‌دی كوڕی مه‌سله‌مه‌ له‌ جه‌نگی ئوحود سه‌رۆكی حیمایه‌كانی پێغه‌مبه‌ر بوو (ﷺ)، وه‌ زوبه‌یری كوڕی عه‌وامیش له‌ جه‌نگی خه‌نده‌ق، وه‌ عه‌بادی كوڕی بشریش به‌ هه‌مان شێوه‌ حه‌ره‌سایه‌تی پێغه‌مبه‌ری كردوه‌ (ﷺ)، وه‌ كۆمه‌ڵێكی تریش له‌ ئه‌نصاره‌كان حیمایه‌ی تایبه‌تی پێغه‌مبه‌ر بون (ﷺ) كه‌ له‌ جه‌نگی ئوحود عه‌دده‌د و ژماره‌یه‌كی یه‌ك له‌ دوای یه‌كیان گیانی خۆیان فیدای ئیسلام كرد و پێش ڕۆحی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) گیانی خۆیان فیدا كرد بۆ ئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر ئه‌زیه‌ت نه‌خوا (ﷺ) هه‌تا خوای رب العالمین فه‌رموی: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ [المائدة: ٦٧] به‌سه‌ با حیمایه‌كانت بچنه‌وه‌ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) پاسه‌وانه‌كان پشوو بده‌ن الله له‌مه‌ودوا ده‌تپارێزێ و ده‌ستی كافر و موشریكه‌كان نادا هیچت به‌سه‌ر بێنن.

له‌ پاشان پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) چه‌ند كه‌سێكی تایبه‌تی دانابوو بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌گه‌ر له‌ ناكاودا كه‌ ڕوبه‌ڕوی كافره‌كان ده‌بویه‌وه‌ و یان قسه‌ و گفتوگۆی له‌گه‌ڵ ده‌كردن پێویستی ئه‌وه‌ی كردبا له‌ سه‌ری كافره‌كه‌ بدرێ چه‌ند كه‌سێكی تایبه‌تی بۆ ئه‌وه‌ دانابوو له‌گه‌ڵی و له‌ پشتی ڕاده‌وه‌ستان كاتێك ئه‌گه‌ر كافره‌كان كاتی ئه‌وه‌ هاتبا پێغه‌مبه‌ر فه‌رمانی بدابا (ﷺ) له‌سه‌ریان بدرێ ئا ئه‌وان شمشێر به‌ ده‌ست و شمشێر هه‌ڵكێش بون بۆ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ): (یه‌كه‌میان عه‌لی كوڕی ئه‌بو تاڵیب كه‌ زاوای بوو ئامۆزاشی بوو، دووه‌میان زوبه‌یری كوڕی عه‌وام).

ئەوانە لە هەرە پاسەوانە تایبەتەکان بون کە چاوەڕوانی فەرمانی پێغەمبەریان دەکرد (ﷺ) لە هەر ڕوبەڕوبونەوەیەکدا شمشێر هەڵبکێشن ئەگەر پێغەمبەر فەرمان بدا لەسەری کافر و بێدین و بێبڕوایەکان بدەن، ئەوە ابن القيم الجوزية ئەو ناوانەی بە سەنەدی سەحیحەوە بە ڕیوایەتی قبوڵکراوەوە لە زاد المعاد هێناوە، (وە میقدادی کوڕی عەمریش یەک بوو لەوان، وە موحەمەدی کوڕی مەسلەمە یەک بوو لەوان، وە عاصم کوڕی ثابت کوڕی أبي الأقلح یەک بوو لەوان، وە الضحاك کوڕی سفيان الكلابي ئەویش یەک بوو لەوان، وە قەیسی کوڕی سەعدی عوبادەی ئەنساریش یەک بوو لەوان).

ئا ئەوانە بە تایبەتی قەیسی کوڕی سەعدی عوبادەی ئەنساری لە ئاستی ئەوە دانرابوو چۆن ئێستا ئێمە شار و وڵاتەکان نیزام و سیستەمەکان وایە بەڕێوبەری پۆلیس هەیە ئەویش وەکو بەڕێوبەرێکی پۆلیسێک بوو لە نیزام و لە دەوڵەتی پێغەمبەر (ﷺ).

ئینجا موغیرەی کوڕی شوعبەش لە جەنگی حەدەیبیە ئەو ڕیوایەتە زۆر ڕون و ئاشکرایە کە لە پشت سەری پێغەمبەر ڕاوەستا (ﷺ)، کاتێک نوێنەری کافرەکان هات کە مامی موغیرە بوو هات لەوێوە و زۆریش بە زمان بوو لە پێغەمبەر هاتە پێش (ﷺ) ڕیشی پێغەمبەری گرت (ﷺ)، موغیرە چەند ڕۆژێک بوو بوبوە موسڵمان بەس چونکە پاڵەوان بوو ئیمانەکەی لە دڵی دامەزرابوو شمشێری لە خۆی بەستبوو وە دەموچاوی خۆی پێچابوو تەنها کونی چاوەکانی دیاربوو لە پشت پێغەمبەر ڕاوەستابوو (ﷺ) ، کاتێک مامی موغیرە دەستی بۆ ڕیشی پێغەمبەر برد (ﷺ)، گوتی موحەمەد هەڵمەفریوێ بەوانەی لە دەوروبەرتن هاتون و پێت وابێ دەگەی بە مەککە پێم وابێ تۆ بکەویتە جەنگ ئەوانە هەمویان ڕادەکەن و جێت دەهێڵن من دونیام بینیوە، ئەویش شمشێرەکەی هەڵکێشا موغیرە حیمایە تایبەتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر سنگی مامی دانا و مامەکەی نەیزانی ئەوە موغیرەی برازایەتی، نوکی شمشێرەکەی تۆزێک گەیاندە سنگی ئێشی پێگەیاند گوتی

تۆزێک بڕۆ پاش یەکجاری تر دەست بەرز نەکەیتەوە لە ڕیشی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر دەتەوێ بە گیان بمێنیتەوە ئەگەر دەشتەوێ بە شمشێرەکە بەناو سینگت بچێت دڵت کون بکا جارێکی تر دەستت بەرزکەوە و بیدە ڕیشی پێغەمبەر (ﷺ)، سەحابەکان وا پێغەمبەریان خۆشدەویست (ﷺ).

بەڵێ خەڵکێک هەیە دەڵێ دەکرێ مامۆستا داعی موسڵمان شمشێر لە دەست بن؟ بەڵێ دەکرێ لە هەموو بار و زروف و سەردەمێکدا ئیسلام جێگیربوە بە دەعوە و بانگەوازی لەولاشەوە پاسەوانیکردنی دەعوە و بانگەوازی و تەوحیدەکەی، ئەگەر لواو لە دەستت بێ شمشێرت لە دەست بێ بۆ ئەوەی کافر و بێدین و بێبڕوایەکان وە پێڕەکانی شەیتان نەتوانن ڕێگا بە دەعوە و بانگەوازیەکەت بگرن وە نەتوانن زمانت بگرن لەوەی کە بڵێی (لا إله إلا الله) وابوە پێغەمبەر (ﷺ) وە سەحابە بەڕێزەکانی کە لەگەڵیشی بونە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) بیلالی حەبەشی کردبوە بەرپرسی نەفەقەی تایبەتی خۆی مالیەی تایبەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر دەستی بیلالی حەبەشی بوە، بیلالی حەبەشی ئاڵوگۆڕ و معامەلە و هەر شتێکی بازاڕی نەفەقەی پێغەمبەر (ﷺ) ویستبای وە سەرفکردنی بۆ ماڵ و منداڵی بیلال بەرپرس بوە.

ئەوەتا جارێکیان گێڕدراوەتەوە کەوا بیلال دەچێتە بازاڕ، پێغەمبەر دەینێرێ (ﷺ) جاروابوە فەقیر و هەژار هاتون هیچی نەبوە پێغەمبەر (ﷺ) بیانداتێ فەرمویەتی بیلال بڕۆ لە بازاڕ قەرزێک بکە بەڵکو الله دەرگامان لێدەکاتەوە ئەو فەقیر و هەژارە با ئاوا ڕەوانە نەکەینەوە، ئەوە سەخیایەتی پێغەمبەر بوو (ﷺ)، نەک وەکو هەندێک لە دەوڵەمەندەکان ناڵێین هەر هەمویان هەبویە بەڵام کاتێک هەژار و موحتاج و پێداویستێک لە دەرگای دەدا و دەچێتە لای هەشیەتی بەڵام نازانێ چۆن قسەکانی ڕیز بکا بە قسەی بێ بنەما ئەو هەژارە بە ڕێ دەکا و وا دەزانێ لە پارەکەی کەم دەبێتەوە ئەگەر بە سەدەقە و بەخشش پێی ببەخشێ یان

بە قەرز پێی بدا یان یارمەتیدەری بێ ئاگای لەوە نیە پاداشتی دەدرێتەوە و بەرەکەت دەکەوێتە ماڵەکەی.

بیلال دەفەرموێ چومە بازاڕ یەک لەو جارانە یەک لە سەرە کافرەکان لە مەدینە لە بازاڕ بوو زۆر دەوڵەمەند بوو گوتی وەرە ئەی بیلال بۆ تۆ دەبینم پیاوێکی ڕاستگۆی دەستپاکی هەموجار قەرز لەوە و لەوە دەکەی بۆ ئاوا کەم و ناتی قەرزەکان دەکەی؟ بۆ نایەی بە یەکجار من قەرزەکەت بدەمێ ماوەیەکت بۆ دیاری بکەم لە پاشان لە ماوە دیاریکراوەکە پێم بدەیەوە و کار و ئیشەکانی خۆتی پێ جێبەجێ بکەی؟ بیلالیش گوتی کارێکی چاکە.

لەوە دەردەکەوێ و بەڵگەی تریش هەیە کەوا کەسابەت و معامەلە و کڕین و فرۆشتن لەگەڵ کافرە موسالیمەکان لە بازاڕدا جائیز و دروستە ئەگەر معامەلە و کڕین و فرۆشتنەکە نەچێتە بابی وەلاء و تەعاونکردنی یان موالات بون بۆی یان شتی حەرامی تێدا نەبێ.

دەڵێ پارەکەی لێ وەرگرت و بردی و سەرفی کرد و بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و بۆ خەڵکە فەقیر و هەژارەکان، کاتێک چەند ڕۆژێک ما کاتی ئەوە بێ پارەکەی بداتەوە پارە نەبوو بیلال بیداتەوە، لەبەر ئەوە یەکسەر بیلال چوە بازاڕ و کافرەکە پێی گوت ئەو سێ چوار ڕۆژەت ماوە ئەی بیلال ئەگەر پارەکە نەیەتەوە ئەو کاتە من دەزانی چیت لێدەکەم؟ ئەویش گوتی نەخێر، گوتی من بۆ ئەوە پارەکەم پێدای هەتا جارێکیتر لە جیاتی پارەکە بتکەمەوە کۆیلە ئەو ڕقەی لە دڵدا بوە و ئەو پیلانەی بۆ داناوەتەوە کافرەکە، بیلالیش گوتی بە پشتیوانی الله هیچ جاریتر نابمەوە کۆیلە، کاتێک ئەو شەوە داهات کە بەیانیەکەی مەوعیدە ئەگەر پارەکەی بۆ نەباتەوە ئەگەری ئەوەی هەیە کافرەکە بیکاتەوە کۆیلە هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) من بەیانی مەوعیدمە و کافرەکەش وای پێگوتم چارەشم نیە و هیچ هەیە بچم بیدەمەوە؟ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) نەوەڵا ئەی بیلال هیچمان

نیه بیدەیتەوه با مەوعیدەکەت بۆ دوابخا، گوتی مەوعیدەکەم بۆ دواناخا ئەو کافره ئەو حقدەی هەیە و دەیەوێ بمکاتەوە کۆیلە دەنا منیش نابمەوە کۆیلە ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، دەڵێ بیلال چوەوە ماڵ و بارگەی تێکنا گوتی خوایە بە پشتیوانی تۆ دەڕۆم بۆ ئەوە نا پارەی ئەو کابرایە بخۆن بەس بۆ ئەوەی نیمە بیدەمەوە و نەبمەوە کۆیلە دەچمە شوێن و ئاوەدانیەکی تر لەوێ هەتا پارەکە پەیدا دەکەم و بۆی دەهێنمەوە تا نەبمە کۆیلە لەبەر چاوی لادەکەوم، دەڵێ بیلال خۆی ڕێکخست و بوە کاتی نوێژی بەیانی، پێش نوێژی بەیانی پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای بیلالی نارد، بیلال بە خەمناکیەوە دەیویست نوێژ بکات و بۆی دەربچێ کەس پێی نەزانێ، ئەنەس چوە لای بیلال گوتی پێغەمبەر سەلامی هەیە (ﷺ) ئەی بیلال دەفەرموێ هەتا ماڵی ئێمە بێ، فەرموی ئەنەس من خۆم کۆکردوەتەوە لەبەر دەستی ئەو کافره قوتارم بێ بچمە شوێن و ئاوەدانیەکی تر، فەرموی پێغەمبەر فەرموی ئێستا بگاتە ماڵی ئێمە (ﷺ)، بیلال بەگەڵی کەوت هەرکە چوو بینی لەبەر دەرگای ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) چەند حوشترێک باری لەسەرە و هیخ بوە، دەڵێ یەکسەر بیلال دڵی خۆشبوو چوە ژورەوە نەیزانی چیە، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «أَبْشِرْ يا بلالُ، أَبْشِرْ يا بلالُ[1]» موژدەت لێبێ بیلال موژدەت لێبێ بیلال، ئەوە هەموی دیارە بۆ پێغەمبەری الله هاتوە (ﷺ)، خوای رب العالمین لە ئاخر چرکە و لەحزە دەرگات لێدەکاتەوە ئەگەر ئیمانداری ڕاستەقینە بی، فەرموی ئەو بارە بەشی قەرزەکەی تۆش دەکا بە زیادەوە وەرە بیبە و بەیانی قەرزەکەت بدەوە و ڕامەکە ئەی بیلال ئەوەی زیادیش بوو بیهێنە بۆ (بيت المال)ی موسڵمانان پێغەمبەری الله (ﷺ) تەماحی تێدا نیە و نایەوێ.

ئینجا موعەیقیبی کوڕی ئەبو فاتیمەی دەوسی ئەویشیان لە خزمەت پێغەمبەر بوو (ﷺ) بەرپرسی مۆری پێغەمبەر بوو (ﷺ) مۆرەکە لە دەست ئەودا بوو بۆ لێدانی هەر نامەیەک

---

[1] سنن أبي داود (٣٠٥٥).

و هەر نوسراوێک پێغەمبەر بینوسیبا (ﷺ)، وە عەبدوڵای کوڕی مەسعود بەرپرسی سیواک و نەعلە و پێڵاوی پێغەمبەر بوو (ﷺ) لە خزمەتیدا بوو بۆی دابین دەکرد و خاوێنی دەکردەوە و بۆی دادەنا، وە ڕەباحی کوڕی ئەسوەد و ئەنەسە لەگەڵ ئەنەسی کوڕی مالیک و ئەبو موسای ئەشعەری دەرگاوانی پێغەمبەر بون (ﷺ) ئەگەر یەکێک بهاتبا لای لە دەرگای بدابا و مۆڵەتی بخواستبا دەبا لەوانە بخوازێ ئینجا ئەوان دەرگایان لێ دەکردەوە و ئیزن و مۆڵەتیان بۆ وەردەگرت لە پێغەمبەر و (ﷺ) ئینجا دەچونە ژورەوە.

ئەوانە مەبەستمان تەنها لێی ئەوەیە بزانن پێغەمبەر (ﷺ) چەند بە نیزام و سیستەم و ئیدارەیەکی ڕێک و پێک ژیاوە لە ژیانی خۆیدا ئەوە نەبێ هەرەمەکی و هەروا بوبێ ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو دەوڵەت و یاسا و ئیدارانەی ئێستا هەن لە هەر وڵات و شوێنێک هەر شتێکی باش و جوانیان هەبێ پێغەمبەر (ﷺ) لەوانی جوانتر و ڕێک و پێکتر و تەواوتر هەبوە.

## وێنە و شێوە و شکڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

پێغەمبەر (ﷺ) لەوپەڕی جوانی جوان بوە وە لەوپەڕی ئاکار و بەژن و قیافەتی پێغەمبەر (ﷺ) دڵگر بوە ئەوەتا ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ (كان رسول الله أزهر اللون) پێغەمبەر (ﷺ) ڕەنگی سپی بوە و سورایەتیەکیشی تێدا بوە ئەزهەر لە زمانی عەرەبی بەو نەوعە دەڵێن (أبيض مستنير مائل إلى الحمرة) ئەو ڕەنگە سپیایەتیەی سپی پاک نەبوە بەڵکو تۆزێک سورایەتی تێدا بوە ڕەنگە سپیەکەی پێغەمبەر (ﷺ) (واسع الجبين) ناوچەوانی فراوان و پان بوە پێغەمبەر (ﷺ) (أدعج العينين) پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ چاوەکانی ڕەشایەتیەکەی زۆر ڕەش بوە لەگەڵ ئەوەدا کالانەی چاویشی زۆر گەورە بوە، وە دەش فەرموێ (وقيل أكحل) چاوی هەردەم وات هەست دەکرد کە ئەنەهو کلی تێکراوە (أهدب الأشفار) پێغەمبەر (ﷺ) برژانگەکانی درێژ بوە (مفلج الأسنان) پێغەمبەر (ﷺ) نێوان

ددانەکانی کەلێنی هەبوە هەروەکو ئێستا خەڵکێک بۆ جوانی وای لێدەکا هی پێغەمبەر (ﷺ) بۆخۆی وابوە (وكث اللحية) وە ڕیشی پێغەمبەر (ﷺ) گەورە بوە و پان و پۆڕ و پڕ بوە، ئینجا (تملأ صدره) سنگی داپۆشیبوو ڕیشی پێغەمبەر (ﷺ) (عظيم المنكبين) پێغەمبەر (ﷺ) شانەکانی گەورەبوە و پان بوە (رحب الكفين والقدمين) ناو لەپەکانی پێغەمبەر (ﷺ) فراوان و گەورە بوە وە پێیەکانی بەهەمان شێوە (ليس بالطويل البائن ولا بالقصير المتردد) پێغەمبەر (ﷺ) نە درێژێکی ئەوەندە درێژ بوە لە تام دەرچوبێ خەڵک لە درێژیان نەکەوێتە بەر دڵی نە ئەوەندەش کورت بوە پێغەمبەر (ﷺ) بە کورت هەژمار کرابێ (رجل الشعر) پێغەمبەر (ﷺ) پرچەکەی تۆزێک لە کۆتایی موەکانی لولێکی هەبوە وەکو گروازە ئەگەرنا ئەویتر جوان هاتوەتە خوارەوە (يضرب شعره إلى منكبيه) پرچی پێغەمبەر (ﷺ) هەتا نزیکی سەر شانەکانی بوە لە چیلچیلەی گوێچکەی درێژتر بوە (إذا تكلم رؤى كالنور يخرج من ثناياه) ئەگەر قسەی کردبا پێغەمبەر (ﷺ) ددانەکانی و دەمی ئاوا بریسکانەوەیەکی لێدەهات کەبریسکایەوە لە دورەوە و زۆر جوان بوو دەتگوت للؤلؤ المرجانە (ضخم الرأس والكراديس) سەری گەورەبوو پێغەمبەر (ﷺ) جا سەری گەورە بۆ پیاوان پەسەندە لەکۆنیشەوە وا گوتراوە و تا ئێستاش ئینجا کەڕادیس ئەو جومگانەی دوو ئێسکەکان بە یەکەوە دەبەستێتەوە دەفەرموێ ئەوانیشی گەورە بون (في وجهه تدوير) دەموچاوی خڕایەتیەکی هەبوو (ذا مشربة) واتە موشی هەبوو لەسەر سنگ و ملی هەتا دەهاتە سەر ناوکی موەکانی ڕەش و باریک بون و چڕ و پڕ بون، ئینجا دەفەرموێت ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ (إذا مشى تقلع كأنما ينحط في صبب) ئەگەر ڕۆیشتبا پێغەمبەر (ﷺ) زەوی دەتگوت لە بن پێی دەهەژێ ئەوها ڕۆیشتنەکەی دەڕۆیشت و زۆر بە جوانی و بە سام و هەیبەتەوە پێغەمبەر (ﷺ)، وە دەش فەرموێت (يتلألأ وجهه كالقمر ليلة البدر) پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ڕۆیشتن کە تەماشات دەکرد دەموچاوی وەکو مانگی چواردە دەدرەوشایەوە بەڵکو لە ڕیوایەتە سەحیحەکان بە سەنەدەوە دەیهێنینەوە بۆتان دەردەکەوێ

یەکێک لە سەحابەکان دەفەرمویێ شەوێک لە شەوەکان مانگە شەو بوو هاتمە دەرەوە پێغەمبەریش هاتە دەر (ﷺ) وەڵاهی دەڵێ سوێند بە الله شەوق و ڕوناکی و جوانی دەموچاوی پێغەمبەر (ﷺ) شەوق و جوانی مانگەشەوی بڕی چیتر نەمان توانی تەماشای مانگەشەو بکەین لەبەر جوانی دەموچاوی پێغەمبەر (ﷺ) تەماشامان دەکرد، لە پاشان دەفەرموێت (حسن الصوت) دەنگی زۆر خۆشبوو پێغەمبەر (ﷺ) (سهل الخدين) پیاوێکی ڕۆح سوک و گیان سوک بوە دەموچاوی دەکەوتە بەر دڵان کە دەتبینی پێغەمبەر (ﷺ) (ضليع الفم) دەمیشی پان و گەورە بوە پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەش نیشانەی جوانی و باشیە بۆ پیاوان کە دەمی پان و گەورە قسەی تەواو لێ دەردەچێ، ئینجا لە پاشان دەفەرمویێ (سواء البطن والصدر) پێغەمبەر (ﷺ) سنگ و سکی وەک یەک بوە ئەوە نەبێ سنگی کەرشی هەبوبێت و لە دەرەوە بێ و سنگی لە پاش بێ یان سکی لە دەرەوە بێ و سنگی لەپاش بێ بەڵکو لە ئاست و ڕاستی یەکدا بوە، ئینجا لە پاشان دەفەرمویێ (أشعر المنكبين والذراعين وأعالي الصدر، طويل الزندين) پێغەمبەر (ﷺ) سنگی تۆزێک بەرەو بەرزی بوو ئینجا لەگەڵ سکی ڕاست بوو لە پاشان دەش فەرموێت باسکەکانی درێژ و گەورەبوو پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا باڵەکانیشی وابوو (رحب الراحة، منهوس العقبين) پێغەمبەر (ﷺ) گۆشتی لە پاژنەیەوە بەسەرەوە گۆشتەکانی کەمبوو لە پشتەوە کە پێت دەبینی، ئەو نەوعە پێیەش زۆر جوان و پەسەندە ئەوە نەبێت قەڵەو و گەورە بوبێ ئاوا گۆشتی کەمبوو، لە پاشان دەفەرموێت (بين كتفيه خاتم النبوة، كزر الحجلة وكبيضة الحمامة) دەفەرمویێ لە نێوان هەردو شانی مۆری پێغەمبەرایەتی پێوەبوو، مۆرەکەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) وەکو هێلکەی کەو وابوو، حەجەلە لە زمانی عەرەبیدا هەندێک لە زانایان دەفەرمون باڵندەیەکە و دیاریکراوە هەندێک دەفەرمون کەوە واتە وەکو هێلکەی کەو و وەکو هێلکەی کۆتر وابوو لە بەینی هەردو شانەکانی موی بەسەرەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە نیشانە و مۆری پێغەمبەرایەتی بوو (ﷺ) (وكان إذا مشى كأنما تطوى له الأرض، ويَجِدُّون

فی لحاقه وهو غير مكترث) پێغەمبەر (ﷺ) هەرکە دەڕۆیشت لەسەر زەوی دەتگوت زەوی لول دەدرێ لەبن پێی ئاوا بە سوک و سانایی و ئاسایی دەڕۆیشت نەک بەملا و بەولادا بڕوا بۆ پێش و پاش بێ خەڵکەکەی بە دوایوە بون و بەدوای دەڕۆیشتن خێراییان دەکرد و زۆرجار نەیدەگەیشتنێ، لە پاشان دەفەرموێ (وكان يسدل شعر رأسه ثم فرقه) پێغەمبەر (ﷺ) پرچی خۆی دەهێناوە خوارەوە هەموی لە یەک ئاست و ڕاستدا بەڵام لە پاشان پرچەکەی لە ناوەڕاستیدا بۆ ئەملا و ئەولای دەبرد و جیاوازی دەخستە هەردو سەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وە پرچی خۆی دادەهێنا و ڕیشی خۆشی بە جوانی دادەهێنا (ويكتحل بالأثمد كل ليلة في كل عين ثلاثة أطراف عند النوم[١]) وە پێغەمبەر (ﷺ) هەموو شەوێ بە مادەی ئیثمەت کە ئێستاش هەیە کلێکی دیاریکراوی تایبەتە تۆزێک چاوەکان دەبرژێنێتەوە هەموو شەوێ لە هەر لا چاوێکی سێجار ئەو کلەی تێدەکرد پێش نوستنەکەی.

بەڕێزان و خۆشەویستان پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ئیمامی نەوەوی ئاوا وەسفی کرد وەرن تەماشای ئافرەتێکی پیرەژنێکی ڕەشماڵ نشینیش بکەن بزانن ئەویش چۆن وەسفی پێغەمبەرمان بۆ دەکا (ﷺ)، ئێمە تێر نابین لە وەسفەکانی مادەم نەمان بینیوە بە چاوان بە ئومێدی ئەوەی خوای رب العالمين لەسەر ڕێبازەکەی ئەو بمان ژێنێ و بمان مرێنێ وە لە قیامەتدا بە خزمەتی بگەین و وە چاومان پێی بکەوێ بەڵام ئێستا با گوێچکەکانمان تێر بێ و مێشکمان پڕبێ لە وێنە و دیمەنی پێغەمبەر (ﷺ) هەرچەندە هەندێک شتی دەبێتە دوبارە بەڵام ئەو ڕیوایەتانەشتان بۆ دەخوێنینەوە.

ئوم مەعبەد کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) کۆچ و هیجرەتی کرد لەگەڵ ئەبو بەکری سدیق -رضي الله عنه- وە دوو کەسیان لەگەڵدا بون عامیری کوڕی فوهەیرە و وە لە پاشان ئەوەی کە

[١] كتاب تهذيب الأسماء واللغات، ج: ١ ص: ٢٥-٢٦.

مەولای ئەبو بەکری سدیق بوو وە عەبدوڵای کوڕی ئورەیقیط کە ڕێگا نیشاندەریان بوو ڕۆیشتن بەلای ڕەشماڵ نشینێک کە ئەو ڕەشماڵ نشینە دایکی مەعبەد بوو خوزاعی بون، ئەو ئافرەتە وا وەسف دەکرێ لەو ڕیوایەتە کە ئیمامی ئەحمەد لە موستەدرەک هێناویێتی و وە ئیمامی زەهەبیش موافقەی لەگەڵ کردوە کە قبوڵکراوە ڕیوایەتەکە و دەهێنرێتەوە، دەفەرموێ «کانتِ امْرأةً بَرْزةً جَلْدةً تَحْتَبي بفِناءِ الخَيْمة، ثمَّ تَسْعى وتُطعِمُ من مر بها» دەفەرموێ پێغەمبەر بەلای ئەو ڕەشماڵەدا چوو (ﷺ) ئافرەتێک کە لە تەمەندا بە تەمەندا چوبوو پیر بوو بوو پیرەژن بوو بەڵام لە هێز و قوەتدا لە خۆی نەکەوتبوو ئینجا لە ناوەڕاستی ڕەشماڵەکە و لەلای ژورەوە دەستەکانی لە ئەژنۆی وەرهێنابوو دانیشتبوو هەرچی بەوێدا چوبا سەخی تەبیعەت بوو هەر ڕێبوار و کاروانێک بەو چۆڵایەتیەدا چوبا ئاوی دەدایە ئەگەر هەیبا نانیشی دەدایە ئەگەر هەیبا «فسَأَلوها لَحمًا وتمَرًا ليَشْتَروا منها، فلم يُصيبوا عندَها شَيئًا من ذلك» پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەبو بەکری سدیق و دوو هاوەڵەکەی تر عامیری کوڕی فوهەیرە و عەبدوڵای کوڕی ئورەیقیط کە هاوەڵی سەفەر و کۆچەکە بون چون داوایان لێکرد ئەگەر خواردنت هەیە و گۆشتت هەیە و خورمات هەیە و هەرچیت هەیە لێت دەکڕین بماندێ، هیچیان دەست نەکەوت «وكان القومُ مُرمِلينَ مُسنِتينَ» بەڵکو خەڵکەکە ئەو ساڵ نەبوو بون وشکانی بوو وە لەوەڕیش نەبوو حەیوان و ئاژەڵەکان بلەوەڕێن بە جوانی و ڕێک و پێکی شیریان لە گواندابێ جا پێغەمبەر (ﷺ) تەماشای یەکێک لە بزنەکانی کرد لەوێدا بەسترابۆوە و نەبردرابوو بۆ لەوەڕ بەجێمابوو لەلای ڕەشماڵەکە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی «ما هذه الشّاةُ يا ئوم مەعبەد؟» فەرموی ئەو بزنە چیە لەوێ ئەی ئوم مەعبەد هێشتوتانەوە؟ «قالَتْ: شاةٌ خلَّفَها الجَهدُ عنِ الغنَم» ئەوە بزنێکی لەڕ و لاوازە نەیتوانی بڕوا لەگەڵ مەڕ و ماڵاتەکە بچێتە لەوەڕ لێرە گەڕاوەتەوە لەبەر بێتاقەتی و بێهێزی، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «هل بها من لَبنٍ؟» ئایە دەبێ شیری تێدابێ گوانەکەی ئوم مەعبەد؟ دەڵێ ئەویش گوتی «هي أجهَدُ من ذلك» گوتی لەوە زۆر لەڕ و

لاوازترە شیر و تەڕایەتی تێدا هەبێ، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی «أَتَأْذَنِينَ لِي أَنْ أحلُبَها؟» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئایە ڕێگام پێدەدەی من بچم بیدۆشم؟ ئەویش گوتی ئاخر تێیدا نیە «بأبي أنتَ وأمِّي، إنْ رأيْتَ بها حَلبًا فاحلُبْها» فەرموی ئەگەر دەزانی فائیدەیەکی لێدەکەی برۆ بۆخۆت بیدۆشە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەو بزنەم بۆ بێنن گوتیە ئیمامی ئەبو بەکر و ئەوان بۆیان هێنا، پێغەمبەر دەستی بە گوانەکەیدا هێنا (ﷺ) (بسم الله)ی خوێند دۆعای کرد گوتی خوایە ڕزقمان بدەی، ئینجا دەڵێ هێواش هێواش بینیمان گوانەکەی پڕ دەبوو گەورە دەبوو لەبەر چاوی ئەو خەڵکە، دەڵێ ئینجا فەرموی جامێکم بۆ بێنن، دەڵێ دۆشی بە دەستی موبارەکی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) «فحلَبَ فيه ثجًّا حتّى عَلاه البَهاءُ» دەڵێ ئاوای دۆشی پێغەمبەر (ﷺ) شیر دەهاتە خوارەوە لەناو جامەکە کەفی کرد یانی ئەوەندە زۆر و باش و جوان شیری لێدەهاتە خوارەوە «ثمَّ سَقاها فشربت حتّى رَوِيَتْ» دەڵێ لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دۆشی و هەریەک شیرەکەمان لێخواردەوە و دایە هەر هەموان ئەوانەی لەگەڵیشیدا بون هەمویان بە تێری لێیان خواردەوە ئینجا پرسی کرد لە شیر و دایە ئوم مەعبەد گوتی ئەوەش بۆ ئێوە لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشت و بەجێی هێشت، ئەبو مەعبەد هاتەوە ماڵەوە تەماشای کرد ئەو بزنە لەڕ و لاوازەی بەجێماوە تریپی شیری تێدا نەبوو گوتی ئەی ئوم مەعبەد ئەو شیرە جوانە کەفی کردوە بە جوانی و بە پڕی لەناو ئەو جامە لەکوێت بوو؟ ئەویش گوتی چیت بۆ بگێڕمەوە ئەی پیاوەکەم بەڕاستی پیاوێک هات بێرەدا ڕەتبوو ئەو پیاوە پیاوێکی عەجایب بوو زۆر جێگای سەرسوڕمان بوو کە سەرنجم دەدا لە دیمەن و وێنە و شێوە و شکڵ و هەڵسوکەوتی، ئەویش گوتی زوبە بۆم وەسفکە گوتی ئەو وایکرد ئەو بزنەی دۆشی (بسم الله)ی لێکرد ئەو هەموو شیرەیدا بزنەکە بەخۆشیان بەتێری لێیان خواردەوە، گوتی ئەو پیاوە چۆنبوو؟ سەرنج بدەن ئەو پیرەژنە بە دیقەتە سەرنجی پێغەمبەری پێشەوای داوە (ﷺ) چ وەسفێکمان بۆ دەکا.

دەفەرمویٚ «رأيْتُ رجُلًا ظاهِرَ الوَضاءةِ» من پیاویٚکم بینی ئەوەی بوٚت دەڵێم ئەی مێردەکەم دەموچاوی زوٚر بریسکاوە و جوانبوو «أبلَجَ الوَجهِ» وە لە پاشان دەموچاوی لە دورەوە دەتگوت تیشک دەدا و دەبریسکێتەوە «حسَنَ الخَلْقِ، لم تَعِبْه ثَجْلةٌ، ولم تُزرِ به صَعْلةٌ» دەفەرمویٚت لە پاشان ئەخلاق و ڕەوشتیشی زوٚر جوانبوو هەڵسوکەوتی لەگەڵ من و لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵی بون لەوپەڕی بەرزی و جوانی بوو، وە لە پاشان ئەو پیاوە سەری بچوک نەبوو، وە سکیشی گەورە نەبوو، لە پاشان دەفەرمویٚ «وَسيمٌ قَسيمٌ» بەڵکو ئەو پیاوە ئاکار و شێوە و شکڵ و قەد و قیافەتی یەکجار جوان بوو «في عَينَيْه دعَجٌ» لە چاوەکانی ڕەشایەتیەکی ڕەش هەبوو واتە چاوی جوان و ڕەش بوو «وفي أشْفارِه وَطَفٌ» وە لە پاشان برژانگەکانی چاوی درێژ و جوان بون، وە لە پاشان دەفەرمویٚت «وفي صَوْتِه صَهَلٌ» وە دەنگی جەهوەری بوو هەرکە دەنگی دەهات دەچوە ناو مێشکت و لە مێشکت دەچەقی وە دەنگیشی نە زوٚر بەرز دەکردەوە و نە زوٚر نزمیش بوو بە جوانی لێی تێدەگەیشتی «وفي عُنقِه سَطَعٌ» وە لە پاشان ملی هەم درێژ بوو هەم زوٚریش جوان بوو دەکەوتە بەر دڵان، لە پاشان فەرموی «وفي لِحيَتِه كَثافةٌ» ڕیشیشیم بینی چڕ و پڕ بوو موەکانی و هیچ جێی نەبوو موی تێدا نەبیٚ لەسەر شوێنی ڕیشی، لە پاشان دەفەرمویٚ «أزَجُّ أقرَنُ» وە لە پاشان موەکانی باریک و ڕەش و جوان بوو، وە لە پاشان دەفەرمویٚ «إنْ صمَتَ فعليه الوَقارُ» ئەگەر هاتو توٚ لە بەرامبەری بێدەنگ بوبای تەماشات کردبا بەڕاستی ویقاڕ و سام و هەیبەتی هەبوو بە کرِایەتی و بە بێدەنگی «وإنْ تكلَّمَ سَماهُ وعَلاهُ البَهاءُ» ئەگەر قسەشی کردبا قسەکانی هەر هەموی لەجێی خوٚی بوو سام و هەیبەتی تری پەیدا دەبوو بە قسەکردن «أجمَلُ النّاسِ وأبْهاهُ من بَعيدٍ» لە دورەوە بتبینیبایە جوانترین خەڵک و مەردوم بوو تەواو دەکەوتە بەر دڵت «وأحسَنُه وأجمَلُه من قَريبٍ» لە نزیکیشدا کە دەهات وەکو لە کوردەواری نمونەیەک هەیە دەڵێ زوٚرجار هەیە لە دورەوە جوانە و لە پێشەوە کە دیقەتی دەدەی هەندێک شێوە و شکڵ و ئەوانەی ناکەوێتە بەر دڵت ئەو جوانیەی لە دورەوەی نیە یەعنی

دور کوژی نزیک خەسار نیە وەکو لە کوردەواری دەڵێن دەڵێ لە دورەوە لەوپەڕی جوانی بوو وە لە نزیکیش کە نزیک دەبویەوە زیاتر دەکەوتە بەر دڵت و جوانتریش بوو «حُلوُ المنطِقِ» بەڕاستی قسەکانی زۆر شیرین بوو «فَصلٌ، لا نَزْرٌ فيه ولا هَذْرٌ» قسەکانی وشە وشەی دەردەبڕی جیاوازی دەخستە نێوانیان تێیدەگەیشتی بەخێرایی قسەی نەدەکرد کە تێینەگەیشتبای و زۆر وازح و ڕون و ئاشکرا بوو قسەکانی «كأنَّ مَنطِقَه خَرَزاتُ نَظمٍ، يَتحَدَّرْنَ» قسەکانی دەتگوت وەکو دنکی مورو کە بە داوێکەوە بکرێ وەکو تەسبیح ئاوا قسەکانی وشەکانی لە دەمی بەردەبۆوە یەک لە دوای یەک بەبێ پچڕان قسەی بۆ دەهات «رَبْعَةٌ لا تَشْنؤُهُ من طولٍ» پیاوێکی مام ناوەندی بوو نە بەرزێکی ئەوەندە بەرز بوو لەبەر دڵان بکەوێ نە نزمێکی ئەوەندە نزم بوو نەکەوێتە بەر دڵان «ولا تَقتَحِمُه عَينٌ من قِصَرٍ» چاوت کە دەکەوتە سەری ئەوەندە کورت نەبوو چاوتی لەسەر لابدەی و بلێیی بەژن و باڵای بەرز نیە «غُصنٌ بينَ غُصنَينِ» وەکو دارێکی جوان لەبەینی دوو داران مام ناوەندی بوو «فهو أنضَرُ الثَّلاثةِ مَنظرًا» سێ کەسی تری لەگەڵدا بوو بەخۆی چوارەم بوو لە هەر سیانەکەی تر دڵگیرتر و جوانتر بوو «وأحسَنُهم قَدْرًا» زۆر بەرز و بەڕێزتربوو لە هەر سیانەکەی تر «له رُفَقاءُ يَحُفُّونَ به» ئەوانەی لەگەڵیدا بون هەردەم دەوریان لێدەدا و زۆر ڕێزیان لێدەنا «إنْ قالَ استَمَعوا لقَولِه» ئەگەر قسەی بکردبا سیانەکەی تر هەستیان لێ ڕادەگرت بە ئەدەب و ڕێزەوە لە بەرامبەری دەوەستان «وإنْ أمَرَ تَبادَروا إلى أمْرِه» هەر فەرمانێکی پێکردبان دەستبەجێ دەچون فەرمانەکەیان جێبەجێ دەکرد «مَحْفودٌ مَحْشودٌ» بەڕاستی پیاوێک بوو دەوری درابوو ئەوانە پاسەوانیەکی ئەوەندە چاکیان لێدەکرد وە ڕێزیشی لێگیرابوو خزمەت دەکرا لەلایەن ئەو سێ کەسەوە «لا عابِسٌ ولا مُفَنَّدٌ» کەسێکی ڕەزا گرانی دەموچاو بەناو یەکدا هاتیەوە نەبوو هەرکە دەتبینی قسەکان و گوفتارەکان و وە ئاکارەکانی دەکەوتە بەر دڵت ئینجا کەسێک نەبوو بە هیچ نەوعێک سنوری بەزێنی بەسەر هیچ کەس و شتێکدا بکات.

ئەبو مەعبەد گوتی «هذا واللهِ صاحِبُ قُرَيشٍ الَّذي ذُكِرَ لنا من أمْرِه ما ذُكِرَ» گوتی سوێند بە الله ئا ئەوەیان دەنا ئەو کەسەیە کە قورەیشیەکان ڕاویان ناوە و لە وڵاتدا بەدەریان ناوە بەدوایدا دەگەڕێن و دەنگوباس لەشوێنێتی «ولقد همَمْتُ أنْ أصْحَبَه» وەڵاهی حەزم دەکرد من هاوەڵی بام و لە خزمەتی بام «ولأفعَلَنَّ إنْ وجَدْتُ إلى ذلك سَبيلًا[1]» ئەوەش هەر دەکەم دایکی مەعبەد ئەگەر ڕێگام هەبێت و پێی بگەم.

کەواتە بەڕێزان و خۆشەویستان پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ئا ئاوا بوە شێوە و شکڵی ئەوەندە جوان و دڵگر بوە ئا ئەوەندە قسەکانی شیرین بوە ئا ئەوەندە قەد و قیافەتی لەوپەڕی ڕێک و پێکی بوە پێویستە ئاوا بیناسین ئەو جوانیەی درابویە لەلای خوای رب العالمین وە ئەو ڕەوشت و ئەخلاقە بەرزەشی درابویە کە لە داهاتودا بە پشتوانی خوای رب العالمین باسی لێوە دەکەین و دێینە سەری.

ئەوەی وەرمانگرتوە ئێستا بۆتان دیاری دەکەین بە پشتیوانی خوای رب العالمین لە سەحیحی بوخاری و سەحیحی موسلیم و لە شەمائیلی پەرتوکە نایابەکەی ئیمامی ترمزی و وە موسنەدی ئیمامی ئەحمەد و وە (دلائل النبوة)ی ئیمامی بەیهەقی و وە لە (صحيح الجامع) و (سلسلة الأحاديث الصحيحة)ی ئەلبانی -رحمهم الله-، بەڕێزان و خۆشەویستان دەزانن بۆ ئەوەندە دەمێنینەوە لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بە تایبەت وێنە و شێوە و شکڵی؟ لەبەر چەند خاڵێکە:

یەکەمیان لەبەر ئەوەی خۆشە کەسێکت کە خۆشدەوێ بۆت وەسف بکرێ تۆ هەر شیرینتر دەبێ لەلات و زیاتر لەلات خۆشەویستر دەبێ.

وە لەبەر ئەوەشە قاضی عیاض و هەندێک لە زانایان دەفەرمون هەر کەس و شتێک کە خۆش بویسترێ لەپێناو سێ شتە:

[1] دلائل النبوة للبيهقي، صفحة: ٢٧٦، صلاح الدين العلائي، إثارة الفوائد (٧١٥/٢).

یەکەمیان هەندێک جار شتەکە بەخۆی جوانە و بەرچاو و دڵگرە لەبەر جوانی و بەرچاوی و دڵگرایەتی خۆشتدەوێ، جا ئێمەش دەمانەوێ بیسەلمێنین کە پێغەمبەر (ﷺ) شێوە و شکڵی چەند دڵگر بوە قەد و قیافەتی چەند کەوتوەتەوەتە ناو دڵان وە چەند شیرین بوە و چەند جوان بوە هەتا لەلامان خۆشەویستربێ.

وە خاڵێکی تر خەڵک و شتەکان لەبەر ئەوە خۆش دەویسترێن کەوا کەسەکە هەندێک جار دەنگی خۆشە دەنگە خۆشەکەی وا دەکا خۆشت بوێ.

وە خاڵێکی تریش هەندێک جار کەسەکە چاکەیەکت لەگەڵ دەکا لەبەر ئەوە خۆشت دەوێ.

جا پێغەمبەر (ﷺ) کۆکەرەوەی هەر سێ سەبەب و هۆکارەکانی خۆشەویستیە، هەم جوان و ڕێک و پێکە لەوپەڕی جوانی و ڕێک و پێکی، هەم دەنگ خۆشیش بوە، وە هەم گەورەترین چاکەشی لەگەڵ ئێمە کردوە کەوا دین و وەحی خوای رب العالمین ی بۆ ئێمە هێناوە و شیکردوەتەوە و ڕێگای بەهەشتی پێ نیشان داوین و وە ڕێگای دۆزەخیشی پێ ترساندوین.

بەڵێ بەڕاء دەفەرموێ -رضي الله عنه-: «مَا رَأَيْتُ مِنْ ذِي لِمَّةٍ أَحْسَنَ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)» دەفەرموێ من نەمبینیوە و نەمبینیبوو هیچ کەسێک لەمە لە زمانی عەرەبیدا بە گەنجێکی تازە پێگەیشتوو تازە دەیهەوێ بلوغی ببێ و پێڕابگا واتە لاو و گەنجێکی لە فەترەی موڕاهەقەی هێشتا تەواو خۆی نەناسیوە و بلوغی نەبوە، بەڕاء دەفەرموێ هیچ گەنجێک و لاوێکم نەبینی جوانتربێ لە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کەوا شمەک و عابایەکی سور لەبەر بکا واتە هیچ گەنج و لاوێک لە جوانی نەیدەگەیشتێ «شَعْرُهُ يَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ» پرچەکەی نزیک بوو بوەوە لەسەر شانەکانی، وە لە پاشان دەفەرموێ

«بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ» هەردو شانەکانی پان بوو ئەو شانەی لەو شانەی دوربوو «لَيْسَ بِالطَّوِيلِ وَلَا بِالْقَصِيرِ[١]» نە زۆر بەرز بوو وە نە زۆر نزمیش بوو مام ناوەندی بوو.

وە بە هەمانشێوە بەڕاء لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَحْسَنَ النَّاسِ وَجْهًا» پێغەمبەر (ﷺ) دەموچاو و ڕوی لە هەموو کەسێک جوانتر بوو «وَأَحْسَنَهُمْ خُلُقًا» وە لە هەموو کەسەکان بە ئەخلاق و ڕەوشتر بوو جوانتر بوو ئەخلاق و ڕەوشتی «لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ وَلَا بِالْقَصِيرِ[٢]» نە زۆر درێژێکی وابوو لەبەر دڵت بکەوێ لە درێژییان جوانیەکەی ببا نە کورتێکی واشبوو کە بە کورت حیساب بێ.

وە ئەمجارە ئەبی ئیسحاق بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: «سُئِلَ الْبَرَاءُ» پرسیار لە بەڕاء کرا «أَكَانَ وَجْهُ النَّبِيِّ (ﷺ) مِثْلَ السَّيْفِ؟ قَالَ: لَا، بَلْ مِثْلَ الْقَمَرِ[٣]» گوتیان ئایە ڕوو و دەموچاوی پێغەمبەر (ﷺ) وەکو شمشێری درێژ بوو واتە پان نەبوو وە بازنەیی نەبوو؟ بەڕائیش لە وەڵامی ئەو کەسانە فەرموی نەخێر، بەڵکو دەموچاوی پانبوو وە بازنەیی بوو وەکو مانگ بوو.

وە لە پاشان سەماکیش دەفەرموێ گوێبیستی جابری کوڕی سەمورە بوم -رضي الله عنهم- «قَالَ له رَجُلٌ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) وَجْهُهُ مِثْلُ السَّيْفِ؟» لێیان پرسی ئایە دەموچاوی پێغەمبەر (ﷺ) وەکو شمشێر وابوو درێژ بووە؟ «قَالَ جابر» جابر فەرموی «لَا» نەخێر نا وانەبوو «بَلْ مِثْلَ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ» بەڵکو وەکو مانگ و وەکو خۆر وابوو هەم لە بازنایەتی وە لە پانایەتی هەم لە ڕەنگ جوانی و درەوشانەوەی «مُسْتَدِيرًا[٤]» دەفەرموێت ئینجا نیشانەیان بۆ دەکا و دەڵێ پان بوو وە بازنەیی بوو.

[١] صحيح مسلم (٢٣٣٧)، صحيح البخاري (٣٥٤٩) (٣٥٥١) (٥٨٤٨) (٥٩٠١)، سنن أبي داود (٤٠٧٢) (٤١٨٣).
[٢] صحيح البخاري (٣٥٤٩)، صحيح مسلم (٢٣٣٧)، سنن الترمذي (١٧٢٤) (٣٦٣٥).
[٣] صحيح البخاري (٣٥٥٢)، سنن الترمذي (٣٦٣٦)، سنن الدارمي (٦٥).
[٤] صحيح مسلم (٢٣٤٤)، سنن الترمذي (٣٦٤٤)، سنن النسائي (٥١١٤).

دوباره جابری کوڕی سەموره دەفەرموێ -رضي الله عنه- «رَأَيْتُ النبي (ﷺ) فِي لَيْلَةٍ إِضْحِيَانٍ» دەڵێ من پێغەمبەرم بینی (ﷺ) له شەوێک که شەوەکه ڕوناک بوو بەهۆی مانگەوه واته مانگ له چوارده بوو «وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ» پێغەمبەر (ﷺ) عابا و پۆشاکێکی مەیله و سوری لەبەردابوو «فجعلتُ أنظرُ إليه وإلى القمرِ، فلهو كان في عيني أحسنَ من القمرِ[١]» دەڵێ لەو شەوەدا من تەماشای مانگم دەکرد له چوارده بوو تەماشای ڕوی پێغەمبەریشم دەکرد (ﷺ) دەفەرموێ بەڵام دەموچاوی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر چاوم زۆر جوانتر و ڕوناکتر بوو درەوشاوەتر بوو له مانگی چوارده.

بەڵێ جابری کوڕی سەمورەش دەفەرموێ هەر ئەویش تەئکید دەکاتەوه له حەدیسێکی تریش که دەموچاوی پێغەمبەر (ﷺ) پان بوه و ڕوناک بوه و درەوشاوەبوه، دەفەرموێ: «كان وجهُهُ مثلَ الشمسِ والقمرِ، وكان مستديرًا[٢]».

وه پێغەمبەر (ﷺ) ئەو دەموچاوه گەشاوەی ئەگەر خەمناکبا پێیوه دیار دەبوو ئەگەر خەمی هەبا پێیوه دیار دەبوو وه ئەگەر خۆشیشی هەبا پێیوه دیار دەبوو، ئەویشیان ئەنەس دەفەرموێ -رضي الله عنه-: «وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئًا رُئِيَ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ[٣]» ئەگەر بهاتبا و شتێکی پێ ناخۆشبا پێغەمبەر (ﷺ) خەمێکی هەبا به دەموچاویەوه دیار دەبوو.

وه ڕەنگی پێغەمبەر (ﷺ) عەلی کوڕی ئەبو تالیب -رضي الله عنه- بۆمان دەگێڕێتەوه دەفەرموێ: «لون النبي (ﷺ) كانَ أَبيَضَ، مُشربا بياضُه بحُمْرَةً» دەفەرموێ سپی بوو سپیایەتیەکەی تۆزێک سورایەتی تێدابوو سپی پاکێکی تەواو نەبوو «وكان أَسوَدَ الحدَقةِ،

[١] سنن الترمذي (٢٨١١)، سنن الدارمي (٥٨).
[٢] صحيح الجامع (٤٨٣٧)، أخرجه مسلم (٢٣٤٤) مطولاً.
[٣] سنن ابن ماجه (٤١٨٠)، صحيح البخاري (٣٥٦٢) (٦١٠٢) (٦١١٩)، صحيح مسلم (٢٣٢٠).

أَهْدَبَ الأَشْفارِ[١]» دەفەرموێ کالانی چاویشی گەورە بوو وە لە پاشان برژانگەکانیشی درێژ بوو.

وە ئەنەس دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَزْهَرَ اللَّوْنِ، كَأَنَّ عَرَقَهُ اللُّؤْلُؤُ، إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ[٢]» دەفەرموێ ڕەنگی پێغەمبەر (ﷺ) ئەزهەر بوو، ئەزهەر لە زمانی عەرەبی سپیایەتیەکە تۆزێک سورایەتی لەگەڵ تێکەڵ بێت، وە دەش فەرموێ عارەقی پێغەمبەریش (ﷺ) وەکو اللؤلؤ والمرجان بوو ئاوا دڵۆپەکان لەسەر دەموچاو و لاشەی دیار دەبوو، ئەگەر بیش ڕۆیشتبا ڕۆیشتنێکی خێرایی دەکرد.

وە لە پاشان سەماکی کوڕی حەرب دەفەرموێ گوێبیستی جابری کوڕی سەمورە بوم -رضي الله عنهم- فەرموی پێغەمبەر (ﷺ) «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) ضَلِيعَ الْفَمِ» پێغەمبەر (ﷺ) دەمی گەورەبوو ئەوەش گوتمان شێواز و شێوەیەکی جوانە بۆ پیاوان لە کۆن و لە نوێ هەر ئاوا دیارکراوە، وە لە پاشان دەش فەرموێ «أَشْكَلَ الْعَيْنِ» پێغەمبەر (ﷺ) هەندێک دەڵێن (أَشْكَلَ) لێرە بە مەعنای کالانەی چاوی گەورەبوو وە هەندێکیش دەڵێن نەخێر سپیایەتیەکەی چاوی تۆزێک سورایەتی کەمی تێدا بوو کە ئەوەش لە پیاوان پەسەند بوە قاضی عیاض دەفەرموێ ماناکەی ئاوا ڕاسترە «مَنْهُوسَ الْعَقِبَيْنِ» وە ئەو پشتی گوپانی ئینسان کەوا پێیە و لە دورەوە دەبینرێ ئەوێی گۆشتی کەم بوە و ئێسکەکەی تەواو دیار بوە ئەوەش نەوعێکە لە جوانی و پەسەندی بۆ پێیەکان هی پێغەمبەر وابوە (ﷺ)، دەڵێ گوتمە سەماک ئەوەی کە لێی گێڕاوەتەوە (ضَلِيعُ الْفَمِ) یەعنی چیە پێغەمبەر (ﷺ)؟ «قَالَ يعني عَظِيمُ الْفَمِ[٣]» یەعنی دەمی گەورە بوو پێغەمبەر (ﷺ).

[١] صحيح الجامع (٤٦٢١).

[٢] صحيح مسلم (٢٣٣٠)، صحيح البخاري (١٩٧٣) (٣٥٤٧) (٣٥٦١)، صحيح مسلم (٢٣٣٠).

[٣] صحيح مسلم (٢٣٣٩)، سنن الترمذي (٣٦٤٦) (٣٦٤٧)، مسند أحمد (٢٠٨١٢) (٢٠٩١٢) (٢٠٩٨٦).

وه له پاشان ئەنەس دەفەرمویٚ قەتادە لێی دەگێڕێتەوە -رضي الله عنه- دەڵێ پرسیم له ئەنەس قژی پێغەمبەر چۆن بوو (ﷺ)؟ ئەویش گوتی: «كَانَ شَعَرًا رَجِلًا» قژی پێغەمبەر (ﷺ) تەواو دەهاتە خوارەوە لوس و لێک بوو له ئاخیر و کۆتایەکەی تۆزێک لول بوو بووەوە وەکو گروازە «لَيْسَ بِالْجَعْدِ وَلَا السَّبْطِ» نە بە تەواوەتی هەموی گروازە بوو نە بە تەواوەتی هەموشی لوس و لێک هاتبوە خوارەوە «بَيْنَ أُذُنَيْهِ وَعَاتِقِهِ[١]» لە بەینی هەردوو چرچیلەی گوێچکەکانی و وە سەر شانەکانی پێغەمبەر بوو (ﷺ) واتە لە چرچیلەی گوێچکەکانی پرچی نزمتر بوو نەشگەشتبوە سەر شانەکانی.

ئەنەس دەفەرمویٚ ئەمجارە پێغەمبەر(ﷺ): « يَضْرِبُ شَعَرُهُ مَنْكِبَيْهِ[٢]» قژی نزیکبوو لە شانەکانی و تەواو نەیگەشتبویٚ.

وە دوبارە هەر ئەنەس دەفەرمویٚ: «كَانَ شَعَرُ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ[٣]» هەتاوەکو گوێچکەکان و نیوەی گوێچکەکانی بوو قژی ئاوا درێژ بوو.

وە ابن عەباسیش دەفەرمویٚ: «كَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَسْدِلُونَ أَشْعَارَهُمْ» ئەهلی کیتاب جولەکە و دیانەکان قژی خۆیان بەردەدایەوە بەڕاستی و تەواوی لە پشت و لا تەنیشتەکان و لە پێشەوە بۆ هیچ لایەکیان دانەدەهێنا و لە ناوەڕاستدا لەتیان نەدەکرد، دەفەرمویٚ ئەهلی کیتاب وابون «وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرُقُونَ رُءُوسَهُمْ» بەڵام موشریک و بتپەرستەکان قژی خۆیان بۆ لایەک دەبرد یان لە ناوەڕاستدا لەتیان دەکرد «وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ بِهِ» لەو شتەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر وەحی بۆ نەهاتبا ئەمری پێ نەکرابا حەزیدەکرد وەکو ئەهلی کیتاب بکا نەک وەکو بت پەرستەکان «فَسَدَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) نَاصِيَتَهُ» پێش پەرچەمی پێغەمبەر (ﷺ) بەریدەدایەوە بۆ هیچ لایەکی نەدەبرد

[١] **صحيح البخاري** (٥٩٠٥) (٣٥٤٧) (٣٥٤٨)، **صحيح مسلم** (٢٣٣٨) (٢٣٤٧)، **سنن أبي داود** (٤١٨٥) (٤١٨٦).
[٢] **صحيح البخاري** (٥٩٠٣) (٥٩٠٤)، **صحيح مسلم** (٢٣٣٨)، **سنن النسائي** (٥٢٣٥).
[٣] **صحيح مسلم** (٢٣٣٨)، **صحيح البخاري** (٥٩٠٥)، **سنن أبي داود** (٤١٨٥) (٤١٨٦).

له یەکەم جار، ئینجا «ثُمَّ فَرَقَ بَعْدُ[١]» له پاشان پێغەمبەر (ﷺ) کە مەککەی فەتح کرد زانایان دەفەرمون کە پێغەمبەر (ﷺ) دەستی کرد بەوە کە قژی له ناوەڕاستدا هەر لەیەک بۆ لایەکی ببات و خەتەکەی بە تەواوەتی دیاربکەوێت وای لێدەکرد (ﷺ).

له پاشان پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ڕەبیعەی کوڕی عەبدورەحمان بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ گوێبیستی ئەنەسی کوڕی مالیک بوم دەڵێ پێغەمبەر وەفاتی کرد (ﷺ): «وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ» له ڕیش و له قژی ده لکه موی سپی نەدەبینرا کە پێغەمبەر وەفاتی کرد (ﷺ) بیست لکه موی سپی له ڕیش و له قژی نەدەبینرا واتە زۆر کەم سپی بوو بوو لک لک و داو داو نەدەبوە بیست دانە له قژی و له ڕیشی سپی بوو بوو کە له تەمەنی شەست و سێ ساڵی وەفاتی کرد (ﷺ)، من لکه مویەکم بینی ڕەبیعە دەفەرموێ «فَرَأَيْتُ شَعَرًا مِنْ شَعَرِهِ فَإِذَا هُوَ أَحْمَرُ» لکه مویەکی پێغەمبەر مابوو (ﷺ) تەماشام کرد سور دەرچوو ڕەنگی مەیلە و سور بوو، دەڵێ منیش پرسیم پێم سەیر بوو «فَسَأَلْتُ فَقِيلَ: مِنَ الطِّيبِ[٢]» دەڵێ ڕەنگی موی پێغەمبەر وانەبوو (ﷺ) بەڵام ئەوەنەی بۆن بەکاردەهێنا پێغەمبەر (ﷺ) بۆنی خۆش بۆنەکە وای لێکردبوو هەندێک لکه موەکانی سور هەڵگەڕابوو.

وە ابن سیرینیش -رضي الله عنه- دەفەرموێ له ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی -رضي الله عنه- دەفەرموێ: «هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَضَبَ؟» قَالَ: فَقَالَ: نَعَمْ، بِالْحِنَّاءِ وَالْكَتَمِ[٣]» ئایە پێغەمبەر (ﷺ) بۆیەی له ڕیش و سەری دەدا؟ دەڵێ ئەنەسیش فەرموی «فَقَالَ: لَمْ يَبْلُغِ الْخِضَابَ» نەخێر پێغەمبەر بەوە ڕانەگەیشت (ﷺ) موەکانی وا سپی نەبوو بون کەوا ڕەنگی بکاتەوە «كَانَ فِي لِحْيَتِهِ شَعَرَاتٌ بِيضٌ» چەند لکه مویەکی زۆر کەم له ڕیشی

[١] صحيح البخاري (٥٩١٧) (٣٥٥٨) (٣٩٤٤)، صحيح مسلم (٢٣٣٦)، سنن أبي داود (٤١٨٨).
[٢] صحيح مسلم (٢٣٤٧) (٢٣٣٨) (٢٣٤١)، صحيح البخاري (٣٥٤٧) (٣٥٤٨) (٥٨٩٥)، سنن الترمذي (١٧٥٤) (٣٦٢٣).
[٣] صحيح مسلم (٢٣٤١) (٢٣٤٧)، صحيح البخاري (٣٥٤٧) (٣٥٤٨) (٣٩١٩)، سنن أبي داود (٤٢٠٩).

پێغەمبەر (ﷺ) سپی بوو بوو، دەڵێ لە پاشان پێم گوت «أَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يَخْضِبُ؟» ئایە ئیمامی ئەبو بەکریش ڕیشی خۆی لە خەنە دەنا و ڕەنگی دەگۆڕی؟ بەڵێ گوتی ئەبو بەکر وایدەکرد، بەڵام هی ئەو بە خەنە بوو، کەتیم مادەیەکە کە لەگەڵ خەنەکە ڕەشی قەترانی دەرناچێ کە ئەوەیان ئێمە قەناعەتمان پێیە کە زانایان دەفەرمون ڕەشی قەترانی حەرامە بەڵام لە ڕەشایەتی دەربێ ئەگەر بە نیەتی سونەت بێ سونەتە مەبەستت فێڵکردن نەبێ لە داخوازی و یان هەر ئیش و کارێکی تر یان تەنها مەبەستت خۆ ڕازاندنەوەش بێ دروستە.

جابری کوڕی سەمورە دەفەرموێ: «وَكَانَ كَثِيرَ شَعْرِ اللِّحْيَةِ[١]» پێغەمبەر (ﷺ) موی ڕیشی زۆر و چڕ و پڕ بوو.

وە ئیمای ترمزی ڕیوایەتی کردوە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) «ضَخْمُ الرَّأْسِ وَاللِّحْيَةِ[٢]» ڕیش و سەری گەورەبوو، هەتا هەندێک لە زانایان دەفەرمون ئەوانەی لە پشتەوە پێغەمبەریان دەبینی (ﷺ) کە قسەی دەکرد لە دورەوە دەیانزانی ئەوە پێغەمبەرە و کەسێکی تر نیە (ﷺ) لەبەر پانی و گەورەیی ڕیشی لە بەینی گوێچکەکان و سەر شانەکانی چەپە و ڕاستەی لە دورەوە و لە پشتەوە ڕیشی دەجوڵا و دیار بوو بەوە دەناسراوە ڕیشی ئاوا پان و درێژ و گەورە بوو پێغەمبەر (ﷺ).

ئەنەس دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ): «ضَخْمَ الرَّأْسِ وَالْيَدَيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ[٣]» پێغەمبەر (ﷺ) سەر و دەست و پێی گەورە بوو (ﷺ).

[١] صحيح مسلم (٢٣٤٤)، سنن الترمذي (٣٦٤٤)، سنن النسائي (٥١١٤).

[٢] الحاكم، المستدرک علی الصحيحين (٤٢٤٥).

[٣] صحيح الجامع (٤٨١٩).

وە لە پاشان ئەمجارە لە (صحيح الجامع) هاتوە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە دەفەرمون لە وەسفی پێغەمبەر (ﷺ): «كان ضخمَ الهامَةِ، عظيمَ اللِّحية[1]» هامە لە زمانی عەرەبی بە سەر دەگوترێ واتە سەری گەورە بوو ڕیشیشی پان و گەورە بوو پێغەمبەر (ﷺ).

ئەبو هورەیرە فەرمویەتی لە وەسفی پێغەمبەر (ﷺ): «كَانَ شَبْحَ الذِّرَاعَيْنِ» قۆڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) پان و ئەستور بوو، ئینجا «بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ» بەینی شانەکانی لێک دوربوو بون و پان بوو «أَهْدَبَ أَشْفَارِ الْعَيْنَيْنِ[2]» وە برژانگەکانیشی درێژ بوو.

گیانمان فیدای ئەو پێغەمبەرە نازدار و جوان قەد و قیافە ڕێک و پێکەبێ، با بێین بزانین بۆنی چۆن بوە پێغەمبەر (ﷺ)، ئارەقەی پێغەمبەر (ﷺ) لە گوڵاو زۆر بۆن خۆشتر بوە ئێستا بۆتان دەردەکەوێ بەڵکو هیچ گوڵاوێک خۆی لە بۆنی ئارەقەی پێغەمبەر نەداوە (ﷺ) گیانمان فیدای بێ.

ئەوەتا ئەنەس دەفەرموێ: «ما شممت شيأ قط مسكا ولا عنبرا أطيب من ريح رسول الله (ﷺ) ولا مسست شيأ قط حريرا ولا ديباجة ألين مسا من كف رسول الله (ﷺ)» گیانمان فیدای بێ، دەفەرموێ ئەنەس هیچ شتێک نیە لە دونیا بۆنم کردبێ بۆنی ئەوەندەی لە میسک و عەمبەریش کە بۆنم کردبێ بۆنی خۆشیان نەدەگەیشتە بۆنی ئارەقەی پێغەمبەر (ﷺ) وە هیچ شتێک نیە تەنانەت لە حەریر و ئاوریشمیش دەستم لێ دابێ ئەوەندەی دەست و ناو لەپی پێغەمبەر (ﷺ) نەرم بوبێ کەواتە پێغەمبەر وابوو (ﷺ).

ئەمجارە دوبارە ئەنەس دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ): «أَزْهَرَ اللَّوْنِ، كَأَنَّ عَرَقَهُ اللُّؤْلُؤُ» دڵۆپە ئارەقەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەتگوت لوءلوء و مەرجانە لە دورەوە وات هەست دەکرد ئەگەر نێو چاوانی سەر کوڵمەی گیانمان فیدای بێ ئەگەر ئارەقەی کردبا

[1] صحيح الجامع (٤٨٢٠).
[2] صحيح الجامع (٤٨١٦).

دڵۆپە ئارەقەکان وەکو لوءلوء و مەرجان دەدرەوشایەوە بەسەر کوڵمە جوانەکەیەوە دیاربوو بەسەر ناوچاوانی، وە دەش فەرموێ «إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ، وَلَا مَسِسْتُ دِيبَاجَةً وَلَا حَرِيرَةً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)، وَلَا شَمِمْتُ مِسْكَةً وَلَا عَنْبَرَةً أَطْيَبَ مِنْ رَائِحَةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)[١]».

وە جابری کوڕی سەمورە دەفەرموێ جارێکیان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژم کرد، لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ): «ثُمَّ خَرَجَ إلى أَهْلِهِ وَخَرَجْتُ معهُ» چووە ناو ماڵ و منداڵەکەی منیش لەگەڵی چوم «فاسْتَقْبَلَهُ وِلْدانٌ» دوو منداڵ پێشوازیان لە پێغەمبەر کرد (ﷺ) «فَجَعَلَ يَمْسَحُ خَدَّيْ أَحَدِهِمْ واحِدًا واحِدًا، قالَ: وَأَمّا أنا فَمَسَحَ خَدِّي» دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) دوو منداڵەکە هاتن بە دەستی موبارەکی نەرمی بە ڕومەتیدا هێنان، دەفەرموێ منیش وامکرد «فَوَجَدْتُ لِيَدِهِ بَرْدًا، أَوْ رِيحًا كَأنَّما أَخْرَجَها مِن جُؤْنَةِ عَطّارٍ[٢]» دەفەرموێ سوێند بە الله دەستی کە لە ڕومەتی منیشدا پێغەمبەر (ﷺ) هەستم بە ساردایەتی و فێنکایەتیەکی زۆر خۆشکرد بۆنێکی وام بۆنکرد کە ئەنەهو لەناو گوڵاو فرۆشە هەرە ڕاقیەکان هاتبێتە دەرەوە ئەو بۆنە ئاوا هاتە بن لوتم کە پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بە ڕومەتمدا هێنا.

لەبەر ئەوە بوە تەماشا بکەن و سەرنج بدەن دایکی ئەنەس ئومو سولەیم ئەو ئافرەتە بەرز و بەڕێزەی کە باشترین مامۆستا و ڕێگای هەڵبژارد بۆ فێر کردن و بە ئەخلاق کردن و تەربێتدانی کوڕەکەی ئەنەس کە بردی کردییە خزمەتکاری پێغەمبەر (ﷺ)، ئەنەس دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ جارێکیان پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) هاتە ماڵی ئێمە، دەڵێ ئارەقی کردبوو بەرێدا ڕۆیشتبوو، دەڵێ لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) تۆزێک هات ماندوبوو لە ماڵی ئێمە پاڵیدایەوە جێگامان بۆ ڕاخستوو پاڵیدایەوە، دەڵێ تۆزێک ئیسراحەتیکرد و هەستایەوە، ئارەقی کردبوو دوبارە لە پاڵدانەوەکەشی، دەڵێ یەکسەر دایکم گوتی ئەنەس وەرە دەڵێ کاتێک هێشتا بە ئاگا نەهاتبوو گوتی ئەنەس وەرە با لە کیسمان نەچێ بڕۆ ئەو

[١] صحيح البخاري (١٩٧٣) (١١٤١) (١٩٧٢)، صحيح مسلم (١١٥٨) (٢٣٣٠)، سنن الترمذي (٧٦٩) (٢٠١٥).
[٢] صحيح مسلم (٢٣٢٩).

جامە بێنە ئارەقەی پێغەمبەرم (ﷺ) بۆ بسڕەوە و لەناو جامەکەی بکە، دەڵێ منیش چوم و وامکرد پێغەمبەر بە خەبەر هات (ﷺ) لەگەڵ ئیش و کارەکەی کە ئێمە کردمان فەرموی: «يَا أُمَّ سُلَيْمٍ، مَا هَذَا الَّذِي تَصْنَعِينَ؟» ئەی دایکی سولەیم ئەوە چیدەکەی تۆ؟ «قَالَتْ: هَذَا عَرَقُكَ نَجْعَلُهُ فِي طِيبِنَا» گوتی ئەوە ئارەقەی تۆیە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ گوڵاوەکانی خۆمان تێکەڵ یەکی دەکەین «والله وَهُوَ مِنْ أَطْيَبِ الطِّيبِ[١]» سوێند بە الله ئارەقەکەی تۆ بۆنی زۆر لە گوڵاوەکەی ئێمە خۆشترە، لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ کە پێغەمبەر پێی فەرموو (ﷺ) ئەوە چی دەکەی ئوم سولەیم؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتی ئەوە ئارەقە بۆن خۆشەکەی تۆیە ئەی پێغەمبەر (ﷺ): «نَرْجُو بَرَكَتَهُ لِصِبْيَانِنَا» دەمانەوێ ئەو خێر و بەرەکەتەی ئارەقەکەت و هی تۆ مێنێتەوە بۆ ئێمە و منداڵەکانمان بەکاری دەهێنین و تێیان هەڵدەسوین، بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیتیفاقی ئەهلی سونە و جەماعە زاتی وە ئارەقەی وە پاشماوەی وە هەر شتێکی پێغەمبەر (ﷺ) تفی وە هەریەک لەو شتانەی کەوا هەیبوە هەر هەموی ئاوێک کە بەکاری هێنابێ ئاسەوارەکانی هەموی خێر و پیت و بەرەکەت بوە ئەگەر ئێستاش بمابا بە ڕیواتی سەحیح هەریەک لە شتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بەس ڕیوایەتەکە سەحیح بێ ئەو کاتە پیت و بەرەکەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە موەکانی و ئاسەوارەکانی هەر هەبوە و هەیە، تەنانەت سەحابەکان موی پێغەمبەریان (ﷺ) بەکاردەهێنا بۆ شیفای نەخۆشیەکانیان بەڵام ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هیچ پیاو چاک و ئافرەتێکی تری ساڵیحە بۆچونی تەواوی ئەهلی سونە و جەماعە ئەوە نیە لەپاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) تەنها بۆ پێغەمبەر بوە موحەمەد (ﷺ)، ئینجا فەرموی بۆ ئەوەی پیت و بەرەکەتی بۆ منداڵەکانمان لێ وەرگرین، پێغەمبەر چی فەرموو؟ فەرموی «أَصَبْتِ[٢]» بەڕاست ڕاستت کردوە و پێکاوتە واتە پیت و بەرەکەتی تێدایە ئارەقەکەی من.

---

[١] صحيح مسلم (٢٣٣١) صحيح البخاري (٦٢٨١)، سنن النسائي (٥٣٧١).

[٢] صحيح مسلم (٢٣٣١) صحيح البخاري (٦٢٨١)، سنن النسائي (٥٣٧١).

وە بەڕێزان و خۆشەویستان مۆری پێغەمبەریش (ﷺ) کە باسمان کرد ئەبو سەعید دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: «كان خاتَمَ النُّبوَّةَ في ظهرِهِ بَضْعَةٌ ناشِزَةٌ[١]» وەکو پارچە گۆشتێک بەرزتر بوو لە پێست و گۆشتی پێغەمبەر (ﷺ) لە بەینی شانەکانی بوو.

لە ڕیوایەتێکی تر جابری کوڕی سەمورە -رضي الله عنه- دەفەرموێ من مۆرەکەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرم بینی (ﷺ) لە بەینی هەردوو شانەکانی بوو لە پشتی پێغەمبەر (ﷺ): «مِثْلَ بَيْضَةِ الْحَمَامَةِ[٢]» وەکو هیلکەی کۆتر وابوو ئاوا تۆزێک ئەستورتر بوو ڕەنگی لە پێستی جیاوازتر بوو وە موشی لەسەر بوە (والله أعلم بالصواب).

پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەری اللەیە هیچ وەسفێکی تری ناوێ بیکەین لەڕوی گەورەیی لە هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان لە بۆچونی ڕاجیح و پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە بەرز و بەڕێزتر و گەورەتر بوە وە لە جوانیش کەس سەری لێ نەداوە لە دەنگ خۆشیش بە هەمان شێوە بۆ ئومەتەکەشی دڵسۆزیەکەی لە داهاتودا بە پشتیوانی خوای رب العالمین دەیخەینە بەر گوێچکەتان ئا ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزە ڕاستە ئێمە نەمان بینی و چاومان لێی تێر نەبوە و بەڵکو بە ئومێدی ئەوەی لە قیامەت ببینین با هەوڵ بدەین بەڵام ئەو پیاوە بۆ ئومەتەکەی لە کۆتایی ئەوە دەڵێین دەفەرموێ: «وَدِدْتُ أَنِّي لَقِيتُ إِخْوَانِي الَّذين آمَنوا بي ولم يرَوْني[٣]» دەفەرموێ خۆزگەم ئەو برایانەی خۆم ببینیبا خوشکەکانی خۆم ببینیبا ئەوانەی ئیمانیان بە من هێناوە و بە چاو منیان نەبینیوە واتە ئێمەش دەگرێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) خۆزگەی بۆ بینینی ئێمە کردوە با ئێمەش ئەو خۆزگەی بهێنینەجێ بەوەی ڕێباز و بەرنامەکەی بگرینەبەر خۆشمان بوێ لە خۆشمان زیاتر و لە هەموو کەس و عائیلە و پارە و پول و دونیامان وە ڕێبازەکەی بگرینەبەر و جێبەجێی بکەین سونەتەکانی زیندو

[١] السلسلة الصحيحة (٢٠٩٣).
[٢] صحيح مسلم (٢٣٤٤)، سنن الترمذي (٣٦٤٤)، سنن النسائي (٥١١٤).
[٣] مسند أحمد (١٢٥٧٩).

بکەینەوە بەڵکو لە قیامەتدا بە دیداری شادبین و ببیینین، یان دەفەرموێ: «طوبى لِمَنْ رآني وآمَنَ بِي» خۆشحاڵی و خۆشبەختی بۆ ئەوانەی منیان بینی بە چاوی سەریان و ئیمانیان پێ هێنام واتە سەحابەکان -رضي الله عنهم- چونکە بۆچونی ڕاجیحی موحەدیسین کە ابن حجر پێداگری لەسەر دەکا لە (نخبة الفكر) هێناوێتی لە (مصطلح الحديث) دەفەرموێ پێناسەی سەحابە کەسێکە: (من لقي النبي مؤمنا به ومات على الإسلام) هەر کەسێک بە دیداری پێغەمبەر شادبوبێ (ﷺ) بە خزمەتی گەیشتبێ بڕوای پێ هێنابێ لەسەر ئیسلامەتی وەفاتی کردبێ و مردبێ ئا ئەوەیان سەحابی بوە چ ئافرەتبێ چ پیاوبوبێ، ئینجا دەفەرموێ «ثُمَّ طوبى ثُمَّ طوبى ثُمَّ طوبى» پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) لە پاشان خۆشبەختی بۆ ئەوانە خۆشبەختی بۆ ئەوانە خۆشبەختی بۆ ئەوانە «لمن آمن بي ولم يرَني[1]» بۆ ئەوانەی کەوا ئیمانیان بە من هێناوە و بە چاوی سەر منیان نەبینیوە.

کەواتە ئێمە لە خۆشبەختیەکی زۆر داین، هەر تەنگەشە و ناخۆشیەکت هەبێ برای بەڕێزم دڵت خۆش بکە بۆ ئەوەی کەوا تۆ لە خۆشبەختیدای مادەم ئیمانت بە پێغەمبەر هێناوە (ﷺ)، ئومەتی ئەوەی بە ئومێدی ئەوەی لە قەبر و قیامەتدا خۆشحاڵ و بەختەوەرتر ببین وە لە مەیدانی حەشیر و حیسابیشدا پێش ئەوەی بگەینە پردی سیڕات، کە بۆچونی ڕاجیحی پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە لەوانە لە سەردەمیەکانیش ابن عثيمينيش بۆچونی وایە -رحمه الله- حەوزی کەوسەری پێغەمبەر (ﷺ) لە پێش پردی سیڕاتە نەک لەدوای پردی سیڕات خەڵکەکە کە تینویان دەبێ دەچن لەوێ ئاو دەخۆنەوە بە دەستی پڕ خێر و بەرەکەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەیدانی حەشر و حیساب زەحمەتییان بینیوە و زۆر ڕاوەستاون ئینجا دەچن لە پردی سیڕات دەپەڕنەوە بە ئومێدی ئەوەی دەر نەکرێین لەسەر حەوزی کەوسەر

[1] صحيح الجامع (٣٩٢٣).

پێغەمبەرمان بناسین (ﷺ) ئومێدمان پێی هەبێ بەڵکو لە ئاوەکەی بخۆینەوە بە دەستی پڕ خێر و بەرەکەتی پێغەمبەر (ﷺ).

## خراپە و نالەباری نەفامیەتی پێش پێغەمبەرمان (ﷺ)

عەطائی کوڕی یەسار دەفەرموێ: «لَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ» دەڵێ گەیشتمە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص -رضي الله عنه- کە سەحەبە بون دەڵێ پێم گوت «أَخْبِرْنِي عَنْ صِفَةِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فِي التَّوْرَاةِ» دەڵێ گوتم هەواڵم پێبدە پێغەمبەر (ﷺ) چۆن وەسف کرابوو لە تەوڕاتی جولەکەکان «فقَالَ: أَجَلْ» گوتی بەڵێ «وَاللَّهِ إِنَّهُ لَمَوْصُوفٌ فِي التَّوْرَاةِ بِبَعْضِ صِفَتِهِ فِي الْقُرْآنِ» گوتی سوێند بە الله ئەو وەسف و سیفەتانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە قورئان چۆن باسیکردوە و وەسفی کردوە ئاواش لە تەوڕات وەسف کرابوو باس کرابوو ئەوەی باسکرابوو: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ شَـٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ [الأحزاب: ٤٥] گوتی لە تەوڕات ئەو بڕگە هاتبوو ئەی پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی پێ موحەمەد بوە ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە و دەکەین بە شاهێدی لەسەر ئومەتەکان وە موژدەدەربی و وە ترسێنەربی لەسەر عەزابی خوای رب العالمین «وَحِرْزًا لِلْأُمِّيِّينَ» وە پەرژین و پارێزەربی بۆ ئەوانەی نەخوێندەوارن واتە عەرەبەکان ئەوکات هەندێکیان ناویان وا دەرکردبوو، وە لە پاشان دەفەرموێ هەر لە تەوڕاتیش هاتبوو «أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي» تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ) بەندەی منی و ڕەوانەکراوی منی لە زۆربەی بڕگەکان هەم لە قورئان هەم لە حەدیسی سەحیح هەم لەو بڕگە سەحیحەی لە تەوڕاتیش هەبوە عەبد بە پێش ڕەسول دەخسترێ لەبەر ئەوەیە زانایان دەفەرمون چونکە عەبدایەتی بۆ الله کە پێغەمبەران کردویانە (علیهم الصلاة والسلام) لەوپەڕی تەواوی ئەنجامیان داوە وە عەبدایەتیش بۆ خوای رب العالمین لە پێغەمبەرایەتی گەورەترە، ئەوان عەبدێکی ڕاستەقینەی الله بونە ئینجا الله خەڵاتی پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیون «سَمَّيْتُكَ الْمُتَوَكِّلَ» الله تعالی لە تەوڕاتدا فەرمویەتی ناوم

له تۆ ناوه ئەی موحەمەد (ﷺ) موتەوەکیل واته زۆر پشت دەبەستی به خوایەکەت «لَيْسَ بِفَظٍّ وَلَا غَلِيظٍ، وَلَا سَخَّابٍ فِي الْأَسْوَاقِ» تۆ مڕ و مۆچ نی لەگەڵ خەڵکەکان توڕە و توند نی وە هاوار هاوار ناکەی لە بازاڕەکان و دەنگت بەرز کەیتەوە «وَلَا يَدْفَعُ بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ» خراپەت ئەگەر لەگەڵ کرا بە خراپە وەڵامی نادەیتەوە «وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَصْفَحُ» بەڵکو تۆ دەبوری و دڵت پاک دەکەیتەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی داوای لێبوردنت لێ دەکەن یان خراپەت بەرامبەر دەکەن «وَلَنْ يَقْبِضَهُ اللَّهُ حَتَّى يُقِيمَ بِهِ الْمِلَّةَ الْعَوْجَاءَ» وە تۆش گیانت لە دەست نادەی و وەفات ناکەی هەتاوەکو ئەو ڕێباز و بەرنامەی عەرەبەکان کە هی ئیبراهیم پێغەمبەر بوە (ﷺ) ڕاست بوە و خواریان کردوەتەوە شیرک و هاوبەشی و خراپەیان هێناوەتە ناوەوە هەتا ئەو ڕێبازە ڕاست نەکەیتەوە و نەیهێنیتەوە سەر تایم سەر (لا إله إلا الله) تۆ وەفات ناکەی «بِأَنْ يَقُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ» هەتا خەڵکەکان پەیدا نەبن کە بڵێن (لا إله إلا الله) «وَيَفْتَحُ بِهَا أَعْيُنًا عُمْيًا» تۆ چاوانێک کەوا ئەو چاوانە نابینان تۆ وایان لێدەکەی ببنە بیناو بکەنەوە چاوەکانیان «وَآذَانًا صُمًّا» وە لە پاشان ئەو گوێچکانەی کە کەڕن لە حەق و ڕەوایەتی تۆ ئەو گوێچکانەش دەکەیتەوە هەتا حەق و ڕەوایەتی پێ وەرگرن و گوێیان لێبێت «وَقُلُوبًا غُلْفًا[1]» وە ئەو دڵانەیش کەوا قوفڵ دراوە ئەو دڵانەی کەوا پەردەی بەسەردا هاتوە پەردەکانیان لادەدەی و دەبنەوە ئینجا کەواتە تۆ ئەرکەکەی خۆتت ئەنجام داوە و وەفات دەکەی.

کەعب الأحبار کە زۆر شارەزا بوە و دوایە موسڵمان بوە جولەکە بوە سوێند دەخوا دەڵێ: (إني أجد في التوراة مكتوبًا) دەڵێ سوێند بە الله من لە تەوڕات بینیم نوسرابوو پێش ئەوەی پێغەمبەربێ (ﷺ) (محمَّد رسول الله) دەفەرموێ ئەوە لە تەوڕاتی جولەکەکان نوسرابوو (لا فظ ولا غليظ) موحەمەد ڕەوانەکراو و پێغەمبەری اللەیە کەسێکی مڕ و مۆچ

[1] صحيح البخاري (٢١٢٥) (٤٨٣٨)، سنن الدارمي (٦)، مسند أحمد (٦٦٢٢).

و تورە و توش نیە لەگەڵ خەڵکی (ولا سَخَّاب في الأسواق) دەنگی بەرز ناکاتەوە لە بازارەکان (ولا يجزي السيئة بالسيئة) وە خراپە بە خراپە وەڵام ناداتەوە (ولكن يعفو ويصفح) بەڵکو دەبورێ و دڵیشی پاک دەکاتەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی هەڵەی لەگەڵ دەکەن (أمته الحمادون) ئومەتی ئەو موحەممەدە (ﷺ) لە تەورات نوسرابوو کەعب الأحبار دەفەرموێ ئەوانە زۆر ستایش کارن واتە حەمد و سوپاسی الله زۆر دەکەن (يحمدون الله في كل منزلة) لە هەر شوێنێکبن حەمد و سوپاس و شوکرانەی الله دەکەن (ويكبِّرونه على كل نجد، يأتزرون إلى أنصافهم، ويوضئون أطرافهم) دەفەرموێ وە لە هەرکاتێکیش کەوا بەرز بینەوە بەسەر هەر شوێنێکدا الله بە گەورە رادەگەیەنن و (الله أكبر) دەکەن هەر شتێکیان بۆ بێ پشت بە خوای رب العالمين دەبەستن، وە لە پاشان دەفەرموێ (لهم في جوف الليل دوي كدوي النحل، مولده بمكة، ومهاجره بطابة، وملكه بالشام[1])دەفەرموێ لە تەوراتیش باسیکراوە ئومەتەکەی ئەو موحەممەدە (ﷺ) لە شەواندا وەکو دەنگی مێش هەنگوین دەنگیان بۆ دێ واتە هەڵدەستنەوە شەو و نوێژەکان دەکەن دەنگیان لێوە دێ گزە گزیان دێ و حەمد و سوپاس و عیبادەتی خوای رب العالمين دەکەن، لە مەککە لە دایک دەبێ، وە دەچێتە مەدینە بۆ هیجرەت، وە موڵک و دەسەڵاتی دەچێتە شامیش.

کەواتە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لە تەورات ناوی هاتوە وە دیانەکانیش ناسیویانە هەروەکو خوای رب العالمين لە ئایەتی قورئانیش دەفەرموێ: ﴿يَعرِفُونَهُۥ كَمَا يَعرِفُونَ أَبنَاءَهُم﴾ [البقرة: ١٤٦] هەر چۆن منداڵی خۆیان شارەزان و دەیناسن ئەوها موحەممەدیش دەناسن کە پێغەمبەری اللهیە (ﷺ) بەس لاملی دەکەن و نایەن بڕوا و ئیمانی پێ بێنن.

[1] أخرجه الدارمي في المقدمة: ١/ ٤ ٥ من طريق الأعمش عن أبي صالح قال: قال كعب: ورجاله ثقات، وجاء في دلائل النبوة للبيهقي: ١/ ٣٧٧، عن أم الدرداء قالت: قلت لكعب الأحبار -وذكر شبيهًا بهذا البيهقي وقد جاء عند الدارمي: ١/ ٦، من طريق معاوية بن صالح عن أبي فروة، عن ابن عباس، أنه سأل كعب الأحبار.

جا بزانین کۆمەڵگای ئەوکاتی پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بە تایبەت عەرەب و قورەیشیەکان لە چ ژیانێکدا دەژیان کە پێغەمبەر هات (ﷺ) ئەو سەردەمە سەردەمی بت پەرستی بوو عەرەبەکان بت پەرستیان وەرگرت لە بت پەرستەکانی نەوەکانی نوح پێغەمبەر (ﷺ) وە لە گەل و نەتەوەی ئیبراهیم، چونکە دوو جۆر وە دوو خاڵی سەرەکی هەیە لە شیرک و هاوبەشی سێیەمیان نیە، ئەو شیرک و هاوبەشیە هەموی یان سەرچاوەی گرتوە لە قەومی نوحەوە کاتێک کەوا پیاوچاکەکانیان وەفاتیان کرد وێنەیان لەسەر شێوەی داتاشین دەچونە سەر قەبرەکانیان و وێنەکانیان لە کۆتایدا پەرست عیبادەتیان کردن و هاواریان لێدەکردن وەکو هاواری اللەیان دەکرد، وە جۆری دوەمیش پەرستش و عیبادەتی ئەستێرەکان لەگەڵ خوای رب العالمین کە ئەوە هی قەومی ئیبراهیم بوو کاتێک ئیبراهیم لەناویان پەیدا بوو، هەتا ئێستاش هەر ئەم دو جۆرە شیرکە هەیە یان ئەوەیە پیاوچاکەکان دەپەرسترێن و دەچنە سەر گۆڕیان و هاواریان لێدەکەن ئەو شتانەی بۆ غەیری الله نابێ ئەنجام بدرێ ئیلا دەبێ بۆ الله بێ بۆ ئەوان دەیکەن یان ئەوەیە هەیە لە سیحرباز و جادوگەر و کاهینەکان دەچن ئەستێرەکان دەپەرستن و سیحر و جادوی پێدەکەن.

جا ئەو نەوعە پەرستشە کە هی بت و سەنەمەکان بوو هاتە ناو قورەیشیەکان ئەگەرنا قورەیشیەکان پێشتر لەسەر دینی ئیبراهیم پێغەمبەر بون (ﷺ)، وە کەمێکیش هەبون چوبونە سەر دینی (أهل الکتاب) یان بوبونە جولەکە و یان بوبونە نەسڕانی و دیان، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئا لەو کاتە بوو خوای رب العالمین دەینێرێ، با بزانین خراپەکانی ئەو کۆمەڵگایە چیبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ناویان.

یەکەمیان قوماریان زۆر دەکرد قومار کردن لەسەر پارە و پول تەنانەت لەسەر هاوسەرەکانیان لەسەر ناموسیان شتێکی بەربڵاو بوو لەناویان زۆریان دەکرد و ئەنجامیان

دەدا (پەنا بە خوای رب العالمین)، سەرنجی ئەمڕۆی ئێمەش بدە قومار کردن لەناو موسڵمانان پەیدا بوەتەوە لە گازینۆکان و لەو شوێنانەی کە کراوەتەوە لە هوتێلەکان (پەنا بە خوای رب العالمین) شوێنی قومار چیەکان ئێستا هەیە و باوە، ئەوە شتێکی جەهالەتی پێش هاتنی ئیسلامە لەناو ئێمە زیندوبۆتەوە ئەمڕۆ، کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ الله تعالى ئایەتی ڕەوانە کرد کە پێغەمبەری نارد (ﷺ) ئەو شتانەی حەرام کرد کە باس دەکا لە پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) لەناو کۆمەڵگا هەبوو باو بوو، دەفەرموێ ئەی گەلی بڕواداران: ﴿إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ [المائدة: ٩٠] ئەی گەلی بڕواداران ئێوە بە دورکەونەوە لە ئارەق و ئەو شتانەی بێهۆشتان دەکا کە الله ناوی خەمری هێنا هەرشتێکی تریش وەکو خەمر بێهۆشکەربێ ئەوانیش دەگرێتەوە و حەرامکرا بەو ئایەتە: ﴿وَٱلۡمَيۡسِرُ﴾ مەیسیریش جۆرێکە لە قومارکردن واتە وازبێنن لە قوماریش و لێی بە دورکەونەوە: ﴿وَٱلۡأَنصَابُ﴾ وە حەیوان و ئاژەڵەکان چیتر لەسەر نوسوب سەر مەبڕن بۆ بت و سەنەمەکان بەردێکی دیاریکراو هەبوو دەچون لەوێ حەیوان و ئاژەڵەکانیان دەکردە قوربانی و لەوێ سەریان دەبڕی الله حەرامیکرد لەسەر ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ): ﴿وَٱلۡأَزۡلَٰمُ﴾ ئەزلامیش ئەوەبوو کەوا دەهاتن تەیر و باڵندەیان دەهێنا هەندێک جار هەبوو هەڵیان دەفڕاند ئەگەر ئیش و کارێکیان هەبا دەیانگوت ئەگەر ئەو تەیر و باڵندە بێتەوە لێرە بنیشێ ئەوە ئیشەکە دەکەین و خەیری تێدایە ئەگەر لێرە نەنیشێ و ئاوا نەکا ئیشەکە ناکەین و خەیری تێدا نیە و شەڕی تێدایە، وەکو هەندێک لەناو ئێمەش ئێستا ئەو شتانە زیندوبونەوە، هەیە دەچێ لەسەر قەبرەکان حەیوان سەر دەبڕێ (پەنا بە الله) ئەوە جائیز نیە پێغەمبەر (ﷺ) لە حەدیسی

سەحیحدا فەرمویەتی: «لَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ[١]» الله لەعنەتی لێکردوە بە دوو تەفسیر تەفسیری دەکەن زانایان:

١.یان هەواڵمان پێدەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ هەواڵتان پێدەدەم الله لەعنەتی کردوە لەو کەسانەی کەوا ئاژەڵ سەر دەبڕێ بۆ بێجگە لە خوای رب العالمین.

٢.یان ئەوەیە ئینشائە و دۆعایە واتە دۆعا دەکەم الله لەعنەت بکا لەو کەسانەی کەوا ئاژەڵ بۆ غەیری الله سەر دەبڕن (پەنا بە خوای رب العالمین).

گوێ بگرن شێخی مەزهەبی ئیمامی شافیعی ئەگەر ئێمەی میلەتی کورد وە مامۆستا بەڕێزەکانیش دەڵێن زۆربەی خەڵک لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعیە ئەو قسە و قەزیانە وا لێمەکەن بڵێن وەڵا ئەوەی گوتی حەیوان لەسەر مەرقەد سەر ببڕی ئەوە دینێکی نوێیە و وەهابیە و فڵانە، ئیمامی نەوەوی لە شەرحی موسلیمدا لە شەرحی ئەو حەدیسەدا دەفەرموێ ئەو حەدیسە ئەوە دەگرێتەوە حەرامە بۆ غەیری الله سەربڕینی ئاژەڵەکان، وەکو لە سەردەمی پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) ئاژەڵ سەر دەبڕدران لەسەر نوسوب وە هەروەها دەفەرموێ وەکو لە زەمانەکەی ئێمەش ئەگەر ئاژەڵ دەبردرێن لەسەر قەبرەکان بۆ پیاو چاکەکان سەر ببڕدرێن (پەنا بە خوای رب العالمین) ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ ئەوەشیان حەرامە و حەدیسەکە دەیگرێتەوە، کەواتە هەندێک جاریش دەفەرموێ حەرامیەکەی دەبێتە شیرک و هاوبەشی ئەگەر تۆ بە نیەتی کەسێک سەری ببڕی ئەو ئاژەڵە پێت وابێ دەتوانێ چاکەت پێ بگەیەنێ یان زەرەرت لەسەر لابدا ئا ئەوەیان شیرک و هاوبەشیە[٢].

جۆرێکی تر لەسەر بڕینی حەیوانەکان ئەوەیە ئەگەر پیاوێکی گەورە یان خۆشەویستێک یان کەسێکی دیار بچێتە ئاوەدانیەک خەڵکەکە بە پیریەوە بێن و حەیوانی لەبن پێی لە

[١] صحيح مسلم (١٩٧٨)، سنن أبي داود (٤٥٣٠)، سنن النسائي (٤٤٢٢) (٤٧٣٤).
[٢] شرح النووي على صحيح مسلم ١٣/ ١٤١.

عەرز بدەن ئیهامی نەوەوی و زانایان هەمویان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی شیرک و هاوبەشیە حەرام و تاوان و گوناحە چونکە تۆ ئەو پیاو و کەسەت گەورە کرد هێناتە ئاستی خوای رب العالمین چونکە سەربڕینی ئاژەڵەکان تەنها دەبێ لەپێناو الله بێ و بەناوی الله بێ ئینجا گۆشتەکەی حەڵاڵ دەبێت و جائیز و دروست دەبێ، کەواتە خەتەرناکە ترسناکە با بگەڕێینەوە لای خوای رب العالمین ئەو هەموو شتانەی سەردەمی نەفامیەت ئێستا لەناو ئێمە پەیدا بوەتەوە بەناوی دینداریش دەکرێ (پەنا بە الله).

یان پژمین لەناو ئێمە ئەوە هەیە خەڵکانێک ئەگەر یەکێک بپژمێ لەسەر ئیشێک بن و بیانەوێ بچن و بەڕێکەون دەڵێن ئەوە سەبری هێنا تازە ئیشەکەمان لێ تێکدەچێ و خراپە، ئەوە وەکو ئەزلامەکەی سەردەمی نەفامیەتی پێش هاتنی پێغەمبەرە (ﷺ) حەرامە، هەر شتێکی داهاتوو هیچ هەڵسوکەوت و شتێکی تۆ نە حەرامی دەکا نەخراپی دەکا نەباشی دەکا هەموی لەدەست خوای رب العالمین ە سەبەبە خێر و چاکەکانت بهێنەجێ پشت بە الله ببەستە با پژمین و هیچ شتێک لەو شتانە نەتگەڕێنێتەوە (والله أعلم بالصواب).

وە خاڵێکی تر لەو خاڵە خراپانەی لەناو کۆمەڵگای نەفامیەت هەبوو کە پێغەمبەر هات (ﷺ) بۆ ئەوەی نەیهێڵێ ئەویش ئارەق خواردنەوە بوو، ئێستاش لەناو ئێمە بەداخەوە ئارەق لە هەموو شتێک زۆرترە ڕێگای تەواوی پێدراوە پێشان هەر شەرم دەکرا و بە یاساش نەدەکرا کەسێک ئارەق خانە و دوکانی ئارەق بکاتەوە لەگەڕەکە موسڵمانەکان، ئێستا (پەنا بە خوای رب العالمین) لە چەندین جێی ناو کوردستانی خۆمان ئارەق خانە و دوکانی ئارەقەکان چەند مەترێک لە مزگەوتەکان دورن و دەکرێنەوە، کەسیش ناتوانێ پێیان بڵێ لە پشتی چاوتان دوو برۆیە لەبەر ئەوەی خەڵکانێکی بەهێز لە پشتیانن ئەگەر هەر ناوێک بێنی و هەر قسەیەک بکەی دەڵێن ئازادی خەڵکەکەت تێکداوە، و ئەگەر بەرگریش لە ئیسلام و قورئان دەکەیت و حەق دەڵێی لەسەر میمبەرەکان ئا ئەو کاتە ئازادی بۆ خەڵکی

موسڵمانی دینداری شوێنکەوتەی پێغەمبەر نیە (ﷺ) بەو پێوەرانەی نەفامیەت ئەمڕۆ شتەکان لەناومان پێوەر دەکرێن (پەنا بە خوای رب العالمین) با بترسێین لە خۆمان.

(نکاح الاستبضاع) هەبوو ئەو سەردەمە (نکاح الاستبضاع) ئەو نەوعە هاوسەرگیرایەتیە بوو ئەگەر کەسێک بەرپرسبا و ناوداربا یان ئازابا ئەو کاتە ئافرەتەکانیان دەبردن دەیانگوت با شەوێک لەلای تۆ بمێنێتەوە تۆ لەگەڵی جەمع ببە بەڵکو منداڵێکی ئازا و چاو نەترس یان باشمان ببێ (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەمڕۆ لەناو ئێمەش هەندێک مەسول و بەرپرس و خەڵکی دەوڵەمەند هەن خەڵکێک دەیوثایەتیان بۆ دەکا بە بەڵگەوە ئافرەتیان بۆ دەبات و شەو لەلایان دەمێنێنەوە، تەنانەت بوە لەناو ئێمەدا و کۆمەڵگاش (پەنا بە الله) هەیە هاوسەر و خێزانی خۆی بردوە، لەسەردەمی هەشتاکان هەر زۆر بوو بۆ ئەمن و بەعسیەکان ئێستاکەش هەر لە ناوماندا ماوە ئەوانە هەموی شتی نەفامیە و لەناوماندا هەیە.

(وأد البنات) زیندە بەچاڵکردنی کچەکان ئەوەش زوڵم و ستەمێکی تر بوو کە ئاینی ئیسلام و هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مافی کچە بەستە زمانەکانیش بوو ئەوکاتەی کەوا باوکە دڵ ڕەقەکان لە سەردەمی نەفامی کە کچیان دەبوو چاویان شین و مۆر هەڵدەگەڕا دەموچاویان ڕەش هەڵدەگەڕا خوای رب العالمین باس دەکا غەمگین دەبون، ئینجا کە کچەکەیان تۆزێک پێی دەگرت و گەورە دەبوو دەیان ڕازاندەوە هەندێک جار هەبوو دەیانگوت وەرە کچەکەمان بتبەین بۆ سەفرە و سیاحەت، دەچون لە بیرێکدا تێیان دەهاوێشت و بەردیان بەسەردا دەدا هەتا دەمرد یان هەندێک زەویان قوڵ دەکرد و ئەو منداڵە بەستە زمانەی کەوا هیچ گوناح و تاوانی نەبوە لە ژێر زەویەکە دایان دەنا و خۆڵیان بەسەردا دەکرد، تەنانەت یەک لە جارەکان یەک لە سەحابەکان کە تەوبەی کردوە و گەڕاوەتەوە لای الله ئێستا ناوەکەم لە خەیاڵ نیە دەفەرموێ سوێند بە الله بۆ ئەوە دەگریەم کچەکەی خۆمم برد کە

خۆڵم بەسەردا دەکرد هەندێک خۆڵ بە ڕیشم کەوت منی ئەوەندە خۆش دەویست تۆزی لە ڕیشم دەکردەوە نەیدەزانی دەمەوێ زیندە بەچاڵی بکەم و بمرێ، ئا ئاوا بێویژدانی بەربڵاوبوو ئا ئاوا منداڵەکان دەکوژران ئاینی ئیسلام پشتگیری کاری کچەکان و ئافرەتان بوو بۆ ئەوە هاتبوو مافەکانیان دابین ببێ، ئینجا هەبوو منداڵی خۆشی دەکوشت لەپێناو ئەوە دەیکوشت دەیگوت وەڵاهی نیمە و پارە و پولم نیە با نەمێنن ئەو منداڵانە ئەوەندە مەسروفیان بکێشم، ئێستاش خەڵکێک لەناو ئێمە پەیدا بوە (پەنا بە الله) ڕۆژانە و هەندێک جار هەفتانە و مانگانە پرسیارمان لێدەکرێ ئافرەت حەملی هەیە و لە چەند مانگێکە و یان لە چەند ڕۆژێکە وەڵا پێیان ناچێتە سەر و منداڵیان زۆرە لەباری دەبەین؟ کۆمەڵێکی زۆر لە زانایانی ئیسلام دەفەرمون هەر کەسێک منداڵەکەی خۆی بچوێنێ و لەباربا ڕۆح و گیانی وەبەر هاتبێ منداڵەکە لە پێناو ئەوەدابێ بڵێ من پێم بەخێو ناکرێ و تەکلیفم لەسەر قورسە، خۆ تۆ ڕزق و ڕۆزیان نادەی؟ وەکو ئەوە وایە منداڵەکەت زیندە بەچاڵ کردبێ و قەتڵت بۆ دەنوسرێ ئەی خوشکی موسڵمان ئەی برای موسڵمان ڕزق و ڕۆزی تۆیش لەسەر خوای رب العالمین ە، دەبێ ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر و زیاد بکرێن نەک ئەو فکر و بۆچونە هاتوەتە ناومان، (پەنا بە الله) تەنانەت دکتۆرەکانی خۆیان پێ مولتەزیمەشن گوناحبارن کە ئافرەت دێتە لات دەڵێی ئەو هەموو منداڵەت بۆ چیە؟ ئەوە فکرەی جولەکەکانە ابن عثیمین دەفەرموێ چوەتە مێشکی موسڵمانان (پەنا بە خوای رب العالمین)، ئەگەرنا لە دیدگای قورئان و فەرموده لە ئیمان لاوازیتە ئەگەرنا پێویستە لێی بگەڕێی هەتا خوای رب العالمین دەتداتێ منداڵت پەیدابێ و هەبێ با لەشکر و ئومەتی پێغەمبەر زۆربێ (ﷺ)، حەدیسی سەحیحی لەسەرە کە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ): «إني مكاثرٌ بكم الأممَ[١]» لێبگەڕێن منداڵتان زۆر هەبێ چونکە من ئومەتەکان زیاد دەکەم لەسەریان و ژمارەی ئومەتی خۆم بەسەر ئەوانی ترەوە و کەیفم پێی دێ، دەبێ لێیبگەڕێی

[١] **سنن أبي داود** (٢٠٥٠)، **سنن النسائي** (٣٢٢٧).

ئیلا ئەگەر عوزری شەرعیت هەبوو ئەی ئافرەت دکتۆرێکی موسڵمانەی مولتەزیمە پابەند بە ئیسلام لە الله ترس لە ئیسلام تێگەیشتبوو گوتی ئەی ئافرەت بەو حەمل و سکەوە ئەگەری ئەوەی هەیە سەدا نەوەد و نۆ یەکەکەی تر بۆلای الله پێیوە بچی و بمری، ئا لەو حاڵەتە زانایان قسەیان لەسەر کردوە ئایە دروستە منداڵەکە بچوێنرێ بەقوربانی دایکەکە بکرێ یانە نا؟ ئەگەرنا بۆ هەواو هەوەسی خۆیان هەیە دەڵێ ئافرەت هەیە (پەنا بە الله) دەڵێ جسم و لاشەم تێک دەچێ ئەو هەموو منداڵەم ببێ، ئەو جسم و لاشەت هەر بۆ ژێر خاک و عەرزە و ڕۆژێک دادێ دەڕزێ خوای رب العالمین وای لە تۆ کردوە منداڵت هەبێ لە الله بترسە ئەی ئافرەتی موسڵمان، یان هەیە دەڵێ من تاقەتم نیە دەوامم هەیە، دەوام خۆ واجب نیە؟ تەنانەت زۆرێک لە دەوامەکانی ئافرەتەکان کەمێکی کەمیان نەبێ مەرجی شەرعیشی تێدا نیە هەتا حەلاڵ بێ نابێ لە پێناو دەوامتدا تۆ نەهێڵی منداڵت ببێ و زۆربێ، بەڵێ خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ * بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ﴾ [التكوير: ٨-٩] لە مەیدانی حەشر و حیسابدا دەڵێ زیندویان دەکەمەوە کچەکانی زیندە بەچاڵ کرابون و منداڵەکانی لە ترسی ڕزق و ڕۆزی کەمی کوژرابون زیندویان دەکەمەوە و دەڵێنە باوکەکانیان و ئەوانەی ئەوانیان کوشتوە، لەبەرچی ئێمەتان کوشت گوناح و تاوانمان چیبوو؟ ئینجا خوای رب العالمین یش دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ﴾ [الأنعام: ١٥١] یان: ﴿خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖ﴾ [الإسراء: ٣١] واتە لەبەر زۆر هەژاری خۆتان و بلێن هەژار دەبین نەکەن منداڵەکانتان بکوژن.

وە خاڵێکی تری خراپەی سەردەمی نەفامی ڕوت و قوتی ئافرەتەکان بوو کە ئێستا لەناو ئێمە سەری هەڵداوەتەوە و زۆرە، پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتەکان وەکو گۆشتی قەساب خۆیان دەخستەڕوو ڕیوایەت کراوە لە مێژودا ئافرەتەکان بۆ دەرەوە خۆیان زۆر جوان دەکرد بەلام لە ماڵەوە ئافرەتەکان بۆ مێردەکانیان بە ئیزعاجیەوە تەماشایان دەکردن و

ژێر فەرمان نەدەبون بەڵام بۆ دەرەوە خۆیان وەکو گۆشتی قەساب دەخستەڕوو، وەکو هەندێک (پەنا بە خوای رب العالمین) لە ئافرەتەکانی ئێستا کە لە الله ناترسێن پێویستە تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە لای الله، بۆ دەرەوە خۆیان دەڕازێننەوە و بۆن خۆشدەکەن وەکو ئافرەتەکانی نەفامی سەردەمی پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ماڵەوەش لەگەڵ پیاوەکانیان ناگونجێن و نادوێن و وە خۆیان کە حەق وایە بۆ ئەوان بۆنخۆش بکەن و بڕازێننەوە ئەوە ناکەن.

وە لە پاشان دۆستایەتی نێوان نێر و مێیەکان ژن و پیاوەکان بە حەرامی بەبێ ئەوەی لێک مارە بکرێن ئەوەش ئێستا باوە لەناومان و هەیە، (پەنا بە الله) بێشەرمی گەیشتوەتە ئەو ئاستەی سوێند بە الله دوێنێ دوای نوێژی بەیانی گەنجێک تەلەفۆن دەکا دەڵێ ماموستا وەڵاهی نازانم پرسیارەکەش چۆن بکەم بەڵام من تازە لە دوای ئەوەی بانگیدا و نوێژم کرد خۆشەویستەکەم تەلەفۆنی بۆ کردم و من ئارەزوم جوڵا ئاوم هاتەوە ئایە ڕۆژوەکەم بەتاڵە یانە نا؟ خەڵک ئەمڕۆ ئاوا بێشەرم بوە، ئێمەش پێمان گوت یەکەمجار لە الله بترسێ شەرم و حەیا پەیدا بکە خەریکی ناموسی خەڵکی خەڵکێکیش خەریکی ناموست دەبێت دڵنیابە بەوە لەسەرت ناچێ خوای رب العالمین تۆڵەت لێ دەستێنێتەوە، ئا ئەوە پەیدا بوەتەوە لەناومان وەکو خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخۡدَانٖ﴾ [النساء: ٢٥] ئەوانەش ناکرێ و نابێ دۆستایەتی لەنێوان ژن و پیاو و کچ و کوڕەکان پەیدا ببێ بەبێ مارەکردن بڵێن وەڵا ئێمە دۆستی یەکین و ئێمە لەگەڵ یەکتر خۆشەویستی دەردەبڕین و برادەرایەتی ئەوە هی نەفامیەت و نەزانینە لەپێش هاتنی پێغەمبەر هەبوو (ﷺ) خوای رب العالمین حەرامی کردبوو.

وە لە پاشان ئاڵا هەڵکردنی ئەو کەسانەی کەوا بەدڕەوشتیان دەکرد و لاشە فرۆش و داوێن پیس بون لە ئافرەتان شوێنیان بۆ دیاریکردبون، ئێستاش لە نێو کۆمەڵگای موسڵمانان (پەنا

بە الله) ئافرەتی بەدڕەوشتی لاشە فرۆش هەندێک جار یاساشیان بۆ دەردەچێ و بەرگریشیان لێ دەکرێ و شوێنی تایبەتیشیان بۆ دادەنرێ وەکو سەردەمی نەفامیەتیەکەی پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ).

ئینجا عەسەبیەت و دەمارگیرایەتی هۆزەکان بۆ یەکتر و گەل و نەتەوەکان بۆ یەکتر هەتا لەسەر گوناح و تاوانیشبا هەر پشتگیری یەکتریان دەکرد دەمارگیر بون بۆ یەکتر، خەڵکەکەی بەرامبەر لەسەر حەقیش با هی بەرامبەر گەل و هۆزەکەیان دەیان کوشتن و لێیان دەدان (پەنا خوای رب العالمین) دەیانگوت (انْصُرْ أَخاكَ ظالِمًا أَوْ مَظْلُومًا) بە عەکسی ڕیوایەتە سەحیحەکەی پێغەمبەر (ﷺ)، دەیانگوت عەشیرەتەکەت براکەت بنەماڵەکەت ئەگەر زاڵمە هەر سەری بخە ئەگەر مەڵومە هەر سەری بخە پێغەمبەر هات مەعنای ئەوەی ڕاست کردەوە فەرموی ئەگەر زاڵم بوو دەستی بگرە مەهێڵە زوڵمەکە بکا نەک سەریبخەی و پشتی بگری بەرامبەر بە بەرامبەرەکەی، ئا ئەوە ڕاست و دروستە ئەگەر مەزڵومیش بێ لەگەڵیدابە.

ئینجا لەناکاو هێرشیان دەکردە سەر یەکتر جاریە و کۆیلەکان لەوەوە زۆر دەبون یەکتریان تەفر و تونا دەکرد ناموسی یەکتریان دەبرد یەکتریان تاڵان دەکرد ئا ئەوانە هەبوو لەناو موجتەمەع و کۆماڵگایەکەی.

وە لە پاشان ئەوەی حەق و ڕاستیبا وە هەندێک لە ئیش و کارەکانیش سەریان بۆ دانەدەهێنا و نەیاندەکرد دەیانگوت ئێمە گەورەین، جاری وابوو بێ ئاوەدانی دیوەخان و بێ قاوەیی دیوەخان بون بەڵام هەر ڕۆحیان گەورە بوو (پەنا بە الله) وەکو لەناو کۆمەڵگای ئێمەشدا ناڵێین هەموو هەندێک لە کاربەدەست و یان ئاغاکان هەبونە جاری وابوو پارەی نەبوو ئیمکانیەتی نەبو قاوەی دیوەخانیشی پێ ئامادە نەدەبوو بەس دەیگوت ئاخر من ئاغام جیاوازم لەگەڵ کرمانج و فلانەکان ئەو ئیشە لە من ناوەشێتەوە سەپانی بکەم و ئەلێرە بێم

سواری پشتی وڵاخ بم و ئەوها و ئاوا و ئاوا... ئەوە وابون موشریک و کافرەکانی پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێک ئیشی دیاریکراو دەیانگوت لەسەر پشتی وڵاخی چاک سوار ببین تیجارەت و بازرگانی بێ دەیکەین ئەو ئیشانەی تر لە ئێمە ناوەشێتەوە جوتیاری و زەوی کێڵان و دروێنەکردن و ئەو بابەتانە (پەنا بە خوای رب العالمین).

**هەندێك وەسف و سیفەتی چاکی کۆمەڵگای پێش هاتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)**

یەک لە سیفەتە باشەکانیان جۆرێک لە جۆرەکانی نیکاح و هاوسەرگیرایەتی شەرعیان هەبوو، کە ماوە لەناو ئیسلامدا ئەویش دایکە عائیشە دەفەرموێ: «أَنَّ النِّكَاحَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ كَانَ عَلَى أَرْبَعَةِ أَنْحَاءٍ» دەفەرموێ نیکاح و هاوسەرگیرایەتی لە سەردەمی نەفامیەت پێش هاتنی پێغەمبەرایەتی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە چوارلاوە دەکراو واتە چوار جۆر بوو:

یەکەمیان دەفەرموێ وەکو ئەوە وابوو خەڵکێک دەچوە داخوازی کچەکە وە ماڵی باوکەکەی پێشوازی لێ دەکردن وەکو ئێستا لە ئیسلام وایە ئینجا مارەییان بۆ دیاری دەکرد و کچەکەیان پێ دەبەخشی بە شاهێدی و وە لە پاشان ئیعلانیان دەکرد و دەیانگوت فلان بۆتە هاوسەری فلان ئا ئەوە وەکو ئەوەی ئیسلام وایە.

دوەمیان دەفەرموێ پیاو هەبوو دەیگوتە خێزانەکەی خۆی ئەگەر لە سوڕی مانگانە پاک بویەوە پێم بڵێ و خۆت بشۆ وەرە دەتبەمە لای فلان پیاو پیاوێکی ئازایە ئاوا بەناو بانگە ئەوەندە وەسفە چاکانەی هەیە لەلای ئەو بمێنیوە هەتا دەبیە دوگیان، و وە لە پاشان دەیهێناوە و دەیگوت ڕۆڵەکەم و منداڵەکەم لە فلانە بەڵکو بەو بچێ.

جۆری سێیەم لە جۆرەکانی هاوسەرگیری سەردەمی نەفامیەت دایکە عائیشە دەفەرموێ کۆمەڵێک خەڵک کە لە دە زیاتر نەبون بەڵکون کەمتر بون کۆ دەبونەوە دەچون جوت دەبون لەگەڵ یەک ئافرەت، ئەگەر حەملی پەیدا بوبا و دوگیانبا کە منداڵەکە دەبوو

ئەوانەی سەر ناس بون لەناو خەڵکی دەیان هێنا دەیانگوت ئەو منداڵە لەو هەشت نۆ نەفەرە بە کامەیان دەچێ هەتا بیدەینێ و هی ئەو حیساب بێ.

وە جۆری چوارەم و کۆتایش دەڵێ خەڵکێکی زۆرجار وابوو کۆدەبونەوە لەسەر ئافرەتێک کە ئەو ئافرەتە ئاڵای هەڵدەگرت و نیشانەی خۆی نیشانەی خەڵکی دەدا کە زیناکەرە و (پەنا بە خوای رب العالمین) هەر پیاوێک بچوبایە لای مانیعی نەبوو ڕەتی نەدەکردەوە.

ئا ئەو چوار جۆرە جوت بون و نیکاحانە هەبون پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام دەفەرموێ «فَلَمَّا بُعِثَ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحَقِّ، هَدَمَ نِكَاحَ الْجَاهِلِيَّةِ كُلَّهُ، إِلَّا نِكَاحَ النَّاسِ الْيَوْمَ[١]» پێغەمبەر (ﷺ) دایکە عائیشە دەفەرموێ کە هات بوە پێغەمبەری الله هەموو جۆرە نیکاح و هاوسەرگیریەکانی هەڵوەشاندەوە ئەو چوارەی باسمان کرد، ئیلا یەکیانی هێشتەوە کە خەڵکی ئێستا لەسەری دەڕوا دایکە عائیشە فەرموی کە لەناو ئێمەش ماوە و باقیە.

وە لە پاشان ڕاستگۆیی بڵاو بوو لەناو خەڵکە کە خەڵکێکی کەمیان درۆی دەکرد زۆربەیان ڕاستگۆ بون، ئا ئەوە لە سەردەمی نەفامی سیفەتێکی چاک بوو کە بەداخەوە ئێستا ئێمە موسڵمانیشین درۆ لەناومان زۆرە ڕاستگۆیی کەمە.

ئینجا ڕێز لێنانی میوان لەبەر هیچ مەسڵەحەت و بەرژەوەندیەک نا ئەگەر میوانیان هاتبا زۆر ڕێزیان دەگرت زۆربەی کۆمەڵگای پێش هاتنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ)، وە لە پاشان لە ئیسلامیشدا ئەوە بوە شتێکی چاک کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ[٢]» هەر یەکێک بڕوای تەواو بە الله و ڕۆژی دوایی بێ با ڕێز بگرێ لە میوانەکانی.

[١] صحيح البخاري (٥١٢٧)، سنن أبي داود (٢٢٧٢).

[٢] صحيح البخاري (٦٠١٨) (٥١٨٥) (٦١٣٦)، صحيح مسلم (٤٧) (١٤٦٨)، سنن أبي داود (٥١٥٤).

وە لە پاشان گەر وەعد و بەڵێنێکیان بدابا زۆربەیان خاوەنی وەعد و بەڵێنی خۆیان بون، ئینجا ڕێزی دراوسێیان زۆر دەگرت ئەگەر دراوسێیەکیان دوژمنێکی دراوسێیەکەی تریشی پەنا بدابا بیگوتبا ئەوە من پەنامداوە ڕێزم لێ بگرە لەبەر دراوسێیەتی ڕێزی لێدەگرت و هیچی لە دوژمنەکەی نەدەکرد، وە سەبر و تەحەمولیان زۆربوو، وە بەڕاستی پیاوی هەڵکەوتوو و ئازاشیان تێدابوو، وە لە پاشان ڕێزی ئەو مانگانەیان دەگرت کە کوشتار و خوێن ڕشتن تێیدا حەرام بوو، وە قەتاوقەتیش ئەوە نەبیسترابوو لە ناویان کە یەکێک بچێ زینا بکا لەگەڵ دایکی یان لەگەڵ خوشکی وە لەگەڵ ئەوانەی کە بە مەحرەم دادەنرێن لە شەریعەتی ئیسلام و دوایی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئومەتەکەی باسیکرد، کە بەداخەوە هەندێک لەو شتانە ئێستا لەناو ئێمەدا هەیە.

کەواتە بەڕێزان و خۆشەویستان ئەوەی لە سەردەمی نەفامیەتیش نەبوە پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بەداخەوە ئێستا بڕۆنە ئەو شوێنانەی کە خەڵکی لێگیراوە بەهۆی ئنتەرنێت و بەهۆی مۆبایل و بەهۆی ئەو بەدڕەوشتی و بەڕەڵاییە، وە لە ئیعلامەکانیش کە نیشان دەدرێ بە پاساوی ئەوەی ئازادیە ئەمڕۆ لەناو ئێمە دەبینرێ چەندین برا لەگەڵ خوشکی و چەندین کوڕ لەگەڵ دایکی و وە چەندین باوک لەگەڵ کچەکانی خۆیان (پەنا بە خوای رب العالمین) توشی ئەو حەرام و تاوان و گوناحە گەورانە بونە.

وە لە پاشان هەر لە سەردەمی نەفانیەت خۆشۆردن لە دوای جەنابەت هەبوە خۆیان دەشۆرد و پاک و خاوێن دەکردەوە، ئینجا لە پاشان منداڵەکانیان سونەت دەکردن، وە لە پاشانەکە ئەگەر یەکێک دزی کردبا دەستی ڕاستەیان دەبڕی، ئا ئەوانە هەموی ڕەفتاری جوان و ڕێک و پێک بون کە لە سەردەمی نەفامیەتیش هەبون، ئینجا ئەگەر پێغەمبەر هات (ﷺ) کە بینی حەج و عومرەشیان دەکرد ئەوانە لە ئیسلامیش بونە شتی چاک و وە پێغەمبەر

(ﷺ) سەلماندی لە ڕێگای وەحیەوە کە هەندێک لەو شتانە بمێنێتەوە لەناو ئومەتی ئیسلام و خوای رب العالمین پێی ڕازییە.

## ڕووداوەکانی پێش لە دایکبونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

ئینجا لەپێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوداوێکی زۆر گەورە ڕویدا، ئەو ڕوداوە گەورە ئەوەبوو کە ئەبرەهەی سەرۆک و دەسەڵاتداری یەمەن کاتێک کەوا نەسڕانی بوو پێی گەیشت کەوا (کعبة الله) خەڵکی زۆر لە دەور کۆدەبێتەوە و پۆل پۆل خەڵک و نەتەوەکان لێرە و لەوێ وڵاتەکان دەچن لەوێ زیارەتی کەعبە دەکەن، ئەوەبوو کەوا ئەبرەهە ڕقی لە دڵدا دروستبوو بۆخۆی کۆشک و نیشانەیەکی دروست کردبوو کەس نەدەچوو زیارەتی ئەوێ بکا شەیتان هێنایە ناو دڵی کەوا بێ (کعبة الله) تێک بدا، ئەبرەهە پیلانی دارِشت خوای رب العالمین یش پێی ئاگادار بوو، لەشکرێکی زۆری کۆکردەوە فیلی زۆر زەبەلاح و گەورە و ڕاهێنراوی هێنا مودەڕەب، ئەوانەی هێنا و بەرەو (کعبة الله) هات کە خوای رب العالمین کردیە سورەتێک لە قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێ: ﴿أَلَم تَرَ كَيفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصحَٰبِ ٱلفِيلِ﴾ [الفيل: ١-٥] مێژونوسان دەفەرمون ئەبرەهە کە هات بەو لەشکرە زۆرە قورەیشیەکان هەموو ڕایانکرد بۆ دەشت و دەر و شاخ و بەرزاییەکان، کەس نەیدەتوانی باری ئەبرەهە ببا لەشکرەکەی ئەوەندە گەورە و زەبەلاح بوو بەڵام ئەبرەهە بێئاگا لەوەی خوای رب العالمین وا ئاگادارە، هەر هەتا حەد و سنورێک خوای رب العالمین ڕێگا و مۆڵەت و جڵەوی زاڵمەکان درێژ دەکا و پێیان دەدا لە حەدێک تەداخول دەکا و ڕایدەگرێ هێزیش نیا بەرامبەر هێزی خوای رب العالمین بوەستێ، خوای رب العالمین دەفەرموێ ئایا نا بینی ئەی موحەمەد (ﷺ) ئێوەش قورەیشیەکان خوای رب العالمین چیکرد بە خاوەن فیلەکان ئەوانەی فیلیان هێنابوو دەیانگوت لەشکرەکەمان تێک ناشکێ بۆ ئەوەی کەعبە لە ڕەگەوە دەربێنن و ئاسەواریشی نەمێنێ: ﴿أَلَم يَجعَل كَيدَهُم فِي تَضلِيل﴾ خوای رب العالمین وای

نەکرد پیلانە گڵاوەکەی ئەوان گومڕا ببێ و بزر و ون ببێت و ئاسەواری نەمێنێ نەتوانن کەعبە بڕوخێنن: ﴿وَأَرسَلَ عَلَيهِم طَيرًا أَبَابِيلَ﴾ خوای رب العالمین چەند باڵندەیەکی بچوک ڕەوانەی کردن کەوا باڵندەی تایبەت بون، ئەو باڵندانە موفەسیرین دەفەرمون هەریەک لە پێو قاچەکانیدا بە پەنجەکانی بەردێکی هەڵگرتبوو بە هی قاچی دوەمیش بەردێکی تر بە دندوکیش بەردێکی تر تەنها سێ بەردیان پێبوو، بەردەکانیش لە چی بون؟ زۆر ڕەقیش نەبون وەکو خۆڵ و گڵ وابوو تۆزێک یەکتری گرتبێ، ئەوانە هاتن ئەو سەربازانەی خوای رب العالمین کە باڵندەکان بون تەیرەن ئەبابیل بون خوای رب العالمین فەرموی بڕۆن لەشکری ئەبرەهەی موجریمی خوێن ڕێژی زاڵم ئەوەی بەخۆی دەنازێ و توشی توغیان بوە تەفر و تونای بکەن، ئەمری الله وایە لەشکرەکان و سەربازەکانی خوای رب العالمین هەندێک جار دیار نین، کورە چی دەکەی ئەی بەشەر و ئینسان و زاڵم و ستەمکار ئەگەر خوای رب العالمین مێرولە و مێروستانت بۆ بنێرێ بە لەشکر و ئەمری پێبکا؟ وەڵاهی مێرولە و مێروستان ناگەڕێنەوە دەتخۆن ژیانت لێ تاڵ دەکەن ناتهێڵن، کێ هەیە بتوانێ بەرامبەر خوای رب العالمین ڕابوەستێ؟ لە مێرولە ڕابگرە هەتا فیل و ئەسپەکانیش هەتا چەک و تەقەمەنیەکانیش تەنانەت هەتا نەوەوی ئەو سەردەمەش هەمویان مەخلوقی خوای رب العالمین ن ناتوانن لە ئەمر و فەرمانی الله دەربچن خوای رب العالمین بفەرموێ دەبێ لەناوبچن دەبێ لەناوبچن، ئەوەتا ئەبرەهە وا سەرلەشکرە و بەخۆی دەنازێ پێی وایە کارەکەی پێ ئەنجام دەدرێ لە فیلەکان دەخوڕێ بڕۆن بەرەو پێش، موفەسیرین دەفەرمون فیلەکان هەتا هاتنە نزیک کەعبە هەر بەرەو پێش و بە خێرایی دەڕۆیشتن لەوێوە کە تێیان دەخوڕین و دەیانگوت بڕۆنە پێش، فیلەکان ڕویان دەسوڕاند و نەدەچونە پێش و لە شوێنی خۆیان دەچەقین، ئەگەر فیل عینادیت لەگەڵ بکا نەک فیل ئەگەر جاشکێک ئەگەر هێسترێک ئەگەر حەیوان و ئاژەڵێکی زۆر بچوکتر لە فیل عینادیت لەگەڵ بکا و پێدابگرێ و چەموش بێ، ساحێب و خاوەنەکەی هیچی پێ لەگەڵ ناکرێ ئەی ئەگەر فیلێک خوای

رب العالمین ئەمری پێبکا بوەستە چیتر بە قسەی ئەبرەهە مەکە؟ وەستان فیلەکان لەوێوە تەیرەن ئەبابیلیش لەسەریان نەوعی ئەو تائیرە سیخۆیانە نیە کە زاڵم و ستەمکارەکان زۆرجار پێیوە دەخورن و دەبرن دەڵێن تائیرەی ئەوهامان هەیە نەوعی تائیرەکانی ئێف شازدەی ئەمریکی نەبوو، بەڵکو تەیرەن ئەبابیل چەند باڵندەیەکی وابچوک بون تەنها یەکاو سێ بەردیان پێبوو، بەردەکانیش وەکو گوتمان موفەسیرین دەفەرمون وەکو خۆڵ و گڵ تۆزێک تەربێ و یەکتر بگرێ ئاوا بون لە دنکی نۆک بچوکار بون لە دنکە نیسک تۆزێک گەورەتر بون هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون، خوای رب العالمین فەرموی: ﴿تَرمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيل﴾ ئەوە ئەمرە ئەی تەیرەن ئەبابیل برۆن ئەو بەردانەی کەوا بەردن و لە سیجیلن واتە لە گڵ و خۆڵی وەکو سوتێنراو و گەرم کراون ئەوە ببەن هەریەک لەو بەردانە لو تەوقی سەری سەرکردە سەربازیەکانی کە خۆیان پێ پاڵەوانە و دێن کەعبە تێک دەدەن بدەن لێیان بدەن و بزانن چیان بەسەردێ: ﴿فَجَعَلَهُم كَعَصفٍ مَّأكُولِ﴾ [الفيل: ١-٥] هەر ئەوەندەیان خۆشی بوو لەشکری ئەبرەهە خوای رب العالمین دەفەرموێ وەکو ئەوەیان لێهات چۆن کایەک ئەگەر بێنی حەیوان و ئاژەڵەکان کاوێژی پێ بکەن و بیجون و چی بەسەردێ ئا ئاوای لێدێ یان وەکو لۆکەیەک و ئەوانە لەبار یەکی بکەیتەوە ئاوا دارزینە ناو یەک، هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون مێشکیان کولا لەناو یەکتردا دارزی بە گەرویاندا هاتە خوارەوە دەهاتە ناو هەناویان ئەویش دادەرزی و لە شوێنی خۆیان دەکەوتن و پەکیان دەکەوت، ئەبرەهەش یەکێک بوە لەوانە بەریکەوتوە بە بریندار مابۆوە خوای رب العالمین ویستویەتی وا سەرشۆری بکا، هەرکە هەڵیان گرتەوە و هەتا یەمەنیان بردەوە لە رێدا پارچە پارچە گۆشتەکانی لێدەبۆوە.

ئەوەی بیەوێ بەربەرەکانێی خوای رب العالمین بکا ئەگەر موسڵمانانیش هێزی تەواوی مادییان نەبێ بەڵام موسڵمانەکان راستەقینەبن وەکو پێغەمبەر (ﷺ) وەکو سەحابەکان

پشت بە خوای خۆیان ببەستن لەکاتی هەرە ناکاو خوای رب العالمین لە ئاخیر چرکە و لەحزەکان تەداخول دەکا و هەموو کاتێک تەیرەن ئەبابیل هەیە و خوای رب العالمین زاڵم و ستەم کارەکانی پێ لەناو ببا.

بەڵێ جا ابن کثیر دەفەرموێ ئەو ڕوداوە بزانین چ پەیوەندیەکی بە لە دایبونی پێغەمبەرەوە هەیە (ﷺ)، ابن کثیر دەفەرموێ: (هَذِهِ مِنَ النِّعَمِ الَّتِي امْتَنَّ اللَّهُ بِهَا عَلَى قُرَيْشٍ، فِيمَا صَرَفَ عَنْهُمْ مِنْ أَصْحَابِ الْفِيلِ) ئەوە لەو ناز و نیعمەتانە هەژمار دەکرێ کە خوای رب العالمین وەکو فەزڵ و منەتەوە بەسەر قورەیشیەکانی کرد کە (أَصْحَابِ الْفِيلِ) و ئەبرەهە و ئەوانەی ڕەت کردەوە نەیهێشت بتوانن بەسەر کەعبە و وە بەسەر قورەیشیەکان زاڵبن (الَّذِينَ كَانُوا قَدْ عَزَمُوا عَلَى هَدْمِ الْكَعْبَةِ وَمَحْوِ أَثَرِهَا مِنَ الْوُجُودِ) ئەو ئەبرەهە و لەشکرەی کەوا دایان نابوو عەزمیان جەزم کردبوو کەعبە لەبن ڕەگ و ڕیشەوە دەربێنن وە هیچ ئاسەوارێکی کەعبە نەمێنێ لەسەر ڕوی زەوی (فَأَبَادَهُمُ اللَّهُ) خوای رب العالمین لەناوی بردن (وَأَرْغَمَ آنَافَهُمْ، وَخَيَّبَ سَعْيَهُمْ) هەموو قسەکان و پیلانەکانی لێ کردنە خەیاڵ پڵاو هیچیان پێ نەماوە و بە دەستی بەتاڵ گەڕانەوە لوتیان لە زەوی چەقی خوای رب العالمین وای لێکردن (وَأَضَلَّ عَمَلَهُمْ) وە گومڕای کردن و عەمەلەکانیشیان هیچی نەما (وَرَدَّهم بِشَرِّ خَيْبَةٍ) بە ڕوو ڕەشیەوە زۆر بە پەشیمانیەوە ڕەوانەی کردنەوە (وَكَانُوا قَوْمًا نَصَارَى) ئا ئەوانە نەسرانیەکان بون دیانەکان بون (وَلَكِنْ كَانَ هَذَا مِنْ بَابِ الْإِرْهَاصِ وَالتَّوْطِئَةِ لِمَبْعَثِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)) ئا ئەوەمان مەبەستە ابن کثیر دەفەرموێ ئەو ڕوداوە لەو شارە کەوا مەککە بوو لەناو قورەیشیەکان لەو ساڵەدا ئەوە پێشەکی و ڕێ خۆشکردن بوو بۆ هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە نەبێ لەبەر قورەیشیەکان خوای رب العالمین ئەو ڕوداوەی وا لێکردبێ ڕویدابێ و ئەبرەهە ڕوو ڕەش بێ و تێک شکابێ و گەڕابێتەوە (فَإِنَّهُ فِي ذَلِكَ الْعَامِ وُلِدَ عَلَى أَشْهَرِ الْأَقْوَالِ) چونکە لەو ساڵە بوو پێغەمبەر (ﷺ) لە بەناو بانگترین وتەکەکانی زانایان لە

دایکبوو (وَلِسَانُ حَالِ الْقَدَرِ يَقُولُ) جا دەفەرمویٚ زمانی حاڵی دەسەڵاتی خوای رب العالمین ئەوەی لیٚ وەردەگیریٚ دەڵیٚ (لَمْ نَنْصُرْكُمْ -يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ- عَلَى الْحَبَشَةِ لِخَيْرِيَّتِكُمْ عَلَيْهِمْ) قورەیشیەکان وا تیٚنەگەن من ئیٚوەم سەرخست بەسەر حەبەشیەکان ئەبرەهە کە حەبەشی بوو لەشکری هیٚنابوو ئیٚوە چاکترن و لەبەر چاکی ئیٚوەبیٚ ئیٚوەم سەرخستبیٚ (وَلَكِنْ صِيَانَةً لِلْبَيْتِ الْعَتِيقِ) بەڵکو لەپیٚناو پاراستنی ئەو ماڵەی خۆم کەوا ماڵیٚکی کۆنە و لەمیٚژە بنیاد نراوە لەسەر زەوی (الَّذِي سَنُشَرِّفُهُ وَنُعَظِّمُهُ وَنُوَقِّرُهُ بِبَعْثَةِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ مُحَمَّدٍ) بەڵکو ئەو ماڵە بەڕیٚزتریش دەکەم شکۆدارتری دەکەم بە هیٚنان و هاتنی پیٚغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ) (خَاتَمِ الْأَنْبِيَاءِ) کە کۆتای پیٚغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام).

جا بەڵیٚ میٚژونوسان دەفەرمون باوکی پیٚغەمبەر (ﷺ) عەبدوڵا کە یەکیٚک بوە لە کوڕە هەرە خۆشەویستەکانی عبد المطلب، کە ڕیوایەت هەیە عبد المطلب گوتی دەیکەمە قوربانی چونکە زۆر لەلام خۆشەویستە ئەگەر الله (١٠) کوڕم بداتیٚ من بەرگری بکەم لە ئاوی زمزم و کەعبەی پیٚیەوە کە (١٠) کوڕەکەی درایە لە هەندیٚک ڕیوایەتەکانی سیرە لە سیرەی ابن هشام هاتوە هەندیٚک زانایان بە سەحیحی دانانیٚن و هەندیٚکیش قبوڵیان کردوە ئینجا لە پاشان خزم و کەس و خەڵکەکان کۆبونەوە (١٠٠) حوشتریان کردە قوربانی بۆ ئەوەی عەبدوڵا بمیٚنیٚتەوە باوکی پیٚغەمبەر (ﷺ).

ئینجا باپیری پیٚغەمبەر (ﷺ) ژنی بۆ عەبدوڵا هیٚنا باشترین ژنی بۆ هیٚنا لە باشترین تیرە و هۆزەکانی مەککە کەوا ئامینەی کچی وەهەب بوو ئەویش کوڕی عبد مناف بوو ئەویش کوڕی زوهرە بوو ئەویش کوڕی کیلاب بوو، جا زۆر پیٚکەوە نەمانەوە ئەو دوو هاوسەرە باوک و دایکی پیٚغەمبەر (ﷺ) بەڵکو باوکی پیٚغەمبەر (ﷺ) بە تیجارەت و بازرگانی ڕۆیشت بەرەو شام لە گەڕانەوەی لە بەینی نیٚوان مەککە و مەدینە ئەجەلی هات و وەفاتی کرد و گەڕایەوە لای خوای رب العالمین بەڵام ئامینە خاتون پیٚغەمبەری بە حەملی خۆیەوە

هەڵگرتبوو پێغەمبەر (ﷺ) لە سکی دایکی بوو، ئینجا لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: «أنا دعوةُ أبي إبراهيمَ وبُشرى عيسى عليهما السلامُ ورأَتْ أمي حين حملتْ بي أنه خرج منها نورٌ أضاءت له قصورُ الشام[١]» جا بەڕێزان و خۆشەویستان لێرەدا دەمانەوێ تەفسیری ئەوەتان بۆ بکەین پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) بە ڕیوایەتی سەحیحەوە کە بۆمان هێنانەوە کە دەفەرموێ من دوعاکەی باوکم ئیبراهیم بوم چونکە پێغەمبەر نەوەی ئیبراهیمە (ﷺ) کە ئیبراهیم پێغەمبەر لە قورئاندا تۆمار بوە دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ [البقرة: ١٢٩] ئیبراهیم لەبەر الله پاڕاوە (ﷺ) خوایە ڕەوانەکراو و پێغەمبەرێکیان بۆ ڕەوانە بکەی بە زمانی خۆیان ئایەتەکانی اللەیان بەسەردا بخوێنێتەوە پەرتوک و نوستاویان فێربکا کە قورئانی پیرۆزە وە حیکمەتیان فێربکات و کارلەجێیی وە بە حیکمەت و پێغەمبەرایەتیەوەش پێغەمبەر هات وە تەسکیەیان بکا لە شیرک و کوفر و خوڕافات دەریان بێنێ بەرەو تەوحید و الله بەیەکگرتن و کاری چاکە خوای رب العالمین تۆ عەزیزی واتە زاڵ و دەسەڵاتداری بەسەر هەموو شتێک ئەل حەکیمی واتە کارەکانت لەجێیە، وە دەش فەرموێ من مژدەی عیسا بوم کە خوای رب العالمین دەفەرموێ عیسا پێغەمبەر فەرموی ئەی بەنو ئیسرائیل: ﴿يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُ﴾ [الصف: ٦] مژدەی پێدان لەپاش من کەسێک دێ کە پێغەمبەرە ناوی ئەحمەدە کە پێغەمبەر ناوی موحەمەد و ئەحمەد بوە ئەوەش هاتەجێ، ئینجا دەفەرموێ دایکیشم لە خەوندا بینی کەوا شتێکی لە دامێندا دەرچوو هاتەدەر ڕوناکی بوو ئەو ڕوناکیە قەسرەکانی شام یان هی بوسڕای ڕوناک کردەوە واتە دین و تەوحیدی پێغەمبەر بوو (ﷺ) کەوا هێنای شام و هەموو وڵاتەکانی ڕوناک کردەوە و پەیدابونی پێغەمبەر بوو (ﷺ).

[١] سلسلة احاديث صحيحة (١٥٤٦)، ابن كثير، البداية والنهاية (٢/٢٥٦).

وه دەش فەرموێ لە فەرمودەیەک کە ابن عباس دەفەرموێ پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ): «ما بعث الله نبيًا من الأنبياء إلا أخذ عليه الميثاق» خوای رب العالمین هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە نەکردوە ئیلا بەڵێنی ئەوەی لێ وەرگرتوە «لئن بعث الله محمدًا وهو حي ليؤمِننَّ به ولينصرنَّه، وأمره أن يأخذ الميثاق» پێی گوتوە ئەی پێغەمبەرەکە خوای رب العالمین ئەگەر تۆ لە ژیاندا بوی موحەممەد لەناوتان پەیدا بوو دەبێ ئیمانیشی پێ بێنی و سەریشی بخەی، بە ئومەتەکەشت بڵێن ئەگەر لە ژیاندا بون موحەممەد هات سەری بخەن و ئیمانی پێ بێنن «لئن بعث محمد وهم أحياء ليؤمنُنَّ به ولينصُرُنّه» ئەگەر ئێوە زیندوبون ئومەتەکە خوای رب العالمین ئاوای بە پێغەمبەرەکان گوتوە بە ئومەتەکانیان بڵێن ئیمانی پێ بێنن و سەرییبخەن.

**ئایە باوك و دایکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وە باپیرەی موسڵمان بون یان بە کافری مردون؟**

هەرچەندە ئەو پرسیارە دەمانەوێ لە پێشەکیدا پێتان بڵێین زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەو جۆرە پرسیارکردنانە هیچ خێر و چاکەیەکی پێوە نیە بۆ قیامەتمان کە لێپرسینەوەی لەسەر بێ، واتە نە لەسەری دەچیتە جەهەنەم نە لەسەری دەچیتە بەهەشت پێویستە نەکرێ باشترە و عیلمێکی سود بەخش نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا زانایان ئیختیلافیان لە نێوان پەیدا بوە و قسەیان لێکردوە.

ئیمامی سیوطی کتابێکی لەسەر نوسیوە بەڵام هەندێک لە زانایان ڕەخنە لە ئیمامی سیوطی دەگرن موحەدیثن لەپاش ئەو دەفەرمون ئیمامی سیوطی لەوێ نەیپێکاوە و مەیلی بەلای ئەوەدا کردوە هەرچەندە سەنەدی سەحیحی بەدەست نەکەوتوە کە بڵێت باوک و دایکی پێغەمبەر (ﷺ) ئەهلی فەترە حیساب بونە و بە کافر حیساب نەبونە، کەواتە بۆچونی یەکەم دەڵێن ئەهلی فەترەن بەو مەعنایەی کەوا تەکلیفی شەرعیان ئەوەندە لەسەر بوە لەسەر ڕێبازی ئیبراهیم بوبن بت و سەنەمیان نەپەرستبێ ئەوانە لە قیامەت دوو بۆچونی لەسەرە ئەهلی فەترە یان ئەوەیە تاقیدەکرێنەوە جارێکی تر لەلای خوای رب العالمین ئەگەر لە

تاقیکردنەوەکە دەرچون ئینجا دەچنە بەهەشت ئەگەر دەرنەچون دەچنە دۆزەخ هەندێکیش دەڵێن لەنێوان بەهەشت و جەهەنەمدا دەبن ئەو بۆچونەیان زەعیفترە، بەڵام دەلیلەکەیان نە سەحیحە و نە حەسەنە ئەوانەی دەڵێن ئەهلی فەترە حیسابن.

وە بۆچونی دوەم دەڵێن کە بۆچونەکە هەر یەکجار زەعیفە و هیچ بەڵگەیەکیان پێ نەهاتوەتەوە نەک لە حەسەن زەعیفەکانیش زەعیفی ئاوانین گوێی لێ ڕابگیرێ کە دەڵێن پێغەمبەر بوە پێغەمبەر (ﷺ) باوک و دایکی لە قەبر زیندوبوەوە ئیمانیان پێهێنا چەند دەقەیەک و لە پاشان مردنەوە ئەوەشیان هیچ دەلیلیان نیە.

بۆچونی سێیەم دەڵێن ئەوانە لەسەر کوفر مردون چەند حەدیسێکی سەحیح دەهێننەوە دەڵێن ئەوەش کار ناکاتە سەر ئەوەی کەوا بڵێین پێغەمبەر (ﷺ) لە پلە و پایەی کەمبێتەوە چونکە باوکی ئیبراهیمیش لەسەر کوفر مرد بە ئیتیفاق بە نەسی ئایەتی قورئانی هیچ کاری نەکردە سەر ئیبراهیم پێغەمبەر (ﷺ) کە ئیمامی نەوەوی زانایەکە لە زانایەکان ئەوە بۆچونیەتی وە هەندێکی تریش لە زانایانی تر.

دەمانەوێ ئەو هەڵوێستە بکەین ئینجا حەدیسەکان بخوێنینەوە ئایە ئەهلی فەترە لە قیامەتدا دەچنە ئەعراف یان بەهەشتین یان دۆزەخین؟

ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونی جیا جیایان هەیە دەتوانین بڵێین سێ بۆچون هەیە:

بۆچونی یەکەم لەسەر ئەوەیە کەوا ئەهلی فەترە دەڵێ ئەوانەی لەسەر شیرک نەمردبێ هەمویان بۆ بەهەشتن ئەگەر کوفریشیان هەبوبێ لەبەر ئەوەی هیچیان پێ نەگەیشتوە لەبەر ئەو ئایەتە: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولًا﴾ [الإسراء: ١٥] کە خوای رب العالمین فەرمویەتی ئێمە هیچ کەسێک تۆڵەی لێ ناستێنینەوە و عەزابی نادەین هەتا ڕەوانەکراو و پێغەمبەری بۆ ڕەوانە نەکەین.

بۆچونی دووەم دەربارەی ئەهلی فەترە دەڵێ بەڵکو ئەوانە نە عەمەلی چاکیان هەیە کەوا پێی بچنە بەهەشت نە پێغەمبەریشیان پێ گەیشتوە کەوا حوجەی لەسەر کردبن و بەهۆیەوە بچنە ئاگری دۆزەخ لەو ناوەدا دەمێننەوە نەبەهەشتینە و نەدۆزەخی، بۆچونێکیش هەیە دەڵێ هەڵوێستە دەکەین و ڕادەوەستین هیچ قسەیەکی لێناکەین بۆمان یەکلا نەبۆتەوە.

بۆچونی سێیەم کە بۆچونی ئەهلی سونە و جەماعەیە ئەوانە دەفەرمون بەڵکو ئەوانە ئینتیحان و تاقی دەکرێنەوە، ئەوە بۆچونی هەندێک لە زانایانی ئەهلی تەحیقیقە لەوانە دەتونین بڵێین بۆچونی ابن کثیر -رحمه الله- ئەویش ئەوەی ڕاجیح و پەسەند کردوە، ئەوەشی بشیەوێ لەو بابەتە تەواو شارەزابێ بۆی دیاریدەکەین سێ تەفسیر هەیە بیخوێنێتەوە کار و ئیشەکان و وتەکانی بۆ یەکلا دەبێتەوە:

یەکەمیان تفسیر ابن کثیر کە بە دور و درێژی لە تەفسیر کردنی ئایەتی [الإسراء: ١٥] باسی لێوە دەکا و هەموو ڕیوایەتەکان دەهێنێ ئینجا جەمع و تەوفیقیش دەکا لە بەینی بەڵگە و دەلیلەکان ئەویان زۆر چاکە.

ئینجا فتحُ البیان ابن لطف القِنَّوجي ئەویشیان تەفسیرێکی چاکە دوو بۆچون دەهێنێ کورتە پوختێکت دەداتە دەست.

وە زۆر بە جوانی و درێژی لە بواری ئسوڵیشەوە کە بەڵگەکان لێک هەڵدەوەشێنێتەوە و لە پاشان بەڵگەکان شیدەکاتەوە و جەمع و تەوفیقت دەداتێ بەڕاستی ئەو پەرتوک و تەفسیرە نایابەی الشنقیطي ە -رحمهم الله- أضواء البیان لە تەفسیرکردنی [الإسراء: ١٥].

کورتەی قسان لە أضواء البیان دەفەرموێ و ابن کەسیریش هەر بۆچونی وایە دەفەرموێ: (أَنَّ الْجَمْعَ بَيْنَ الْأَدِلَّةِ وَاجِبٌ مَتَى مَا أَمْكَنَ بِلَا خِلَافٍ) بۆ یەک هێنانەوە و کۆکردنەوەی هەموو بەڵگەکان بەیەکەوە واجبێکی پێویستیە لەسەر موسڵمانان و زانایان بیکەن هەتا پێیان بکرێ بەبێ جیاوازی (لِأَنَّ إِعْمَالَ الدَّلِيلَيْنِ أَوْلَى مِنْ إِلْغَاءِ أَحَدِهِمَا) چونکە ئەگەر دوو

دەلیل هەبون پێت وابوو دەلیلەکان یەک ناگرنەوە زانایان بیهێنن وای لێبکەن یەک بگرێتەوە و بە هەردو دەلیلەکان ئیش بکرێ ئا ئەوەیان چاکترە لەوەی بەیەک دەلیل ئیش بکرێ (وَلَا وَجْهَ لِلْجَمْعِ بَيْنَ الْأَدِلَّةِ إِلَّا هَذَا الْقَوْلُ بِالْعُذْرِ وَالِامْتِحَانِ) کەواتە دەڵێ جەمعی بەڵگەکانی ئەهلی فەترە بەوە دەبێ ئیهامی شەنفیتی دەفەرموێ ئەگەر بڵێین ئینتیحان دەکرێن لە قیامەت ئەهلی فەترە.

لەبەر ئەوە ئەو هەڵوێستە دەکەین و بۆتان ڕوندەکەینەوە پرسیار لەو بوارانە زۆر دەکرێ وە زۆرجاریش گوێبیست بوینە هەندێک لە زانایان یان بڵێین هەندێک لە داعی و بانگخوازەکان بە نالەباری بەبێ لەبەرچاو گرتنی بۆچونەکان و بەڵگە هێنانەوە وەڵامیان دەدەنەوە و خەڵکەکە لەکۆڵ خۆیان دەکەنەوە ئا ئەوەش کەم و کورتیە بۆ زانستی شەرعی لەبەر ئەوە بەچاکمان زانی لێرەدا بەرچاوی هەموو خەڵکەکە ڕون بکەینەوە و بەڵگەکان بێنینەوە و بە کورتی و پوختی هیچی تێدا نەهێڵینەوە.

لەبەر ئەو فەرمودە کە لە موسنەدی ئەبو یەعلا هاتوە کە ابن کەسیریش بە چەند ڕیوایەتێک لە تەفسیرەکەی تۆماری کردوە کە ئەنەس دەفەرموێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «يؤتى بأربعةٍ يومَ القيامةِ» چوار جۆرە کەس لە قیامەتدا دەهێنرێن «بالمولودِ والمعتوهِ ومَن مات في الفترةِ والشيخِ الفاني» دەفەرموێ ئەو چوار کەسە ئەوانەن: یەکەمیان ئەوەی کە بە منداڵی مردوە بە تایبەت منداڵی کافرەکان، وە دوەمیان ئەوەی شێت بوە و هیچ هۆشی لەخۆی نەبوە بە شێتایەتی مردوە، وە سێیەمیان ئەهلی فەترە ئەوانەی هیچ پێغەمبەرێکیان پێ نەگەیشتوە و بە دیاریکراوی بۆیان نەهاتوە، وە چوارەمیان کەسێکی خەفای کە لە بەتەمەنیان و پیربونیان دەخەفێ و لەسەر خەفایەتیەکەی دەمرێ هۆشی لەخۆی نامێنێ عەقڵی نامێنێ ئەو چوار کەسە لە قیامەتدا دەهێنرێن «كلُّهم يتكلَّمُ بحُجَّتِه» هەریەکەیان بەڵگەی خۆیان دەهێننەوە، منداڵەکە دەڵێ ئەی خوای خوای رب العالمین من منداڵ بوم فامم

نەبو هەتا بەدوای پێغەمبەر بکەوم (ﷺ) من هیچم نەدەزانی و مردم چیم لێدەکەی، ئینجا له پاشان شێتەکە دەڵێ هیچ هۆشم لەخۆم نەبو من شێت بوم چیم لێدەکەی ئەی خوای خوای رب العالمین هەتا عەقڵم هەبێ و وەکو خەڵکەکەی تر ڕێی ڕاست بگرمەبەر، ئەو کەسەی ئەهلی فەترەشە دەڵێ هیچ بەڵگەمان بەدەست نەبو هیچ کەسێک بۆ ئێمە نەهاتبوو تێمان بگەیەنێ پێغەمبەرانمان نەبینیبوو (علیهم الصلاة والسلام)، ئەو کەسەی کەوا خەفاشە و له پیریان ئەویش دەڵێ من خەفام هۆشم لەخۆم نەما وەکو شێتم لێهات ئەی خوای خوای رب العالمین چیم لێدەکەی، خوای خوای رب العالمین یش دەفەرموێ له حەدیسەکەی پێغەمبەر دەفەرموێ «فيقولُ الربُّ، عزَّ وجلَّ، لِعُنُقٍ منَ النارِ: ابرُزْ[١]» خوای رب العالمین دەفەرموێتە پارچە ئاگرێک وەرە بەدیارکەوە و وەرە پێش پارچە ئاگرێک دەهێنن ئینجا خوای خوای رب العالمین دەفەرموێ بەڵێ ڕاستە لەدونیادا ئێوە وابون بەڵام لێرە تاقیتان دەکەمەوە بڕۆن خۆتان لەو ئاگرە بدەن دەڵێ ئەوانەی کەوا هیدایەت و ڕێنوینیان نەبوە کە لەوێ عەقڵ و هۆشیان تەواوە شتەکە بە بەرچاوی خۆیان دەبینن دەکشێنەوە فەرمانی الله جێبەجێ ناکەن ئینجا خوای خوای رب العالمین دەفەرموێ من دەمزانی ئێوە ئەگەر عەقڵ و هۆشیشتان هەبا و ئاگاداریشبان له دونیادا فەرمانی منتان جێبەجێ نەدەکرد ئێوە بڕۆن بۆ ناو ئاگری جەهەنەم، هەندێکیشیان خۆیان بە ئاگرکەدا دەدەن و دەربازیان دەبێ و ناسوتێن پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەمری الله سەدا سەد جێبەجێ دەکەن الله تعالی دەفەرموێ دەمزانی ئێوەش ئەگەر عەقڵ و هۆشتان هەبا و ئاگاداربان بەڵگەتان بۆ هاتباوە فەرمانی منتان جێبەجێ دەکرد ئێوەش بڕۆن بۆ بەهەشت.

جا لەبەر ئەو فەرمودەشە وە ئەو فەرمودانەش کە پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ) ئێستا دێینە سەری هی دایک و باوکی وە هی هەندێک خەڵکی تر له ئەهلی فەترەش بوبن بۆناو ئاگرن

[١] **البوصيري، إتحاف الخيرة المهرة (١٧٧/٨)، أخرجه البزار (٧٥٩٤)، وأبو يعلى (٤٢٢٤)، والبيهقي في ((الاعتقاد)) (ص١٦٩).**

ئینجا زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە ئەو جەمع و تەوفیقەیان کرد کە دەفەرموێ ئەوانەی کەوا حەدیسی سەحیح دەربارەیان هاتبێ بۆناو ئاگرن ئەوە ئەوانەن لە مەیدانی حەشر و حیسابدا لەو تاقیکردنەوە ئەگەر ئەهلی فەترەش بن قوتاریان نابێ ئەو کاتە فەرمانی الله دەشکێنن دەنێردرێن بۆ جەهەنەم پێغەمبەر ئەوەی پێدراوە و ئەو زانیاریەی پێ گوتراوە لەبەر ئەوە فەرمویەتی بۆناو ئاگرن، وە ئەوانەی تریش ڕزگاریان دەبێ کە حەدیس دیاری نەکردون و فەرمانی الله لە مەیدانی حەشر و حیسابدا جێبەجێ دەکەن، أبو الحسن الأشعري ش ئەوەی لە ئەهلی سونە ڕیوایەت کردوە وە ئیمامی بەیهەقیش لە کتابی الإعتقاد دەفەرموێ ئەو بۆچونە لە هەموو بۆچونەکانی تر سەحیح تر و پەسەندترە.

بەڕێزان و خۆشەویستان با بێینە سەر فەرمودە سەحیحەکان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی دەکا لە موسنەدەکەی لە بوڕەیدە دەفەرموێ بوڕەیدە فەرموی: «خَرَجْنا مَعَ الرسول الله (ﷺ)» دەڵێ ئێمە دەرچوین جارێکیان لەخزمەت پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) «حَتَّى إِذَا كُنَّا بِوَدَّانَ» هەتا گەیشتینە شوێنێک ناوی وەدان بوو «قَالَ: مَكَانَكُمْ حَتَّى آتِيَكُمْ» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): ئێوە لێرە دابنیشن تۆزێک مۆڵەتم بدەن هەتا دێمەوە لاتان و ڕۆیشت «فَانْطَلَقَ، ثُمَّ جَاءَنَا وَهُوَ سَقِيمٌ» پێغەمبەر ڕۆیشت (ﷺ) ماوەیەکی کەمی پێچوو هاتەوە زۆر پێغەمبەر (ﷺ) لاشە و جسم گران دیاربوو بە مەعنای خەمی پێوە دیاربوو «فَقَالَ: إِنِّي أَتَيْتُ قَبْرَ أُمِّ مُحَمَّدٍ» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): من تازە مۆڵەتم لە ئێوە خواست قەبری دایکی موحەمەد کە دایکی منە (ﷺ) لێرەدا بوو چوم سەردانم کرد «فَسَأَلْتُ رَبِّي الشَّفَاعَةَ» لەبەر الله پاڕامەوە تکام قبوڵ بکا لە دایکم خۆشبێ «فَمَنَعَنِيهَا» پێغەمبەر دەفەرموێ خوای رب العالمین منی قەدەغە کرد (ﷺ) «وَإِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ، فَزُورُوهَا[١]» منیش

[١] مسند أحمد (٢٣٠١٧) (٢٢٩٥٨) (٢٣٠٠٣)، صحيح مسلم (٩٧٧) (١٩٧٧)، سنن أبي داود (٣٢٣٥) (٣٦٩٨).

هەتا ئێستا ئێوەم قەدەغە کردبوو بچن سەردانی گۆڕ و قەبرەکان بکەن لەمەودوا بڕۆن سەردانی گۆڕەکان بکەن.

ئەو فەرمودەیان ئیمامی بەیهەقی لە ڕێگایەکی تر بە لەفزێکی تر هێناوێتی ئینجا پێتان دەڵێین کە فەرمودەیەکی سەحیحە لە هەموو ڕێگاکانیەوە، کە ئەلبانی لە (أحكام الجنائز) هێناوێتی، ابن حبان لە سەحیحەکەی، ئیمامی حاکم لە موستەدرەکەکەی، ئیمامی زەهەبیش موافیقە کە ئیمامی حاکم فەرمویەتی سەحیحە.

ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێ: «انتهى النَّبيُّ ﷺ إلى رَسمِ قَبرٍ فجَلَس» ئەو بەو ڕیوایەتە هێناویەتیەوە کە بورەیدە و ئەو سەحابانە فەرمویان پێغەمبەرمان بینی (ﷺ) لەگەڵی لە سەفەردا بوین لە شوێنێک قەبرێک دیاربوو چوە سەر قەبرەکەی و دانیشت «وجَلَس النّاسُ حَولَه» خەڵکیش لە دەورەی دانیشتن «فجَعَل يحَرِّكُ رأسَه كالمخاطِبِ» بینیمان پێغەمبەر (ﷺ) هیچ دەنگی لێوە نەدەهات بەس سەری دەجوڵاند و دەتگوت یەکێک دەیدوێنێ و قسەی لەگەڵ دەکا «ثمَّ بكى» لە پاشان پێغەمبەر لە هاڕژنی گریانیدا و گریا «فاستقبَلَه عُمَرُ» ئیمامی عومەر هاتە خزمەتی و فەرموی «فقال: ما يُبكيكَ يا رَسولَ اللهِ؟» ئەوە چیە دەتگریەنێ ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) «قال: هذا قَبرُ آمِنةَ» فەرموی ئەو گۆڕەی وا لەسەری دانیشتوم هی ئامینەی دایکمە، لە پاشانەکە فەرموی «بنتِ وَهبٍ، استأذَنْتُ رَبِّي في أن أزورَ قَبْرَها فأذِنَ لي» من مۆڵەتم لە الله خواست ئەگەر بێمە ئەو ناوچە سەردانی گۆڕی دایکم بکەم فەرموی بڕۆ سەردان بکە و ڕێگای پێدام «واستأذَنْتُه في الاستِغفارِ لها فأبى» من هەوڵمدا خوای خوای رب العالمين مۆڵەتم بدا داوای لێبوردن بکەم بۆ دایکم بەڵام خوای رب العالمين نەیهێشت «فأبى عَلَيَّ» فەرموی داوای لێبوردنی بۆ مەکە «وأدركَتْني رِقَّتُها فبَكَيتُ» دڵم بە دایکم سوتا کە بۆناو ئاگرە لەبەر ئەوە دەستم بە گریان کرد، بەڕێزان و خۆشەویستان ئینجا

بورەیدە و سەحابەکانی تر دەفەرمون «فما رأينا ساعةً أكثرَ باكيًا من تلك السّاعةِ[١]» هیچ کات و رۆژێک پێغەمبەرمان نەبینی (ﷺ) ئەوەندەی ئەوکاتە بگریە لە هەموو کاتێک زیاتر گریا.

وە لە پاشان لە سەحیحی موسلیم هاتوە ئەبو هورەیرە ڕیوایەت دەکا و دەفەرمویٚ: «زَارَ النَّبِيُّ (ﷺ) قَبْرَ أُمِّهِ، فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ» جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی گۆڕی دایکی کرد، پێغەمبەر گریا و سەحابەکانیش هەموو دەستیان بە گریان کرد «ثم قال: اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي زيارة قبر أم فأذن لي» من مۆڵەتم خواست لە خوای پەروەردگارم سەردانی گۆڕی دایکم بکەم مۆڵەتی دام «وَاسْتَأْذَنْتُهُ فِي الإستغفار لها فلم يأذن لِي» داوام کرد لە خوای خۆم مۆڵەتم بدا داوای لێبوردن بکەم لە دایکم خۆشببێ بەڵام الله مۆڵەتی نەدام «فَزُورُوا الْقُبُورَ، تُذَكِّركم الآخرة[٢]» لەمەودوا ئێوەش سەردانی گۆڕ و قەبرەکان بکەن تا قیامەت و مردنتان بەبیر بێتەوە.

وە بەهەمان شێوە ئیمامی موسلیم لە ئەنەسیشەوە ڕیوایەتی کردوە دەفەرمویٚ: «أَنَّ رَجُلا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ» پیاوێک گوتی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) «أَيْنَ أَبِي؟» باوکی من ئێستا لە کوێیە و مردوە؟ «قَالَ: فِي النَّارِ» فەرموی باوکت بۆناو ئاگرە «فَلَمَّا قَفَّى دَعَاهُ» کە پیاوەکە پشتی لە پێغەمبەر کرد و ڕۆیشت (ﷺ) پێغەمبەر بانگی کردەوە و فەرموی دڵت هیچ نەکا «إِنَّ أَبِي وَأَبَاكَ فِي النَّارِ[٣]» باوکی من و باوکی تۆ هەردوک بۆناو ئاگرن.

هەندێک لە عولەمایان ویستویانە ئەوانەی کە ئەو بۆچونانەیان هەبوە کەوا دەڵێن باوک و دایکی پێغەمبەر (ﷺ) ئەهلی فەترە بونە یان ئەوەیە موسڵمان بونە، ئەوانە دەڵێن ئەو

---

[١] البيهقي، دلائل النبوة (١٨٩/١)، [له متابعة]، أخرجه سفيان في ((حديثه)) (٢٢٠)، والبيهقي في ((دلائل النبوة)) (١٨٩/١) واللفظ له.

[٢] صحيح مسلم (٩٧٦)، سنن أبي داود (٣٢٣٤)، سنن النسائي (٢٠٣٤).

[٣] صحيح مسلم (٢٠٣)، سنن أبي داود (٤٧١٨)، مسند أحمد (١٢١٩٢) (١٣٨٣٤).

حەدیسە سەحیح نیە ئەگەر لە موسلیمیش هاتبێ بەڵام زانایان لەوانە پێشەوا نەوەوی -رحمە الله- کە شەرحی سەحیحی موسلیمی کردوە شێخێکی گەورەی مەزهەبی ئیمامی شافیعیە دەفەرموێ ئەو حەدیسانە ئاوای لێ وەردەگیرێ: (فِيهِ جَوَازُ زِيَارَةِ الْمُشْرِكِينَ فِي الْحَيَاةِ) دروستە سەردانی کەسی موشریک و کافر بکەی ئەگەر کەسەکە موشریکەکە لە ژیاندا بوو (وَقُبُورِهِمْ بَعْدَ الْوَفَاةِ) وە دروستیشە سەردانی گۆڕی کافر و موشریکەکانیش بکەی بۆ پەند و وانە و عیبرەت وەرگرتن لە پاش مردنیان (لِأَنَّهُ إِذَا جَازَتْ زِيَارَتُهُمْ بَعْدَ الْوَفَاةِ فَفِي الْحَيَاةِ أَوْلَى) ئەگەر دروستبێ لەپاش مردنیان بچیە سەر گۆڕیان ئا ئاواش دروستە لە ژیاندا بچیە سەریان (وَفِيهِ النَّهْيُ عَنِ الِاسْتِغْفَارِ لِلْكُفَّارِ) ئەو حەدیسانە ئەوەشی لێوەر دەگیرێ الله نەهی کردوە و قەدەغەی کردوە داوای لێبوردن بکەی لە الله بۆ کافرەکان ئەگەر کەسی نزیکیشت بن، قسەکەی نەوەوی ئەوە دەگەیەنێت -رحمە الله- کە بەوە ڕازیە باوک و دایکی پێغەمبەر (ﷺ) بۆناو ئاگرن (پەنا بە خوای رب العالمین).

ئەوە ئەوە ناگەیەنێ کە هەندێک لەو زانایانەی بۆچونی تریان هەیە گوتویانە ئێمە چۆن دەبێ لەبەر پێغەمبەر دڵمان بێنێ وابڵێین (ﷺ)؟ لەلای خوای رب العالمین فەرمانەکان یەکلاکەرەوەیە ئەو حەدیسانەی پێغەمبەر سەحیحن (ﷺ)، باوکی ئیبراهیمیش کافر بوو الله تعالی بە نەسی ئایەت قەدەغەی ئیبراهیمی کرد کەوا داوای لێبوردنی بۆ بکا، وە خێزانی نوح و لوطیش بۆناو ئاگرن خوای رب العالمین نەیهێشت پیاوەکانیان تکایان بۆ بکەن، کەواتە ئەوە عەدالەت و دادپەروەری خوای رب العالمین ە.

وە لە حەدیسەکەی تردا هی ئەنەس ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: (فيه أن من مات على الكفر فهو في النار) هەر یەکێک لە ئەهلی فەترەبێ و کێ بێ لەسەر کوفر مردبێ بۆ ناو ئاگرە (ولا ينفعه قرابة المقربين) وە ئەگەر خەڵکی نزیکی ئەوان هەرچەندێک باش بێ و پێغەمبەریش بێ سود و کەڵکی بۆ ناگەیەنێ ئەگەر بۆخۆیان ئیماندار نەبن و عەمەلیان

نەبێ (وفيه: أن من مات في الفترة على ما كانت عليه العرب من عبادة الأوثان) دەڵێ لەو فەرموده ئەوەش وەردەگیرێ خەڵکانێک کەوا لە ئەهلی فەترە لەسەر بت پەرستی و شیرک و یان کوفری عەرەبەکان مردون ئا ئەوانە (فهو من أهل النار) ئا ئەوانە بۆناو ئاگرن (وليس في هذا مؤاخذة قبل بلوغ الدعوة) ئا ئەوە ئەوەیان لێ وەرناگیرێ کە بڵێی وەڵاهی دەعوەیان پێ نەگەیشتوە، چونکە (فإن هؤلاء كانت بلغتهم دعوة إبراهيم) ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ بەڵگە لەسەر ئەوانە ئەوەیە قورەیشیەکان باوک و دایکی پێغەمبەریش (ﷺ) کە لەوان بونە خۆ دەعوە و بانگەوازی ئیبراهیم پێغەمبەریان گەیشتبوێ (ﷺ) دەبا کافر نەبن دەبا بت نەپەرستن (وغيره من الأنبياء[١]) وە جگە لە هی دەعوەی ئیبراهیم پێغەمبەر پێغەمبەرەکانی تریشیان گەیشتبوێ.

ئینجا لە پاشان ئیمامی بەیهەقی لە عامری کوڕی سەعد ئەویش لە باوکیەوە ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: «جاء أعرابيٌّ إلى النبيِّ (ﷺ) فقال إنَّ أبي كان يصِلُ الرَّحِمَ وكان وكان» دەڵێ پیاوێکی ئەعرابی هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی باوکی من سیلەی ڕەحمی جێبەجێ دەکرد ئەوەندە باشبوو ئاوای دەکرد (فأينَ هو؟) ئێستا ئەو دەبێ لەکوێ بێ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموی (في النَّارِ) بۆناو ئاگرە باوکت (قال: فكأن الأعرابيُّ وجَدَ من ذلك) ئەعرابیەکە دڵی شکا و کە ئەنەهو قسەیەکی قورس بوو پێی گوترا، ئینجا پێغەمبەر فەرموی (فقال: يا رسولَ اللهِ فأين أبوكَ؟ قال: حيثما مررتَ بقبرِ كافرٍ فبشِّرْهُ بالنارِ[٢]» ئەعرابیەکە لە وەڵامیدا گوتی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەی باوکی تۆ لەکوێیە مادەم هی من ئەوەندە باشیش بوە و بۆناو ئاگرە؟ پێغەمبەریش لە وەڵامیدا فەرموی بەلای هەر گۆڕێکدا ڕۆیشتی ئەگەر کافر بوو مزگێنی پێ بدە بە ئاگر، مەعنای باوکی منیش بۆناو ئاگرە وەکو زانایانی ئەو

[١] شرح صحيح مسلم (٧٩/٣).

[٢] إسناده صحيح على شرط الشيخين، وأعله بعضهم بالإرسال، أخرجه البزار (١٠٨٩) واللفظ له، والطبراني (١٤٥/١) (٣٢٧)، وابن السني في ((عمل اليوم والليلة)) (٥٩٥).

فەرموده شەرحیان کردوه و دەفەرمون، ئینجا ئەو ئەعرابیه دەڵێ من موسڵمان بوم بارێکی زۆر قورسم کەوتە سەر کە پەککەوتە بوو بوم بەلای هەر قەبرێکدا دەبا بچم ئەمری پێغەمبەر بوو (ﷺ) بمزانیبا کافره دەبا بچمە سەرینگانی گۆڕەکەی و پێی بڵێم موژدەت لێبێ بە ئاگری جەهەنەم ئەو تەکلیفەم دەڵێ خستە سەرە خۆم.

ئینجا لە پاشان بزانن ابن کثیر چ دەفەرموێ، دەفەرموێ (وَالْمَقْصُودُ أَنَّ عَبْدَ الْمُطَّلِبِ مَاتَ عَلَى مَا كَانَ عَلَيْهِ مِنْ دِينِ الْجَاهِلِيَّةِ) ئیمامی ابن کثیر دەفەرموێ لەسەر دینی نەفامەتی و کافرایەتی مرد (خِلَافًا لِفِرْقَةِ الشِّيعَةِ فِيهِ) ئەو بۆچونانەی زۆر برەو بەوە دەدەن کە عەبدولموتەڵیب و باوک و باپیری پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بەهەشتن ئەوە بە پێچەوانەی بۆچونی ئەوانە ئەوە بۆچونی شیعەکانە (وَفِي ابْنِهِ أَبِي طَالِبٍ[1]) وە ئەبو تاڵیبی کوڕی عبدولموتەڵیبیش بۆناو ئاگرە هەروەکو دەڵێ بەدرێژی لە سیرەکەی خۆم ابن کثیر دەفەرموێ لە وەفاتی ئەبو تاڵیب بەڵگەکان دەهێنمەوە و بەدرێژتر باسی دەکەم.

لە کۆتایی ئەو توێژینەوە و ئەو قسانە دەربارەی ئەهلی فەترە و باوک و دایکی پێغەمبەر (ﷺ) لە (دَلَائِلِ النُّبُوَّةِ) وتەکەی ئیمامی بەیهەقیتان بۆ دەهێنینەوە بەوەندە کیفایەت دەهێنین و پێیان وایە بەسە کە ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێ: (وَكَيْفَ لَا يَكُونُ أَبَوَاهُ وَجَدُّهُ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ بِهَذِهِ الصِّفَةِ فِي الْآخِرَةِ وَقَدْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْوَثَنَ) ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێ چۆن باوک و باپیرەی پێغەمبەر (ﷺ) لە قیامەت وایان بەسەر نایە و ناچنە ناو ئاگر لەگەڵ ئەوەی لەگەڵ قەوم و گەلەکەی خۆیان بتیان دەپەرست (حَتَّى مَاتُوا، وَلَمْ يَدِينُوا دِينَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلَامُ) خۆ هەتا مردیشن هیچ بەڵگە و ڕیوایەتێک نیە هاتبنە سەر دینی عیسای کوڕی مەریەمیش (ﷺ) (وَكُفْرُهُمْ لَا يَقْدَحُ فِي نَسَبِهِ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) جا ئەگەر بڵێین ئەوان کافر بونە ئەوە هیچ کەم و کورتیەک ناگەیەنێتە خانەوادە و نەسەبی

[1] البداية والنهاية، ابن كثير، ج: ٢ الصفحة: ٣٤٢.

پێغەمبەر (ﷺ) (لِأَنَّ أَنْكِحَةَ الْكُفَّارِ صَحِيحَةٌ) چونكە ژن و مێردایەتی و هاوسەرگیرایەتی بەشێك لە كافرەكان ڕاست و دروست بوە (وەكو دوێنێش باسمان كرد) (أَلَا تَرَاهُمْ يُسْلِمُونَ مَعَ زَوْجَاتِهِمْ) ئایە تۆ نایان بینی ئەوان موسڵمان دەبن و خێزانیشیان كە موسڵمان دەبن (فَلَا يَلْزَمُهُمْ تَجْدِيدُ الْعَقْدِ) ئەوە عەقدی نیكاح و مارە كردنەوەیان هی كافرەكان كە موسڵمان دەبون پێویستی نەبوو پێغەمبەر نەیدەفەرموو (ﷺ) وەرە لێكتان مارە بكەینەوە مادەم بەو نیكاحە سەحیحەی سەردەمی كافرایەتی كە لەگەڵ ئیسلام تێكی دەكردەوە نیكاح و مارە بڕینیان هەبوبا (وَلَا مُفَارَقَتُهُنَّ) وە پێغەمبەر لێكی جیا نەدەكردنەوە (إِذَا كَانَ مِثْلُهُ يَجُوزُ فِي الْإِسْلَامِ[1]) چونكە نمونەی ئەو نیكاحەی ئەوان كافران بەشێك كە دەیانكرد لە ئیسلامیشدا هەبوو.

ئینجا ابن كثیر دەفەرموێ: (وَإِخْبَارُهُ (ﷺ) عَنْ أَبَوَيْهِ وَجَدِّهِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ بِأَنَّهُمْ مِنْ أَهْلِ النَّارِ) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودە سەحیحەكان كە هاتوە باپیری و باوكی بۆناو ئاگرن (لَا يُنَافِي الْحَدِيثَ الْوَارِدَ عَنْهُ مِنْ طُرُقٍ مُتَعَدِّدَةٍ أَنَّ أَهْلَ الْفَتْرَةِ وَالْأَطْفَالَ وَالْمَجَانِينَ وَالصُّمَّ يُمْتَحَنُونَ فِي الْعَرَصَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ) دەڵێ ئەوە ئەوە هەڵناوەشێنێتەوە كە ماوەیەك پێش ئێستا لە سەرەتای وتارەكە باسمان كرد ئەوانەی ئەهلی فەترەن یان منداڵن بە منداڵی دەمرن یان شێتن یان ئەوانەی تەواو كەڕن لە ڕیواتێكی تر لە حەدیسەكە هاتوە و گوێبیستی هیچ نابن ئا ئەوانە ئینتیحان دەكرێن لە گۆڕەپانی قیامەتدا (كَمَا بَسَطْنَاهُ سَنَدًا وَمَتْنًا فِي تَفْسِيرِنَا عِنْدَ قَوْلِهِ تَعَالَى ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ [الإسراء: ١٥]) دەڵێ لەوێ بە سەنەد و بە ڕیوایەتەكان بە دور و درێژی لە تەفسیری ئایەتی [الإسراء: ١٥] هێناومەتەوە و باسم لێكردوە (فَيَكُونُ مِنْهُمْ مَنْ يُجِيبُ) هەیانە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا فەرمانەكەی الله جێبەجێ دەكەن بەناو ئاگرەكەدا دەڕۆن ئەوانە بۆ بەهەشتن (وَمِنْهُمْ مَنْ لَا يُجِيبُ) هەشیانە

[1] كتاب صحيح السيرة النبوية للألباني
[ناصر الدين الألباني] ص: ٢٨.

هیدایەتی نەبوە و فەرمانەکە جێبەجێ ناکا دەرِسێتەوە ئەوەشیان بۆناو جەهەنەمە (فَيَكُونُ هَؤُلَاءِ مِنْ جُمْلَةِ مَنْ لَا يُجِيبُ) جا ئەوانەی پێغەمبەریش هی باوک و باپیرەی خۆی کە حەدیسەکەی فەرموە دەربارەیان دەبێ لەوانیان حیساب بکەین ابن کثیر فەرموی کە وەڵامی الله نادەنەوە لە مەیدانی حەشر و حیسابدا بەناو ئاگرەکەدا برِۆن و رِزگاریان ببێ (فَلَا مُنَافَاةَ[١]) کەواتە بەڵگەکان تێک ناگیرێن و یەکتر هەڵناوەشێننەوە.

جا ئەلبانیش -رحمه الله- دەفەرموێ باشترین جەمع و تەوفیق و وتەکان وتەکەی ابن کەسیرە -رحمه الله- کە لە سیرەکەی خۆیدا وای فەرموو ئێمە بۆمان خوێندنەوە دەڵێ ئەوە ئەوە دەگەیەنێت جەمع و تەوفیق لە بەینی بەڵگەکان.

## لەدایکبونی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پێگەیشتنی

دیارە ئیختیلاف و جیاوازی لەنێوان زانایانی مێژونوس و سیرە نوس هەیە کە ئایە پێغەمبەر (ﷺ) لە چ مێژویەک لە دایکبوە، هەر لەبەر ئەوەشە ئەو زانایانەی دەفەرمون ئاهەنگگێرِانی لە دایکبونی پێغەمبەر (ﷺ) کە پێیان بیدعەتە ئەو کۆمەڵە زانایە دەفەرمون خەڵک کۆبێتەوە دەڵێن دیاریش نیە سەدا سەد لە چ رِۆژێک لە دایک بوە چونکە ئیختیلاف و جیاوازی زۆر هەیە ئەوەش دەکەنە یەکێک لە بەڵگەکان، هەندێک لە زانایان دەڵێن لە دوی (ربيع الأول) پێغەمبەر لە دایک بوە (ﷺ)، وە هەندێکیان دەڵێن لە هەشتی (ربيع الأول) لە دایک بوە، وە هەندێکی تر دەفەرمون لە دەی (ربيع الأول) لە دایک بوە، بەڵام زۆرینەی زانایانی سیرەنوس دەفەرمون لە دوازدەی (ربيع الأول) پێغەمبەر (ﷺ) لەدایک بوە، دەفەرمون لە چ شوێنێک لە دایک بوە؟ لەو شوێنەی ئەوکات پێی دەگوترا (دار أبي طالب أو شعب بني هاشم) لە دۆڵی بەنو هاشم لە ماڵی أبو طالب کە (دار أبي طالب)یان پێدەگوت لەوێ لە دایک بوو، کە لە سەردەمی حەجاجی کورِی ئەبو یوسفی

[١] كتاب البداية والنهاية - ت التركي
[ابن كثير] ج: ٣ ص: ٤٢٩.

سەقەفی بەناوی براکەی ئەو دۆڵ و شوێنە ناوی دەرکرد، بەناوی موحەمەدی کوڕی یوسفی برای حەجاجی کوڕی یوسف، بەڵام ئێستا ئەو شوێنە ئەوەی چوبێتە حەجی ماڵی خوای رب العالمین کە پێغەمبەری لێ لە دایکبوە (ﷺ) پێی دەڵێن مەکتەبەی عامە کە لەلای کەعبەوە دیارە ئەوەی سەرنجی دابێ بینایەکی لەسەرە و مەکتەبە عامەیە ئا لەوێ پێغەمبەر (ﷺ) لەدایکبوو، وە ئەوەی باوەشی بۆ پێغەمبەر کردەوە (ﷺ) لە باوەشی خۆی بەخێوی کردبوو یەک لە ئافرەتەکان ئوم ئەیمەن بوە، ئوم ئەیمەن کەوا ناوی بەرەکەی حەبەشی بوە کەوا یەکێک بوە لە جاریەکانی عەبدوڵای باوکی پێغەمبەر (ﷺ)، وە یەکەم کەس کە شیری دابێتە پێغەمبەر (ﷺ) ثوەیبەی جاریەی ئەبو لەهەبی مامی پێغەمبەر بوو (ﷺ)، وە لە پاشان وا باوبوو لەناو عەرەبەکان ئەوکات ئەگەر منداڵیان بوبا و لە ئاوەدانی و شارەکان بان دەیانگوت پێویستە منداڵەکانمان ماوەیەک بنێرینە نێوان خەڵکەکانی لە بادیە و لە دەشتن بۆ ئەوەی لەوێدا باشتر بەخێو بکرێ و زمانێکی چاکتر فێرببێ و وە مێشکی کۆڵ نەبێ، واتە لەبەر ئەو سەبەب و هۆکارانە بوو زانایان دەفەرمون منداڵەکانیان دەنارده دەشت لای ئافرەتێک لەوێ بەخێوی بکەن لەبەر ئەوەی هەتا زمانی ڕاستی عەرەبی و فەصیح تەواو و فێر بن دەیانگوت لە شارەکان فەصاحەت ئەوەندە نەماوە وە بۆ ئەوەی مێشکیان تیژ بێت و جەو و هەوایەکی خۆش و چاک هەڵمژن لەو پێناوە بوو پێغەمبەریش (ﷺ) باپیرەی عبد المطلب بڕیاریدا کەوا ڕەوانەی بکات بۆ بەنی سەعد، یەک لە ئافرەتەکانی بەنو سەعد بەنو سەعدی کوڕی بەکر کەوا ناوی حەلیمەی سەعدیە بوو پێغەمبەری بە نسیب بوو (ﷺ) لەگەڵ خۆی برد و بوە شیردەری دوەمی پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای ثوەیبیە ئەلەوێ شیری دایە و پێغەمبەری پێگەیاند (ﷺ).

پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ڕۆژێک لە ڕۆژەکان دەچێ گەمە دەکا لەگەڵ منداڵەکانی بەنو سەعد یەکێک لە برا شیریەکانی خۆی لەگەڵدا دەبێ، ئەویش کە دەگەڕێتەوە ماڵەوە بەو

هەواڵەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوداوی لەتکردنی سینگی یەکەمجاری ڕویدا کەوا (شق صدر)ی پێغەمبەر (ﷺ) سینگ لەتکردنی ئەوە ڕوداوێکی ڕون و ئاشکرایە ئەوانەی بەربەرەکانێی ئەو ڕیوایەتە دەکەن لە زانایان بەڵگەیان بە دەستەوە نیە چونکە لە سەحیحی موسلیم و وە جارێکیشیان لە سەحیحی بوخاری و موسلیم ئەو ڕوداوانە تۆمار بوە بەڵام لێرە ئیختیلاف و جیاوازی دروستبوە لەنێوان زاناکان ئایە چەند جار پێغەمبەر (ﷺ) سینگی لەتکراوە و دڵی هاتوەتە دەر و شۆراوەتەوە لەناو تەشتێکی زێڕین؟ کە ئێستا دەیگێڕینەوە بۆتان لە ڕیوایەتی سەحیحی موسلیمدا هاتوە، بۆچونی پەسەند و ڕاجیح کە ابن کثیر و جگە لەو دەفەرمون دوجاران ئەوە ڕویداوە، جارێکیان پێغەمبەر منداڵبوو (ﷺ) لە بەنو سەعد کە ئەنەس دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «أَتَاهُ جِبْرِيلُ (ﷺ)، وَهُوَ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ، فَأَخَذَهُ، فَصَرَعَهُ، فَشَقَّ عَنْ قَلْبِهِ» دەڵێ پێغەمبەر گێڕایەوە (ﷺ) فەرموی من گەمەم دەکرد لەگەڵ منداڵەکانی بەنو سەعد کاتێک جوبرائیل هات لە ڕیوایەتێک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ دوو باڵندەی وەکو بازی سپی بون لەسەر سەری من بون هاتن دابەزین و یەکیان جوبرائیل بوو دەفەرموێ سینگیان شەق و لەتکردم ئینجا لە پاشان دڵیان دەرهێنام «فَاسْتَخْرَجَ الْقَلْبَ، فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ عَلَقَةً. فَقَالَ» جوبرائیل پارچەیەکی دەرهێنا لەناو دڵمدا و فەرموی «هَذَا حَظُّ الشَّيْطَانِ مِنْكَ» ئەوە بەشی شەیتانە لە دڵتدا هەبوە ئەوە دەرم هێنا ئەی موحەمەد (ﷺ) «ثُمَّ غَسَلَهُ فِي طَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ بِمَاءِ زَمْزَمَ» دەڵێ لە پاشان دڵی لەناو جام و تەشتێکی زێڕیندا شوشتم بە ئاوی زمزم، دەڵێ لە پاشان «ثُمَّ لَأَمَهُ» لە پاشان دڵی لە شوێنی خۆی دانام و برینەکەی دوریەوە جوبرائیل، لە پاشان دەفەرموێ «ثُمَّ أَعَادَهُ فِي مَكَانِهِ، وَجَاءَ الْغِلْمَانُ» ئینجا گەڕاندیەوە لای خۆی و تەواو دڵم جێگیر بووەوە و ئینجا منداڵەکان ڕایانکرد «يَسْعَوْنَ إِلَى أُمِّهِ» بۆ دایکە شیر دەرەکەی حەلیمە گوتیان ئەی حەلیمە ئا ئەو برایەمان کە قوڕەیشیە لەگەڵماندا بوو ئێستا هاتن خەڵکێک لە عەرزیاندا و ویستیان بیکوژن حەلیمەش بە دڵە ڕاوکێوە ڕایکردە دەرەوە لەگەڵیان و پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ)

که گوتیان «إِنَّ مُحَمَّدًا قَدْ قُتِلَ» کوڕە قوڕەیشیەکەتیان ئەی حەلیمە کوشت دەڵێ ئەویش ڕایکرد و «فَاسْتَقْبَلُوهُ، وَهُوَ مُنْتَقِعُ اللَّوْنِ» هاتن پێغەمبەریان بینی (ﷺ) ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو گۆڕابوو ڕەنگی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان گوت ئەوە چی ڕویداوە؟ و فەرموی هاتن منیان لە زەویدا و سنگیان لەتکردم و دڵیان دەرهێنام و دایانناوە شوێنی خۆی ئەنەسی کوڕی مالیک دەفەرموێ سوێند بە الله «وَقَدْ كُنْتُ أَرَى أَثَرَ ذَلِكَ الْمِخْيَطِ فِي صَدْرِهِ[١]» دەفەرموێ من لە مەدینە چەند جارێک سینگی پێغەمبەرم بینی (ﷺ) جێگای دورینەوەکانی جوبڕائیلی لێ دیاربوو کەواتە شتێکی حەقیقی و ڕاست بوە خوای رب العالمین بۆ پێغەمبەر کردویەتی (ﷺ).

جا جاری دوەمیش پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئەوەی بچێتە (ئیسرِاء و میعڕاج) زانایان دەفەرمون بۆ ئەوەی ئامادە بێ بۆ ئەو سەفەرە دور و درێژە بۆ بڕینی نێوان ئاسمانەکان بۆ داخڵ بون و بەشداربونی لەگەڵ ملأ الأعلی و مەلائیکەتەکان ئەوە هێز و قوەت و توانای دەوێ لە توانای ئینسانی عادەتی نیە لەبەر ئەوە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «وكنت في مكة» دەفەرموێ من شەوێکیان لە مەککە بوم پێش ئەوەی بچمە (ئیسرِاء و میعڕاج)، دەفەرموێ «فشق سقف بيتي[٢]» کەلێنێک کەوتە سەقفیماڵەکەم سەربانەکەی جوبڕائیلی لێ دابەزی هات سینگی لەت کردم دڵی دەرهێنام لە تەشتێک و جامێکی زێڕین بە ئاوی زمزم شۆردی ئینجا دەڵێ سینگ و دڵمی پڕ کرد لە حیکمەت و ئیمان ئینجا دوریەوە و ئینجا بوڕاق هات و سەفەری (ئیسرِاء و میعڕاج)م کرد.

کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) لە بۆچونی پەسەند و ڕاجیح دوجار سینگی شەق و لەتکراوە و دڵی شۆراوەتەوە و ئینجا چوەتە (ئیسرِاء و میعڕاج) لە جاری دوەمەکەیدا، لە پاشان لەناو بەنی سەعددا پێغەمبەر (ﷺ) دایکی حلیمة السعدیة دڵی پێی سوتا کە سینگی لەتکراوە

[١] **صحيح مسلم** (١٦٢)، **سنن النسائي** (٤٥٢)، **مسند أحمد** (١٢٢٢١) (١٢٥٠٦) (١٤٠٦٩).
[٢] **صحيح البخاري** (٣٤٩) (١٦٣٦) (٣٣٤٢)، **صحيح مسلم** (١٦٢) (١٦٣)، **سنن الترمذي** (٢١٣) (٣١٥٧).

دایکیشی لەلای نیە، لەگەڵ خۆی هێنای و بارگەی تێکنا و هێنایەوە لای دایکی گوتی حاڵێکی وا بەسەر کوڕەکەتان هاتوە و دایکیشی بۆ دڵخۆشکردنی پێغەمبەر (ﷺ) مێژوو نوسان دەفەرمون وەگەڵ خۆی خستوو گوتی ڕۆڵەکەم ئەی موحەمەد با بچین بەرەو شاری یەثریب واتە مەدینەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی ئێستا گوتی با بچین سەردانی ماڵە خاڵەکانی باوکت بکەین لەوێ بۆ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ترس و ناخۆشی و زەحمەتیەی بۆی توش بوو بوو بەوەی سینگی لەتکرابوو هیچی لەسەر نەمێنێ.

ئامینە لەگەڵی چوو پێغەمبەری لەگەڵدابوو (ﷺ) هەرکە چون گەشت و سەفەرەکەی خۆیانکرد (گیانمان فیدای پێغەمبەربێ (ﷺ)) بە دڵخۆشی چوو دایکی لەگەڵیدا بوو بەڵام لە گەڕانەوەی ئەو منداڵە لە تەمەنی شەشساڵندایە لەسەر بۆچونی پەسەند و ڕاجیح، منداڵی شەش ساڵانە زۆر پێویستی بە دایکیەتی کە حەنونیەتی بداتێ و باوەشی بۆ بکاتەوە فرمێسکی بسڕێتەوە بەڵام ئەمر و فەرمانی خوای رب العالمين وایە لە گەڕانەوەی بەرەو مەککە لە نێوان ئەو ئاقارەدا لە ئەبواء کە شوێنێکە خوای رب العالمين فەرمان دەکا (ملك الموت) بڕۆ دەبێ موحەمەدە خۆشەویستەکەم (ﷺ) بێدایک بمێنێتەوە و من خۆم پەروەردەی بکەم و بەخێوی بکەم، لەوێوە دایکی وەفات دەکا ئامینە خاتون و هەر لە ئەبواء دەیشارنەوە.

فرمێسکەکانمان بۆ پێغەمبەرە (ﷺ) لە تەمەنی شەش ساڵیدا بێ دایک و باوک مایەوە هیچ کەسێک نەبوو فرمێسکی بسڕێتەوە و لە باوەشی خۆی بگرێ، ئەوە ئەمر و فەرمانی خوای رب العالمين بوو هەتا هەموو خەڵک بزانێ ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) دایک و باوکیشی نەبوە پەروەردەی بکا خوای رب العالمين بەسیبوە پەروەردەی کردوە و ئەخلاق و ڕەوشتی زۆر جوانی وەرگرتوە، لەبەر ئەوە مەولەوی شاعیر دەفەرموێ:

(هەتیو بە ئەدەب عومی عەلامە

لەمە موعجبزتر موعجیزە کامە)

دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) بێ دایک و باوک گەورەبوو بێ باوک بوو هەتیو بوو وە لەگەڵ ئەوەدا لەوپەڕی ئەخلاق و ڕەوشت بوو چونکە زۆربەی ئەو منداڵانەی باوکیان نامێنێ بێناز دەبن پەروەردەیان کەم دەبێتەوە و دایکیان ڕەنگە نەتوانێ پەروەردەی بکا ئەگەر دایکی نەشمێنێ خراپتر، ئینجا لەگەڵ ئەوەدا پێغەمبەر (ﷺ) مەولەوی دەفەرموێ (هەتیو بە ئەدەب) هەتیو بوو پێغەمبەر (ﷺ) بەس ئەدەب و ئەخلاقێکی زۆر جوانی هەبوو، لە پاشان دەفەرموێ (عومی عەلامە) پێغەمبەر (ﷺ) دەستی نوسینی نەبوو نەخوێندەوار بوو بەڵام لەوپەڕی زانایی زانا بوو هیچ زانایەک نەیدەگەیشتێ و خۆی لێنەدەدا، ئینجا دەفەرموێ (لەمە موعجبزتر موعجیزە کامە) لەو موعجیزە دەبێ چ شتێکی تر موعجیزەتربێ خوای رب العالمین بە هەتیوی ئەوەندە بە ئەخلاق و بە ڕەوشت و بە ئەدەبی کرد وە لەگەڵ ئەوەدا بە نەخوێندەواری ئەوەندە زانای کرد.

بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) کێ هات بوە دایکی و لە باوەشی خۆینا؟ ئوم ئەیمەن، ئوم ئەیمەن کە جاریەکەی باوکی بوو کە لە باوکی ئەیمەن ئەیمەنی هەبوو لە پاشان باوکی ئەیمەن کە نەمابوو لەکۆتایی شویکرد بە زەید و لەویش ئوسامەی بوو واتە ئوسامە و ئەیمەن برا بون لە دایکەوە، ئەو ئوم ئەیمەنە جارێکیان دایکە عائیشە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ چونکە پێغەمبەری بەخێو کردبوو (ﷺ) شەرمێکی ئاوای نەبوو وەکو دایکێک تەماشای پێغەمبەری دەکرد (ﷺ) دەفەرموێ جارێکیان ئوم ئەیمەن لە ماڵمان بوو، پێغەمبەر فەرموی ئاوم بۆ بێنە عائیشە، دەڵێ منیش ئاوم بۆ هێنا ئەویش ئاوەکەی خواردەوە، ئوم ئەیمەنیش دیاربو توێنی بوو فەرموی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) موحەمەد هەستە تۆش ئاو بۆ من بێنە، عائیشە دەڵێ ڕوی خۆمم ڕناندەوە وەکو ئافرەت دەیکەن پێغەمبەر ئاگای لێ نەبێ (ﷺ) ئای ئای ئوم ئەیمەن ئەوە چی دەڵێی ئەوە پێغەمبەری اللەیە؟ دەڵێ ئوم ئەیمەن ڕوی

تێکردم و فەرموی عائیشە تۆ هەروا پێغەمبەرت بینیوە بەس من لە منداڵی دەیەها جار لە باوەشی خۆمم گرتوە و کرِم کردوەتەوە ئەگەر ئاوی ویستبێ و تینو بوبێ بۆم هێناوە چ قەیدی دەکا ئەگەر ئێستا ئەویش هەڵبستێتەوە بۆ دایکەکەی کە باوەشی بۆ کردبۆوە بە منداڵی ئاوی بۆ بێنێ؟ پێغەمبەر فەرموی ڕاست دەکا ئوم ئەیمەن ئەی عائیشە من دەچم ئاو بۆ دایکە ئوم ئەیمەن دەهێنم و با بیخواتەوە، ئاوی بۆ هێنا و خواردیەوە.

لە پاشان ئوم ئەیمەن هێنایەوە لە باوەشی خۆی گرت و لە ماڵی (عبد المطلب)ی باپیری پێغەمبەر ژیا (ﷺ) تا تەمەنی گەیشتە هەشت ساڵان، خوای رب العالمین جارێکی تر پێغەمبەری تاقیکردەوە، لە تەمەنی هەشت ساڵیدا فەرمانیدا بە (ملك الموت) برِۆ ئەو پشت و پەنایەی دونیا کە (عبد المطلب)ی باپیرێتی لێی بستێنەوە (عبد المطلب)یش دەبێ بمرێ و وەفات بکا، پێغەمبەر (ﷺ) لە تەمەنی هەشت ساڵیدا بەبێ باپیرەش مایەوە، ئەمجارە برای باوکی حەقی کە لە دایک و باوک برابوو لەگەڵ عەبدوڵا ئەبو تاڵیب باوکی ئیمامی عەلی بەخۆیەوە گرت و پێغەمبەری بەخێو کرد (ﷺ) زۆر لەگەڵی بە بەزەیی بوو وە زۆریشی خۆشدەویست بەڵام کەم دەرامەت بوو ئەبو تاڵیب پارە و پولێکی ئەوتۆی نەبو، پێغەمبەریش (ﷺ) هەر لەو منداڵیەیدا پیاوێکی بە عیزەت بوو حەزی لێبوو بەرهەمی دەستی خۆی بخوا شەرمەزاری کەس نەبێ لەبەر ئەوە چوو بۆ بازاڕەکان دەستی کرد بە ئیش و کار، لێی دەپرسن ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) تۆ چ ئیش و کارێکت دەکرد دەفەرموێ «ما بَعَثَ اللَّهُ نَبِيًّا إلّا رَعى الغَنَمَ» هیچ پێغەمبەرێک نیە (علیهم الصلاة والسلام) ئیلا شوانایەتی مەڕی کردوە گوتیان تۆش ئەی پێغەمبەر (ﷺ) چ ئیشێکت دەکرد؟ فەرموی منیش سوێند بە الله «وأنا رعيتها لأهل مكة بالقراريط[1]» دەڵێ منیش شوێنێک کە ناوی قەڕاریطە مێگەلە مەڕی مەککەیەکان شوانایەتیم دەکرد و لەوێ دەم لەوەڕاند.

[1] ابن عدي، الكامل في الضعفاء (٦/٢١٦)، يعرف بعمرو بن يحيى بن سعيد، أخرجه البخاري (٢٢٦٢) باختلاف يسير.

پێغەمبەر (ﷺ) هێواش هێواش نەش و نمایکرد ئەو بێ باوک و دایکە لەوپەڕی ئەخلاق و ڕەوشتدا ناسرا بە ڕاستگۆ هەر لە منداڵیەوە ناسرا بە ئەمین، لەبەر ئەوە بوو خەدیجە خانی کچی خوەیلید کە تاجیرەیەکی یەکجار گەورە بوو لە شاری مەککە شۆڕە ژن بوو ئافرەتێک بوو بە پەنجە ئاماژەی بۆ دەکرا لە ئەخلاق و ڕەوشت وە لە جوانی و ڕێک و پێکی لە پارە هەبون و دەوڵەمەندی چەندین پیاوی بەتوانای ناوداری ئەو سەردەم چونە داخوازی بەڵام شوی نەکردەوە لەپاش ئەوەی دوجار شوی کردبوو بەڵام هەر خەدیجە ناردی بەدوای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی لەتۆ بازرگانێکی ئەمین و ڕاستگۆتر نادۆزمەوە ئەوەندە پارە و پولەم هەیە لەگەڵ مەیسەرەی یەک لە خزمەتکارەکانم پێویستە بچیتە شام و بازرگانیم بۆ بکەی، پێغەمبەریش چوو هاتەوە (ﷺ) خێر و بەرەکەتێکی زۆری لەگەڵ خۆی هێناوە پارەیەکی زۆری بۆ خەدیجە هێناوە و دڵی داوە خەدیجە لێی وەرگرت و قبوڵی بوو، هەرکە لە مەیسەرەشی پرسی چیت بینی لەو پیاوە لە ڕێگادا؟ گوتی وەڵاهی ئەخلاق و ڕەوشتەکەی زۆر بەرزبوو وە زۆریش جوان هەڵسوکەوتی دەکرد ئەمین بوو ڕاستگۆش بوو ئامانەتەکەی زۆر بە ساغی گەیاندە جێگای خۆی، لەبەر ئەوە خەدیجە ئارەزوی جولا بەلای ئەوەدا باشترین پیاو ئەو پیاوەیە با لە خۆیشی بچوکتربێ با بێ باوک و دایکیش بێ با کەم دەرامەتیش بێ شوی پێبکا لەجیاتی پێغەمبەر بچێتە داخوازی (ﷺ) خەدیجە بانگی نەفیسەی کرد کە دەستە خوشکی بوو ئافرەتێکی قسە زان بوو فەرموی وەڵاهی بە دڵمدا هاتوە نەفیسە ئەگەر بچی لە لایەک بە موحەمەد بڵێی (ﷺ) بڵێ ئەو خەدیجە خەڵک زۆر هاتوەتە داخوازی و ڕەتی کردونەتەوە پیاوی زۆر مەعقول و دیار بەڵام حەز دەکا موحەمەد بێتە داخوازی و لێی قبوڵ بکات ئەویش شوی پێدەکا، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) ڕازیبوو بە قسەی نەفیسە چوو هەواڵیدا بە مامەکانی، مامەکانیش زۆر دڵیان خۆشبوو لەگەڵی چون بۆ داخوازی خەدیجە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام پێغەمبەر نە باوکی و نە دایکی لە داخوازیەکەی نەبوو ئەوە هەر بۆ ئەوەیە کە بسەلمێنرێ ئەگەر پیاو کە خۆی پیاوبێ ڕێگای

الله بگرێتەبەر و پشتیوانی الله بە دەست بێنێ کەسی تری لە دونیا هەندێک جار پێویست نیە و لەوپەڕی بەرزی بەرز دەبێتەوە، بەڵێ پێغەمبەر چوو (ﷺ) لە مامی خەدیجە خەدیجەیان داخوازیکرد و ئەویش پێی بەخشین و خەدیجەی مارە کرد و دایکە خەدیجە -رضي الله عنها- بوە یەکەم خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) وە بوە ئەو ئافرەتەی کەوا پشتیوانی پێغەمبەر بوو (ﷺ) بوە یەکەم دایکی ئیماندااران -رضي الله عنها-.

دایکە خەدیجە ئەو ئافرەتە بەرز و بەڕێزە بوو کە جارێکیان جوبڕائیل هات فەرموی ئەی موحەمەد (ﷺ) لە اللهوە هاتوم و ڕایدەگەیەنم برۆ ئەگەر چویەوە ماڵ بە خەدیجە بڵێ خوای رب العالمین سەلامی هەیە بۆ خەدیجە، خەدیجە ئەو ئافرەتە بەرز و بەڕێزەیە کە دایکە عائیشە دەفەرموێ جارێکیان موحەمەد (ﷺ) هەر دەیگوت خەدیجە خەدیجە یان دەستە خوشکی خەدیجە ها ئەوە ببەن دیارییە بۆ دەستە خوشکی خەدیجە خەدیجە خۆشی دەویست ئەوەیان خوشکی خەدیجەیە هاتوە و ڕێزی لێبگرن، دەڵێ منیش غیرەی ئافرەتایەتیم هەستا گوتم ئەوە چیە ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) هەر دەڵێی خەدیجە خەدیجە الله بۆی قەرەبوو کردیتەوە لەجێی ئەو پیرەژنە بە ئافرەتێکی گەنج و لاو و ناسک، دەڵێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) عائیشە تۆ چیت دەوێ کەسێک ئەگەر خوای رب العالمین ڕزق و نسیبی وا کردبێ خۆشەویستیەکەی لە دڵی پێغەمبەری الله (ﷺ) دانابێ، فەرموی کەس قەرەبوی خەدیجەم بۆ ناکاتەوە لەو کاتەی دەستم کرد بە بانگەوازی دەهاتمەوە ماڵەوە خەدیجە خاتون دڵی دەدامەوە ئەو کاتەی کەسم نەبو پشتگیری کارم بێ و ئیمانم پێ بێنێ بۆ یەکەمجارم بوو هاتمەوە خەدیجە دەستبەجێ شاهێدومانی هێنا و ئیمانی پێم هێنا، خەدیجە منداڵەکانی بۆ بەخێو دەکردم، خەدیجە دڵی خۆش دەکردم، خەدیجە پشتگیری کاری دەکردم، کێ هەیە و کێ هەیە... عائیشە دەفەرموێ دڵم وای لێهات خوایە یا ڕەبی هەر بێدەنگ بێ پێغەمبەر (ﷺ) بریا برینەکەی دڵیم نەکولاندبایەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) لەو تەمەنەی نەش و نما کردنی بوو کە بە ڕاستگۆ ناسرابوو خەدیجەش زۆر دڵی خۆشدەکرد و لەگەڵیدا بوو، هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) تەنها ئیبراهیم نەبێ لە خەدیجە پەیدابون وەکو ئاماژەمان بۆ کرد لە سەرەتا و ڕابردودا، ئینجا خەدیجە پشتگیری کارێکی تەواوی پێغەمبەر بوو (ﷺ) کە ئەو ماڵە ناوبانگی زۆریان دەرکرد ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) لەناو قوڕەیشیەکان، لە سوڵح و مەسڵەحەتەکان وای لێهات پێغەمبەر بەشداری پێدەکرا (ﷺ)، ئەوەبوو کاتێک کەوا (کعبة الله) تێکیاندا و ویستیان بنیادی بنێنەوە کە بنیادیان نایەوە لەسەر هەندێک لە ڕیوایەتەکان دەڵێن کەعبە ئەو حیجرەی ئیسماعیل کە ئێستا لە پشتیەتی نیوە دیوارێکی هەیە و بە بازنەیی سوڕاوەتەوە کە بەناو کەعبە حیسابە ئەوەی تەواف بکا نابێ بەناو ئەوێدا بچێ و دەبێ بە ئەودیوی تردا بچێ دەڵێن ئەوە بناغەکەی ئیبراهیم پێغەمبەر بوو (ﷺ) کەعبە ئەوەندە گەورە بوە بەڵام قوڕەیشیەکان چونکە دەسەڵاتی مادی و پارە و پولیان کەم بوو کە بنیادیان نایەوە ئاوا بە بچوکی وەکو شێوە و شکڵەکەی ئێستا بنیادیان نایەوە و ئەو حیجری ئیسماعیلیان لێ جیاکردەوە و ئەوەندە مەترەیان لە کەعبە دەرهێنا ئینجا لە سەردەمی عەبدوڵای کوڕی زوبەیریش کە دەبێتە خەلیفەی موسڵمانان لە مەککە لەپاش ئەوەی کەوا ئیمامی عەلی نامێنێ و وەفات دەکات وە حەسەنیش نامێنێ ئینجا عەبدوڵای کوڕی زوبەیر جارێکی تر کەعبەی لەسەر حیجری ئیسماعیلەوە بە پان و پۆڕی بنیاد نایەوە بەڵام حەجاجی کوڕی ئەبو یوسفی سەقەفی کاتێک کەوا عەبدوڵای کوڕی زوبەیری شەهید کرد و کوشتی کە کوڕی ئەسمائی کچی ئیمامی ئەبو بەکریش بوو کاتێک کەوا لەوێ دوبارە کەعبەیان لەسەر ئەمری خەلیفەی موسڵمانان تێک دایەوە و وەکو وێنەی ئێستا ئاوا بنیادیان نایەوە کە قوڕەیشیەکان کردبویان.

جا ئەو کەعبەیە کە بنیادیان نایەوە قورەیشیەکان گەیشتنە (حجر الأسود) کە داینێنەوە و جێگیری بکەن لە شوێنی خۆی لەبەر ئەوەی لەلای قورەیشیەکان (حجر الأسود) و کەعبە پلە و پایەی هەبوو دڵیان پێوەبوو هەریەک لە تیرەکانی قورەیشی گوتی من دایدەنێمەوە کێشە و ئاژاوە لە نێوانیان دروستبوو، ئەوەبوو یەکێکیشیان گوتی پێم باشە کەسێک بکەنە حەکەم لەنێوان خۆتاندا، گوتیان کێ بێ ئەو حەکەمە؟ گوتیان کێ لەلای ئەو لایەوە هات لێمان بەدیارکەوت ئەمڕۆ با ئەو حەکەم بێ، لەناکاو سەریان هەڵبڕی و بینیان محمد المصطفى (ﷺ) هات و بوە حەکەم لە نێوانیان و پێی ڕازی بون هەموو گوتیان ئەوە (الصادق الأمين)ە ڕازینە بە هەر حوکمێکی ئەو موحەمەدە بیدا با گەنج بێ و لە ئێمە و لە زۆربەمان بچوکتربێ، جا پێغەمبەریش (ﷺ) حیکمەتی خۆی بەکارهێنا و ئەو کاتە فەرموی عابایەک بێنن بەردەکەی لە ناوەڕاستی عاباکەی دانا و فەرموی هەر یەکێک لە سەرکردەی تیرەکانی قورەیشی کە حەزی لێیە (الحجر الأسود) دابنێ با بێ لچکێکی عابایەکەی بگرێ بەرزی بکاتەوە بەرەو (كعبة الله) جا هەرکە بەرزیان کردەوە هەمویان پلە و پایەی ئەوەیان پێ بەخشرا کە (الحجر الأسود)یان لە شوێنی خۆی داناوەتەوە، و بە دەستی پڕ خێر و بەرەکەتی خۆی (الحجر الأسود)ی هەڵگرت پێغەمبەر (ﷺ) لەو شوێنەی دانایەوە کە ئێستا لێی دانراوە و ئینجا خەڵکەکە ئاژاوە و کێشەکەیان لە نێواندا نەما.

کە پێغەمبەر ئەوهابوو (ﷺ) ئینجا دەستی بەوە کرد فەهمی ئەوەی کرد پێغەمبەر (ﷺ) کەوا الله تعالى پاراستی پێش پێغەمبەرایەتیش هەندێک هەڵە و کەم و کورتی هەیە لەناو قورەیشیەکان نابێ ئەنجام بدرێ، بۆ نمونە لە فەرمودەی سەحیح هاتوە پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیانیدا نە گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی خواردبوو کەوا لەسەر نوسوب کافر و موشریک و بت پەرستەکان سەریان دەبڕی نە خۆشی قەت لەسەر نوسوب حەیوان و ئاژەڵی سەر بڕیوە، قەت لە ژیانیدا کڕنوشی نەبردوە و سوجدەی نەبردوە بۆ هیچ بت و سەنەمێک وە پێغەمبەر

(ﷺ) له خراپەکانی سەردەمی نەفامیەت پارێزراو بوو خوای رب العالمین پاراستبوی وە ئەو ژیریەشی دابویە کە فەهمی دەکرد چ ڕاستە و چ هەڵەیە.

لەبەر ئەوە سەرەتای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە خەو بینینی ڕاست و دروست وەحیەکەی دەستی پێکرد.

**پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و لە چ مێژویەك بوو بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)**

ڕای پەسەند و ڕاجیح لە حەقدەی ڕەمەزانی ساڵی چل و یەکەمی لە دایکبونی پێغەمبەر (ﷺ) هێشتا چل و یەک نەبو بوو بە تەواوەتی لە چلیش تێپەڕی کردبوو پێغەمبەر (ﷺ) کە ڕێک دەکاتە بەرامبەر شەشی هەشت واتە مانگی ئابی ساڵی (٦١٠) زاینی وەکو أبو الحسن الندوي و وە هەندێکی تر لە زانایانی مێژونوس لێکیان داوەتەوە و ئاوایان هێناوەتەوە.

دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە -رضي الله عنها- دەفەرموێت: «أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّادِقَةَ فِي النَّوْمِ» یەکەمین جار وەحی و نیگا بۆ پێغەمبەر هات (ﷺ) کە دەستی پێکرد بە خەون بینین بوو (کە هەندێک لە زانایان دەفەرمون شەش مانگی خایاند ئەو خەون بینینانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە خەونی پێغەمبەران بە هی پێغەمبەری ئێمەشەوە (ﷺ) وەحی بوە پێی گوتراوە (الرؤيا الصالحة) یان (الرؤيا الصادقة) واتە خەونی باش یان خەونی ڕاست) «فَكَانَ لَا يَرَى رُؤْيَا إِلَّا جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ» پێغەمبەر (ﷺ) دایکە عائیشە دەفەرموێ هیچ خەونێکی نەدەبینی لەو ماوە ئیلا وەکو ڕوناکی بەرەبەیان ڕوناکی دەدایە و سەدا سەد دەهاتەجێ و لەجێ بوو ڕاست بوو «ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلَاءُ» پێغەمبەر (ﷺ) دوایە دڵی خۆشبوو بەوەی بچێ کەنارگیربێ و بچێتە شوێنە چۆڵ و بیابانەکان و وە یەک لە شاخەکانی دیاریکرد لە غاری حیراء لەوێوە پەرستشی خوای رب

العالمین بکا «فَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ يَتَحَنَّثُ فِيهِ» لەوێدا دەچوو لە غاری حیراء ئەشکەوتی حیراء عیبادەت و پەرستشی ئەنجام دەدا و ماڵ و منداڵ و ئاوەدانی بەجێ دەهێشت.

له پاشان دەفەرموێ چەندین شەو وای دەکرد ئینجا دەهاتەوە لەلای دایکە خەدیجە -رضي الله عنها- دوبارە خۆی ئامادە دەکردەوە زاد و زەخیرەی دەبردەوە جارێکی تر دەچوەوە چەندین شەوی تر ئاوا بەردەوام دەبوو لە عیبادەت و پەرستشەکەی.

له پاشان ڕۆژێک لە ڕۆژەکان کە حەڤدەی ڕەمەزان بوە لەسەر بۆچونی پەسەندی مێژونوسان لە ساڵی چل بەرەو چل و یەکەمی لە دایکبونی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمجارەیان کەسێک دێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) کە جوبرِائیلە، جوبرِائیل دێ و پێغەمبەر دەگێرِێتەوە (ﷺ) دەفەرموێ دایکە عائیشە لەو ڕیوایەتە هێناویەتیەوە کەوا دەڵێ کەسێک هات منی توند لە باوەش گرت و گوشیمی ئینجا فەرموی «اقْرَأْ» دەڵێ گوتی بخوێنە، دەڵێ منیش گوتم «مَا أَنَا بِقَارِئٍ» من خوێندەواریم نیە هەتا بخوێنم «قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى، بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي» جاری دوەم منی لە باوەش گرتەوە و منی گوشی دوبارە پێی گوتم بخوێنە هەرکە بەریدام گوتی بخوێنە، دەڵێ منیش دوبارە پێم گوت «مَا أَنَا بِقَارِئٍ» من خوێندەواریم نیە «فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ، حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي» دوبارە زۆر بە توندی منی گوشی و بەریدام و ئینجا گوتی بخوێنە دەڵێ جاری سێیەمیش گوتم خوێندەواریم نیە، دەڵێ ئەمجارە فەرموی منی گرت و لە باوەش بە توندی و بەریدام فەرموی: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ * خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ * ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ * ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ * عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ﴾ [العلق: ١-٥] یەکەمین ئایەتەکانی قورئان کە دابەزی بەسەر پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) سەرەتای ئایەتەکانی سورەتی العلق تا ئایەتی پێنجەم بەسەری دابەزی.

پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) دایکە عائیشە لێی دەگێڕێتەوە کە بۆ ئەوانی گێڕاوەتەوە دەفەرموێ من سام گرتوو بوم لە شوێنی خۆم یەکسەر هاتمەوە و گەڕامەوە لای دایکە خەدیجە هیچم پێ نەگوترا تەنها گوتم «زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي» جێگاکەم بۆ ڕابخەن و پێمدا بدەن و با تۆزێک پشوو بدەم، دەڵێ دایکە خەدیجە وای لەگەڵ کردم دەڵێ هەرکە ترسەکەم لەسەر نەما ڕوم کردە خەدیجە گوتم «لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي» وەڵاهی لە خۆم دەترسێم شتێکم بەسەربێ واتە یان عەقڵم لە دەست بدەم و یان شتێکم بەسەر بێت کەوا شتەکە ناخۆش بێ، دەڵێ دایکە خەدیجەش فەرموی «فَوَاللَّهِ لَا يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا» نەخێر مەترسە لەوە ئەی موحەمەد (ﷺ) خوای رب العالمین قەت شتی وا توشی تۆ ناکا تۆ زەبون بکات و ناخۆشی وات بەسەربێ لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی فەرموی «إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ» تۆ سیلەی ڕەحم بەجێ دەگەیەنی زۆر بە جوانی ئەی موحەمەد (ﷺ)، جا سیلەی ڕەحم خەڵکێک وا تێگەیشتوە بەس سەردانیکردنە نەخێر سیلەی ڕەحم پێناسەکەی لە دیدگای شەریعەتی ئیسلامدا زانایان دەفەرمون تەنها لە هاتوچۆکردن زیاترە واتە ئەگەر هەژاربێ ئەو کەسەی سیلەی ڕەحمی لەگەڵ دەکەی تۆ هەبون بی دەبێ پێی ببەخشی و پێی بدەی ئەگەر غەمناک بێ و تۆ نەت بێ دەبێ غەمی بڕەوێنیتەوە ئاوا سیلەی ڕەحمی تەواوە، واتە تۆ دەچی لەگەڵ خزمە نزیکەکانت ئەوانەی سیلەی ڕەحمت لەگەڵ هەنە ئەی موحەمەد (ﷺ) هەتبێ یارمەتیان دەدەی و سەردانیان دەکەی و غەمیان دەڕەوێنیتەوە، لە پاشان فەرموی دایکە خەدیجە -رضي الله عنها- «وَتَحْمِلُ الْكَلَّ» وە تۆ کەسێکی پەککەوتە و یان فەقیر و هەژاربێ تۆ بارەکەی هەڵدەگری باری چەندیش قورسیش بێ لەگەڵی «وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ» وە کەسی نەبوو لە هەر بوارێک نەبوبێ تۆ هەوڵی ئەوە دەدەی شتی بۆ بە بەرهەم بێنی و پێی ببەخشی «وَتَقْرِي الضَّيْفَ» واتە ڕێزی میوانانیش دەگری «وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ» ئەگەر هانات بێننە بەر کەسێک شتێکی لێ قەومابێ حەق و ڕەوابێ تۆ لەگەڵیدا دەبی و دەچی پشتگیری کاری دەبی.

ده‌ڵێ یه‌کسه‌ر خه‌دیجه‌ که‌ ئه‌و قسانه‌ی بیست و وا وه‌ڵامی پیاوه‌که‌ی خۆی دایه‌وه‌ موحه‌مه‌د (ﷺ) فه‌رموی وه‌ره‌ با بچینه‌ لای وه‌ره‌قه‌ی کوڕی نه‌وفه‌لی کوڕه‌ مامم، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی زیره‌ک و دانایه‌ با بزانین ئه‌وه‌ی له‌ تۆ ڕویداوه‌ چیبوه‌ و بۆمان شیبکاته‌وه‌، دایکه‌ خه‌دیجه‌ ده‌ستی پیاوه‌ هاوسه‌ره‌ خۆشه‌ویسته‌که‌ی خۆی گرت موحه‌مه‌د (ﷺ) پێکه‌وه‌ دوو قۆڵی ئه‌و ئافره‌ته‌ شۆڕه‌ ژنه‌ی یارمه‌تیده‌ره‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌گه‌ڵ ئه‌و مانگی چوارده‌ که‌ له‌ویش جوانتر بوه‌ محمد المصطفى (ﷺ) (صادق الأمين) به‌ڕێکه‌وتن به‌ره‌و ماڵی وه‌ره‌قه‌ی کوڕی نه‌وفه‌ل، هه‌رکه‌ چون دایکه‌ خه‌دیجه‌ -رضي الله عنها- ده‌فه‌رموێ و ڕیوایه‌ت ده‌که‌ن که‌ وه‌ره‌قه‌ کوڕه‌ مامی بوه‌ له‌ سه‌رده‌می پێش هاتنی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) هه‌رکه‌ ئه‌وان چونه‌ لای بوو بوه‌ دیان ئیمانی به‌ عیسا پێغه‌مبه‌ر هێنابوو (ﷺ) وه‌ عیبرانی زۆر چاک شاره‌زا بوو بوو ده‌یزانی قسه‌ی پێبکا و پێیوه‌ بشنوسێ ئیماندارێکی چاکی سه‌ر دینی عیسا بوو له‌ پاشان له‌ به‌ ته‌مه‌نیان هه‌ردوو چاوی نابینا بوو نه‌یده‌بینی هه‌رکه‌ چونه‌ لای دایکه‌ خه‌دیجه‌ پێی فه‌رموو ئه‌ی وه‌ره‌قه‌ی ئامۆزام سه‌رنج بده‌ پیاوه‌ به‌ڕێزه‌که‌ی من هه‌ندێک هه‌واڵی له‌لایه‌ و وای لێ قه‌وماوه‌ ئایه‌ ئه‌وه‌ ده‌بێ چیبێ؟ جا وه‌ره‌قه‌ش گوتی «يَا ابن أَخِي مَاذَا تَرَى؟» تۆ چیت بینیوه‌ بۆم بڵێ ئه‌ی گوڕی برام ئه‌ی برازام؟ گوتیه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) «فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) خَبَرَ مَا رَآى» دایکه‌ عائیشه‌ ده‌فه‌رموێ پێغه‌مبه‌ر وای بۆ گێڕاینه‌وه‌ (ﷺ) ده‌ڵێ ئه‌وه‌ی بینیبوم بۆ وه‌ره‌قه‌ باسم کرد، ده‌ڵێ هه‌رکه‌ بۆم باسکرد وه‌ره‌قه‌ گوتی مه‌ترسه‌ «فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَى مُوسَى (ﷺ)» فه‌رموی ئه‌وه‌ ئه‌و ناموسه‌یه‌ واته‌ جوبڕائیله‌ که‌ دابه‌زییه‌ به‌سه‌ر موسا، ناموس له‌ زمانی عه‌ره‌بی بۆ ئه‌وه‌ به‌کار ده‌هێنرێ که‌وا که‌سێک به‌ نهێنی شتی گرنگ و سود به‌خش بێنێت بۆ خه‌ڵکی ئا ئه‌و نه‌وعه‌ په‌یامنێره‌یه‌، واته‌ جوبڕائیله‌ به‌ نهێنیه‌وه‌ له‌لای خوای رب العالمين ئه‌و خێر و به‌ره‌که‌ته‌ی پێغه‌مبه‌رایه‌تی بۆ تۆ هێناوه‌ ئه‌وه‌ش به‌سه‌ر موسا دابه‌زی بوو بۆی هێنابوو، گوتی «يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا» وه‌ره‌قه‌ گوتی خۆزگه‌ من ته‌مه‌نم باقیبا و له‌سه‌ر شینگ و توانا و هێزبام ئه‌و کاته‌ی که‌وا

تۆ لەناو خەڵکەکە دەعوەت دەکرد «لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا حِينَ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ» خۆزگە ئەو کاتە زیندوبام کە خزم و کەس و گەلەکەت شار بەدەرت دەکەن ئەی موحەمەد (ﷺ)، پێغەمبەر زۆر جێگای سەر سوڕمان بوو لەلای ئەو خزم و کەسانە ئەوەندە ڕێزی لێ دەنێن چۆن دەری دەکەن بە تەعەجوب و سەرسوڕمانیەوە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «أَوَ مُخْرِجِيَّ هُمْ» فەرموی ئایە ئەو خزم و کەسانەی من من بەدەر دەنێن لە شاردا و وڵات بەدەرم دەکەن؟ وەرەقەش فەرموی «قَالَ وَرَقَةُ: نَعَمْ» بەڵێ بەڵێ دڵنیابە چونکە «لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلَّا عُودِيَ» هیچ کەسێک نەبوە لە پێغەمبەران لە پیاوچاکانی پێش تۆ (علیهم الصلاة والسلام) ئەگەر ئەو پەیامەی هێنابێ ڕاستە ڕێگا بە گەلەکەی خۆی پیشان بدا اللهیان پێ بناسێنێ ئیلا دوژمنکاری کراوە لەلایەن گەل و نەتەوەکەی خۆی «وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا» سوێند بە الله ئەگەر ئەو ڕۆژەم لێ دابێ و من مابم لە تەمەندا من سەرت دەخەم بە پشتگیری کردنێکی تەواو و بەهێز «ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ وَفَتَرَ الْوَحْيُ[1]» دایکە عائیشە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی وەرەقە ئەوەندەی نەبرد و وەفاتی کرد و گەڕایەوە لای خوای رب العالمین وە وەحیش ماوەیەکی پێچوو نەهات بۆ پێغەمبەر (ﷺ).

ڕەنگە پرسیاری ئەوە بکرێت وەرەقەی کوڕی نەوفەل بە موسڵمانی مرد بەهەشتیە یان دۆزەخیە؟ بۆچونی پەسەند و ڕاجیح چەندین بەڵگەی حەدیسمان لە دەستە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) من وەرەقەم دیت لە یەک لە بەهەشتەکان، لە ڕیوایەتێکی تر دەفەرموێ دوو بەهەشتی هەبون و پێی درابون، لە ڕیواتێکیش دەفەرموێ بە جل و بەرگی سپیم بینی ئەگەر بۆناو ئاگربا جل و بەرگی سپی لەبەر نەدەکرا لە ڕۆژیی دوایدا واتە ئەوە کەڵکی هەبو بۆ وەرەقەی کوڕی نەوفەل وەرەقەی کوڕی نەوفەل بەهەشتیە و چونکە لەو کاتەوە

[1] صحيح البخاري (٣) (٣٢٣٨) (٣٣٩٢)، صحيح مسلم (١٦٠) (١٦١)، سنن الترمذي (٣٣٢٥) (٣٦٣٢).

بە دڵی خۆی ئەوەندەی لە توانایدا هەبو ئیمانی هێناوە بە پێغەمبەر (ﷺ) وەعدی ئەوەشیدا ئەگەر بمابا سەریشی بخستبا و لەگەڵیشیدابا.

لە پاشان ماوەیەک وەحی دواکەوت، چەند ئەو وەحیە دواکەوت؟ ئیختیلاف و جیاوازی زانایانی لەسەرە بەڵام بۆچونی ڕاجیح و پەسەند هەر ئەوەش دەچێتە عەقڵی سەلیم ماوەیەکی زۆر نەبوە هەندێک ڕیوایەت دەڵێن سێ ساڵ بوە نا ئەوەیان زۆرە، لەبەر ئەوەی لە ڕیوایەتی سەحیحی بوخاریدا هاتوە دەفەرموێ کە وەحی نەدەهات بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ماوەی کەوتە نێوان ئەوەندە حەز و ئارەزوی کرد پێغەمبەر (ﷺ) حیکمەتەکە ئەوەبوە هەتا پێغەمبەر تەواو بێتەوە سەر خۆی ترسەکانی نەمێنێ حەز و ئارەزو و خۆشی بۆ ئەوە بکا جارێکی تر ئەو وەحیە بۆی بێتەوە، هەرکە وای لێهات ئینجا ماوەیەک الله دوایخست -جل شئنه- بە حیکمەتی خۆی.

بەڵێ فەترەی وەحی بۆچونی دروستی زانایان لە سێ مانگ تێپەڕی نەکردوە نەک بویێتە ئەوەندە ساڵە و ئەوەندە ماوە زۆرە، ئینجا کە پێغەمبەر هاتەوە سەر خۆی (ﷺ) جارێکی تر وەحی دەستی پێکرد.

## قۆناغەکانی بانگەوازی

کە پێغەمبەر وەحی بۆ هات و بوە پێغەمبەری الله یەکلا بۆوە پێغەمبەر (ﷺ) کە پێغەمبەری اللەیە، ئەرکی ئەوەی کەوتە سەر یەکەمین جار کە جارێکی تر دوبارە لە دوای ئەشکەوتی (حیراء) وەحی بۆ هات لە دوای ئەوەی ماوەیەکی پێچوبوو پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) ڕۆژێکیان دەڕۆیشتم لە کۆڵانێک لە کۆڵانەکانی مەککە بینیم کورسیەک لەنێوان زەوی و ئاسمانەوەیە فریشتەیەکی لەسەرە بینیم ئەو فریشتە و کەسە بوو کە لە غاری (حیراء) هاتبوە لای من، دەڵێ سوێند بە الله بینیم نێوانی ئاسمان و زەوی داگرتبوو، شەش سەد باڵی هەبوو ئەوەیان جوبڕائیل بوو (علیه السلام) لەسەر وێنە و

دیمەنی خۆی ئەمجارە هاتە خزمەت پێغەمبەر و (ﷺ) خۆی پێ نیشاندا، جوبڕائیل لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعە گەورەی هەموو فریشتەکانە چەند ئەرکێکی پێ سپێردراوە یەک لە ئەرکەکان هێنانی وەحی لەلای خوای رب العالمین بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) چونکە ئەمینی ئاسمانەکان و زەوی بوە، وە لە پاشان ئەرکی عەزابدانی ئومەتەکان کە خوای رب العالمین ویستبێتی هەر ئومەتێک عەزاب بدا جوبڕائیل سەرپەرشتیاری مەلائیکەتەکانی عەزاب بوە، لە یەک لە ڕیوایەتەکان هاتوە دەڵێ قەومی لوت کاتێ الله بڕیاریدا سەراونوقمیان بکا و نغرۆیان بکا لە ژێر زەوی جوبڕائیل هات بە یەک لا باڵ شەش سەد باڵی هەیە بە یەک لا باڵ ئەوە هێز و قوەتی مەلائیکەتەکانە دەفەرموێ لە خاکی قەومی لوتی گیر کرد هەر هەموی لەبن زەوی دەرهێنان خەڵکەکەش هەموی لەسەربوو بەو یەکلا باڵە ئەوانەی گەیاندە بن ئاسمانی دونیا ئینجا لەوێ سەراو نوخنیان کردنەوە ئەو قۆرتەی هەبوو ئەو خاکەی کە هەڵکەندرابوو بە لاباڵەکەی جوبڕائیل بە سەراو نخونی خەڵکەکە کەوتنەوە ناوی، کێ هەیە قودرەت و توانای هەبێ بەرامبەر؟ ئەوە یەکێکە لە جوندی و سەربازەکانی الله جوبڕائیل بەرامبەر بە الله و سەربازەکانی الله بوەستێ، جوبڕائیل ئەرکی ئەوەشی پێ سپێردرابوو ئەگەر لەشکری کافرەکان هێرشیان بکردبا سەر موسڵمانەکان جوبڕائیل دەبوە سەر لەشکری فریشتەکان دەهات دەجەنگا لەگەڵ کافرەکان وەکو لە جەنگی بەدر ئەوە ڕویدا وەکو لە جەنگەکانی تریش هەبوە و ڕویداوە خوای رب العالمین جوبڕائیل و لەگەڵ چەند فریشتەیەکی ناردوە هەر جارە و بە ژمارەیەک هاتوە و شەڕ و جەنگی کردوە لەگەڵ کافرەکان شان بەشانی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ).

پێغەمبەر (ﷺ) ئەمجارە وەحی بۆ هات ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنذِرْ * وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ﴾ [المدثر: ١-٧] لەو حاڵەتە بوو کە چوەوە ماڵەوە ئەمجارە فەرموی (دثرونی، دثرونی) کە جوبڕائیلی بینیەوە تۆزێک دوبارە سام و هەیبەتی لێ نیشت گوتی دوبارە داماپۆشنەوە داماپۆشنەوە

خوای رب العالمین ئایەتەکانی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ﴾ی نارد واته ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە و داپۆشیوە کاتی خۆ پێچانەوە نەما هەستەوە و ڕابکە: ﴿قُمْ فَأَنذِرْ﴾ الله ئەمرت پێدەکا هەڵسەوە دەستبکە بە بانگەوازی خەڵکی بترسێنە لە عەزابی خوای رب العالمین لە ئاگری دۆزەخ و جەهەنەم مێژونوسان دەفەرمون لەو لەحزە و چرکەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئیسراحەتی نەما کەوتە بەر فەرمانی خوای رب العالمین سەد لە سەد فەرمانەکەی جێبەجێ کرد دەستی کرد بە دەعوە و بانگەوازی.

چوار قۆناغی هەبوە دەعوە و بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ):

یەکەمیان (الدعوة السرية) بە نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) دەستیکرد بە بانگەوازی سێ ساڵی خایاند.

وە دەعوەی جەهری و ئیعلانی کرد و بە ڕاشکاوانە خەڵکی بانگ دەکرد بەرەو ئیسلام، قۆماغی دوەم بوو لەپاش ئەو سێ ساڵە ئا ئەوە بەبێ ئەوەی شەڕ و کوشتار و ڕوبەروبونەوە بکا لەگەڵ کافر و موشریکەکان لە کوشتن و بڕین بەڵام تەنها لە قسە و حوجە و بەڵگە هێنانەوە خەریک بوو بە بەڵگەکان، ئەوەشیان لەپاش ئەو سێ ساڵە بانگەوازی نهێنی دەستی پێکرد هەتا پێغەمبەر (ﷺ) کۆچ و هیجرەتی کرد بۆ شاری یەسریب کە بوەتە مەدینەی پێغەمبەر (ﷺ).

وە قۆناغی سێیەمله مەدینە دەستی پێکرد دەعوە و بانگەوازی بە ئاشکرا لەگەڵ بەرگریکردن بە شەڕ و چەک لە دەعوە و بانگەوازیەکەی و لە خۆیان و موسڵمانان ئەوەش سەرەتای ئیعلانکردنی جەنگ و جیهاد و قیتال بوو کە الله مۆڵەتی بە پێغەمبەردا (ﷺ) ئەو قۆناغەش هەتا سوڵحی حودەیبیەی خایاند.

بەڵام لە پاش سوڵحی حودەیبیە قۆناغی چوارەم هات هی دەعوە و بانگەوازی ئاشکرایی پێغەمبەر (ﷺ) هەتا وەفاتی کرد تا ئێستاش زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون

هەر ئەو قۆناغە ماوەتەوە بۆ ئێمە دەبێ بەردەوام بین لەسەری، ئەویش دەعوە و بانگەوازی بە ئاشکرایی وە لەگەڵ جەنگ و جیهاد و کوشتار لەگەڵ ئەو کەسانەی کۆسپ و تەگەرە دروستدەکەن لەسەر ڕێگای دەعوە و بانگەوازیەوە لە کافر و موشریکەکان تا حوکمی ئیسلام و قورئان جێگیر دەکرێ ئەوە قۆناغی کۆتایی بوو لە دەعوە و بانگەوازیەکەی پێغەمبەر (ﷺ).

پێغەمبەر (ﷺ) ئەو سێ ساڵەی دەعوەی بە نهێنی کرد چۆن دەستی پێکرد؟ بەوە دەستی پێکرد پێغەمبەر (ﷺ) هات لەسەر کێوی صەفا ڕاوەستا بەڵام سەرەتا با باسی ئەوە بکەین کێ ئیمانی پێ هێنا و بوە موسڵمان؟ کۆمەڵ و دوفعەی یەکەم لە موسڵمانان یەکەمین کەس بەبێ ئیختیلاف و جیاوازی لەسەر ڕوی زەوی لە ژن و لە پیاوان لە کۆیلەکان و جاریەکان لەگەڵ حوڕ و ئازاد و سەربەستەکان دایکە خەدیجە بوو -رضي الله عنها- یەکەم کەس ئەو خەڵاتەی پێ بەخشرا هەرکە هاتەوە ماڵەوە و وەرەقەی کوڕی نەوفەل وایگوت یەکسەر دایکە خەدیجە یەکەم کەس بوو فەرموی (أشهد أن لا إله إلا الله وأنك رسول الله) شاهێدومانی هێنا ئەو خەڵاتە گەورە بەو شۆڕە ژنە بەرز و بەڕێزە بەخشرا.

لەبەر ئەوە دەمانەوێ بۆتان باسی ئەوە بکەین ئایە دایکە خەدیجە فەزڵ و گەورەییەکەی چەند بوە؟ ئیختیلاف و جیاوازی هەیە لەبەینی زانایانی ئەهلی سونە و جەماعە ئایە دایکە عائیشە یان دایکە خەدیجە بەرز و بەڕێزتر بونە پلەدارتر بونە بەڵام ئیتیفاق هەیە بەبێ ئیختیلاف ئەو دوو خێزانانەی هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) خەدیجە و عائیشە -رضي الله عنهن- لە هەر هەموو ئەوانی تر پلەدارتر بونە بەڵام لەنێوان ئەو دوانەدا زانایان چوار بۆچونیان هەیە:

بۆچونێک ابن القيم هێناویەتیەوە دەفەرموێ زانایان هەڵوێستەیان کردوە و ڕاوەستاون هیچ قسەیان لێ نەکردوە گوتویانە نازانین کامەیان پلەدارترە بەسەر ئەوەی تر، ئەوانە بەڵگەیەکی ئەوتۆیان نیە.

بۆچونی دوەم دەڵێن دایکە عائیشە لە دایکە خەدیجە بەرز و بەڕێزتر و پلەدارتر بوە کە ئیمامی سەفارینی فەرمویەتی و ڕیوایەتی کردوە لە ئیمامی بول بەلانی کە یەکێکە لە زانایانی موتەئەخیرینی مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ئەویش دەفەرموێ ابن حەمدان وای فەرموە و لەوەوە گێڕاومەتەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەی دەڵێن دایکە عائیشە عیلمی زیاتر بوە و بانگەوازی زیاتری کردوە.

بۆچونی سێیەم دەفەرموێت دایکە خەدیجە پلەدارترە لە دایکە عائیشە ئەوەشیان بۆچونی (ابن قدامة المقدسي، و پێشەوا أبو بكر محمد بن داود، و وە ئیمامی السهيلي، وە حافز ابن حەجەری عەسقەلانیش ئەوە بۆچونیەتی) دەڵێن ئەوەی خەدیجە کردی بۆ ئیسلام و ئومەتی ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ) دایکە عائیشە و کەس پێی نەکراوە.

بەڵام بۆچونی پەسەندی کۆتا کە چوارەمیانە ئەوە بۆچونی ابن تيمية و بە باش دانانی ابن قەیمی جەوزیەیە دەفەرمون تەفسیڵ هەیە لە هەندێک شتدا درێژی دەکەنەوە و دەفەرمون لە هەندێک شت و خاڵدا دایکە خەدیجە لەپێش دایکە عائیشەیە (پلەدارترە) لە مەسەلەی پشتگیری کردنی بانگەواز پارە و ماڵ بەخشین لەپێناو بانگەوازی و دەعوە و ئیسلام هەموو پارەکەی خۆی تەرخان کردبوو وە یەکەم ئافرەتێکە کە ئیمانی بە پێغەمبەر هێناوە (ﷺ) وە لەسەرخستنی پێغەمبەر و دڵدانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەوەی دایکە عائیشە ناگاتە دایکە خەدیجە ئەو پلەدارترە، بەڵام لەڕوی عیلم و زانستی و بڵاوکردنەوەی عیلم و زانستی دایکە عائیشە بەرز و بەڕێزترە لەبەر ئەوەی دایکە خەدیجە لە عیلم و زانستی ئەوەندە نەژیاوە و ئەوەندەشی نەبوە کە دایکە عائیشە هەیبوە چونکە دایکە عائیشە -رضي الله

عنها- له هەموو ئافرەتانی ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) زاناتر بوە و زانیاری زیاتری سود بەخشی بە ئومەتی پێغەمبەر گەیاندوە (ﷺ).

له پاشان پێغەمبەر (ﷺ) لەپاش دایکە خەدیجە دوەمین کەس کە لە منداڵان دەکاتە یەکەمین کەس عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی زاوای پێغەمبەر (ﷺ) وە ئامۆزای کە لە ماڵی ئەوان دەژیا پێغەمبەر زۆری خۆشدەویست (ﷺ) کە ڕای پەسەند تەمەنی دە ساڵ بوە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب تەمەنی دە ساڵ بوە لە دوای دایکە خەدیجە ئەو ئیمانی هێناو بوە موسڵمان، وە لە دوای ئەو زەیدی کوڕی حاریثە لە کۆیلەکان یەکەم کەسە بەڵام لە ڕوی ژمارەی مرۆڤەکان و نەوەکانی ئادەم سێیەمە کە بوەتە موسڵمان زەیدی کوڕی حاریثە کەوا یەکێک بوو لە کۆیلەکانی خەدیجە بە دیاری دایە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر خۆشەویست بوو لەلای پێغەمبەری الله (ﷺ)، هەرکە دایک و باوکی دێن و دەیدۆزنەوە لە یەمەنەوە پێی دەڵێن وەرە ئەی زەید من باوکتم و ئەویتر دەڵێ من مامتم دایکیشت وای سەلام هەیە کەوا بگەڕێیتەوە و بتبەینەوە تۆمان دۆزیەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) دڵی ناخۆش دەبێ زەیدی لێ بستێننەوە دەفەرموێ من هیچ قسەیەک ناکەم بەڵام با زەید بێ خۆی بڕیارەکە بدا، کە بانگی زەید دەکەن باوکی و مامی دەڵێن ئەی زەید ئێمە باوکت و مامتین فەرموو لەگەڵمان وەرەوە و با بچینەوە، زەید دەفەرموێ سوێند بە الله هیچ کەس هەڵنابژێرم بەسەر پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەوەی باوکم و دایکم و مامم بۆم دەکەن ئەو بە زیادەوە کردویەتی سەرەڕای ئەوەی شتی زۆر باشتر و ئەخلاق و ڕەوشتی بەرزتریشم لێ بینیوە، پێغەمبەر دڵی زۆر خۆشبوو پێکەنی فەرموی مامی زەید و باوکی زەید چی لێبکەم؟ زەید ئەوە لەگەڵتان نایەتەوە و زەید لە ماڵی پێغەمبەر مایەوە (ﷺ)، زەیدی باوکی ئوسامە -رضي الله عنهما-، وە لە پاشان هەر چوار کچەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لەپاش زەید کە باوکیان بینی و داوای

ئەوە دەکا پێغەمبەری اللەیە (ﷺ) یەک لە دوای یەک هاتنە خزمەتی و شاهیدومانیان هێنا و بونە موسڵمان.

کەواتە یەکەم خانەوادە وە یەکەم بنەماڵە وە یەکەم خێزان کە بە ژن و پیاو و کۆیلەکەی ماڵیانەوە و منداڵەکەی کە بەخێوی دەکەن عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و وە کچەکانی خۆیەوە بونە موسڵمان و یەکەم خاڵ و بارەگای دەعوە و بانگەوازی بۆلای خوای رب العالمین ماڵی پێغەمبەری پێشەوا بوو (ﷺ)، ئینجا لە دوای ئەوان پێغەمبەر هاتەدەر (ﷺ) ئەبو بەکری سدیقی بینی کە برادەری خۆی بوو بەویشی ڕاگەیاند من بومە پێغەمبەری الله (ﷺ) یەکەم کەس لە پیاوە حوڕ و ئازاد و سەربەستەکان ئەبو بەکری سدیق بوو لەپاش ئەوەندە کەسانەی تر ژماردمان بوە موسڵمان ئەویش بەدوای پێغەمبەر کەوت (ﷺ)، ئەویش چوو کۆڵی نەدا هەندێک خەڵکی دەعوە و بانگەواز کرد لەوانە عوسمانی کوڕی عەفان موسڵمان بوو لەسەر دەستی ئیمامی ئەبو بەکر کە عوسمان لەوکاتە تەمەنی سی و چوار ساڵان بوو، وە لە پاشان عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف کە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفیش تەمەنی سی ساڵان بوو ئەویشیان لەسەر دەستی ئیمامی ئەبو بەکر بوە موسڵمان، وە چەندێکی تریش سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس و زوبەیری کوڕی عەوامیش ئەوانەش لە تەمەنەکانی سێ سزدە و پازدە و حەڤدە ساڵاندا بون ئەوانەش لەسەر دەستی ئەبو بەکری سدیق بونە موسڵمان.

ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) الله تعالی فەرمانی پێدەکا دەعوە و بانگەوازیەکەی ئاشکرا بکا وە عەشیرەت و تیرەکەی خۆی پێش هەموو کەسێک ئاگادار بکاتەوە لە (لا إله إلا الله) و وە پێیان ڕابگەیەنێ ئەو ڕەوانەکراو و پێغەمبەری اللەیە (ﷺ)، جا ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: «قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) حِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾ [الشعراء: ٢١٤] قَالَ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا» دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ)

کە الله تعالی فەرمانی پێدا و فەرمووی تۆ هۆز و گەلە نزیکەکانی خۆت بانگەواز بکە بەرەو ئیسلام یەکسەر ئەویش ڕابوو و هەستا بەو فەرمانەی خوای رب العالمین فەرمووی ئەی گەلی قورەیش یان وشەیەکی نمونەی ئەو وشەی هێناوە فەرمووی ئەبو هورەیرە دەفەرمویٚ پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ)، فەرمووی «اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ، لَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا» وەرن بۆ خۆتان بە دەستی خۆتان خۆتان ڕزگار بکەن و خۆتان بکڕن شتێکی لەلای خوای رب العالمین واتە کردەوەی چاک بکەن و ئیمان بێنن چونکە من لە هاناتان نایەم و ناتوانم هیچتان بۆ بکەم «عَبَّاسُ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ» ئەی عەباسی مامم کوڕی عەبدولموتەڵیب «لَا أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا» من ناتوانم هیچ شتێکت بۆ بکەم لەلای الله ئەگەر تۆ لێرە ئیمان نەهێنی و بڕوا نەهێنی و شتێک بۆخۆت بەدەست نەهێنی «وَيَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللَّهِ» ئەی سەفیەی پوری پێغەمبەری الله (ﷺ) پێغەمبەر پێی فەرموو ئەی پورە سەفیە من ناتوانم هیچت بۆ بکەم ئەگەر تۆ لە دونیادا شتێک بەدەست نەهێنی لە ئیمان و لە ئیسلام «لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا» من هیچم لە دەست نایە بۆت بکەم لەلای خوای رب العالمین «وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ، سَلِينِي مَا شِئْتِ مِنْ مَالِي، لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا[1]» ئەی فاتیمەی کچە خۆشەویستەکەم پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) لە ماڵی دونیا تۆ خۆشەویستی لەلام هەرچیم هەیە لێم داوا بکە هەتا پێت بدەم بەڵام بۆخۆت شتێک بکە لەلای خوای رب العالمین هیچم پێ ناکریٚ بۆت ئەگەر ئیمان نەهێنی و موسڵمان نەبی.

جا پێغەمبەر (ﷺ) دەستیکرد بە دەعوە و بانگەوازی چوو لەسەر کێوی صەفا ڕاوەستا لە یەک لە ڕیوایەتەکان بانگی کردن ئەی بەنو عەبدولموتەڵیب ئەی بەنو هاشم ئەی بەنو فیهر ئەی بەنو فڵان و فڵان هەموو کۆببنەوە و دەورەم لێبدەن کارێکی گرینگم هەیە پێتان، پێغەمبەر (ﷺ) ڕوی تێکردن و هەموو خەڵکەکە هاتن ڕووەو پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی ئەو

[1] صحيح البخاري (٢٧٥٣) (٣٥٢٧) (٤٧٧١)، صحيح مسلم (٢٠٤) (٢٠٦)، سنن الترمذي (٣١٨٥).

ڕۆژە پێی نەکرابێ نوێنەرێکی خۆی نارد زانی شتێکی گرنگە، جا پێغەمبەر ڕوی تێکردن (ﷺ) فەرموی ئێوە پێم بڕوا دەکەن ئەو دۆڵە کە لەبەر چاوتانە ئەگەر بڵێم ئێستا سوارێک هاتوە و شەڕی بۆتان هێناوە یان لەشکرێکی تێدایە لەناکاو هێرشتان دەکاتە سەر کە هیچیش بەبەرچاوان نابینن؟ لە یەک لە ڕیوایەتەکان لە سیرەی ئیبنو هیشامدا دەڵێ بە یەکدەنگ گوتیان هوتافیان کێشا و گوتیان «مَا جَرَّبْنَا عَلَيْكَ كَذِبًا» ئێمە قەتاوقەت هیچ درۆیەکمان لە تۆ نەبینیوە، (مَا) مای نافیەیە لە زمانی عەرەبیدا (كَذِبًا) نەکیرەیە قاعیدەی زمانی عەرەبیە ئەگەر نەفی نەکیرەی لەدوا هات (تفيد العموم) واتە گشتیە یەعنی درۆی گەورە و بچوکیشمان لەتۆ نەبینیوە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) دەربڕینەکە وابوە، یان لە ڕیوایەتی تر دەفەرمون زانایان و مێژونوسان و سیرەنوسان دەفەرمون گوتیان ئیلا ڕاستیمان لەتۆ بینیوە هەموو شتێکت پێ بڕوا دەکەین، پێغەمبەریش فەرموی (ﷺ) دەنا من موژدەدەر و ترسێنەرم لەلای خوای رب العالمین بۆتان هاتوم من پێغەمبەری اللەم (ﷺ) ڕوی تێکردن و فەرموی ئینجا لەوێوە ڕق و کینەی ئەبو لەهەبی مامی کە بە کافرایەتی ژیا و بە کافرایەتیش مرد لەوێ لەپێش هەموو کافرەکان پێش هەر هەموان دەستپێشخەری کرد لە کوفر و بێدینی و حیقدەکەی، هەردوو دەستەکانی خۆی دەرهێنا دەستەکانی ڕووەو پێغەمبەر ڕاگرت (ﷺ) وەکو لە کوردەواری دەڵێن گەشکەی پێگرت (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەو جورئەتەی بەخۆیدا و شەیتان هانیدا لەسەر ئەوە، ئینجا گوتی «أَلِهذا جَمَعْتَنا؟ يابن أخي» هەر بۆ ئەوە ئێمەت کۆکردبۆوە لێرە؟ ئەی کوڕی برام هیچی ترت پێ نەبو؟ واتە شتێکی گاڵتە جاڕییە و گاڵتەی پێکرد ئەبو لەهەب بە پێغەمبەر (ﷺ) و وتەکەی، لەوێ پێغەمبەر بەسەر خۆیدا شکایەوە بەڵام لەبەر خاتری خوای رب العالمین قبوڵی کرد بۆ ئەوەی سەبر و ئارامی گرت فەرمانی ئەوەی پێ نەبو تۆڵەی خۆی بستێنێتەوە لەسەر دەعوەکەی بەردەوام بوو ئەبو لەهەبیش خوای رب العالمین تۆڵەی لێکردەوە و کە سوڕەتی: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ [المسد: ١] دابەزی خوای رب العالمین فەرموی هەردو دەستەکانی ئەبو

لەهەب بڕزێ کە گەشکەی پێ بە تۆ گرت ئەی موحەممەد (ﷺ) چونکە ئەبو لەهەب گوتی «تبن لك يابن أخي» تۆ دابڕزێی تۆ بەهیلاک بچی ئەی کوڕی برام هەر بۆ ئەوە ئێمەت هێنا؟ خوای رب العالمين دەفەرموێ بە هیلاک بچێ هەردوو دەستەکانی بڕزێ هی ئەبو لەهەب کە گەشکەی پێ گرتی و ئەو قسانەی پێگوتی: ﴿وتب﴾ ئەوە نەبێ ئەوە فەرمانێکبێ و لە داهاتوو بێتەجێ الله فەرموی دەستبەجێ ئێستا فەرمانەکەم جێبەجێ دەکەم با دەستەکانی لە شوێنی خۆی بڕزن، بەڵێ مێژونوسان دەفەرمون ئەبو لەهەب نەخۆشیەکی گرت لە دەستەکانی گۆشتەکانی هەموی هەڵوەرا و ئێسک و دەمارەکانی مایەوە و چارەسەری پێنەکرا.

پێغەمبەر (ﷺ) ئاوا بەردەوام بوو لە دەعوە و بانگەوازیەکەی و دەستی پێکرد دەسوڕایەوە لە گەڕەک و کۆڵانەکانی مەککە دەیفەرموو «قُولُوا: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ؛ تُفْلِحُوا» ئەگەر ئێوە بڵێن هیچ پەرستراوێکی حەق و ڕەوا نیە جگە لە الله سەرفراز دەبن ئەی قوڕەیشیەکان، ئەبو لەهەبی مامی لە ڕق و کینەی دڵیەوە کە کافر و بێ بڕوا بوو لەسەر ئەو حاڵەش مرد وردە بەردی کۆکردبووەوە و لە دوای دەڕۆیشت لە هەر کۆڵانەیەکی بچوبا پێغەمبەر وای گوتبا (ﷺ) لە گۆزینکی موبارەکی پێغەمبەر (ﷺ) نیشانەی دەگرتەوە و وردە بەردەکانی لێدەدا و دەیگوت پێی بڕوا مەکەن ئەوە برازای منە هەر لە بچوکیەوە فرچکی بە درۆوە گرتوە و درۆتان لەگەڵ دەکا (پەنا بە خوای رب العالمين).

پێغەمبەر (ﷺ) لەو چرکە ساتەوە دەستیکرد بە دەعوە و بانگەوازی دوژمنی بۆ پەیدابون بە ئاشکرا سونەتی خوایی وایە بەڕێزان خۆشەویستان لە سوڕەتی (العصر) خوای رب العالمين پێهان نیشاندەدا دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ﴾ سوێند بەکات و زەمەن چونکە گرنگی کات و زەمەن لەوەدایە هەموو چاکەکان هەموو ڕوداوەکان وە ژیانی مرۆڤ و جنۆکەکانیش هەر لە زەمەن و کاتدایە بەسەری دەبەن لەبەر ئەوە الله سوێندی پێ خوارد

فەرموی سوێند بە کات: ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ﴾ هەموو مرۆڤەکان بە تێکڕا ئەلف و لامی (ٱلۡإِنسَٰنَ) ئیستیغراقیە واتە ئەوەی کەوا مرۆڤ و ئینسانە هەر هەمویان لە خەسارەتمەندیتان (فِي خُسۡرٍ) (فِي) فی زەرفیەیە واتە لەناو خەسارەتمەندیدا قوڵ بونەتەوە و نقوم بونە خەسارەتمەندی دەوری داون وەکو ژورێک کەوا لێی دابنیشن، ئینجا خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئیلا ئەوانەی بڕوا بێنن بە عیلم و زانستیەوە الله بناسن: ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ عەمەلیش بکەن بە ئیمان و الله ناسیەکەیان: ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ﴾ وە یەکتریش ڕابگەیەنن لەسەر حەق و ڕەوا دەعوە و بانگەوازیی بکەن بەرەو حەق و ڕەوا و ئیسلام و الله بە یەکگرتن: ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ [العصر: ١-٣] ئەگەر ئەوەشیان کرد بە دڵنیاییەوە کەسێک بڕواداری ڕاستەقینەبێ کار و کردەوە بکا بە (لا إله إلا الله) و کردەوە چاکەکان ئەنجام بدا خەڵکیش دەعوە و بانگەواز بکا بەرەو ئیسلام و ڕێی ڕاست و حەق دوژمنی لێ پەیدا دەبن لەبەر ئەوە دەبێ یەکتر ڕابگەیەنن بە سەبر و ئارامی ئارامی و سەبرتان هەبێ وەکو پێغەمبەر هەیبوو (ﷺ) لە دەعوە و بانگەوازیەکەیدا لە داهاتودا چەند دیمەنێک دەخەینە بەر گوێچکەتان ئەو کاتە دڵنیا دەبن سەبری پێغەمبەر (ﷺ) چەند بوە وە هی سەحابە بەڕێزەکانیشی.

بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) هەر لەو ساتە وەختانەدا بوو کەوا سەرەتا نزیکەی چل و هەندێک نەفەر بونە موسڵمان ابن هیشام و ئەهلی سیرە وا ڕیوایەت دەکەن ابن کەثیریشی لەگەڵ -رحمهم الله-، لەبەر ئەوەی ئاسان نەبو دەعوە و بانگەوازی لەناو ئەو قوڕەیشیە دڵ ڕەقانە لەناو ئەو خەڵکە بە دەسەڵاتە، پێغەمبەر (ﷺ) تاقە سوار بوو لە سەرەتادا تەنها لە ماڵەوە خەدیجە لەگەڵێدابوو لەگەڵ کچەکانی و لەگەڵ ئیمامی عەلی ئامۆزای -رضي الله عنهم- کەسی وای لەگەڵدا نەبوو لە دەرەوەش چەند کەسێک بون لەبەرئەوە نەیدەتوانی پێغەمبەر

(ﷺ) زۆر بە فراوانی دەعوە و بانگەوازیەکەی فراوان بێ تەنها چل و هەندێک نەفەر بڕوایان پێهێنا.

ئینجا ئیمانی عومەر و ئیمانی حەمزەش حەمزە لە پێش عومەرەوە -رضي الله عنهما- بوە موسڵمان ڕوداوەکەی ئیمانی حەمزەش هەندێک لە مێژونوسان دەفەرمون مورسەلە هەندێکیش کاری پێدەکەن و دەیهێننەوە دەڵێن جێگای پەند و وانە و عیبرەتە، جارێک لە جارەکان ئیمانی حەمزە دەگەڕێتەوە لە یەک لە ڕۆژەکان چوەتە ڕاو و هاتەوە لە ڕێگادا جاریەیەکی عەبدوڵای کوڕی جەدعان کە جاریەکە موسڵمانیش نەبوو بەڵام سۆزی مرۆڤایەتی هەستا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کە بەرەبەیانیەکەی بینیبوی ئەبو جەهل لەسەر کێوی سەفا و لەو ناوەڕاستان ڕێگای بە پێغەمبەر گرتبوو (ﷺ) جوێن و قسەی نالەبار و سوکایەتی بە پێغەمبەر کردبوو گوتبوو (ﷺ)، لە یەکێک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ وردە بەردی هێنابوو لەنێو چاوانی موبارەکی پێغەمبەریشی دەدا (ﷺ) تا بەخوێنیدا هێنا، جا ئەو جاریەی عەبدوڵای کوڕی جەدعان دڵی بە پێغەمبەر سوتا (ﷺ)، حەمزەی شێری الله و شێری پێغەمبەرەکەی الله (ﷺ) کەوانی لە دەستە و لە دەستێک شمشێر کەل و پەلی ڕاوی پێیە و بە ئارەقە و ماندبونەوە دەگەڕێتەوە ئەو جاریە ڕێگای پێدەگرێ سۆزی حەمزەی دەجولێنێ و هیچی تری پێ ناکرێ، دەڵێ حەمزە تۆ لەکوێ بوی؟ نەتبینی ئەمڕۆ من ئەبو جەهلم بینی لە کێوی سەفا ڕێگای گرتبوو بە برازاکەت وردە بەردی لەنێو چاوانی دەدا هەتا بە خوێنیدا هێنا ئینجا جوێن و سوکایەتی و قسەی ناشرینیش مەپرسە چەندی پێگوت، دەڵێ تۆ ڕاست دەڵێی و وا ڕویداوە؟ دەڵێ بەڵێ، دەڵێ تۆ لە ڕاو بوی و ئاگات لێ نەبوو، حەمزە دەڵێ ئێستا لەکوێیە ئەبو جەهل؟ حەمزە غیرەی دەجولێ بۆ برازاکەی و بەخۆی و کەوانەکەی بە ئارەقە ڕشتنەکەی کە لە ڕاو هاتوەتەوە و کردویەتی دەچێتە سەر سەری ئەبو جەهل کۆڕیان بەستوە و لە مەجلیس و کۆڕ دانیشتون و ئەبو جەهل

دەگێڕێتەوە و خەڵکەکەی تریش لە کافرەکان لە قاقای پێکەنین دەدەن دەڵێن موحەمەدی وا لێکردوە(ﷺ)، حەمزەی پاڵەوان دەچێ لەسەر سەری ئەبو جەهل ڕادەوەستێ چونکە مێژونوسان دەفەرمون هیچ کەسێک نەبوە لە قوڕەیشیەکان بە قەد حەمزەی پاڵەوان ئازا بوبێ هەر هەموو تیرەی قوڕەیشیەکان لێی دەترسان و حیسابیان بۆی دەکرد هیچ کەس نەیگەشتوەتێ لە ئازایەتی و غیرەت گەشتبێتە حەمزەی مامی پێغەمبەر (ﷺ) وە هەم برای شیری پێغەمبەریش بوو (ﷺ)، گوتی بۆم هەستەوە ئەبو جەهل من بیستومە تۆ ئەمڕۆ ئیهانە و سوکایەتیت بە برازاکەم کردوە موحەمەد (ﷺ)؟ ئەویش گوتی بەڵێ چونکە ئەو سوکایەتی بە خوایەکانی ئێمە دەکا، گوتی دیارە تۆ نەتزانیوە ئەی ئەبو جەهل کەوانەکەی بڵند کرد لە یەک لە ڕیوایەتەکان لە تەختی نێو چاوانی ئەبو جەهلیدا بە خوێنیدا هێنا و ڕیشی ئەبو جەهل سور بوو لە خوێندا و ئینجا حەمزە پێی گوت تۆ نەتزانیوە من ئیمان و بڕوام هێناوە بە برازایەکەم؟ ئەو پێغەمبەری اللەیە.

دەڵێ خزم و کەسەکانی ئەبو جەهل و دار و دەستەی کەوتنە خۆ هەڵبستنەوە ئەبو جەهل دەیزانی حەمزە چ پاڵەوانێکە لەوێ دەبێ خوێن سەرکان ببا بنەماڵەی ئەبو جەهل لە ڕەگ و ڕیشە دەردێ تازە یەکسەر گوتی حەقی خۆیەتی و تۆڵەی خۆی سەندوەتەوە حەمزەی پاڵەوان لێی بگەڕێن دابنیشن لە شوێنی خۆتان و هیچمان پێ لەگەڵی ناکرێ، ئینجا ئیمامی حەمزە هات بەدوای پێغەمبەردا گەڕا (ﷺ) هەتا دۆزیەوە و فەرموی تۆڵەم سەندەوە لە ئەبو جەهل لەنێو کۆڕ و مەجلیسەکەی خۆیدا و ڕێگام پێ نیشاندە تازە من وام گوتوە دەبێ ڕاستگۆ دەربچم و بەڕاستی ببمە موسڵمان بوە موسڵمان.

چەند ڕۆژێکی خایاند عومەری کوڕی خەتابیش بوە موسڵمان، لە ڕوداوی ئیمامی عومەر کە دەڵێن بوەتە موسڵمان چەندین ڕیوایەت هەن بەڵام ڕیوایەتی لە هەمویان سەحیحتر و تەواوتر ئەوەی چوەتە لای خوشکی و لەوێ خەبابی بینیوە ئەوانە هیچیان سەحیحی تەواو

نین لەبەر ئەوە مێژونوسان هەر بە کورتی دەیڵێن لە ڕوی سحەتەوە دەفەرمون عەبدوڵای کوڕی مەسعود فەرمویەتی «مَا زِلْنَا أَعِزَّةً مُنْذُ أَسْلَمَ عُمَرُ[١]» تەنها ئەو ڕیوایەتە سەحیحە کە عەبدوڵای کوڕی مەسعود فەرموی ئێمە بەعیزەت بوین موسڵمانەکان پێشتر ژێر دەستە بوین زەلیل بوین بەڵام لەو ڕۆژەی عومەر بوە موسڵمان موسڵمان هەمویان بە عیزەت بون و هەر بە عیزەت ژیان.

ئینجا بۆچونی ڕاجیح و پەسەند دۆعاکەی پێغەمبەر بوو گیرابوو (ﷺ) کە فەرموی «اللَّهُمَّ أَعِزَّ الْإِسْلَامَ بِأَحَبِّ هَذَيْنِ الرَّجُلَيْنِ إِلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ، أَوْ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ[٢]» فەرموی ئەی خوای رب العالمین لەبەرت دەپاڕێمەوە بە یەکێک لەو دوو پیاوانە کامیان لەلای تۆ خۆشەویستە بەو ئیسلام بە عیزەت بخە ئەی خوای رب العالمین کە ئەبو جەهلە و یان عومەری کوڕی خەتاب، ئینجا دیارە زانایان دەفەرمون «وَكَانَ أَحَبَّهُمَا إِلَيْهِ: عُمَرُ» بەدیار کەوت کە لەو دوو پیاوانە خۆشەویستەکە لەلای الله عومەری کوڕی خەتاب بوو.

ئەوەبوو موسڵمانان عەزیەت دەدران پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێکیان ئەبو بەکری سدیق هاتە لای فەرموی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) حەز بەوە دەکەم کە دایکە عائیشە بۆمان ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ باوکم چوە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی حەزم بەوەیە بێم لەلای (کعبة الله) وتارێک بخوێنمەوە و بە گوێچکەی قوڕەیشیەکان تەواودا بچرپێنم کە (لا إله إلا الله) مەعنای چیە؟ پێغەمبەریش فەرموی (ﷺ) ئەی ئەبو بەکر ژمارەی موسڵمانان کەمە ڕەنگە بەرگریان پێ لێت نەکرێ، ئەبو بەکر عائیشە دەفەرموێ -رضي الله عنها- ئەوەندە پێداگری کرد و ئیلحاحی کرد پێغەمبەر ڕێگای پێدا (ﷺ)، پێغەمبەر هات بۆخۆی لەلای (کعبة الله) دانیشت موسڵمانەکان هەر کەسە لە سەرە گەڕەک و کۆڵانەکانی تیرە و هۆزەکانی خۆیان

[١] صحيح البخاري (٣٦٨٤) (٣٨٦٣).

[٢] سنن الترمذي (٣٦٨١)، مسند أحمد (٥٦٩٦).

دوربەدوری تەماشای ئەبو بەکر و پێغەمبەریان دەکرد (ﷺ) نەیاندەوێرا بێن لێی کۆببنەوە لەبەر توند و تیژی و خراپەکاریەکانی قورەیشیەکان بەرامبەریان.

لەبەر ئەوەیە زانایان دەفەرمون یەکەم وتاربێژ لە ئیسلامدا ئەبو بەکری سدیقە بۆیەکەمجار وتاری خوێندەوە لەلای (كعبة الله) ڕوی کردە قورەیشیەکان هەرکە دەستی پێکرد قورەیشیەکان هێواش هێواش غیرەی کوفر و بێدینیان جوڵا هاتن بەرەو لای ئەبو بەکری سدیق دەستیانکرد بە لێدانی ئەبو بەکری سدیق نەیانهێشت وتارەکەی تەواو بکا، بەڵێ زۆرجاران وایە لەلایەن ئەبو جەهلە ڕیشە و پیشەکانی ئەوانەی لەسەر ڕێی ئەبو جەهل دەڕۆن لە هەموو مێژوی ئیسلام هەر وابوە وتاربێژ و بانگخوازە حەق و ڕەوایەکان ئەگەری ئەوەی هەیە لێشیان بدرێ مەعنای ئەوە نیە بێ حیکمەتن، ئەوەی ئەمڕۆ بڵێ خەتیبەکە ئەگەر لادەدرێ یان لێیدەدرێ یان دەگیرێ یان ئەزیەت دەدرێ بەو مەرجەی خەتیبەکە خاوەن ئیمان بێ لەسەر ڕێبازی ڕاستەقینەی پێغەمبەری پێشەوابێ (ﷺ) عیلم و زانستی پێبێ و عەمەلیشی پێ بکا مەڵێن ئەوە حیکمەتی نیە و خراپە و نابێ ماموستا خەتیب داعی لێی بدرێ، یەکەم خەتیبی ئیسلام ئەبو بەکری سدیق پێغەمبەر لە پاڵیەتی و لە تەنیشتیەتی (ﷺ) هیچیشی پێ ناکرێ غەیری دۆعا، لێیدەدرێ هەتاوەکو عتبة بن أبي ربيعة هات و بە نەعل و پێڵاوەکانی لە دەموچاوی ئەبو بەکری سدیقیدا هەموی کردە برین هیچێک لە دەموچاوی نەما خوێنی لێ نەیە لەگەڵ ڕیش و دەموچاو و هەموی تێکەڵ یەک بوو کەس نەیناسیەوە لە بەنی تەمیم و وە لە خزم و کەس و کارەکانی ئەبو بەکر بە چوار دەستە و بە لەهۆش خۆچون ئەبو بەکریان بردەوە ماڵەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێنەکرا بە دەست هیچ بەرگریەکی لێبکا بەس بزانن هەڵوێستی ئەبو بەکری سدیق کە بردیانەوە ماڵەوە بەنو تەمیم هەموی لێی خڕبونەوە و گوتیان ئەبو بەکر دەمرێ ئەو کات ئێمەش قسەمان دەبێ لەسەر ئەو کەسانەی لێیانداوە خزم و

کەسەکانیان وایان گوت، ئەبو بەکری دانی ئێوارەکەی بەهۆش خۆی هاتەوە ئوم خەیری دایکیان بانگ کرد گوتیان نان و ئاوێکی بۆ بێنە، یەکەمجار ئەبو بەکر چاوی هەڵهێنا ئایە ترسابووو؟ خەتیبەکان ماموّستاکان داعیەکان ئەوانەی ڕێگای ئەبو بەکرتان گردۆتە بەر بە چاو سور کردنەوەیەک و لادانێک و عەزیەتدان و گرتن و ئەشکەنجە دانێک نابێ دەبێ وەکو ئەبو بەکری سدیق بن نابێ ترستان لێ بنیشێ و ڕێباز و ڕێگا ڕاستەکە بەربدەن، ئەبو بەکر چاوی هەڵهێنا یەکەم قسە ئەوەی کرد فەرموی «ماذا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)» پێغەمبەر لە دوای من چیکرد؟ خەمی خۆی نەبو خەمی پێغەمبەری بوو (ﷺ)، دایکی گوتی نان و ئاو بخۆ، فەرموی سوێند بە الله نابێ نە نان نە ئاو لە گەروی ئەبو بەکر بچێتە خوارەوە هەتا هەواڵی پێغەمبەرم بۆ دەهێنی (ﷺ)، گوتی لە کوێ هەواڵی بێنم؟ گوتی هەواڵەکەی بڕۆ لای ئوم جەمیلی کچی خەتاب چونکە ئوم جەمیل بە ژێر بە ژێری موسڵمان بوو بوو، هەرکە ئوم خەیر دایکی ئەبو بەکر چوە لای ئوم جەمیل، ئوم جەمیل گوتی نە ئەبو بەکر دەناسم نە موحەمەد دەناسم (ﷺ) نەیوێرا خۆی ئاشکرا بکا، گوتی بەڵام هەر ئەوەندەم پێدەکرێ ئەی ئوم خەیر لەگەڵت بێم بۆلای کوڕەکەت، گوتی دەوەرە لەگەڵم، هەرکە هات بینی ئەبو بەکر لەناو ئەو خوێن و ناخۆشیەدایە و هەموو لاشەی برینە یەکسەر لە هاواریدا هەم بۆ ئەوەی سەرنجی دایکی زیاتر ڕابکێشێ هەم بۆ ئەوەی خوشکێکی موسڵمانی ئەبو بەکر بوو زۆر دڵی پێی سوتا و گریا گوتی ئەی الله لەناویان ببا ئەوانەی کەوا تۆیان وا لێکردوە ئەی ئەبو بەکر، چیت بەسەر هاتوە؟ ئەبو بەکریش فەرموی واز لەمن بێنە بەڵام ئوم جەمیل پێغەمبەر چیدەکا (ﷺ) لەکوێیە؟ ئەویش ئیشارەتیدا گوتی ئەها ئەوە دایکت وا شت لێرە کۆدەکاتەوە و کافیرەیە ئایە قسە بکەم یان نا؟ گوتی گوێ بەو مەدە ئاساییە قسە بکە، گوتی لە ماڵی الأرقم بن أبي الأرقم ە، جا دایکی هات خواردنی بۆ ئەبو بەکر هێنا جاری دوەم گوتی ئەوە هەواڵت زانی دەبخۆ و بخۆوە، گوتی وەڵاهی سوێند بە الله

ئەمجارەش نابێ ئاو و خواردن لە گەروم بچێتە خوار هەتا بە چاوی سەر نەمبەن پێغەمبەر نەبینم (ﷺ).

ئەوە خۆشەویستی سەحابەکان بوو ئەوە دڵسۆزی پاسەوانەکان و حیمایەکانی پێغەمبەر بوو (ﷺ) لەسەر ئیسلام هەرچیان بەسەر دەهات باکیان بەس ئیسلام سەلامەت بێ و پێغەمبەری الله (ﷺ) هیچی بەسەر نەیە.

دەڵێ بە دوو دەستە ئوم جەمیل و ئوم خەیری دایکی ئەبو بەکری سدیق بردیان کە دونیا تەنهایی بوو خەڵک بە دەرەوە نەبو بۆ ماڵی الأرقم بن أبي الأرقم لەوێوە پێغەمبەر بینی (ﷺ)، فەرموی دڵم خۆشە ئەبو بەکر دەتبینم کەوا لەسەر پێ دەڕۆی سوپاس بۆ الله هیچی ئەوهات لێنەهاتوە ئەو برینانەش الله شیفات بدا، فەرموی من ئەوانەم ناوێ ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) فەرموی من دڵم خۆشترە بەوەی بە خزمەتت گەیشتم، لە یەکێک لە ڕیوایەتەکان دەفەرموێ پێغەمبەر هەستاوە بەپیر ئەبو بەکرەوە چوو توند سەری گرت و لە باوەشی خۆینا دەستیکرد بە ماچکردنی سەر و دەموچاو و شانی ئەبو بەکر هەموو سەحابەکانی تریش وایان کرد ئینجا قسەکانی لەگەڵ کرد، ئەبو بەکریش فەرموی ئەوە ئوم خەیری دایکمە هێشتا هەر کافیرەیە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) حەزدەکەم دۆعاشی بۆ بکەی وە داواشی لێبکەی ببێتە موسڵمان، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) دۆعاشی بۆ کرد داواشی لێکرد ببێتە موسڵمان خەیری ئەوەی پێوەبوو ئەو چونە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) لەو ئان و سات و کۆڕ و مەجلیسەدا دایکی ئیمامی ئەبو بەکر بوە موسڵمان.

ئەوە خەمخۆری ئەبو بەکر بوو لەبەر ئەوەیە ئەمڕۆ موسڵمانان دەڵێن ئێمە ژمارەیەک هەین بۆچی خوای رب العالمین سەرمان ناخا؟ لەبەر ئەوەی دڵسۆزیەکەی ئەبو بەکرمان نیە لەبەر ئەوەی قوربانیەکانی سەحابەکانمان لەناودا نیە، ئەمڕۆ بە ئەستەم ئەگەر چاوێکت لێ سورکرێتەوە و دینارێکت بڕوا ئا ئەو کاتە سەد بیانوو دەهێنیتەوە بەناوی حیکمەت کە

حیکمەت نیە هیچیان خۆت دوردەخەیتەوە لە بانگەوازی و دینداریەکەت و ڕێبازە ڕاستەقینەکەی الله و پێغەمبەر (ﷺ) بە خەڵکی نیشانی بدەی، ئەبو بەکر لەوێ خەمی ئەوە دەخوا موسڵمانێک زیادبێ هەم دڵسۆزی بۆ دایکی بە ئاگری دۆزەخ نەسوتێ وە هەم لەلایەکی تریشەوە دڵسۆزی بۆ ئیسلام کە موسڵمانێک زیاد ببێ.

کە کافرەکان ئەوانەیان زانی و موسڵمانانیان زۆر ئەزیەتدا ئەوەبوو موسڵمانەکان شوێنێکیان دۆزیەوە کە حەبەشە بوو کە مەلیکی ئەوێ بەناوی نەجاشی پاشاکەی ئەوێ دادپەروەر بوو نەسرانی بوو، ئەوەبوو کۆمەڵێک لە موسڵمانان هیجرەتیان کرد بۆ ئەوێ کە لەوێ جێگایان بویەوە و جێگیر بون کە عومەر بوە موسڵمان یەک لە بۆچونەکان دەڵێ هاتنەوە بۆ جاری دوەمیش دوبارە ئەزیەتدران و چونەوە کە ئەو شوێنەیان بە دەستکەوت قوڕەیشیەکان هەستان بڕیارێکی زۆر ترسنۆکانەی زاڵم و ستەمکارانەیاندا بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) گوتیان ئەوە لەوێ پەرە دەستێنێ و لێرە خەڵک وا زیاد دەکات کۆبونەوە سەرکردە قوڕەیشیەکان گوتیان چارەمان ئەوەیە موحەمەد بکوژین (ﷺ)، ئەو بڕیارەیاندا و چونە لای بەنو هاشم و بەنو عبد المطلب داوایان لێکردن موحەمەدیان تەسلیم بکەن کەسێک بیکوژێت و ئەوانیش هەموو کۆبنەوە خوێنێکی زۆر بدەنە بەنو عبد المطلب و ئەوانیش ڕازی بن و بە حیسابی قوڕەیشیەکان کە (نعوذ بالله) موحەمەد بەڵایە و لەکۆڵی خۆیان کردەوە، بەڵام ئەمری الله وا نەبوو بەنو عبد المطلب و بەنو هاشم دەستبەرداری پێغەمبەر نەبون (ﷺ) موسڵمانەکان لەبەر ئیسلامەتی وە خزم و کەسەکانی تریشیان لەبەر خزم و کەسایەتی و عەشایری پشتگیری ئەوەیانکرد گوتیان ئێمە قەتاوقەت موحەمەدتان تەسلیم ناکەین (ﷺ) بیکوژن، ئەوانیش بڕیاری ئەوەیاندا کەوا حەساریان لەسەر دابنێن بپچڕێ نێوانی قوڕەیشیەکان لەگەڵ بەنو هاشم و بەنو عبد المطلب، ئەوەبوو چون لە دۆڵی أبي طالب لەوێدا کۆبونەوە موسڵمانەکان و وە کافرەکانی خزم و کەسی پێغەمبەر (ﷺ)

تەنها ئەبو لەهەبی مامی پێغەمبەر نەبێ (ﷺ) ئەویان گەڕایەوە ناو قوڕەیشیەکان و شەرمی بەخۆی نەبو هیچ شتێک کاری تێ نەدەکرد کافربوو وازی هێنا لە پشتگیری کاریکردنی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوە لە ساڵی حەوتەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ڕویدا (ﷺ) لە ساڵی دەیەم کۆتایی پێهات سێ ساڵ لەو ئابڵۆقە ئابوری و ئیجتیماعیەی وە سیاسیەی پێغەمبەردا (ﷺ) ژیا لەگەڵ خزم و کەسەکانی لە موسڵمانەکان و لە کافرەکان جاری وابوو نان نەبو بیخۆن.

بەندی یەکەم ئەوەبوو نەدەبا ژنیان بدەنێ وە نەدەبا ژنیشیان لێ بخوازن.

وە بەندی دوەمی نوسراوێکیان نوسی کە لە کەعبە هەڵیان واسی گوتیان بۆ ئەوەی هەموو بەبەرچاومان بێ ئەویش ئەوەبوو نە شتیان پێ بفرۆشن و نە شتیان لێبکڕن لێنەگەڕێن کەسیش بچێتە ناویان بۆ کڕین و فرۆشتن.

وە بەندێکی تریان ئەوەبوو کەوا دڵیان پێیان نەسوتێ ئەگەر ببینن لە هەر حاڵ و بارێکدا دەژین هەر کەسێک هێرشیان بکاتە سەر یان چیان بەسەردا بێنێ قوڕەیشیەکان پشتگیری کاریان نەبن.

ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خديجة الكبرى ی هاوسەر و خێزانی و لەگەڵ کچەکانی وە لەگەڵ خزم و کەسەکانی موسڵمانەکان و وە کافرەکانیش کە لەگەڵی مانەوە ئەو سێ ساڵەیان زۆر بە ناخۆشی بەڕێکرد، بەڵام لە کۆتایەکەیدا خوای رب العالمين دڵی کەسێک لە کەسەکانی نەرمکرد لەنێو قوڕەیشیەکان کەوا ناوی هشام کوڕی عمرو کوڕی ربیعة کوڕی الحارث بوو چوە لای موتعیمی کوڕی عەدی ئەویش لە پاشان کۆمەڵێک لە قوڕەیشیەکانی تریان کۆکردەوە گوتیان بۆ ئێمە زۆر نەنگی و بێ ئابڕوییە ئەو خەڵکە لەوێدا وا لەبرسان دەیانەوێ بمرن خزم و کەسی ئێمەن موحەمەدیشیان تەسلیمی ئێمە نەکرد (ﷺ)، وەرن ئێمە لەو عەیبە خۆمان دەربێنین بچین سەحیفەکە لێبکەینەوە و وە لە

پاشانەکە سوڵح و ئاشتەوایی بکەین لەگەڵیان و با بێنەوە ناو قورەیشیەکان و بژین، ئەوەبوو خەڵکە قورەیشیەکە بە قسەی هیشام و موتعیمی کوڕی عەدییان کرد و وە پێغەمبەریش (ﷺ) هەواڵی ئەوەی پێیاندا لەو ئان و ساتە بوو فەرموی ئەو لاپەڕەی نوسیویانە مۆرانە کە یەکێکە لە سەربازەکانی الله چوە هەموی خواردوە ئیلا یەک وشەی نەتوانیوە بخوا ئەویش زکری خوای رب العالمین ە ئەویش ناوی خوای رب العالمین ی تێدایە.

بەڵێ قورەیشیەکان کە چون تەماشایان کرد لاپەڕەکە هیچی نەمابوو نوسراوەکە ئیلا ناوی خوای رب العالمین مۆرانە نەیتوانیبوو بیخوا، جا کەسێک بیەوێ دژایەتی الله بکا ئەوە بێنێتە بەرچاوی مۆرانە کە چەند بچوکە ئەگەر خوای رب العالمین فەرمانی پێبکا سەربازێکی ونی خوای رب العالمین ە لەناکاو دوژمنەکانی خۆی پێ دەشکێنێ، و ئاشتەواییەکە دروستبوو بەنو عبد المطلب و بەنو هاشم بە موسڵمان و کافرەکانیانەوە هاتنەوە ناو شاری مەککە و دۆڵەکەیان بەجێ هێشتوو پێکەوە ژیان و ئاشتەوایی دروستبوو تەنها ئەبو جەهل زۆر زۆری پێ ناخۆش بوو بەڵام هیچی پێ نەکرا لەگەڵ ئەو هەموو خەڵکە و قورەیشیەکان.

## ساڵی غەمگینی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) چەند مانگێک لە دوای ئەوەی ئابلۆقە ئابوری و سیاسی و ئیجتیماعیەی کە لەسەریان هەڵگیرا بەنو عبد المطلب و وە بەنو هاشم هاتنەوە ناو مەککە لەوێوە پێغەمبەر (ﷺ) پشتگیریکاری دەرەوەی ماڵی کە ئەبو تاڵیبی مامی بوو واتە باوکی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب -رضي الله عنه- ئەو پیاوە بەتەمەنە کە زۆر پشتی پێغەمبەری دەگرت (ﷺ) ئەمر و فەرمانی الله وابوو وەفاتی کرد و گەڕایەوە لای خوای رب العالمین، لە سەرەمەرگدا پێغەمبەر دەچێ (ﷺ)

وەفائەن بۆ ئەو هەموو چاکانەی ئەبو تاڵیب بۆی هەبوە کەوا هیدایەتی ببێ بەڵام کەسێک الله ڕێنمونی نەکا و هیدایەتی تەوفیقی نەدا هیچ هێز و قوەتێک نیە هیدایەتی بدا، ئەبو جەهل لەسەرینگانی دەبێ لەگەڵ چەند قورەیشیەکی تر پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) کارێکی وابکە مامە هەتا پێم بکرێ ڕزگارت ببێ لە مەیدانی حەشر و حیساب و قیامەت بڵێ (أَشْهَدُ أَنّ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا الله وأَشْهَدُ ان محمداً رسول الله) لەو لاوەش ئەبو جەهل پێی دەگوت لادەدەی ئەبو تاڵیب لەو تەمەنەی خۆت لە ڕێگای باب و باپیرەت؟ ئەوەبوو ئەبو تاڵیب شەرمیکرد لەبەر ئەبو جەهل و دەوروبەری هیدایەت و ڕێنمونی تەوفیقی نەبو شاهێدومانی بەسەر زمانیدا نەهات و پێغەمبەر هیچی بۆ نەکرا (ﷺ)، تەنها ئەوەندەی پێکرا وەکو عەباس پێی دەڵێ ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەوەی ئەبو تاڵیب بۆتۆی کرد هیچ کەسێک بۆتۆی نەکرد بەڵام تۆ چیت پێکرا بۆی بکەی؟ پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) سوێند بە الله هەر ئەوەندەم پێکرا کە ئازار و ئەشکەنجەکانی ناو جەهەنەم یەکجار زۆربوو: ﴿فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ [النساء: ١٤٥] دەبوو بەڵام من وام لێکرد ئێستا بە تکا و شەفاعەتەکەم هەر لەناو جەهەنەم هەمیشەییە بەڵام دوو پۆلی ئاگر لەژێر پێی دادەنێن ناو مێشکی لەگەڵی دەکوڵێت ئەوە کەمترینی عەزابی ئاگری دۆزەخە (پەنا بە خوای رب العالمین)، چونکە خوای رب العالمین ئایەتی ڕەوانەکرد فەرموی: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾ [القصص: ٥٦] ئەی موحەممەد (ﷺ) بەتۆ ناکرێ ئەوەی خۆشتویست و سۆزت بۆی هەبوو ڕزگاری بکەی و هیدایەت و ڕێنوێنی تەوفیقی بکەی لەبەر ئەوەی هیدایەت و ڕێنمونی دوو بەشی سەرەکیە یان تەوفیقیە تەنها لە دەست اللهیە کە لە کوفرەوە خەڵک پێی دەبێتە موسڵمان لە گوناحەوە پێی دەبێتە چاکەکار و تەوبەکار و دەگەڕێتەوە یان هیدایەتی ئیرشادی و ڕێنمونیە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەس دەیانتوانی ڕێنوێنی بکەن و هیدایەتی ئاشکرا کردنی دەعوە و ڕێنیشاندانی بکەن.

جا له پاشان به ئیختیلاف لەنێوان زانایان هەندێکیان لەوانە ابن کثیر -رحمه الله- دەفەرموێ تەنها سێ ڕۆژی خایاند خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەریش (ﷺ) لەپاش مردنی ئەبو تاڵیب واته پشتگیریکارەکەی ماڵێی ئەوەی دڵی دەدایەوه ئەویشیان وەفاتی کرد و گەڕایەوه لای الله بەڵام ابن جەوزی بەغدادی -رحمه الله- دەفەرموێ دوو مانگ هەتا سێ مانگی خایاند لەپاش مردنی ئەبو تاڵیب ئینجا خەدیجه وەفاتیکرد ئەو ساڵه ناوی لێنرا (عام الحزن) واته ساڵی غەمگینی بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، له ماڵەوه دڵ دەرەوەی نەما له دەرەوەش پشتگیری کاری نەما مامەکەی ئەبو تاڵیب بەڵام الله بەسیەتی -جل شئنه- هەر ئەوی لەگەڵدا بوو خوای رب العالمین سەریخست.

## چەند دیمەن و وێنەیەك له ئازار و ئەشكەنجەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

بەڵێ ئەو ماوه مێژونوسەکان دەفەرمون له کاتی مەککەدا و له پاش دەعوه و بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ) که به ئاشکرا کردی چەندین خاڵی تێدایه له ئەزیەت و ئازار و هەڵسوکەوتی قورەیشیەکان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) و لەگەڵ موسڵمانەکان.

خاڵی یەکەم ئەوەبوو زۆر ئازار و ئەزیەتیان دەدان به قسه و دیعایه لەشوێن کردن به جوێن پێ فرۆشتن به سوکایەتی پێکردن تەنانەت به لێدان و به گرتن، وه هەتا گەیشته پلەی ئەوەی به کوشتن کاتێ کەوا سومەیه و یاسر ئەو بنەماڵەی تازه موسڵمان بوو بون ئەبو جەهل و پیرەکانی ئەبو جەهل وازیان لێیان نەهێنا له یەک له ڕیوایەتەکان پێغەمبەر (ﷺ) بەلایاندا چوو لەژێر ئەشکەنجه بون هیچی پێ نەکرا بۆیان، یاسر گوتی چیمان لێدەکەی پێغەمبەر (ﷺ)؟ بەسترابۆوه و ئەشکەنجه دەدرا پێغەمبەریش فەرموی (ﷺ) «صبراً آل یاسرٍ، فإنَّ موعدَكم الجنةُ» واته له دونیادا هیچم پێ ناکرێ بۆتان ئارامتان هەبێ بەهەشت بۆ ئێوەیه سەبر بگرن، سەبریان گرت و یاسر له ژێر ئەشکەنجەدا تەمەنی له دەستدا و گیانی دەرچوو گەڕایەوه لای خوای رب العالمین، سومەیەش ئەبو جەهلی ڕق له دڵ وازی لێ

نەهێنا و هاتە سەر سەری ڕۆژێک لە ڕۆژەکان کە لە زەوییان بەستبابۆوە هەردوو قاچەکانی و دەستەکانی ڕوە و ئاسمان دەیڕوانی ئازاریان دەدا و ئەبو جەهل پێی گوت ئەوەی من بیستومە سومەیە تۆ ئیمان نیە بە موحەمەدت هێناوە بەڵکو ئاشقی موحەمەد بوی لەبەر جوانی یان ئەویندارای و دڵدارییە لەگەڵی دەکەی؟ سومەیە ئەوەی پێ قبوڵ نەکرا وەڵامی دایەوە لە هەندێک لە ڕیوایەتەکان دەڵێن بە قسەی ناخۆش لە هەندێکی دەڵێن تفێکی کرد لە ڕوی ئەبو جەهل و ئەبو جەهل حەڕبەکەی دەرهێنا و لە دامێنی سومەیەیدا و ئا لەوێدا گیانی دەرچوو، یەکەم شەهیدە کە بە دەستی کافرەکان کوژرابێ خوێنی ڕژابێتە خاکی مەککە سومەیەی کچی خیاط بوو.

لە پاشان ڕوبەروبونەوە موسڵمانەکان و پێغەمبەریان کرد (ﷺ) بەوەی چەندین مفاوەزاتیان لەگەڵ پێغەمبەر کرد (ﷺ) وەرە ماڵت دەدەینێ وەرە پلە و پایەت دەدەینێ جوانترین ئافرەتت بۆ دەخوازین ئەگەر نەخۆشی باشترین پزیشکت بۆ دەهێنین چارەسەرت بکا ئا ئەوانەش نرخی نەبوو پێغەمبەر هەر خەریکی بانگەوازی و الله بەیەکگرتنەکەی بوو ڕایدەگەیاند بە خەڵکی، لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) هەر خەریکی ئەوەبوو هاوەڵەکانی لەسەر عەقیدە و بیروبڕوا پەروەردە دەکرد بۆ ئەوەی ببنە پۆلی یەکەمی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی و بانگەوازی ڕاستەقینە، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش بەدەر نەبو لە ئازار و ئەشکەنجەکان، هەندێک وێنە لەو وێنانەی پێغەمبەر ئازار و ئەشکەنجەی پێخواردوە:

یەک لەوان عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط ئا ئەو پیاوە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی قوڕەیشیەکان، لە سەرەتا پیاوێکی نەرم و نیان بوو بە تەبیعەت وابوە کە بۆمان دەگێڕێتەوە ابن عەباس لە یەک لە ڕیوایەتەکان کە ئەلبانیش قبوڵیەتی ئەو ڕیوایەتە و دەیکاتە شاهێد بۆ ڕیوایەتەکەی تریش ئێستا بۆتان دەگێڕینەوە دەڵێ وەرگیراوە و قبوڵ کراوە ابن عەباس دەفەرموێ عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط وەکو قوڕەیشیەکانی تر نەبوو دەهات لە کۆڕ و

مەجلیسی پێغەمبەر دادەنیشت (ﷺ) لەسەرخۆبوو گوێی دەگرت لە پێغەمبەر (ﷺ) قسەی ناخۆشی پێ نەدەگوت ئازاری نەدەدا بەڵام لەولاوە برادەرێکی گیانی بە گیانی هەبوو کە لەیەک لە ڕیوایەتەکان کەوا ابن مەسعود ڕیوایەتیکردوە ئەویشیان تەبەرانی و ئەبو داودیش هێناویەتیەوە و هەیثەمیش لە مجمع الزوائد دەفەرموێ لەو ڕیوایەتەی دوەمەوە ئەو کەسەی گیانی بە گیانی لەگەڵ عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط برادەر بوو زۆر یەکتریان خۆش دەویست ئوبەی کوڕی خەلەف بوو، چوبوو بە تیجارەت بۆ شام هەرکە هاتەوە لەماڵەوە شەوێ پرسی دەنگوباسی ئەو موحەمەدە چی لێهاتوە (ﷺ)؟ لە هاوسەرەکەی ئوبەی کوڕی خەلەف پرسی، گوتی وەڵا پەرەی سەندوە و خەڵک زۆر بەدوای کەوتوە، گوتی ئەی برادەرە گیانی بە گیانیەکەم عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط دەبێ چیبکا؟ ئەو چی لێهاتوە؟ گوتی وەڵا ئەویش دەڵێن بەدوای ئەو کەوتوە چونکە دەچێ دادەنیشێ و خۆی لێ بێدەنگ دەکا وەکو ئەبو جەهل و ئەوان ناکا قسەی پێ بڵێ و بەدرۆی بێنێتەوە، دەڵێ ئاخیری وای لێهات کەوا بەیانی هاتە دەرەوە ئوبەی کوڕی خەلەف لە بازاڕدا عوقبەی کوڕی ئەبی موعیطی بینی ڕوی لێوەرگێڕا عوقبە سەلامی لێکرد سەلامی لێوەرنەگرتەوە، گوتی لەبەرچی وام لێدەکەی ئەی ئوبەی؟ گوتی من بیستومە تۆش داوتە ئەو نەفامی و نەزانیەی بەدوای موحەمەد کەوتوی (ﷺ)؟ گوتی نەخێر وا نیە بەڵام من وەکو قوڕەیشیەکانم لەگەڵ نەکردوە سوکایەتی پێبکەم، گوتی ئەو ڕوەی من لەتۆ حەرام بێ برادەرایەتیمان نەمێنێ قوڕەیشیەکانیش بە خراپی ناوت دەهێنن بزانە عوقبە هەتا تۆ نەچی قسە بە موحەمەد نەڵێی.

بزانن عوقبە بۆ ئەوەی برادەرایەتی ئوبەی لەدەست نەدا شەیتان ئەو فێڵەی لێکرد لەناو قوڕەیشیەکان ناو بداتەوە و پشتگیری لێبکەن، ئەوەبوو گوتی چیبکەم باشە ئەی ئوبەی؟ گوتی بڕۆ لە کۆڕ و مەجلیسەکەی دانیشە تف بکە ڕوی پێغەمبەر (پەنا بە الله) پێیگوت

«إلا أن تدفل بوجه رسول الله (ﷺ)» ئەویش نەیگوت (رسول الله) گوتی موحەمەد ئێمە دەڵێین (رسول الله)، گوتی بڕۆ تف بکە ڕوی پێغەمبەر (ﷺ) (پەنا بە الله).

عوقبەی گێلی گەمژەی نەزان بە قسەی ئوبەی کوڕی خەلەف لەگەڵ قوڕەیشیەکان هات لە کۆڕ و مەجلیسی پێغەمبەر دانیشت (ﷺ)، کاتێ کەوا پێغەمبەر دەستی کرد بە قسە عوقبە تفێکی کۆ کردەوە زمانی شەلەل بێ وەکو شەلەل بوو لەناو بچێ وەکو لەناو چوو ڕویکردە پێغەمبەر و (ﷺ) تفێکی لەڕوی موبارەکی چواردەی مانگی گەشاوە (وەکو مانگ گەشاوەبوو ڕوی پێغەمبەر (ﷺ)) عوقبە تفەکەی لە ڕوی پێغەمبەر کرد (ﷺ) بە ناشیرین ترین وشە جوێنی پێدا، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بەغیرەت بوو فەرمانی بەدەست نەبو ملی عوقبە بگرێ و لەوێدا تۆڵەی لێ بستێنێتەوە بەڵام غیرەتی جوڵا پێغەمبەر (ﷺ) ڕوی تێکرد و گوتی بزانە عوقبە ئەوە نێوان من و نێوان تۆ ڕۆژێک دادێ ڕەنگە لە مەککە دەربچی ئەو خێڵ و عەشیرەت و قوڕەیشیانە نەبن لە پشتت بن ئەگەر لە شاخەکانی مەککە دەرچوی سوێند بە الله ئەوە وەعدبێ لەبەینی من و تۆ ئەی عوقبە ئەوها بڕیار دەدەم بە خوای رب العالمین سوێند دەخۆم دەبێ لەسەرت بدەم و بتکوژم بە کوشتنێکی لەسەرخۆ لە تۆڵەی ئەو تفەی تۆ کردتە من ئەی عوقبە بەڵام با بۆت بمێنێ و ڕۆژی خۆت دادێ، هەر ئەوەندەی پێگوت پێغەمبەر (ﷺ)، بزانن خوای رب العالمین چی بۆ پێغەمبەر دەکا؟ پێغەمبەر لەسەر ئیسلام تف لە ڕوی کرایە ئەی مامۆستای بەڕێز ئەی داعیەکان ئەی خەتیبەکان ئەی موسڵمانان بەدڵنیاییەوە ئێوەش ئەگەر ڕاست بکەن و ڕێی پێغەمبەرتان گرتبێ (ﷺ) دەبێ لەلاتان زۆر ئاسایی بێ پێڕانی ئەبو جەهل و عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط و وە لە پاشان ئوبەی کوڕی خەلەفێک هەبێ خەڵکێک هان بدات سوکایەتیت پێ بکرێ و تف لە ڕوت بکرێ تۆش ڕەنگە هەندێک جار دەسەڵاتیشت نەبێ بەڵام شتەکە لە

دڵ و مێشکت هەڵگرە ئەگەر کەسەکە نەبوە موسڵمان لە ڕۆژی خۆیدا موسڵمان بەغیرەتە وەکو پێغەمبەر (ﷺ) تۆڵەی ئیسلام و ڕوی خۆت کە موسڵمانی لێی بکەوە.

ئەوەتا جەنگ جەنگی بەدرە سەحابەکان بۆمان دەگێڕنەوە لەوانە ابن عەباس دەفەرموێ لە جەنگی بەدردا عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط گوتیە قوڕەیشیەکان با لەگەڵتان نەیەم، ئەبو جەهل گوتی لەبەرچی؟ گوتی وەڵا من شتێکم هەیە لەگەڵ موحەمەد (ﷺ) سوێندی لە من خواردوە ئەگەر لە شاخەکانی مەککە دەرچم لە هەر شوێنێک بمبینێ بە لەسەر خۆیی بمکوژێ منیش دڵنیام قسەی خۆی دەهێنێتەجێ ئەگەر لە دەستی بێ، گوتیان وەرە مەترسە ئێمە حوشترێکی سوری چالاکت دەدەینێ لە مەیدانی جەنگی بەدر ئەگەر ئێمە لە پاشەکشەدا بوین تۆ خێرا ڕابکە و خۆت قوتار بکە، دەڵێ یەکسەر پێغەمبەر (ﷺ) لە جەنگی بەدر کە زاڵبوو بەسەر قوڕەیشی و کافرەکاندا ئەلەوێوە عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط ویستی بە حوشترە سورەکەی ڕابکا و هەڵبێ بەڵام سوارچاکەکانی پاسەوانانی تایبەتی ئیسلام و موحەمەد (ﷺ) ئەو ڕۆژە ڕۆژی فورقان بوو ڕۆژی بەرز کردنەوەی (لا إله إلا الله) بوو ئەو ڕۆژە بوو کە تۆڵەکان دەستێندرایەوە ئەو ڕۆژە بوو کە قوڕەیشیەکانی بە کەیفی خۆیان گاڵتە و گەپیان دەکرد بە موسڵمانان لە کاتی مەککە کە هێزیان هەبو ئەو ڕۆژەیە کەوا هێزیان نەما و دەبێ تۆڵەیان لێ بستێنرێتەوە و لوتیان لە زەوی بچەقێنرێ لەبەر ئەوە حوشترەکە ساتمەیەکی کرد و لە یەک لە چۆڵەوانیەکان مەفرەزە و لەشکری موسڵمانان بەسەر عوقبەدا هەڵگەیشتن و توند گرتیان و بردیانە ناو دیل و ئەسیرەکان کە حەفتا لە کافرەکان دیل و ئەسیر و ژێر دەستەی موسڵمانان بون.

کاتێک جەنگ کۆتایی پێهات پێغەمبەر ڕوی سوڕاند (ﷺ) وا دەبینێ عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط ئەوەی تفی کردوەتە ڕوی پێغەمبەر (ﷺ) وە لەپاش ئەو تفە ئەو عوقبە بەوەندەش نەوەستا جارێک لە جارەکانی تریش لەلای (کعبة الله) عابای لە گەردنی

پێغەمبەر توند کرد (ﷺ) پێغەمبەر فەرموی سوێند بە الله ئەگەر عوقبە عاباکەی بەرنەدابا و شلی نەکردباوە خەریک بوو هەردوو چاوم دەر بپەڕێ، وە جارێکی تریش بە فیتی ئەبو جەهل و ئەوان چەند ڕیخۆڵەک و پیسایی و پاشماوەی قەسابخانەکانی قوڕەیشەکان هەبو عوقبە هێنای لەسەر ملی پێغەمبەری (ﷺ) دانا کە لە سوجدە و کڕنۆش بردن بوو، کەس نەبو بتوانێ لەسەر ملی لابدا فاتیمە ئەو کاتە تازە پێڕادەگەیشت گەنج بوو هات لەسەر ملی لایدا و گوتی بۆ وا لەو پیاوە دەکەن کە موحەمەدە (ﷺ) قسە و جوێنی پێدان و پێغەمبەری بردەوە ماڵ (ﷺ).

پێغەمبەر ئاوڕی سوڕاندەوە لە جەنگی بەدر عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط وا لەناو ئەسیرەکانە پێغەمبەر چاوی سور بوو (ﷺ) فەرموی هەی هەی سەحابەکان ئەوە عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط کەوا تفی کردوەتە ڕوی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککە عابای لە گەردنی توند کردوە ڕیخۆڵەکی بەسەردا داوە چۆن دەبێ بە دیلی بگیرێت و بمێنێ لەسەر ڕوی زەوی؟ وەڵاهی ئیمامی عەلی دەفەرموێ هەر ئەوەندەم گوێ لێبوو سەحابەکان هەرکەس هەڵیکێشا شمشێر ئەگەر یەک کەس لە سەحابەکان بکەوتایە بەر دەستی سەحابەکەی تر چاوی نەیدەبینی سەری پەل بدابا بەڵام دەڵێ خۆشبەختانە من پێش هەمویان گەشتمە عوقبە لەناو دیلەکان دەرم هێنا فەرموم ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) دایکم و باوکم بە فیدات بێ چی لێبکەم؟ فەرموی «أقتلوه صبرا» بە لەسەر خۆیی بیکوژە و تۆڵەکەی لێبکەوە لەناوی ببە.

لەبەر ئەوە بەڵێ ئەسیر و دیلەکانیش هەتا ئێستا بۆچونی جمهوری عولەمای ئەهلی سونە و جەماعە ئەگەر خەلیفەی موسڵمانان ئەگەر ئەمیری موسڵمانان ئەمیری شایستەبێ بڕیار بەدەست ئەو دەبێ بۆ چاو شکاندنی کافرەکان ئایە بیانکوژێ یان بیان هێڵێتەوە یان فیدیەیان لە بەرامبەر وەربگرێ یان ئاوا بەڕەڵایان بکا و بیانداتەوە.

بەڵێ عوقبە لەوێ کۆتایی پێهات هەر چەند ساڵێک توانی، ئەگەر موسڵمانان ئارامیان هەبێ لە دەعوە و بانگەوازیەکی ڕاستەقینەدا هێزی لەشکری شەیتانی و کافر و بێدینەکان وەڵاهی هەر چەند ساڵێک دەتوانن خۆیان ڕابگرن لە کۆتایەکەی خوای رب العالمین ئارام و سەبری دڵی موسڵمانان دەهێنێ تۆڵەیان لێ دەستێنێتەوە ڕسوایان دەکا.

بەڕێزان و خۆشەویستان جارێکیتر پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) تەماشا بکەن و سەرنج بدەن ئازار و ئەزیەتیەکی تری پێغەمبەر (ﷺ) کە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە ئەبو هوڕەیرە بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ ئەبو جەهل جارێک لە جارەکان هات بینی پێغەمبەر (ﷺ) وا لە کڕنۆش و سوجدە بردندایە لە ڕوە و (كعبة الله).

لەبەر ئەوەی نوێژەکان ڕاستە پێنج نوێژە فەرزەکە فەرز نەکرابوو هەتا پێغەمبەر چوە ئاسمان و شەوی ئیسڕا و میعراج (ﷺ) بەڵام لە سەرەتای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەهلی سونە و جەماعە یەکدەنگن بە ڕیوایەتی سەحیح دەیهێنن کە جوبڕائیل هات لە یەک لە دۆڵەکانی مەککە پێغەمبەری فێرە نوێژ و فێرە دەستنوێژ شۆردن کرد لەوێوە پێغەمبەر (ﷺ) دو ڕکاعەت دو ڕکاعەت نوێژەکانی دەکرد خەدیجەی خێزانیشی فێرکرد وە لە پاشان عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی ئامۆزاشی فێرکرد کە سەرەتا موسڵمان بون دوو ڕکاعەت دوو ڕکاعەت نوێژ هەر لەسەریان بوو دەیانکرد هەتا پێنج نوێژە فەرزەکە لەسەریان فەرزکرا لە شەوی (ئیسڕاء و میعڕاج)دا.

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو هوڕەیرە دەفەرموێ ئەبو جەهل هات پێغەمبەر نوێژی دەکرد لەلای (كعبة الله) ئەبو جەهل ڕویکردە دار و دەستەکەی خۆی و قوڕەیشیەکان و کافرەکان گوتی ئەوە چیە؟ موحەمەد هەر ئێستاش بەردەوامە بە ئاشکرا دێ کڕنوش و سوجدە دەبا بۆ خواکەی خۆی قسە دەڵێ بە خوایەکانی ئێمە «واللّاتِ والْعُزّى، لَئِنْ رَأَيْتُهُ يَفْعَلُ ذلكَ لَأَطَأَنَّ على رَقَبَتِهِ -أَوْ لَأُعَفِّرَنَّ وَجْهَهُ» گوتی ئەمجارە من ببینم موحەمەد وا بکا خۆی هەڵکێشا ئەبو

جەهلی ناپاڵەوانی نەزان وایزانی بە پێغەمبەر دەوێرێ (ﷺ)، گوتی ئەمجارە من ببینم دەچم قاچ دەخەمە سەر گەردن و ملی دەبێ لوت و دەموچاوی لە خۆڵ وەردەم و بیچەقێنم بە تەواوی نەیەڵم سەر ڕاست بکاتەوە مادەم وا دەکات و کڕنوش بۆ خواکەی خۆی دەبا، دەڵێ ئەبو جەهل هات پێغەمبەر وابوو (ﷺ) لە سوجدە بردندا بوو لەناو نوێژدا بوو هات کە بە حیسابی خۆی وا لە پێغەمبەر بکا (ﷺ) هەنگاو بە هەنگاو لە ئاخیر چرکەساتدا خوای رب العالمین سونەتی وایە بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆ شوێنکەوتوانی ئینجا تەداخول دەکا و فەرمان دەکا، لە سەرەتادا بزانێ ئیمانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) یان ئەگەر پیاو چاکێک و ئافرەتێکی ساڵیحە بەڵایەکی بەسەر بێ بایی چەندە؟ وە کافرەکەش تا چەند مەغرور دەبێ؟ لە سەرەتا الله تعالی تەداخول ناکا.

ئەبو جەهل ڕۆیشت هەتا گەیشتە نزیک پێغەمبەر (ﷺ) قورەیشیەکان وا تەماشای دەکەن کاتێک یەک هەنگاو مابو پێ بەرزکاتەوە بنێتە سەر ملی پێغەمبەر (ﷺ) «وَهو يَنْكُصُ على عَقِبَيْهِ وَيَتَّقِي بيَدَيْهِ» پشتاوپشت کشایەوە ئەبو جەهل و ڕەنگی تێکچوو بە هەردوو دەستی وایدەکرد کە ئەنەهو کەسێک پاڵ پێوە دەنێ و لەسەر ڕێگای خۆی پشتاوپشت گەڕایەوە و ڕەنگی تێکچوبوو، ڕویان تێکرد «فقالوا: ما لَكَ؟! يا أبا الحكم» دار و دەستەکەی پێیان گوت تۆ پاڵەوانەکەی چەند چرکە و لەحزەیەک پێش ئێستا بوی ئێستا خێرە ڕەنگت تێکچوە ئەی ئەبول حەکەم؟ «فَقالَ: إنَّ بَيْنِي وبيْنَهُ لَخَنْدَقًا مِن نارٍ وَهؤلاء أَجْنِحَةً» گوتی من بینیم دۆڵێکی ئاگرین لەنێوان من و موحەمەد پەیدا بوو باڵیشم دەبینی لەسەر ئەو دۆڵە باڵەکان وایان لێدەکردم بۆم دەهاتن، دەڵێ پێغەمبەریش (ﷺ) ئینجا کە لە نوێژ بویەوە ئەوەبوو سەبەب نزولی کۆتایی ئایەتەکانی سوڕەتی (العلق) کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ * عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ﴾ نابینن ئەو کەسەی قەدەغەی دەکا، بەندەکەی من کە موحەممەدە (ﷺ) کاتێک نوێژ دەکا: ﴿أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ * أَوۡ أَمَرَ

بِٱلتَّقوَىٰٓ﴾ نازانی ئەو ئەبو جەهلە و قورەیشیە و دار و دەستەکانی ئەگەر ئەوە لەسەر ڕێگای هیدایەت و ڕێنوێنیە، و فەرمان دەکا بە تەقوای الله و بە تەوحید و الله بەیەکگرتن بۆچی وای لێدەکا؟

خوای رب العالمین کە وای فەرموو ئەو ئایەتانەی دابەزاند پێغەمبەر لە نوێژ بویەوە (ﷺ) بە ئەبو جەهلی گوت ئەگەر هەرچی بکەی من نوێژەکانم هەر دەکەم کڕنۆش بۆ خوای خۆم هەر دەبەم -جل شئنە-، جا خوای رب العالمین پاڵپشتی هەڵوێستەکەی پێغەمبەری کرد (ﷺ): ﴿كَلَّا لَئِن لَّم يَنتَهِ لَنَسفَعَا بِٱلنَّاصِيَةِ﴾ الله سوێند دەخوا دەفەرموێ ئەگەر واز نەهێنێ ئەبو جەهل بە پێش پەرچەمی دەیگرین (نَسفَعَا) یانی گرتنێکی زۆر توند، بەو پێش پەرچەمەی خۆی دەیگرین ئینجا لەسەر دەم ڕای دەکێشین: ﴿نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ﴾ لەبەر ئەوەی ئەبو جەهل ئەوەی بە پێش پەرچەم دەیگرین بە فریشتەکان کەسێکی لە هەڵەدایە کەسێکی درۆزنە قسەکانی درۆیە و موحەمەد ڕاستە (ﷺ)، لە پاشان دەفەرموێ: ﴿فَليَدعُ نَادِيَهُۥ﴾ئەگەر خۆی هەڵدەکێشێ بەو خەڵکەی لە پشتین لایەنەکەی و دەستە و تاقمە و دائیرەکە و نادیەکەی با بچێ بیان هێنێ خوای رب العالمین دەفەرموێ، شەڕ لە مەیدان بوە شەڕی خوای رب العالمین و ئەبو جەهل، ئەبو جەهلێکی بەسیتی پیس پڕی ناوی سکی پیساییە، ئەبو جەهلێک کەوا گیان و ڕۆح و هەموی بە دەستی خوای رب العالمین ە، خوایەک غەزەبی لێگرتوە دەبێ چۆن ئیهانەی بکا لەسەر محمد المصطفى (ﷺ) کە هیچ خراپەی نیە بۆ ئەبو جەهل و ئەوان تەنها دڵسۆزە بۆ ئەوانیش دەڵێ وەرن ببنە موسڵمان بەڵکو ڕزگارتان بێ لە ئاگری دۆزەخ بچن بۆ بەهەشتی پان و بەرین بەڵام بە قسەی ناکەن، دەڵێ ئینجا خوای رب العالمین فەرموی: ﴿فَليَدعُ نَادِيَهُۥ﴾ با ئەو بچێ دەستە و تاقمی خۆی بانگ بکا: ﴿سَنَدعُ ٱلزَّبَانِيَةَ﴾ ئێمە فریشتەکانی دەرگاوانانی جەهەنەم دەنێرینە خوار.

لەبەر ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی «والله لو دنا مني لخطفَتْه الملائكةُ عُضوًا عُضوًا. يعني أبا جهلٍ[١]» فەرموی سوێند بە الله ئەگەر ئەبو جەهل یەک شاقاوی تر لەمن نزیک بوباوە یەکسەر پشتاو پشت نەگەڕاباوە سوێند بە الله مەلائیکەتەکان حازر بون و دەمبینی الله ئەمری پێ کردبون و دەهاتن پارچە پارچەیان دەکرد بە بەرچاوی قوڕەیشی و مەککەیەکان لەسەر دەم ڕایان دەکێشا بۆناو ئاگری دۆزەخ خەڵکەکە هەموو دەبا بیبینن.

بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەو هەموو سەبر و تەحەمولەی هەبوە دوژمنانی ئیسلام ئەو هەموو ڕێگایانەیان گرتەبەر بۆ ئەوەی پێغەمبەر ئازار و ئەزیەت بدەن (ﷺ)، تەنها ئەوەندەش نا بەڕێزان و خۆشەویستان بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) لێرەوە ئەو سەبر و ئارامیەی بوە ئەوەی ئەوەی کە سەحابەکان زیاتر سەبر و ئارامی بگرن وە موژدەشی پێدەدان بە سەرکەوتن.

پێغەمبەر بۆخۆی دەفەرموێ (ﷺ) کە لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەد هاتوە لە سونەنی ترمزی وە ابن ماجەش ڕیوایەتی کردوە وە ئیمامی ترمزی دەفەرموێ (حديث حسن صحيح) ئەلبانیش خۆی لێ بێدەنگ کردوە واتە پێی ڕازییە، کە ئەنەس دەفەرموێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «لَقَدْ أُوذِيتُ فِي اللَّهِ وَمَا يُؤْذَى أَحَدٌ» دەفەرموێ من لەپێناو الله ئەوەندەم ئازار و ئەشکەنجە و زەحمەتی بینی هیچ کەس لەسەر ئەو زەویە لەپێناو الله ئەو ئازار و ئەشکەنجەی نەبینیوە «وأُخِفْتُ فِي اللَّهِ وَمَا يُخَافُ أَحَدٌ» وە من لەبەر خاتری خوای رب العالمين ئەوەندەم ترس هاتوەتە سەر و ترسێنرام لە پێناو خوای رب العالمين کەسێک ئەو ترسەی نەهاتوەتە سەر «ولقد أتَتْ عليَّ ثلاث من بينِ يومٍ وليلةٍ، وما لي وبلالٌ ما يأكُلُه ذو كَبِدٍ» دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) سی ڕۆژ یان شەو بەسەرماندا دەهات من و بیلال نەبو کە خاوەن ژیانێک و خاوەن جەرگێک کە بیخوات و پێیوە بژی ئێمە هیچمان نەبو لەوەی

[١] صحيح الجامع (٥٢٦٩)، أخرجه مسلم (٢٧٩٧).

کە پێیوە بژین و بیخۆین و بیخۆینەوە «إِلَّا مَا يُوَارِي إِبِطَ بِلَالٍ[1]» ئیلا ئەوەندەی کەوا بیلال حەشاری دەدا و شاردبویەوە واتە کەمێکی کەم نەبێ نەمان بوو پێیوە بژین و بخۆین.

ئەوەش لەبەر ئەوە نەبو پێغەمبەر (ﷺ) قوڕەیشیەکان بە ڕاستگۆی تێنەگەن هەر بە ڕاستگۆی تێدەگەیشتن بەڵام حقد بوو لە دڵیان و دژایەتی حەقیقەت و ڕاستیەکانیان دەکرد، ئەوەش بەو بەڵگە کاتێک ئەبو جەهل جارێکیان بە پێغەمبەری گوت (ﷺ) «قد نعلم يا مُحمَّدُ أنَّكَ تَصِلُ الرَّحمَ» ئێمە چاک دەزانین تۆ سیلەی ڕەحم بەجێ دەگەیەنی ئەی موحەمەد (ﷺ) «وتَصدُقُ الحديثَ» وە قسەکانی دەیکەی ڕاستگۆی تێیدا لەبەر ئەوەی درۆمان لێت نەبینیوە ئەوە ئەبو جەهل پێیگوت «ولا نُكذِّبُكَ» ئێمە تۆ بەدرۆ ناهێنینەوە «ولكن نُكذِّبُ الَّذي جئتَ به» بەڵکو ئێمە ئەوەمان پێ ڕاست نیە و بە درۆی دەهێنینەوە کە هێناوتە دەڵێی لەلای خوای رب العالمين ە ئەگەرنا تۆ کەسێکی ڕاستگۆی بڕواشت پێ دەکەین بەڵام ئەوەی هێناوتە ڕاستگۆیی نیە و تەواو نیە و درۆینە لەبەر ئەوە خوای رب العالمين ئەو ئایەتەی زانایان دەفەرمون لەسەر ئەبو جەهلی دابەزاند و دەفەرموێ: ﴿قَدۡ نَعۡلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحۡزُنُكَ ٱلَّذِي يَقُولُونَۖ فَإِنَّهُمۡ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ﴾ الله دەفەرموێ ئێمە دەزانین ئەی موحەممەد (ﷺ) بەو قسەی ئەبو جەهل و سەرانی تری قوڕەیش کاتێک دەڵێن تۆ بە درۆ ناهێنینەوە و ئەو ئایەتانەی خوای رب العالمين بڕوا پێ ناهێنین و بە درۆی دەهێنینەوە تۆ غەمگین دەبی: ﴿وَلَقَدۡ كُذِّبَتۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَىٰ مَا كُذِّبُواْ﴾ لە پێش تۆش پێغەمبەران بە درۆ هێنرانەوە لەلایەن گەل و نەتەوەکانیان بەڵام ئەوان ئارامیان گرت لەسەر ئەوەی بە درۆیان دەهێنانەوە: ﴿وَأُوذُواْ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمۡ نَصۡرُنَاۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ وَلَقَدۡ جَآءَكَ مِن نَّبَإِيْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ [الأنعام: ٣٣-٣٤] فەرموی بەڵێ ئەوان ئارامیان گرت پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) لەسەر ئەوەی بە درۆیان دەهێنانەوە وە

[1] سنن ابن ماجه (١٥١)، سنن الترمذي (٢٤٧٢)، مسند أحمد (١٢٢١٢) (١٤٠٥٥).

ئەزیەت و ئازار دران لەپێناو من بەڵام هەتا سەرکەوتنی منیان گەیشتنێ ئارامیان گرت کە سەرکەوتنیان بۆهات بشزانە وشە و وتەکانی خوای رب العالمین گۆڕانکاری بەسەردا نایە واتە تۆش ئەگەر ئارام بگری وە ئومەتەکەشت نەسرِ و سەرکەوتنی ئێمەت بۆ دێ تۆ هەواڵی پێغەمبەرانی پێشتریشت پێدراوە.

## هەندێك دیمەن و نمونەی ئازار و ئەشكەنجەی هاوەڵەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

دیمەنەکانی ئازار و ئەزیەت و ئەشکەنجەی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەکان گەلێک زۆرن ئێمە تەنها چەند نمونەیەکی ئاشکرامان بۆتان هەڵبژاردوە یەکێک لەو نمونانە عەبدوڵای کوڕی مەسعودە -رضي الله عنه- ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزە لە ڕوی ئیمانەوە وە لە ڕوی لاشە و جەستەیەوە لاواز بوو بەڵام لە ئیمانەوە چەقیبوو شاخێک بوو، یەک لە جارەکان مۆڵەتی خواست و گوتی دەچم لەلای (كعبة الله) ئایەتەکانی قورئان بۆ یەکەمجار بە دەنگ دەخوێنم دەچرپێنم بە گوێچکەی قوڕەیشیەکان، گوتیان ئاخر بەرگەی ئەوە ناگری قوڕەیشیەکان تەحەمول ناکەن گوێ بگرن لە ئایەتەکانی قورئان ئەگەری ئەوەی هەیە ئازارت دەن لێتدەن.

بەڵێ عەبدوڵا گوێی بەوە نەدا و چوو لەوێ بۆ یەکەمجار سوڕەتی (الرحمن) چەند ئایەتەکانی یەکەمی خوێندەوە ئینجا هەرکە خوێندیەوە قوڕەیشیەکان بەربونە سەری و لێیاندا هەتا وای لێهات دەموچاوی بەخوێندا چوو، لە پاشان هاتەوە و موسڵمانەکان پێیان گوت پێمان نەگوتی قوڕەیشیەکان وازت لێناهێنن؟ فەرموی دەنا سوێند بە الله ئەگەر بەیانیش بیەوێ وابکەم وادەکەم و هیچ ترسم نیە لەسەر قورئان با لێم بدرێ.

ئەوەتا ئەبو زەڕی غیفاریش -رضي الله عنه- کە دەبێتە موسڵمان مۆڵەتی ئەوە وەردەگرێ بچێ لەلای (كعبة الله) یەک بە دەنگی موسڵمان بونی خۆی ئاشکرا بکا، ئەوەتا ئاشکرای کرد و یەک بەدەنگی گوتی قوڕەیشیەکان گوێتان لێبێ (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن

محمد رسول الله) قورەیشیە ڕق لە دڵەکان یەک یەکێکی هاندا بەوەی کۆببنەوە لەسەر ئەبو زەڕی غیفاری و لێیاندا هەتا هەموو لاشە و جەستەیان ماندو کرد و شەکەت کرد و لە زەوی کەوت، هەتا عەباسی مامی پێغەمبەر (ﷺ) کە هێشتا موسڵمانیش نەبو دڵی پێی سوتا و بەلایاندا چوو گوتی ئەوە چیدەکەن ئێوە قورەیشیەکان؟ ئەوە لە بەنو غیفارە ئەوانەی کەوا ئەو عەشیرەت و تیرەن لەنێوان مەککە و مەدینە نیشتەجێن تیجارەت و بازرگانیەکانی ئێوە لە شام کە دەیکەن و دێنەوە هەموو بەلای ئەوانە وە بەنو غیفار مەشهورن بە زەلام کوشتن و ڕێگری وەڵاهی ئەو پیاوەیان لێبکوژن قەت لە قورەیشیەکان خۆشنابن، ئینجا دەستیان لێ هەڵگرت، ئینجا ئەبو زەڕ بەوە پاشگەز نەبویەوە لە ئیسلام و ئیمان بەو ئەشکەنجەدانە بەیانیەکەشی دوبارە جارێکیتر هاتەوە وای گوتەوە و دوبارە جارێکیتر لێیان دایەوە و دوایە دەستیان لێ هەڵگرت.

لە پاشان خەبابی کوڕی ئەڕەت ئەو پیاوە بەرز و بەڕێز و مەزنە کە لەو سەحابانەیە لە سەرەتاکان بوە موسڵمان کۆیلە بوو لەبن دەستی ئافرەتێک بە ناوی ئوم ئەنمار، ئەو ئوم ئەنمارە زۆر حاقیدە بوو بەرامبەر بە ئیسلام دڵ ڕەق بوو هەرکە زانی خەباب بوەتە موسڵمان خەباب دوکانێکی هەبو بۆ ئوم ئەنمار ئیشی تێدا دەکرد هی ئاسنگەری، کاتێ کەوا ئوم ئەنمار ئەوەی زانی ڕۆژانە دەهات پارچە ئاسنێکی سور دەکردەوە لەسەر ئاگر هەتا تەواو داخ و گەرم دەبوو بە سەری خەبابی کوڕی ئەڕەتیەوە دەنا سەحابەکان دەگێڕنەوە دەفەرمون وەڵاهی ئەوەی بەوێدا دەچوو لە دور بە دوری کزە کزی سوتانی پێستەکەی خەباب و موەکانی بۆنی دونیای داگرتبوو دەهات و بۆنمان دەکرد، ئینجا هەتا لە هۆش خۆی دەچوو ئوم ئەنمار دەیگوت هەتا هەڵنەگەڕێیتەوە لە دینی ئیسلام و واز نەهێنی لە موحەمەد ئاوا ئازارت دەدەم، هەتا ئەو ڕۆژە داهات خەباب هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەی پێغەمبەری الله وەڵاهی ئەوەندە ئازار دەدرێم لەهۆش خۆم دەچم نازانم چی بکەم لە دەست

ئوم ئەنمار؟ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) دۆعات بۆ بکەم؟ فەرموی بۆم بکە، فەرموی خوایە تۆڵەی خەباب لە ئوم ئەنمار بستێنیتەوە، تۆڵەکە بەوە هات بەڕێزان و خۆشەویستان مێژونوسان دەفەرمون ئوم ئەنمار نەخۆشیەکی لەسەری گرت وەکو سەگ دەحەپی وەکو گورگ دەیلوراند لە ئێش و ژانەکەی پزیشکانی ئەو سەردەمە دەرمانی ئەوەیان بۆ دانا گوتیان دەبێ ڕۆژانە و چەند ڕۆژ جارێک ئاسنێک داخ بکەن بە سەریەوە بنرێ لە ئێش و ژانی داخەکەی و سوتانەکەی ئاگای لە ئێشی ژانەسەر نەمێنێ، ئینجا ئەوە دۆعای پێغەمبەر بوو (ﷺ) خەباب دەهات ئاسنەکەی کە بەسەری خەبابەوە دەنا ئوم ئەنمار گەرمی دەکرد بەسەری ئوم ئەنماریەوە دەنا هەتا ژان و ئێشەکەی نەمێنێ و لورە لورەکەی وەکو سەگ و گورگی نەمێنێ لەهۆش بچێ ئەوە تۆڵەی خواییە.

بەڕێزان و خۆشەویستان بیلالی حەبەشی -رضي الله عنه- کۆیلەبوو لەبن دەستی ئومەیەی کوڕی خەلەف بیلال تاوان و گوناحی هەر ئەوەندە بوو کە تۆڵەیان لێ دەستاندەوە دەیگوت اللەی تاک اللەی تاک (لا إله إلا الله) دادپەروەری و حەق هەر ئەوەندەی دەگوت خۆ هیچی تر نەبو، وەکو بە درێژایی مێژو تا ئێستاش و قیامەت دادێ موسڵمانان هەر ئەوە دەڵێن و دەڵێنەوە دوژمنان وازیان لێ ناهێنن، ئومەیەی کوڕی خەلەف بیلالی دەهێنا لە یەکێک لە ڕیوایەتەکان لە گەرمایی حیجاز کە لەوێدا خۆر و هەتاو و تیشکی ڕۆژ ڕاستەوخۆ لەسەر زەوی دەدا گەرمایەتیەکەی زۆر گەرمە ئەوەی چوبێتە حەجی ماڵی خوای رب العالمین هەستی پێکردوە و تامی کردوە و دەبینێ جا لەو گەرمایە ئومەیە بیلالی دەهێنا لەو زەویەدا هەردو پێیەکانی و هەردو دەستەکانی لە زەویدا ڕوە و ئاسمان بوو ئەو سندمی دەکرد و وە دەیبەستەوە هەتا جوڵەی نەبێ، بەردی گەورەی گەرمی دەهێنا لەسەر سکی دایدەنا، قامچی توند و پەیتی دەهێنا بە دەستی خۆی ئومەیە خەڵکی وا دەکرد دەورە لە بیلال بدەن بە قامچیەکان لێی دەدا دەیگوت هەڵگەڕێوە لە دینی موحەمەد (ﷺ)،

بیلالیش لەسەر خۆی ڕوه و ئاسمان دەیڕوانی مەعنەوییەن لێی دیار بوو کەوا پاداشتەکەی بەهەشتە الله لێی ڕازی دەبێ ژیانی دونیا ماوەیەکی کەم و کورتە و لەسەر خۆ ڕویدەکردە ئومەیە و دەیگوت (أحد، أحد) ئەی اللەی تاک ئەی اللەی تاک هەڵناگەڕێمەوە لە دینی موحەمەد (ﷺ) تا لە کۆتاییەکەی ئەبو بەکری سدیق ڕۆژێکیان چوو بیلالی کڕیەوە لە ئومەیەی کوڕی خەلەف، بەڵام تۆڵەی بیلالیش بەوە هات کە لە جەنگی بەدر ئومەیە خۆی پەنا دابوو بە یەکێک لە سەحابەکان (والله أعلم) عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بوە کە لەگەڵی برادەر بوە لە پێشتردا بەڵام بیلال کە دەیبینێ قبوڵی ئەوە ناکا پەنا بدرێ عەبدوڕەحمان دەڵێ چەندێک ڕاست و چەپم کرد بیلال خۆی نەگەیەنێتە ئومەیە دەڵێ گوتی ئەی عەبدوڕەحمان ڕێگام بدە وەڵاهی نابێ ئومەیە لەسەر زەوی بە ژیانەوە بمێنێ ئەوەندەی عەزیەت داوم لە پێناو خوای رب العالمین من وا سەبر و ئارامم گرت ئێستا دەسەڵاتم هەیە و تۆڵەی لێ دەکەمەوە تۆڵەی خۆم و موسڵمانەکان، دەفەرموێ شمشێری ڕادەوەشاند بیلال هەتا گەیشتە من نوکە شمشێرێکیش بە قاچی من کەوت بریندار بوم بەڵام لە پشتی من ئومەیەی دەرهێنا و لەسەریدا و خوێنی ڕشت و تۆڵەی خۆی و موسڵمانانی لێکردەوە لە جەنگی بەدر.

ئەوە ئاکام و دوارۆژی هەر زاڵم و ستەمکار و بێدین و کافرێکە کەوا ئازار و ئەشکەنجەی موسڵمانان دەدات بێ باکانە لەو کاتەی دەسەڵاتی هەیە بەڵام الله ڕۆژی دادەهێنێت کە تۆڵەی لێ بستێنێتەوە هەندێک جار بە دەستی موسڵمانان و بە ڕۆژی ڕوناک.

بەڕێزان و خۆشەویستان ئەبو بەکری سدیقیش ئەوەندە ئازار و ئەزیەت و ئەشکەنجە دەدرا هەتا وای لێهات بارگەی تێک بنێ و نمونەمان بۆتان هێنانەوە لە ڕابردودا کە یەکەم وتار بێژ بوو لەپێناو خوای رب العالمین ئینجا دەموچاویان سور کرد لەناو خوێندا و وە قسەیان پێدەگوت ڕێگرییان لێ دەکرد لە دەعوە و بانگەوازیەکەی بارگەی تێکنا ئەویش هیجرەت

بکات بۆ حەبەشە بەڵام لە ڕێگادا زەیدی کوڕی دەغینە پێیرا گەیشت، کە یەکێک بوو لە سەرۆک تیرەکانی ناودارەکانی عەرەبی ئەو کات گوتی پێویست نیە تۆ ئەبا بەکر بڕۆی تۆ پیاوێکی سیلەی ڕەحم جێبەجێ دەکەی، پیاوێکی یارمەتی هەژارەکان دەدەی، پیاوێکی ناودار و زانای، پیاوێکی چاکی، چۆن دەبێ مەککە تۆ بەدەربنێ و بڕۆی؟ وەرە لە پەنای من وەرەوە ناو مەککە، ئەویش بڕیاریدا ڕازی بوو بە قسەکەی کوڕی دەغینە هاتەوە، لەوێ کوڕی دەغینەیش بە قوڕەیشیەکانی گوت دەست لە ئەبو بەکر نەدەن من پەنام داوە، ئیمامی ئەبو بەکر تەنها مەرجی ئەوەی لەسەر بوو لە کۆڵانەکان و لە ئاوەدانیەکان وتار نەخوێنێتەوە و خەڵکی سەرنج ڕانەکێشێ بەرەو ئیسلام، بەڵام ئەبو بەکر یەکەم خەطیبی ئیسلامە وە داعیە و ڕێبازی الله و پێغەمبەری (ﷺ) چاک گرتوەتە بەر و تێی گەیشتوە دەزانێ مۆڵەتی ئەوەی بۆ نیە لە ماڵدا بەس گیانی سەلامەت بێ و ماڵ و سامانی سەلامەت بێ و نەگیرێ و لێی نەدرێ بانگەوازی واز لێ بێنێ، لەبەر ئەوە ئەبو بەکری سدیق -رضي الله عنە- ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزە ژورێکی دروستکرد لە حەوشەکەی خۆی بەلای دەرەوە لەوێدا کە لە بەنی جومەح لەوێدا دەژیا و لەو گەڕەکە بوو لەو ژورەوە دەستی کرد بە نوێژ کردن ئەبو بەکری سدیق وە قورئانی دەخوێند بە دەنگە خۆشەکەی، تا وای لێهات هەموو منداڵ و ژنەکانی قوڕەیشیەکان ئەوەی بۆ ئاو دەچوو بۆ بازاڕ دەچوو هەرکە گوێی لە دەنگی ئەبو بەکر دەبوو قورئان خۆشی سەرنج ڕاکێشە دەهاتن دەورەیان لە ژورەکەی ئەبو بەکری سدیق دەدا کاریگەری تێدەکردن، قوڕەیشیەکان بەوە چاویان چوە پشتی سەریان و گوتیان قبوڵی ئەوەمان نیە منداڵەکانمان سەرنج ڕادەکێشێ بە دەنگەکەی و وە نوێژ دەکا بە بەرچاوی ئەوان، هەر چەند ئیمامی ئەبو بەکر فەرموی من لە ماڵی خۆمم لە ماڵی خۆشم ناتوانن قەدەغەم بکەن من ژورێکم کردوە لەسەر حیسابی خۆم قورئانی تێدا دەخوێنم و نوێژی تێدا دەکەم.

ئەوەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی هەر مامۆستایەک هەر داعیەک هەر کەسێک لە ڕاهی خوای رب العالمین ڕێگای بۆ خەڵکی ڕون دەکردەوە ڕێبازی پێغەمبەری گرتبوەبەر (ﷺ) دەعوەی دەکرد ئەگەر لێی قەدەغە کرا لە هەر مزگەوت و ئاوەدانیەکان نابێ بوەستێ تەنانەت دەبێ ماڵی خۆی بکاتە مۆڵگەی ئەوەی خەڵکی موسڵمان تێبگەیەنێ و حاڵی بکا و لە موناسەباتەکان بەژداربێ و وتار و قسەی هەبێ و ڕونکردنەوە بۆ خەڵکی بدا نابێ کۆڵ بدا وەکو ئەبو بەکری سدیق.

کاتێک هیچیان پێ لەگەڵ ئەبو بەکر نەکرا قوڕەیشیەکان کوڕی دەغینەیان بانگ کرد گوتیان وەرە ئێمە قبوڵمان نیە تۆ پەنای ئەبو بەکرت داوە گلەیمان لێ مەکە لێی قبوڵ ناکەین ئەوەی ئەنجام دەدا بڕۆ پێی بڵێ و تۆ پشتیوانیەکەی لێ بستێنەوە، عائیشە -رضي الله عنها- دەفەرموێ لە ماڵ بوین کوڕی دەغینە هاتە لای باوکم ئەبو بەکری سدیق پێی ڕاگەیاند گوتی ئەی ئەبو بەکر من مۆڵەتم بۆ وەرگرتبوی تۆ بێدەنگ بی و لە ماڵی خۆت بی، دەڵێ ئەویش گوتی من هەر تەنها لە ماڵی خۆمم، گوتی دەڵێن ژورێکت دروستکردوە لە نزیک دەرگاکەی خۆت و لە حەوشەکەت لەوێوە قورئان دەخوێنی و نوێژ دەکەی سەرنجی قوڕەیشیەکان منداڵ و وە خەڵکەکە و ئافرەتەکانت ڕاکێشاوە؟ قوڕەیشیەکان ئەوەیان قبوڵ نیە ئەی ئەبو بەکر حەز دەکەم وازبهێنی لەوە ئەگەرنا من پشتیوانی خۆم و پەنادانەکەت هەڵدەوەشێنمەوە.

ئیمامی ئەبو بەکری سدیق دایکە عائیشە دەگێڕێتەوە چی فەرموو؟ گوتی وەرە لە ڕاهی الله کورە بەجێم مەهێڵە کورە با نەمکوژن قوڕەیشیەکان با نەمگرن با ئەزیەتم نەدەن ماڵم لێ نەستێنن کورە وەرە پشتت پێ دەبەستم چۆن تۆ پەنام نادەی؟ نا ئەوانە هیچیان نەبو اللەی ناسیبوو تەوەکولی کردە سەر خوای رب العالمین لە وەڵامیدا گوتی «أَرُدُّ جِوَارَكَ يابن الدغنة» گوتی ئەو پەنادانەی تۆم ڕەتکردەوە لە ئێستا و هەڵم وەشاندەوە، گوتی ئەی

چیدەکەی ئەبو بەکر من دڵیشم پێت دەسوتێ؟ گوتی من ڕازیم بە پەنادانی خوای رب العالمین الله بەسمە ئەگەر اللهم هەبێت و پشت بەو ببەستم هیچی کەسی ترم ناوێ کوڕی دەغینە چیتر منەتم لەسەر مەکە و هەڵم وەشاندەوە کار و ئیشی خۆم هەر دەکەم دەعوە و بانگەوازی هەر دەکەم ئەگەر لە ماڵەوەش بێ وانە و دەرسەکان هەر دەڵێمەوە بێمنەت بن لەوە خۆ نابێ لە ماڵەوەش لێم قەدەغە بکەن، ئەبو بەکری سدیق وا بەردەوام بوو دەبێ ئێمەیش چاو لە ئەبو بەکری سدیق بکەین ئا ئەوانە بەڵگەی ڕاستەقینەن نەک بە چاو سورکردنەوەیەک و بە جارێک قەدەغەکردنێکی دەعوە و بانگەوازی دەرس و وانەکان لە ماڵی خوای رب العالمین لێی بکشێینەوە و بڵێین گیان و ماڵمان سەلامەت بێ بەسە، ماڵی خۆت بکە شوێنی دەعوە و بانگەوازی ئەوەت لەسەرە.

لە پاشان عوسمانی کوڕی مظعون -رضي الله عنه- کە لەیەکێک لە بۆچونەکان دەڵێن برای شیری پێغەمبەر بوە (ﷺ) ئەو سەحابە بەڕێزە کە لە سەحابە بەڕێز و موسڵمانە سەرەتاییەکانی موسڵمان بوو بوو لە ئەوەڵ جارەکان، ئا ئەوەش وەلیدی کوڕی موغیرە کاتێک گەڕاوە ناو مەککە لە حەبەشە هاتەوە ئەو کات ئەو پەنایدا نەوەک کافرەکان، کافرەکان قبوڵیان نەبو موسڵمانانیان زۆر ئەزیەت دەدا، بەڵام هەرکە بینی ڕۆژانە دەهاتە دەرێ فڵانە سەحابە و موسڵمان برایەتی فڵانە ئافرەتە خوشکێتی لە ئیمان و لە ئیسلام و عەقیدە ئازار و ئەزیەت دەدرێن ئەویش چونکە وەلیدی کوڕی موغیرە پەنای داوە ئا ئەوکاتە ئازار و ئەزیەتی بەسەردا نایە ویژدانی قبوڵی نەکرد ئیمانی جوڵا چوە لای وەلیدی کوڕی موغیرە گوتی من چیتر پاڵپشتی تۆم ناوێ تەحەمولی ئەوە ناکەم من بە سەلامەتی بسوڕێمەوە و خوشک و برا موسڵمانەکانم ئازار و ئەزیەت بدرێن، گوتی ئاخر ئەگەر پەنایەکەت لێ بستێنمەوە و پشتگیریت نەکەم ئەی عوسمان وازت لێ ناهێنن قوڕەیشیەکان؟ گوتی من تەنها پشتگیری خوای رب العالمین م دەوێ منیش وەکو برا و

خوشکەکانم ئازارەکان با تام بکەم و تەحەمول بکەم، ئەوەبو عوسمان پشتگیریەکەی لەوێ هەڵوەشاندەوە گوتی بەخۆت ئیعلان بکە عوسمان، ئەوەبو عوسمان گوتی ئاگاداربن قورەیشیەکان ئەو کۆڕ و مەجلیسە هەموو بزانن من چیتر پشتگیری کردن و پەنادانی وەلیدی کوڕی موغیرەم ناوێ، هەر لەو کۆڕ و مەجلیسەوە بوو کە لەبید شیعرەکانی دەخوێندەوە کە گوتی هەموو ناز و نیعمەتەکان لەناوچونی بۆ هەیە، یەکسەر عوسمانی کوڕی مەظعون لێیوە بە وەڵام هاتوو گوتی نەخێر ناز و نیعمەتەکانی بەهەشت لەناوچونی بۆ نیە، لێیان بوە دەمەقاڵێ و شەڕەقسە ئەخیری قورەیشیەک هەستایەوە لە عوسمانی کوڕی مەظعونیدا تەنانەت لە چاوێکیدا چاوەکەی سپی هەڵگەڕا لە یەک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ دەستبەجێ ڕژا و کوێر بوو، وەلیدی کوڕی موغیرە هەستایەوە گوتی برازاکەم پەنادانی من باشتر نەبو بۆ تۆ؟ گوتی نەخێر نا وەڵا ئێستا ئۆخشنی دڵم هات منیش وەکو برا و خوشکەکانی تری موسڵمانم لەسەر ئیسلام لێمدرا وەڵاهی ئامادەم چاوەکەی تریشم لە پێناو خوای رب العالمین و لەسەر ئیسلام دابنێم سەبر و ئارامی بگرم.

ئەوەیە ئیمان و هێزی موسڵمانان لەبەر ئەوە لە هیچ سەردەم و کاتێک قورەیشیەکان تا ئێستا و قیامەتیش قەت بە موسڵمانی ڕاستەقینە ناوێرن موسڵمانی ڕاستەقینەی الله دۆست گیانی لەسەر دەستێتی، مردن بون شەهیدییە بۆی دەچێتە بەهەشتە پان و بەرینەکە، ئازار و ئەشکەنجەدانی تەرازوە خێرەکانی پێ زیاد دەبێ، کاتێک ماڵی لێدەبەن الله بۆی قەرەبوو دەکاتەوە لە دونیا و لە قیامەت، کاتێک سومعەی دەبەن ڕۆژێک دادێ خوای رب العالمین ئاشکرای دەکا کافر و بێدینەکان بێ سومعە دەکا و ئەو هەر سومعە بەرزە دیعایەیە لە شوێنی کراوە، لە دونیا و لە قیامەت الله سەری دەخا هەندێک جاریش هەر لە دونیادا الله دوژمنەکان ڕسوا دەکا و دەخاتە بەردەستی بەدەستی خۆی ئۆخشنی دڵی خۆی و موسڵمانان

بێنێ تۆڵەی لێ بستێنێتەوە وەکو پێغەمبەر (ﷺ) لە جەنگی بەدر لە عوقبەی کوڕی ئەبی موعیطی سەندەوە و وە بیلال لە ئومەیەی کوڕی خەلەفی ستاندەوە.

## شەو ڕۆیی و بەرزبونەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئاسمان

پێغەمبەر (ﷺ) لەپاش نەمانی خەدیجەی خێزان و هاوسەری وە مامی ئەبو تاڵیب وە ئەو هەموو ئازار و ئەشکانجانە ڕویکردە طائیف کە دایکە عائیشە -رضي الله عنها- فەرموی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ ڕۆژێک داهات لەسەرت ئازار و ئەشکەنجەکان و دڵ شکانەکەت زەحمەتربێ لە جەنگی ئوحود؟ پێغەمبەریش فەرموی (ﷺ) «لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ مَا لَقِيتُ» دەڵێ عائیشە تۆ چی دەڵێی؟ وەڵاهی ئەوەی من تامم کرد و بەسەرم هات بە دەستی گەل و نەتەوەکەی تۆ قوڕەیشیەکان وە بە دەستی ئەهلی مەککە و دەوروبەری هیچ کەسێک تامی نەکردوە «وَكَانَ أَشَدَّ مَا لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ» ئەوەی لە هەموو ڕۆژان ناخۆشتر و زەحمەتتر بوو دڵم تێیدا شکا لە ڕۆژی عەقەبە بوو «إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابن عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ» کەوا چوم بە دەستی خۆم لەگەڵ زەید خۆم نمایشکرد لەسەر بەنو سەقیفی سەرکردەکانیان کە لە تائیف دەژیان کە یەکیان ناوی کوڕی عَبْدِ يَالِيلَ بوو کوڕی عَبْدِ كُلَالٍ و دوو براکەی تر وەڵامیان نەدامەوە «فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي» من بە دڵ شکاوی و بە غەمگینی گەڕامەوە هیچ وەڵامێکی ئەوتۆیان نەدامەوە «فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلَّا وَأَنَا بِقَرْنِ الثَّعَالِبِ» من هۆشم نەهاتەوە سەر خۆم ئەوەندە دڵشکام ئەوەندەیان ئازاردام ئەوەندەیان قسەی ناخۆش پێگوتم و منداڵیان بەدوا خستم هەتا گەیشتمە ئەو شوێنەی پێی دەگوترێ (قرن الثعالب) نزیک بومەوە لە مەککە «فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي» سەرم بڵند کرد بینیم پارچە هەورێک وا سێبەرم لێدەکا خوای رب العالمین ڕەحمی پێم کرد «فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ، فَنَادَانِي» تەماشای ناو هەورەکەم کرد بینیم جوبرائیلی لەناودا بوو هاواری لێدەکردم و بانگی دەکردم «فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ

قَوْمِكَ لَكَ وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ» باش بزانە ئەی موحەمەد (ﷺ) الله بیستی قەومەکەت و تائیفیەکان چیان پێکردی و چیان پێگوتی و چۆن ڕەتیان کردیتەوە «وَقَدْ بَعَثَ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ» لەبەر ئەوە الله وا غەزەبی گرتوە فریشتەی شاخەکانی بۆت ناردوە ئەوە ئێستا وا لەلای من ئامادەیە هەر فەرمانێکی پێدەکەی الله قبوڵیەتی -جل شئنه- ئەگەر فەرمانی پێدەکەی شاخەکان لێکبداتەوە و هەمویان لەناو ببا بۆ ئەوەی دڵت بێتەوە سەرەخۆ و چیتر غەمگین نەبی فەرمانەکەت جێبەجێ دەکا «فَنَادَانِي مَلَكُ الْجِبَالِ فَسَلَّمَ عَلَيَّ ثُمَّ قَالَ» دەڵێ فریشتەی شاخەکانیش سەلامی لێمکرد و پێیگوتم و بانگی کردم ئەی موحەمەد «فَقَالَ: ذَلِكَ فِيمَا شِئْتَ» ئەوەی دەتەوێ وا من لەبەر ئەمر و فەرمانی تۆ ڕاوەستاوم «إِنْ شِئْتَ أَنْ أُطْبِقَ عَلَيْهِمُ الْأَخْشَبَيْنِ» وەڵاهی ئەگەر دەتەوێ ئەو دوو زنجیرە چیایەی مەککە و طائیف کەوتوەتە نێوان هەردوکیان بەیەکدا دەدەم و هیچ کەسیان نەمێنێ تەفر و تونایان دەکەم لەسەر ئەمر و فەرمانی خوای رب العالمین، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەوە ڕەحم و بەزەیی ئەو بوە ئەوە حیکمەتی ئەو بوە قەت بەرگری بۆخۆی نەویستوە لەخۆی نەکردوە ئیلا ویستویەتی ئاینی ئیسلام و کەلیمە و وشەی (لا إله إلا الله) سەربکەوێ و دواڕۆژی چاکی هەبێ «بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ مِنْ أَصْلَابِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ وَحْدَهُ، لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا[1]» فەرموی ئەوە مەکە ئەی فریشتەی شاخەکان بەڵکو من ئومێدی ئەوە دەخوازم خوای رب العالمین لە داهاتودا و لە نەوەکانی قوڕەیشیەکان و ئەو عەرەبانە خەڵکانێک دەربچن و پێ بگەن و پەروەردەبن کە تەنها الله بپەرستن و شیرک و هاوبەشی بۆ ئەمجام نەدەن، بەڵێ ئەوەش بوو کوڕەکەی ئەبو جەهل عیکریمە بوە باشترین پاڵەوانی ئیسلام و تەنها اللەی پەرست و شیرکی پەیدا نەکرد وە دەیەهای تریش ئومێدەکەی پێغەمبەر هاتەجێ (ﷺ).

[1] صحيح البخاري (٣٢٣١) (٧٣٨٩)، صحيح مسلم (١٧٩٥).

خوای رب العالمین کاتێ کەوا بینی پێغەمبەر (ﷺ) چوە طائیف و دڵی شکێنرا و هاتەوە ئەمجارە خوای رب العالمین خەڵاتێک بە پێغەمبەر دەبەخشێ (ﷺ) دڵی دەداتەوە، سەر زەوی لە پێغەمبەر (ﷺ) تەنگەبەر بوو دۆستەکانی ئەوەندە دەسەڵاتدار نەبون بتوانن پشتگیریەکی وای پێغەمبەر بکەن (ﷺ) لەو ناخۆشی و دڵ بریندار یانە دەری بێنن بەڵام خوای رب العالمین گەیشتە ئەو ئاستە پێغەمبەر (ﷺ) کە خەڵاتێکی گەورەی پێ ببەخشێ ئەویش خەڵاتی (الإسراء والمعراج) بوو.

پێغەمبەر (ﷺ) قازی عیاض دەفەرموێ لەپاش گەڕانەوەی لە طائیف وە ساڵێک پێش هیجرەتکردنی پێغەمبەر (ﷺ) خوای رب العالمین بڕیاریدا گەشتێکی سەر زەوی شەو ڕەوی پێ بکات و وە گەشتێکی ئاسمانیش میعراجەکە هەڵیبکێشێ بەرەو ئاسمانەکان چەندین نیشانەی گەورە بە پێغەمبەر پیشان بدا (ﷺ) وەکو خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ﴾ [النجم: ١٨] ئەو شەوە مەبەستمان ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) ببینێ چەند نیشانە و بەڵگەیەکی گەورەیی خوای رب العالمین و نیشانە و بەڵگە گەورەکان ببینێ.

بەڕێزان و خۆشەویستان بۆتان دەگێڕینەوە بزانین چۆن چوە (بيت المقدس)؟ وە لەوێشەوە چۆن هەڵفڕی بەرەو ئاسمانەکان (ﷺ)؟ لە پێشتردا لە باسی لەتکردنی سینگی باسمان کرد کە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) من لە شوێنێکدا بوم ئەو شوێنە هەندێک لە زانایان دەفەرمون ماڵی خۆی بوە و لە ڕیوایەتێکیش دەفەرموێ لە حەتیمی واتە (بينَ الرُّكْنِ والمقامِ) لە بەینی ڕوکنی (الحجر الأسود) و مەقامی ئیبراهیم پێغەمبەر بوم (ﷺ) دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ)، کەوا کاتێک کەسێک هاتە لام بینیم جوبڕائیلە پێغەمبەر نیشانەی کرد بۆ سەحابەکان دەستی لەخوار ملی دانا لە سەروی سنگیەوە دەفەرموێ ئەلەوێوە هات لەتیکرد و شەقیکرد و بڕی هەتا لەناوکمی تێپەڕکرد و سنگی کردمەوە ئەمجارە دڵی

دەرهێنام شۆردی لە جامێک و تەشتێکی زێرین ئینجا دڵ و سینگی پڕ کردم لە ئیمان و لە حیکمەت لە پاشان دایخستەوە و ئینجا فەرمانی پێکردم پێغەمبەر دەفەرمویٚ (ﷺ) کە لێرەوە ئێستا باسی دەکەین ئەنەس دەگێڕێتەوە و دەفەرمویٚ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئینجا «أُتِيتُ بِالْبُرَاقِ» بوڕاقی بۆ هێنام جوبڕائیل، بوڕاق چیە ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)؟ دەفەرمویٚ «وَهُوَ دَابَّةٌ أَبْيَضُ طَوِيلٌ» گیانلەبەرێکی بەرزی درێژ بوو پشت و ئەوانەی سەری لەگەڵ پشت و کلکی درێژ بوو لە پاشان دەفەرمویٚت سپی بوو، دەفەرمویٚت «فَوْقَ الْحِمَارِ وَدُونَ الْبَغْلِ» لە گوێدرێژ بەرزتر بوو لە وڵاغە بەرزەی ئەسپ و هێستر و ئەوانەش تۆزێک نزمتر بوو، دەفەرمویٚت «يَضَعُ حَافِرَهُ عِنْدَ مُنْتَهَى طَرْفِهِ» هەرکە تەماشام دەکرد لە ڕۆشتندا کە سواری پشتی بوم هەر یەک هەنگاوی ئەو بوڕاقەی کە دەیهاوێشت هەتا چاوم حوکمی دەکرد بازی دەدا و ئینجا لەوێوە بە عەرز دەکەوت و دەڕۆیشت ئەوەندە بازەکانی بەهێز و دور و درێژ بون، ئینجا دەفەرمویٚت «فَرَكِبْتُهُ حَتَّى أَتَيْتُ بَيْتَ الْمَقْدِسِ» من سواری پشتی ئەو بوڕاقە بوم هەتا هاتمە (بيت المقدس) «قَالَ فَرَبَطْتُهُ بِالْحَلْقَةِ الَّتِي يَرْبِطُ بِهِ الْأَنْبِيَاءُ» من ئەو بوڕاقە جڵەوەکەی و ئەوەی لە ملی بوو پەتەکە بەستامەوە لەو شوێنەی کە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) وڵاخ یان بوڕاقیان لیٚ دەبەستایەوە، دەفەرمویٚت «قَالَ: ثُمَّ دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَصَلَّيْتُ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ» لە پاشان چومە ناو مزگەوت (بيت المقدس) دوو ڕکاعەت نوێژم کرد بۆ خوای رب العالمين «ثُمَّ خَرَجْتُ» لە پاشان هاتمە دەرەوە «فَجَاءَنِي جِبْرِيلُ (عَلَيْهِ السَّلَامِ) بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ وَإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ، فَاخْتَرْتُ اللَّبَنَ، فَقَالَ جِبْرِيلُ (عَلَيْهِ السَّلَامِ): اخْتَرْتَ الْفِطْرَةَ[1]» دەڵیٚ جوبڕائیلیش پێی گوتم کاتێک جامێکی بۆ هێنابوم لە ئارەق و وە جامێکیشی بۆ هێنابوم لە شیر من شیرەکەم هەڵبژارد فەرموی فیطڕەت و (لا إله إلا الله) و ڕێبازی ڕاستەقینەت هەڵبژارد ئەی موحەمەد (ﷺ).

[1] تا ئێرە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە بە ژمارە (١٦٢).

له پاشان مالیکی کوڕی صەعصەعه بۆمان دەگێڕێتەوه دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی شەوی ئیسراو میعراجدا فەرموی «بَيْنَمَا أَنَا فِي الْحَطِيمِ - وَرُبَّمَا قَالَ : فِي الْحِجْرِ - مُضْطَجِعًا إِذْ أَتَانِي آتٍ فَقَدَّ - قَالَ : وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ : فَشَقَّ - مَا بَيْنَ هَذِهِ إِلَى هَذِهِ» ئەو ڕوداوەی سینگ لەتکردنی دەگرێتەوه ئینجا له پاشان وەکو بۆمان گێڕانەوه دەفەرموێ «فَانْطَلَقَ بِي جِبْرِيلُ حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الدُّنْيَا» دەڵێ ئینجا له (بيت المقدس)ەوه هەتا ئەوێی گێڕایەوه و دەفەرموێ له (بيت المقدس)ەوه جوبرائیل منی لەگەڵ خۆی هەڵکێشا و بەرز کردەوه بەرەو ئاسمانەکان «فَاسْتَفْتَحَ، فَقِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جِبْرِيلُ. قِيلَ: وَمَنْ مَعَكَ؟ قَالَ: مُحَمَّدٌ» دەڵێ له ئاسمانی یەکەم دەرگاوانی ئاسمانی یەکەم له فریشتەکان، لێرەوه ابن حجر العسقلاني لەو ڕوداوه دەفەرموێ ئەوه چەند پەند و وانەیەکی لێ وەردەگیرێ:

یەکەم مۆڵەت خواستن بۆ هەر شوێنێک که موڵکی خۆت نەبێ و دەچی جوبرائیل له ئاسمانی یەکەم مۆڵەتی له دەرگاوانی ئاسمانی یەکەم خواست.

دەفەرموێ ئەوەشی پێ جێگیر دەبێ که ئاسمانەکان دەرگایان هەیه وه مەلائیکەتی پاسەوانی هەیه ئەو دەرگایانه دەرگاوانیان هەیه ئەوه بەوه جێگیر دەبێ له عەقیدەی ئەهلی سونه و جەماعه.

ئینجا دەڵێ کاتێک داوای کرد فریشتەکه گوتی تۆ کێی له دەرگای ئاسمان دەدەی؟ گوتی من جوبرائیلی فریشتەم، گوتی ئەوه کێیه لەگەڵتدایه؟ گوتی موحەمەدم لەگەڵدایه (ﷺ)، دەڵێ فریشتەکه گوتی «وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ؟» دیاره پێغەمبەرایەتی بۆ هاتوه موحەمەد تەواو بوەته پێغەمبەری الله (ﷺ)؟ «قَالَ: نَعَمْ» جوبرائیلیش فەرموی بەڵێ «قِيلَ: مَرْحَبًا بِهِ، فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ. فَفَتَحَ» فەرموی بەخێربێ بەخێربێ بەخێربێ موحەمەد (ﷺ) بەڕاستی باشترین هاتوو موحەمەده هاتوه بۆ ئاسمانەکان ئێستا، دەرگای ئاسمانی یەکەمی لێکردەوه «فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا فِيهَا آدَمُ» دەفەرموێ له ئاسمانی یەکەم که پێم نایه ناو ئاسمانی یەکەم بینیم ئادەم لەوێ بوو

(ﷺ) «فَقَالَ: هَذَا أَبُوكَ آدَمُ» دەڵێ جوبرِائیل پێی گوتم ئا ئەوە باپیرەت ئادەمە ئەی موحەمەد (ﷺ) «فَسَلِّمْ عَلَيْهِ» دەڵێ منیش سەلامم لێی کرد «فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ السَّلاَمَ» دەڵێ ئەویش سەلامەکەی وەڵام دامەوە «ثُمَّ قَالَ: مَرْحَبًا بِالاِبنِ الصَّالِحِ» دەڵێ له پاشان ئادەم کە سەلامی لێ وەرگرتمەوە گوتی بەخێربێی ئەی کوڕە چاکەکەم ئەی نەوە چاکەکەم «وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ» بەخێربێی ئەی پێغەمبەرە باشەکە (ﷺ) «ثُمَّ صَعِدَ حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الثَّانِيَةَ، فَاسْتَفْتَحَ» دەڵێ ئینجا منی بەرز کردەوە جوبرِائیل له ئاسمانی یەکەم بۆ ئاسمانی دووەم لەوێش داوای کرد دەرگای ئاسمانی دووەمی لێبکرێتەوە، دەڵێ له پاشان دوباره فریشتەکە گوتی ئەوە کێت پێیە و تۆ کێی؟ دەڵێ گوتی من جوبرِائیلم و موحەمەدم پێیە (ﷺ)، دەڵێ گوتی دیارە پێغەمبەرایەتی بۆ هاتوە موحەمەد (ﷺ)، دەڵێ گوتم بەڵێ و دەرگای لێبکردینەوە و دەڵێ ئەویش بەخێری هێنام فریشتەی دەرگاوانی ئاسمانی دووەم گوتی بەخێربێی باشترین هاتوو بۆلامان موحەمەدە (ﷺ)، دەڵێ دەرگای لێکردمەوە و هەرکە له ئاسمانی دووەم چومە ژورەوە بینیم یەحیا پێغەمبەر بوو (ﷺ) لەگەڵ عیسا کە ئەوانە هەردوکیان کوڕە پوری یەکترن پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) «وَهُمَا ابنا الْخَالَةِ» دایکیان خوشک بوە «قَالَ: هَذَا يَحْيَى، وَعِيسَى، فَسَلِّمْ عَلَيْهِمَا» دەڵێ جوبرِائیل فەرموی ئا ئەوەیان یەحیایە و ئەوەشیان عیسایە دە سەلامیان لێبکە دەڵێ سەلامم لێکردن و ئەوانیش سەلامیان لێوەرگرتمەوە و ڕویان تێکردم و گوتیان «مَرْحَبًا بِالأَخِ الصَّالِحِ، وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ» گوتیان بەخێربێی بەخێربێی برایە چاکەکەمان پێغەمبەرە چاکەکە (ﷺ) «ثُمَّ صَعِدَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ» له پاشان جوبرِائیل دەڵێ منی بەرز کردەوە بۆ ئاسمانی سێیەم بە هەمان شێوەی ئاسمانی یەکەم و دووەم مۆڵەتی خواست و دەرگاوانی ئاسمانی سێیەم قسەی لەگەڵ کرد و له کۆتایەکەیدا دەرگای لێکردینەوە و بەخێری هێناین و دەڵێ له پاشان بینیم «إِذَا يُوسُفُ، قَالَ: هَذَا يُوسُفُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ» له ئاسمانی سێیەم یوسفم بینی و سەلامم لێی کرد دەڵێ سەلامی وەڵام دامەوە و ئەویش گوتی بەخێربێی بەخێربێی برایە چاکەکەم و پێغەمبەرە چاکەکە (ﷺ)، دەڵێ له

پاشان بۆ ئاسمانی چوارەم ڕۆیشتین بە هەمان شێوەی ئاسمانی یەکەم و دووەم و سێیەم فریشتەکە کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ جوبڕائیل و دەرگای لێکردمەوە و بەخێری هێنام، دەڵێ لە ئاسمانی چوارەمیشەوە تەماشام کرد ئیدریس پێغەمبەر بوو (ﷺ)، دەڵێ سەلامم لێکرد لەسەر داوای جوبڕائیل و ئەویش بە هەمان شێوەی پێغەمبەرەکانی تر وەڵامی دامەوە گوتی بەخێربێی برایە چاکەکەم پێغەمبەرە چاکەکە (ﷺ)، دەڵێ دوایی منی برد بەرەو ئاسمانی پێنجەم ئەویش دەرگایان لێکردینەوە بە هەمان شێوە و جاری جاران دەڵێ هەرکە چومە ئاسمانی پێنجەم بینیم هاڕون پێغەمبەر بوو (ﷺ) سەلامم لێکرد لەسەر داوای جوبڕائیل و ئەویش وەڵامی دامەوە و گوتی بەخێربێی برایە چاکەکەم پێغەمبەرە چاکەکە (ﷺ)، دەڵێ دوایە بەرزی کردمەوە بەرەو ئاسمانی شەشەم بە هەمان شێوەی ئاسمانەکانی تر  داوای دەرگا کردنەوەی کرد و کە دەرگایان لێکردمەوە و بەخێریان هێنام و بینیم لە ئاسمانی شەشەم موسا بوو (ﷺ)، دەڵێ سەلامم لێکرد و ئەویش وەڵامی دامەوە و سەلامی لێ وەرگرتمەوە و بەخێری هێنام گوتی بەخێربێی برایە چاکەکەم پێغەمبەرە چاکەکە (ﷺ)، لە پاشان دەفەرموێ «فَلَمَّا تَجَاوَزْتُ بَكَى» تۆزێک ڕۆیشتم تێپەڕ بوم لە موسا پێغەمبەر (ﷺ) موسا دەستی کرد بە گریان «قِيلَ لَهُ: مَا يُبْكِيكَ؟» گوتیان ئەوە چیە دەتگرێنێ؟ «قَالَ: أَبْكِ» دەڵێ ئەویش گوتی من دەگریەم «لِأَنَّ غُلَامًا بُعِثَ بَعْدِي يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِهِ أَكْثَرُ مَنْ يَدْخُلُهَا مِنْ أُمَّتِي» موسا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئا ئەو گەنجە برایەمان موحەمەد لەپاش من هاتوە (ﷺ) بوەتە پێغەمبەری الله ئومەتەکەی ئەو زۆر ژمارەیان زیاترە لە ئومەتی من کە دەچنە بەهەشت دەگریەم بۆ ئومەتەکەی خۆم، پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ ئینجا بەجێم هێشت چوم بەرەو ئاسمانی حەوتەم لەگەڵ جوبڕائیل، دەڵێ ئینجا دەرگایان لێکردینەوە بە هەمان شێوەی ئاسمانەکانی تر ئینجا بەخێریان هێنام و دەڵێ لە پاشانەکە لە ئاسمانی  حەوتەم ئیبراهیم پێغەمبەر بوو (ﷺ) دەڵێ جوبڕائیل پێی گوتم «هَذَا أَبُوكَ إِبْرَاهِيمُ» ئەوەش باپیرە و باوکتە ئیبراهیم پێغەمبەرە (ﷺ)، دەڵێ گوتی سەلامی لێبکە سەلامم لێکرد و وەڵامی

دامەوە و ئەویش گوتی «مَرْحَبًا بِالِابن الصَّالِحِ، وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ» بەخێربێی ڕۆڵە و کوڕە چاکەکەم ئەی پێغەمبەرە چاکەکە، دەڵێ «ثُمَّ رُفِعَتْ لِي سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى» دەڵێ ئینجا لەپاش ئەو کاتە بۆ من بەرز کرایەوە و نزیک بومەوە لە خوای رب العالمین (سدرة المنتهى) پەردەکە هەڵگیرا «فَإِذَا نَبْقُهَا مِثْلُ قِلَالِ هَجَرَ» پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) بەروبومی ئەو دار خورمایەی لەوێ بینیم وەڵاهی ئەوەندەی مەشکە و کوندەکانی هەجەر بوو خورمایەکانی پێیوە بوو ئەوەندە گەورە بوو، وە چونکە دیارە مەشکە و کوندەی هەجەر گەورەتربوە لە مەشکە و کوندەی مەدینە و شارەکانی تر، لە پاشان دەفەرموێ «وَإِذَا وَرَقُهَا مِثْلُ آذَانِ الْفِيلَةِ» من بینیم پەلک و لقی ئەو دار خورمایانە پەلکەکانی ئەوەندەی گوێی فیل گەورە و پان بوو نەم بینیبوو شتی وا لە دونیا «قَالَ: هَذِهِ سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى» دەڵێ جوبرائیل پێی گوتم ئەوە (سدرة المنتهى)یە ئا ئەوە ئەو دار خورمایەیە و شوێنی کۆتای هەموو مەخلوقاتەکانە و نزیک بویتەوە تۆ لە خوای رب العالمین «وَإِذَا أَرْبَعَةُ أَنْهَارٍ» چاوم هەڵهێنا چوار ڕوبار بون «نَهْرَانِ بَاطِنَانِ، وَنَهْرَانِ ظَاهِرَانِ» دوو ڕوباریان ژێر زەوی حیساب بون و نادیار بون دوانیشیان ئاشکرا بون «فَقُلْتُ: مَا هَذَانِ يَا جِبْرِيلُ؟» ئا ئەو دوانەی کەوا دیار نین چین؟ فەرموی ئەوانەی دیار نین «فَنَهْرَانِ فِي الْجَنَّةِ» ئەوە دوو ڕوباری بەهەشتن «وَأَمَّا الظَّاهِرَانِ فَالنِّيلُ، وَالْفُرَاتُ» بەڵام دوو ڕوبارەکەی تر ئەوە ڕوباری نیل و فوراتە «ثُمَّ رُفِعَ لِيَ الْبَيْتُ الْمَعْمُور» لە پاشان من بەرز کرامەوە (البيت المعمور)یش بەرز کرایەوە پێم نیشاندرا، (بيت المعمور)یش ئەو شوێنەیە کەوا خوای رب العالمین لە ئاسمانی دروستکردوە لە ڕیوایەتی سەحیح هاتوە دەڵێ ئەگەر بکەوێتە خوار ڕێک دەکەوێتە سەر (كعبة الله)ی سەر ڕوی زەوی لە بەرامبەر ئەوە مەلائیکەت و فریشتەکان تەواف بە دەوری ئەو بەیتە دەکەن لە ئاسمانەکان و لەوێوە خوای رب العالمین دەپەرستن، هێندە گەورەیە و ژمارەی مەلائیکەتەکان هێندە زۆرە ڕۆژانە حەفتا هەزار مەلائیکەت دەچن لە یەکێک لە ڕیوایەتەکان بەبێ ئەوەی مەلائیکەتێک توانیبێتی دوبارەی بکاتەوە لە ژمارە زۆری

فریشتەکان لەوەتەی ئەو بەیتە لەوێدا دانراوە دەچنە ناوی و بە دەوریدا دەسوڕێنەوە، دەڵێ له پاشان «ثُمَّ أُتِيتُ بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ، وَإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ وَإِنَاءٍ مِنْ عَسَلٍ، فَأَخَذْتُ اللَّبَنَ» دەڵێ لەوێشەوە جوبرائیل جامێك لە خەمر و ئارەقی هێنا وە لە جامێك لە شیری هێنا جامێكیش لە هەنگوین من شیرەكەم هەڵبژارد، دەڵێ فەرموی «هِيَ الْفِطْرَةُ» بەڕاستی فیترەتت هەڵبژارد شتێكی سروشتی کە (لا إله إلا الله) و تەوحید و ڕێبازی ڕاستەقینەیە بۆخۆت و ئومەتەكەت «الَّتِي أَنْتَ عَلَيْهَا وَأُمَّتُكَ» ئەو فیترەت و ڕێبازەی خۆت و ئومەتەكەت كە لەسەرین، دەڵێ لە پاشانەكە خوای رب العالمین دواندی و قسەی لەگەڵ دەكا، ئینجا «ثُمَّ فُرِضَتْ عَلَيَّ الصَّلَوَاتُ خَمْسِينَ صَلَاةً كُلَّ يَوْمٍ» خوای رب العالمین بەخێرهاتن لە پێغەمبەر دەكا (ﷺ)، بەڵام بۆچونی ڕاجیح و پەسەند پێغەمبەر (ﷺ) بە چاوی سەر خوای رب العالمین ی نەبینیوە لەو شەوە.

لێرەدا زانایان دەفەرمون ئایە هیچ مرۆڤێک لە دونیادا دەتوانێ بە چاوی سەر خوای رب العالمین ببینێ؟ ابن تیمیة دەفەرموێ (وَقَدْ اتَّفَقَ أَئِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ عَلَى أَنَّ أَحَدًا مِنْ الْمُؤْمِنِينَ لَا يَرَى اللَّهَ بِعَيْنِهِ فِي الدُّنْيَا) هیچێک لە بڕوادارەكان بە چاوی سەریان زانایانی موسڵمانان یەک دەنگن لەسەر ئەوەی لە دونیادا خوای رب العالمین نابینن (وَلَمْ يَتَنَازَعُوا إلَّا فِي النَّبِيِّ (ﷺ) خَاصَّةً) هیچ جیاوازییەک نیە هیچ ئینسانەكان تەنها بۆ پێغەمبەر (ﷺ) جیاوازییەک هەبوە كە هەندێكیان دەڵێن بە چاوی سەر بینیویەتی لەوانە لە ابن عەباس ڕیوایەت كراوە و ڕیوایەتێک لە ئیمامی ئەحمەد بەڵام زانایان وەڵام دەدەنەوە بەوەی كە دەفەرمون (أَنَّ النبي (ﷺ) لَمْ يَرَهُ بِعَيْنِهِ فِي الدُّنْيَا دَلَّتْ عَلَى ذَلك الْآثَارُ الصَّحِيحَةُ الثَّابِتَةُ عَنْ النَّبِيِّ (ﷺ) وَالصَّحَابَةِ وَأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ[1]) هەموو بەڵگەكانی ڕاست و دروست لە ئاثار و حەدیس و ئەوەی لە سەحابەكان و موسڵمانان و پێشەوایانیان گێڕدراوەیە كەوا بەڵگەی ئەوەن و ئەوە

[1] مجموع فتاوى، ج: ٢ ص: ٣٣٥.

جێگیر دەکەن پێغەمبەر (ﷺ) بە چاوی سەر خوای رب العالمین ی نەبینی، ئەوەی ئەوەی ابن عەباسیش دەفەرمویّ لەگەڵ ئیمامی ئەحمەد نمونەی ئەوانیش کە فەرمویانە مەبەستیان پێی چاوی سەر نەبوە بەڵکو بە موتڵەقی پێغەمبەر بینیویەتی چونکە لە ڕیوایەتێکی تر لە ابن عباسەوە دەڵێ بە دڵ خوای رب العالمین ی بینی بە چاوی سەر نەبو کە لە دایکە عائیشەیش دەپرسن هەر وەڵامی ئەوە دەبێ.

لەبەر ئەوەیە ابن قەیمی جەوزیە دەفەرمویّ لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە کە ابن عەباس دەڵێ بە دڵ خوای رب العالمین ی بینیوە نەک بە چاوی سەر ئەوەیان سەحیح ترە، وە دایکە عائیشە و ابن مەسعودیش دەفەرمون: ﴿وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ * عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ﴾ [النجم: ١٣-١٤] دەڵێن لەوێوە جوبریل بوو جارێکی تر پێغەمبەر (ﷺ) بە چاوی سەر لەسەر دیمەن و وێنە و شێوە و شکڵی خۆی بینی ئەوە نەبێ ئەو ئایەتە بەڵگەبێ اللهی بە چاوی سەر بینیبێ پێغەمبەر (ﷺ)، لەبەر ئەوە دایکە عائیشە دەفەرمویّ «مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا (ﷺ) رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ أَعْظَمَ، فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ الْفِرْيَةَ[١]» دەفەرمویّ هەریەکێک گومان ببا و بڵێ پێغەمبەر موحەمەد (ﷺ) بە چاوی سەر لەلای (سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ) یان لە ئاسمان خوای رب العالمین ی بینی لە شەوی میعراجدا دەفەرمویّ ئەوە بوختان و درۆی کردوە و هەڵی بەستاوە بە خوای رب العالمین.

وە ئەبو زەڕیش -رضي الله عنه- دەفەرمویّ پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد «هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ يا رسول الله؟» ئایە بە چاوی سەر اللەت بینیوە ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)؟ «فقَالَ: نُورٌ، أَنَّى أَرَاهُ؟[٢]» نورێک لەگەڵ من بەربەست بوو تەنها نور و ڕوناکیەکم بینی من چی ببینم و چۆن ببینم؟

---

[١] صحيح مسلم (١٧٧)، صحيح البخاري (٣٢٣٤) (٤٦١٢) (٤٨٥٥)، سنن الترمذي (٣٠٦٨) (٣٢٧٨).

[٢] صحيح مسلم (١٧٨)، سنن الترمذي (٣٢٨٢)، مسند أحمد (٢١٣١٣) (٢١٣٩٢) (٢١٤٩٨).

ئەو نور و ڕوناکیە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەو پەردە نورینیە بوو لە نێوان خوای رب العالمین و پێغەمبەر (ﷺ) کە پێغەمبەر نەیتوانی بە چاوی سەر خوای رب العالمین ببینێ لەبەر ئەوەی هیچ لاشە و جەستەیەک هیچ عەقڵ و هۆش و ڕۆحێک وە هیچ چاوێک لە توانایدا نیە خوای رب العالمین ببینێ لەبەر ئەوەی الله تەوەجوهی کردە یەک شاخ لەو کاتەی کەوا موسا قەومەکەی داوایان لێی کرد با الله ببینین بە چاوی سەر خوای رب العالمین فەرموی تەماشای ئەو شاخە بکەن یەک تەوەجوهی کرد بۆ شاخەکە شاخەکە تاواوە، ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون دەبێ بۆ جارێکی تر خوای رب العالمین زیندومان دەکاتەوە بە هێز و توانایەکی زیاتر بە مێشک و ڕۆحێکی گەورەتر و بەهێزتر لە دونیادا چاوەکەمان هێندە هێزی هەبێ هەتا بتوانین بە چاوی سەر یەکێکە لە هەرە ناز و نیعمەتە گەورەکانی قیامەت کەوا خوای رب العالمین مان ببینین -جل شئنه- الله لەوانمان بکا کە ببینین، لە ڕیوایەتێکی تر پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «رَأَيْتُ نُورًا[١]» من تەنها ڕوناکیەکم بینی پەردەیەکی نورینم بینی.

لەبەر ئەوە پێشەوا عثمان بن سعيد الدارمي دەفەرموێ (اتفاق الصحابة على أنه لم يره[٢]) سەحابە هەمویان یەک دەنگ بونە کە بە چاوی سەر پێغەمبەر (ﷺ) خوای رب العالمین ی نەبینیوە.

ئینجا پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) هەرکە گەڕامەوە پەنجا نوێژ لەسەر خۆم و ئومەتەکەم لە یەک ڕۆژدا فەرزکرا، موسا پێیگوتم ئەی موحەمەد (ﷺ) خوای رب العالمین چی لەسەر پێویست کردی؟ دەڵێ گوتم پەنجا نوێژ لە شەو و ڕۆژێکدا فەرموی وەڵاهی ئەوەی من شارەزای ئومەت و مرۆڤەکان بم ئومەتەکەی تۆ ناتوانن پەنجا نوێژ ئەنجام بدەن لە شەو و ڕۆژێک تەمبەڵی زۆری لێدەکەن من پێم باشە تۆ ئەگەر بچیەوە لای خوای رب العالمین و

[١] صحيح مسلم (١٧٨).

[٢] كتاب مختصر زاد المعاد [محمد بن عبد الوهاب] ص: ١٠٦.

لەبەری بپاڕێیەوە بەڕاستی هەتا خەفیف و سوکی بکا لەسەر خۆت و ئومەتەکەت، دەڵێ گەڕامەوە و خوای رب العالمین کە نوێژی لادا لە پەنجایەکە چلی لەسەرمان هێشتەوە، دەڵێ دوبارە گەڕامەوە لای موسا جارێکی تر گوتی هێشتا هەر زۆرە من تەجروبەم هەیە لەگەڵ بەنو ئیسرائیل ئەی موحەمەد (ﷺ)، دەڵێ دوبارە گەڕامەوە و هەتمەوە دەی تری لادا، هەتا لە کۆتاییەکەی کۆتاجار کردیە پێنج خوای رب العالمین، دەڵێ بەڵام خوای رب العالمین دەنگێک هات لەلای ئەوەوە هەرکە گەڕامەوە بوە پێنج و چیتر نەگەڕامەوە لای، فەرموی «أَمْضَيْتُ فَرِيضَتِي، وَخَفَّفْتُ عَنْ عِبَادِي[1]» فەرموی دڵنیابە موحەمەد (ﷺ) خێری هەر پەنجا نوێژەکەم تازە نوسیوە بۆ ئومەتەکەت بەو پێنج نوێژە فەرزەی کە دەیکەن بەڵام ئەوە لەسەرم سوک و ئاسان کردن لەبەر تکا و شەفاعەتەکانی تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ).

پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە چەندین دیمەنی تریشی بینی هەندێکیان ڕیوایەتی زەعیفی لەسەرە و هەندێک سەحیح، هەرکە هاتەوە پێغەمبەر (ﷺ) لەو شەوەدا لە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەدا بە لاشە و جەستە لەگەڵ ڕۆحی چوو بوو ئەو کەسانەی دەڵێن وەکو خەون چوە ئەوە ڕاست نیە ئەو کەسانەی دەڵێن هەر ڕۆحی چوە و لاشەی لە مەککە بوە ئەوە ڕاست نیە، ئەوە ڕاستە کەوا بە لاشە و جەستە لەگەڵ ڕۆحەکەی وەکو گەشتێکی ئاسایی خەڵکەکەی تر کە دەیکەن بە لاشە و جەستە و ڕۆحیانەوە ئەویش وا خوای رب العالمین بۆ پێغەمبەر ڕێکی خست (ﷺ) و بردیە ئاسمانەکانیش، ئەوەی بڵێ عیلمی ئێستا قبوڵی ناکا دینی ئێمەش ئەو عیلمە قبوڵ ناکا کە ڕیوایەتە سەحیحەکان ڕەت دەکاتەوە خوای رب العالمین بە ڕاستی داناوە و پێغەمبەریش (ﷺ) لە ڕیوایەتی سەحیح گێڕاویەتیەوە ئەگەر خوایەک بتوانێ ڕۆژ و ئاسمان و زەوی وا ڕابگرێ کە ئەوانە هەمویان مەخلوقی ئەون هەموشی موسەخەر کردوە بۆ مرۆڤەکان لەناو هەموو مرۆڤ و

[1] صحيح البخاري (٣٢٠٧) (٣٣٩٣) (٣٤٣٠)، صحيح مسلم (١٦٤) (١٦٨)، سنن الترمذي (٣١٣٠) (٣٣٤٦).

مەخلوقاتەکانیش موحەمەد لە هەمویان گەورەتر و بەڕێزترە (ﷺ) لەلای خۆی زۆر ئاسانە لە دەسەڵات و قودرەتی ئەو اللەیە لە یەک شەو و بەوەندە چرکە و دەقیقانە پێغەمبەر (ﷺ) بگاتە (بیت المقدس) و لەوێش هەڵبکشێ بەرەو حەوت ئاسمانەکە و لەوێش دابەزێتەوە و بێتەوە مەککە هێشتا پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکەکەی مەککە بە خەبەر نەهاتبن لە خەوەکەیان و هەر لەو شەوە مابنەوە و ئینجا بەیانی بە ناویاندا بگەڕێ و پێغەمبەر بفەرموێ ئەوەم بینی (ﷺ).

قوڕەیشیەکان سەریان سوڕما گوتیان چۆن ئەوەت بینیوە؟ گوتی وەڵا من چوم لە یەکێک لە ڕیوایەتەکان دەفەرموێ لە (بیت المقدس) و دەنا بۆ مەعلوماتتان قوڕەیشیەکان خوای رب العالمین کۆمەڵی پێغەمبەرانی هێنایە ئەوێ ئیبراهیم بوو موسا بوو عیسا بوو من پێش نوێژیم بۆیان کرد لەوێ بومە ئیمامی پێغەمبەرەکان (علیهم الصلاة والسلام)، ئێ گوتیان ئەگەر وایە عەمری کوڕی هیشام بە پێکەنینەوە گوتی مادەم وایە وا دەڵێی موحەمەد دە وەرە ئێمە لە جولەکە و دیانەکان وەسفی موسا و عیسامان زانیوە هی ئیبراهیمیش بۆمان وەسفکە ئەوانە پیاوی چۆن بون؟ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «أما عيسى ففوق الربعة ودون الطويل، عريض الصدر» پیاوێکی هێندە باڵا بەرز نەبو عیسا زۆریش کورت نەبو سینگی پان بوو «ظاهر الدم» زۆر خوێن شیرین بوو «جعد» پرچی هەموو گروازە بوو «الشعر، تعلوه صهبة» تۆزێک ڕەنگی بەلای سپی و سورایەتیشی تێدابوو هەروەکو «كأنه عروة بن مسعود الثقفي» عەڕوەی کوڕی مەسعودی سەقەفی تۆزێک بە عیسا دەچێ ئەوە لەبەر چاوتانە و دەیبینن، بەڵام هەرچی موسا بوو فەرموی «فضخم آدم» موسا بەڕاستی باڵا بەرز و بە شان و شەوکەت و گەورەبوو لاشە و جەستەکەی بەهێز دیاربوو وە ئەسمەر بوو وە «طوال» زۆر باڵای درێژ بوو «كأنه من رجال شنوءة» وەکو بەنو شەنوئیەکان کە باڵایان چەند بەرزە ئەوها بوو بەهێزیش دیاربوو «متراكب الأسنان» ددانەکانی لەسەر یەکتر بون

و لەپاڵ یەکتر بون «مقلص الشفة، خارج اللثة، عابس» هەرکە تەماشات دەکرد سام و هەیبەتی هەبوو دەم بە زەردەخەنە نەبو لێی دەترسای زۆر بەهێزیش دیار بوو «وأما إبراهيم فوالله لأشبه الناس بي خلقا وخلقا[١]» بەڵام هەرچی ئیبراهیم پێغەمبەر بوو (ﷺ) سوێند بە الله لە شێوە و شکڵ و دیمەنی عەینی من بوم وە لە ئەخلاق و ڕەوشتیشی من وام بینین.

ئێ گوتیان باشە ئەوە ئەوانەت وەسف کرد (زانیان وەسفەکەی ڕاستە) (بيت المقدس) چۆن بوو؟ تۆ خۆ نەچویە (بيت المقدس) بۆمان وەسفکە، پێغەمبەر دەفەرموێ وەڵامم دانەوە گوتی شەو بوو من چوم بە شەویش لێی دەرچوم، دەڵێ جوبڕائیل لەناکاو فلیمەکەی هێناوە بەرامبەرم و پێی نیشاندام هەرکە ئەو قسەم کرد (بيت المقدس) وێنەکەی لە بەرامبەرم حوبڕائیل بە لاباڵێک ڕایگرت، دەڵێ ئینجا منیش یەک بە یەک دیمەنەکانی (بيت المقدس)م بۆ گوتن و دەڵێ گوتم ئەو دەرگەی لەو شوێنە بوو وا من چومە ناوی و ئا دەرگایەکیشی لە فلان شوێن بوو ئا ئاوا بوو بینایەکەی، دەڵێ سەریان سوڕما و هیچیان پێ نەکرا ئیلا ئەوە نەبێ کەوا بە درۆم بێننەوە حاقید بون دڵ ڕەق بون، ئینجا دەڵێ بڵاو بوەوە دەنگە باسەکە و کە دەچنە لای ئەبو بەکری سدیق پێی دەڵێن هاوەڵەکەت وا دەڵێ، دەفەرموێ وایگوت؟ گوتیان بەڵێ، گوتی سوێند بە الله ئەگەر لە زمانی ئەو بیستبێتتان لە دەمی ئەو هاتبێتە دەر ئەو قسانە دە هێندەش زیاتر بڵێ من لە ئێستاوە پێی بڕوا دەکەم و ڕاستگۆیە موحەمەد (ﷺ)، ئەوە سدیقایەتی ئیمامی ئەبو بەکر بوو کەوا لە دور بە دوریش ئەوەندە متمانەی بە پێغەمبەر بوو (ﷺ) بە هەموو قسە و گوتنەکانی بڕوای دەکرد و تەسدیقی دەکرد و ئیمانی پێ دەهێنا.

لە کۆتایدا تەنها ئەوە دەڵێین وەکو أبو الحسن الندوي و زانایان فەرمویانە پەند و وانە لەوە ئەوە دەردەخات کە پێغەمبەرمان (ﷺ) گەورەی هەموو پێغەمبەرانە کە (بيت المقدس) و

[١] الدر المنثور السيوطي - جزء: ٩ صفحة : ١٨٣.

كه‌عبه‌ش هه‌ر هی موسڵمانانه‌ هه‌تا قیامه‌ت نابێ جوله‌كه‌كان به‌ هی خۆیانی دابنێن ئه‌و شه‌ڕه‌ی ئێستا و له‌ ڕابردوش ده‌كرا و هه‌تاوه‌كو جوله‌كه‌كان ده‌رده‌په‌ڕێنرێن له‌ ئیسرائیل و له‌ (بيت المقدس)ه‌وه‌ به‌ دڵنیاییه‌وه‌ حه‌ق و ڕه‌وایه‌ بۆ ئه‌وه‌ی جوله‌كه‌كان له‌وێ نه‌مێنێن كلیلی (بيت المقدس) وه‌كو ئیمامی عومه‌ر بۆ یه‌كه‌مجار ڕزگاری كرد باپیره‌ سه‌ڵاحه‌دینیش بۆ دوه‌م جار وه‌ سێیه‌م جاریش سه‌ر له‌شكری موسڵمانان به‌ دڵنیاییه‌وه‌ (إن شاء الله) الله پێمانی ده‌به‌خشێته‌وه‌ ڕزگاری ده‌كاته‌وه‌ و جوله‌كه‌كان سه‌ر شۆڕ ده‌كات و وه‌ موسڵمانان له‌ چنگیان ده‌پارێزێ وه‌كو ئێستا جارێكی تر پیلانیان له‌ موسڵمانه‌كانی فه‌له‌ستین داناوه‌ته‌وه‌ الله جوله‌كه‌كان رسوا بكا و له‌ناویان ببا و موسڵمانه‌كان بپارێزێ و سه‌ریانبخا.

## په‌یمانی عه‌قه‌به‌ی یه‌كه‌م و دوه‌م

جا دوژمنانی ئیسلام كه‌وتنه‌ ئه‌وه‌ی زیاتر ئازار و ئه‌شكه‌نجه‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) بده‌ن پاڵه‌په‌ستۆی بخه‌نه‌ سه‌ر ئه‌وه‌بوو پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌ستیكرد به‌ نمایشكردنی ئیسلام به‌سه‌ر گه‌ل و نه‌ته‌وه‌كانی ده‌هاتنه‌ شاری مه‌ككه‌ بۆ تیجاره‌ت و بازرگانی یان له‌ مه‌وسیمه‌كانی حه‌ج و زیاره‌تكردنی ماڵی الله كه‌ خه‌ڵكه‌كه‌ ئیسلامی له‌سه‌ر نمایش ده‌كردن و وه‌ خۆی پێ ده‌ناساندن به‌ نیه‌تی ئه‌وه‌ش بوو كه‌ ڕێگا و جێگایه‌كی باشتر له‌ مه‌ككه‌ بدۆزێته‌وه‌ تاوه‌كو خۆی و سه‌حابه‌كان بچن له‌وێ ده‌عوه‌ و بانگه‌وازی زیاتر بره‌و پێبده‌ن و وه‌ ده‌وڵه‌تی ئیسلامی دابمه‌زرێنێ.

دوو به‌یعه‌ زۆر مه‌شهور و به‌ناو بانگن واته‌ دوو گفت و دوو به‌ڵێن نامه‌ كه‌ له‌نێوان پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) و ئه‌نساره‌كان ڕویدا یه‌كه‌میان پێی ده‌ڵێن به‌یعه‌ی عه‌قه‌به‌ی یه‌كه‌م واته‌ په‌یمان و به‌ڵێن و گفتی عه‌قه‌به‌ی یه‌كه‌م، عه‌قه‌به‌ شوێنێك بوو كه‌ له‌ مه‌ككه‌ ده‌رده‌چوی شوێنێك بوو خه‌ڵكی هه‌ندێك جار ده‌هاتن له‌وێ كۆده‌بونه‌وه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌و شوێنه‌ بۆ جاری یه‌كه‌م ابن القيم الجوزية بۆمان ده‌گێڕێته‌وه‌ كه‌ به‌یعه‌ی عه‌قه‌به‌ی یه‌كه‌م بوو

دەفەرموێ «إن رسول الله (ﷺ) لقي عند العقبة في الموسم ستة نفر من الأنصار كلهم من الخزرج» دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی خەڵکەکە بۆ حەجی ماڵی الله هاتبون چونکە حەج لەپێش هاتنی پێغەمبەریش (ﷺ) خەڵکێک بڕوای پێی هەبو دەهاتنە خزمەت (کعبة الله) دەفەرموێ لە عەقەبە کە شوێنێکە گەیشتە شەش کەسی ئەنساریەکان هەمویان لە خەزرەجیەکان بون چونکە ئەنساریەکان بریتی بون لە ئەوس و خەزرەج کە دوژمنداری زیاتر لە سەد ساڵی لە نێوانیاندا هەبو خوێنیان دەڕشت ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) لەوێ چاوی بەوان کەوت، کە دایکە عائیشە دەگێڕێتەوە -رضي الله عنها- دەفەرموێ خێر و بەرەکەت بوو جەنگی بعاث، جەنگی بعاث ئەو جەنگە بوو لە نێوان ئەوس و خەزرەجیەکان ڕویدا بە فیتی جولەکەکانی ئەوکات بە سەدان خەڵکی تێدا کوژرا و وە ماڵی یەکتریان تاڵانکرد و نزیکەی چوار تا پێنج ساڵ پێش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بچێتە شاری یەثریب ببێتە شاری پێغەمبەر (ﷺ) بچێتە مەدینە ئەو جەنگە ڕویدا، جا ئەو جەنگە بوە مایەی ئەوەی کەس نەبو پێکیان بێنێتەوە سەرکردەیەکی وایان نەمابوو بەوە ڕازی نەبون بە یەکەوە ئەوس و خەزرەجیەکان کەسێک بڕیار بدەن ببێتە برا گەورەی یەثریب و مەدینەییەکان، جا لەو پێناوەدا ئەوانەش دەگەڕان بەدوای ئەوەدا چارەسەرییەکیان بۆ هەبێ پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە شەش کەسیان لەوانە (أبو أمامة کە اَسْعَد کوڕی زُرارة، وە عوف کوڕی الحارث، وە رافع کوڕی مالك، و وە قطبة کوڕی عامر، وە عقبة کوڕی عامر، وە جابر کوڕی عبد الله کوڕی رئاب)، پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردن بەرەو ئیسلام ئا ئەوانە هەمویان دڵیان نەرمبوو دەست بەجێ لەوێ بونە موسڵمان بەڵام کە ویستیان بگەڕێنەوە پێغەمبەر (ﷺ) تەماحی ئەوەی کرد بگەڕێنەوە دەعوە و بانگەوازی بکەن لە یەثریب مصعب کوڕی عمیر وەکو ڕەوانەکراوی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەو شەش کەسە ناردی بەرەو شاری یەثریب کە نیشتەجێ ببێ لە ماڵی أسعد کوڕی زرارة و بانگەوازی بکەن بەرەو ئیسلام.

ئەو موسعەبەی کە لە مەککە گەنجێکی دەوڵەمەند بوو بە بۆن خۆشیەکەی خەڵکی مەککە لەسەری گەڕەک کە بەدیار دەکەوت و لە کۆڵانەکان خەڵکەکە لەماڵەوە دەیانگوت ئەوە موسعەبە هات کەس هێندەی ئەو ناتوانێ ئاوا خۆی بۆن خۆش بکا و برازێنێتەوە ئەوها ناسرابوو کە بوە موسڵمان دایکی گوتی ئەگەر واز نەهێنی لە ئیسلامەتی من ئەو هەموو ماڵ و سەروەت و سامانەی هەتە و پێتدەدەین لێت دەستێنمەوە، لە کۆتایەکەیدا موسعەب ڕازی بوو بەوەی موسڵمان بێ هەموو ماڵ و سەروەت و سامان و خۆشیەکانی لێ بستێندرێتەوە، ئینجا هەتا گەیشتە ئەوەی موسعەب کەوا بە فەقیری و هەژاری مایەوە پارە و پولی نەما بەڵام ئیمانی هەبو لەبەر ئەوەیە زانایان دەفەرمون نابێ ئیمان بە هیچ شتێک بگۆڕدرێتەوە عەقیدە و بیروبڕوا نابێ بەهیچ شتێک بگۆڕدرێتەوە تەنانەت خاکت وڵاتت ماڵت سەروەتت سامانت دەسەڵاتت پارەت منداڵت خێزانت ئەوانە هەموی هەندێک جار الله داوای ئەوەت لێدەکا کە لە پێناو ئیمان و عەقیدەکەت دەستیان لێ بەردەیت و دەستبەرداریان بی وەکو پێغەمبەران کردویانە (علیهم الصلاة والسلام) وە سەحابە بەڕێزەکان بە کردار جێبەجێیان کردوە و وابونە.

ئینجا کە چونەوە مەدینە لەوێوە دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ئیسلام ماڵەکانی مەدینە لەبەر ئەوەی کێشەیان هەبوو دڵ نەرمتر بون لە خەڵکەکەی مەککە زوتر و بە ئاسانتر ئیسلامەتی لە ناویان بڵاوبویەوە، ئا ئەو کاتە جارێکی تر دێنەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) شەش کەسی تریشیان لەگەڵە و ئەو دوازەدەکەی تر بەیعەتی لەگەڵ دەبەستنەوە ئینجا بەیعەی عەقەبەی دوەم دێ.

بەیعەی عەقەبەی دوەم تەواو مەدینە ئیسلامەتی بەخۆیەوە هەڵگرتبوو حەفتا و پێنج کەسیان کە حەفتا و سێیان پیاو بون و دوانیان ئافرەت بون نەسیبەی کچی کەعبی ئەنصاری لەو دوو ئافرەتانە بوو کە لە جەنگی ئوحود دا پاسەوانی هەرەتایبەتی پێغەمبەر

بوو (ﷺ) ڕاستە ئافرەت بوو بەڵام چوبوە شەڕ و جەنگ بە سەدان پیاوانی ئەوکات ئەگەر دەورەیان لێ دابا پێی نەدەوێران هەندێک جار هەبوە نەسیبە هەشتا برینی لە لاشە و جەستەی بوە ئینجا مەیدانی شەڕ و جەنگی بەجێ نەهێشتوە، پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) ئەوەی من لە نەسیبە بینیم لە یەک لە جەنگەکان شمشێرەکان دەبریسکایەوە لەسەر سەری کۆڵی نەدەدا و پاسەوانی دەکرد لە پێغەمبەری الله (ﷺ)، لەبەر ئەوە پیاو و ئافرەتانی سەحابیان بەڕاستی نەوعێکی تایبەت بون خوای رب العالمین بەدیهێنابون لە بەرگریکردن لە عەقیدە و بیروبڕوا و ئیسلام لەبەر ئەوە ئاوا بە ئاسانی ئیسلام بڵاوبویەوە و دەوڵەتی دامەزراند.

بەڵێ لە بەیعەی عەقەبەی دوەم پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لەگەڵ عەباسی مامی، کە عەباس هێشتا موسڵمان نەبو بوو بەڵام دڵی بە پێغەمبەرەوە بوو وەکو برازای خۆی خۆشیدەویست، لە سێیەکی شەودا و لە تاریکایی شەودا چونە عەقەبەی دوەم چونە عەقەبە و لەوێ بەیعەی دوەمی عەقەبە ببەستن ئەوەبوو ئەنساریەکانیش هاتبون گوێ لە پێغەمبەر بگرن (ﷺ)، لەوێ پێغەمبەر فەرموی من بەیعەتتان لەگەڵ دەبەستم ئەی ئەنساریەکان کە موسڵمان بونە من قەدەغە بکەن لە دوژمنەکانم دەستیان پێم نەگا کاتێک دێمە ناوتان ئیسلامەتی بڵاوبێتەوە شیرک پەیدا مەکەن بۆ خوای رب العالمین زینا نابێ بکرێ ڕیبا نابێ بخورێ وە خەڵک بە ناحەق نابێ بکوژرێ ئەو هەموو بەیعەت و پەیمان و بەڵێنەی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ حەفتا و پێنج کەسەکەی ئەنساریەکان و لەگەڵ حەفتا و پێنج کەسەکەی شاری یەثریب بەستا کە دوانیان ئافرەت بون، یەکیان ناوی نەسیبەی کچی کەعب بوو وەکو گوتمان وە ئەویتریشیان ئافرەتێک بوو لە بەنی مازنی بەنو نەجار کە نوسەیبە لەوان بوو وە أسماء بنت عمرو بن عدي یەکێک بوو لەو ئافرەتانەی تر کە دوەم بوو لە حەفتا و پێنج کەسیەکەی ئەنساریەکان.

بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی بەدەست هێنا، هەندێک لە مێژونوسان دەفەرمون عەباسیش قسەی کرد گوتی ئێمە لێرە هەموو خزمەکانی موحەمەد (ﷺ) تاک تاکمان نەبێ پشتگیریمان لێکردوە ئەگەر ئیمانیشمان پێ نەهێنابێ قەت نەمانهێشتوە بتوانن بیکوژن قورەیشیەکان ئازار و ئەزیەتیەکی وای بدەن لەناو بچێ موحەمەد (ﷺ) بەڵام موحەمەد دڵی ئۆقرەی نەماوە لەناو ئێمە بمێنێتەوە لەپێناو بەرژەوەندی بانگەوازیەکەی حەزی بە هیجرەت کردنە لەبەر ئەوە ئەگەر ئێوەش دەتوانن بیپارێزن ناموسی و وە گیانی موحەمەد (ﷺ) ئەوەی دەیەوێ بۆی جێبەجێ بکەن لە ئێستا مەردبن و بەڵێنی مەردایەتی و پیاوەتیمان پێ بدەن؟ ئەگەر ناتوانن با لەناو ئێمە بمێنێتەوە باشتر و ئەولاترە، دەڵێ دیارە پێغەمبەر (ﷺ) کە وای فەرموو عەباسیش وایگوت بەڕائی کوڕی مەعرور دەستی پێغەمبەری گرت (ﷺ) لە پاشان گوتی «فوالَّذي بعثَكَ بالحقِّ لنمنعنَّكَ ممَّا نمنَعُ أُزُرَنا، فبايِعنا يا رسولَ اللهِ» فەرموی سوێند بەو خوایەی کە تۆی بە پێغەمبەر ڕەوانە کردوە ئەوەی کە ئێمە ماڵ و منداڵ و ناموسی خۆمانی پێ دەپارێزین غیرەتی ئەنساریەکانیش دەزانی چەندە لەسەر ناموس، ئەنسار زۆر بەناوبانگ بون لە پاراستنی ناموس، دەفەرموێ سوێند بە الله بەویشەوە تۆ دەپارێزین وەکو ناموسی خۆمان وەکو منداڵی خۆمان گیانمان لەسەر دەست دەبێ دە بەڵێنمان لەگەڵ ببەستە ئەی موحەمەد (ﷺ) پێغەمبەری الله «فنحنُ واللهِ أهل الحروبِ» بشزانە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە چاک ڕاهاتوین لەسەر شەڕ و جەنگەکان لەبەر ئەوەی شەڕمان هەر هەبوە لە نێواندا و هەر کردومانە و لە ئامادەباشیدان ئەگەر جەنگیش ڕوبدا، وە لە پاشان دەڵێ بۆمان ماوەتەوە لە باوک و باپیرەمان جورئەت و جەنگاوەرایەتیەکە پشتمان پێ ببەستە ئەی موحەمەد ئەی پێغەمبەری الله، وە لە پاشان گوتیان بیستومانە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) با چاکت پێ بڵێین فڵانە کەسەکان لەناو قورەیش زۆر ئەزیەتیان دای ئەگەر دەڵێی هەر ئێستا لێرە تەجروبەمان بکە و ناگەڕێینەوە هەر ئەوەندە کەسەمان دەچینە سەر ئەو قەبیلە و تیرە و ئەوانەی ئەزیەتیان دای لەناو

قورەیشیەکان سوێند بە الله تۆڵەت دەستێنینەوە بە کرداریش بمان بینە چیت بۆ دەکەین، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەوەم داوا نیە لێتان بەڵام کە موسڵمانان دەنێرم بۆ شارەکەتان وە منیش کۆچ دەکەم و دێمە ناوتان ئەو بەڵێنانەتان لە یادبێ و بمان پارێزن، هەموو بە یەک دەنگی گوتیان پێغەمبەر (ﷺ) زۆر دڵ خۆشبوو کە گوتیان بەڵێ دەتپارێزین فەرموی «بلِ الدَّمَ الدَّمَ والهدم الهدم» فەرموی خوێنمان وەکو یەکبێ خوێن بە خوێن و وە ڕوخان بە ڕوخان و «أنا منكُم وأنتُم مِنِّي» من تازە لە ئێوەم ئەنساریەکان و ئێوەش لە منن پشتم پێتان دەبەستم لەپاش پشت بەستن بە خوای رب العالمين «أحارِبُ مَن حاربتُم وأسالِمُ مَن سالمتُم» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) منیش جەنگی ئەو کەسە دەکەم کە جەنگی ئێوەی ئەنساری دەکا وە لەگەڵ ئەوەش ئاشتەوایی دەکەم کە لەگەڵتان لە ئاشتەوایی دایە.

ئەوە زەمینە سازیەکی زۆر باش بوو بە فەرمانی خوای رب العالمين بۆ ئەوەی موحەمەد (ﷺ) دڵی خۆشبوو کەوا سەحابەکان ئازار دەدرێن شوێنێکی زۆر لەبار و گونجاوی بۆ دۆزینەوە ببنە پشت و پەنایان.

جا لێرەدا دەمانەوێ بچینە سەر خزمەت قورئانی پیرۆز بزانین قورئانی پیرۆز چۆن بۆمان ڕوندەکاتەوە لە هەموو سەردەم و کاتێکدا وە لەگەڵ پێغەمبەریش (ﷺ) کافر و بێبڕواکان چیان داوایە لە موسڵمانان؟ وە قورەیشیەکان چیان داوا بوو لە پێغەمبەر (ﷺ)؟ لە ئەنجامدا الله پێمان دەفەرموێ نابێ ئێمە بەهیچ جۆرێک لە عەقیدە و بیروبڕوامان تەنازول بکەین لە وەلاء و بەڕائدا لابدەین بەڵکو دەبێ هەر دۆستی الله بین و الله بناسین لە پێناو الله گیانمان ماڵمان منداڵمان خاکمان زەویمان هەموی بکەینە قوربانی، ئەوەتا خوای رب العالمين دەفەرموێ لە سورەتی [الإسراء: ٧٣-٧٧] کە زۆر گرنگە هەموو داعیەکان هەموو مامۆستاکان وە هەرکەسێکیش ئیدیعای ئەوەی کرد کە بڵێ من دەمەوێ حوکمی ئیسلام بگەڕێنمەوە بانگەوازی دەکەم فەرمان دەکەم بە چاکە ڕێ دەگرم لە خراپە ئەو چەند

ئایەتەی سورەتی (الإسراء) بخوێنێتەوە و بە تەفسیر تێی بگا لە واتاکەی و بە کردار جێبەجێی بکا لە ژیانی ڕۆژانەیدا ئەوکاتە هەموو کافرەکان جنس و وە ڕەگەزیان و قسەیان و شێوازیان لە هەموو کاتێک هەر یەکە موسڵمانیش دەبێ هەر یەکبێ و لەسەر ڕێبازی الله و پێغەمبەر (ﷺ) لانەدا، الله تعالى دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَفۡتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ لِتَفۡتَرِيَ عَلَيۡنَا غَيۡرَهُۥۖ وَإِذٗا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلٗا﴾ کادە لە زمانی عەرەبی ئەوانەی شارەزان ئەفعالی موقارەبەیە واتە زۆر نزیک بوو وە نزیک بونەوە لەوەی قوڕەیشیەکان و کافرەکان بە فیتنە و ئاشوبت ببەن بەوەی کەوا لە وەحی و نیگا و فەرمانەکەی من لات بدەن ئیفتیرا بکەی و درۆ بکەی بە قسەکان و وەحیەکەی من شتێکی وا بڵێی لە دین و قورئان کە ئەوان پێی ڕازینە نەک ئەو قورئانەی من بۆتۆم ناردوە لە هەموو سەردەمێک هەر وابوە بەڵێ خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَإِذٗا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلٗا﴾ ئەگەر تۆ لاتدا لە قورئانەکەی من هەندێک ئایەتت لەبەر دڵی ئەوان تەفسیر نەکرد و نەتگوت و کردارت پێ نەکرد واتە ئیفتیرات کرد (نعوذ بالله) بە قورئانەکەی من الله دەفەرموێتە پێغەمبەر (ﷺ) ئا ئەو کاتە ئینجا ئەوان بە دۆستت دەگرن، واتە ئەوە قاعیدە و بنەمایە دەبێ ئێمە ئەوەی لێ وەربگرین هەر کافرێکی موتڵەق هەر موشریکێک أهل الکتاب بن یان کافرەکانی تر یان هەر مورتەد و هەڵگەڕاوەیەک ئەگەر لە موسڵمانێکی ڕاستەقینە ڕازی بوو بە دۆستی خۆی گرت و پشتگیری لێ دەکرد و مەدحی دەکرد لەوە دڵنیابن خەلەلێک هەیە لێرەدا ئیلا ئەگەر سیاسەتی کاتی بێ وابکا ئەگەرنا بە حەقیقەت کافرەکە ئەگەر وایگوت دیارە تۆ لە قورئانی ڕاستەقینە لاتداوە لەبەر ئەوە ئاوا لەگەڵت دۆستە، الله فەرمویەتی ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەو کاتە بە دۆستت دەگرن ئەگەر تۆ قورئانەکە بگۆڕی بۆیان، ئێستاش جولەکە زل هێزە کافرەکان لەسەرتاسەری زەوی ئەوان ئیسلامەتیهان بۆ تەعریف دەکەن موسڵمانانی لاواز و نەزان و بێ عیلمیش هەندێک جار دەڵێن تەواوە، یەعنی ئەمریکا دێ جولەکە دێ دەڵێ ئیسلامەتی دەبێ وابێ ئاوا بڕۆ مزگەوت ئاوا وەرە دەرەوە شێوە و شکڵت وابێ منداڵت

وابێ چ قەید دەکا ژن و پیاو تێکەڵ بن کە ئەوە توند ڕەوییە بڵێی لێکیان جیابکەوە با ئافرەت حوڕییەتی هەبێ و خۆی دانەپۆشێ ئاوا ئاوا ئاوا... ئەوە ئاوایە ئەو ئایەتە دەیگرێتەوە ئەو نەوعە دینە دینێکە کە جولەکە و کافرەکان ئاوایان دەوێ بە گوێرەی مرازی خۆیان وە بە گوێرەی خواستی خۆیان دینەکە دادەتاشن بەڵام ئەو دینە دینێکی حەقە کە الله بۆ ئێمەی ناردوە الله چی فەرموو ئەو جێبەجێ بکە کافر لێت ڕازییە لێت ڕازی نیە ئەوەت مەبەست نەبێ با الله لێت ڕازی بێ و لەسەر سونەتی پێغەمبەر بڕۆی (ﷺ) با بە دۆستت نەگرن و بە دوژمنت بزانن، ئەوەی الله دۆستی بێ هەر دەباتەوە وەکو پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر کافر و سەر ڕوی زەوی هەموو دوژمنی بن ئەوەی اللەش دوژمنی بێ و لە خەت لابدا لە موسڵمانەکان الله پشتگیریکاری نەکا قەتاوقەت سەرناکەوێ ئەگەر هەموو دونیا هێزبێ و لەبەر دەستی بێ و بۆشی بەکار بهێنرێ، ئینجا الله دەفەرموێ: ﴿وَلَولَا أَن ثَبَّتنٰكَ لَقَد كِدتَّ تَركَنُ إِلَيهِم شَيـًٔا قَلِيلًا﴾ ئەگەر ئێمە تۆمان جێگیر نەکردبا ئەی موحەمەد (ﷺ) ڕاوەستامان نەکردبای لەسەر بەرنامە ڕاست و دروستەکە خۆ نزیک بوو تۆ وات لێهاتبوو لەبەر بەرژەوەندی دەعوە و بانگەوازی مەیلێکی یەکجار کەمت هەبێ بۆ ئەوەی ئەوان پێی ببنە موسڵمان تۆزێک نەرم لەگەڵیان قسە بکەی و لەگەڵیان بدوێی و نەرمی بنوێنی مەیلێکی کەمی وات دەبوو بەڵام ئێمە لێ ناگەڕێین جێگیرمان کردی ئەو مەیلە کەمەشت هەبێ، هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون مەیلەکە چی بوو؟ کاتێ کەوا ئەبو جەهل و سەرکردە کافرەکان گوتیانە پێغەمبەر (ﷺ) کە ئێمە دێینە کۆڕی تۆ بیلال و خەباب و ئەوانەی کەوا بنەماڵە نینە و ناودار نینە پێشتر کۆیلە بونە ڕوو مەکە ئەوان ڕوو لە ئێمە بکە ئێمە قسەت لەگەڵ بکەین و پشت لەوان بکە هەتا ئێمە تەواو دەبین لە کۆڕەکە لە پاشان ڕوبکە ئەوان و ئێمە بەڕێ بکە، لە تەماحی ئەوەی کە ببنە موسڵمان هەندێک لە زانایان دەڵێن ئەو فکر و بۆچونە ئەگەری هەبوو پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ ئەو هەموو خەڵکە و سەرکردە دەبنە موسڵمان، چ قەید دەکا با وا بکەم بیلال و خەبابیش ڕەنگە پێیان ناخۆش

نەبێ لەپێناو ئەوەی ئەوان ببنە موسڵمان و موسڵمانان بەهێزبن بەڵام الله قبوڵی نیه -جل شئنه- ئەو مەیلە کەمەشی بە کردار نەکرد و نەیبوو پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا خوای رب العالمین دەفەرموێتە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿إِذٗا لَّأَذَقۡنَٰكَ ضِعۡفَ ٱلۡحَيَوٰةِ وَضِعۡفَ ٱلۡمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيۡنَا نَصِيرٗا﴾ ئەی موحەمەد (ﷺ) خۆ ئەگەر هەتبا مەیلە کەمەکە بۆ ئەوەی ئەبو جەهل و ئەوان ببنە موسڵمان پشتت لە بیلال و ئەوان کردبا لە کۆڕ و مەجلیسەکە ئەوها نەرمیەکی وات نواندبا لەگەڵ سەرکردە کافرەکان الله دەفەرموێ دوو ئەوەندەی خەڵکی تر لە دونیا و لە قیامەت عەزابم دەدای ئەی موحەمەد (ﷺ)، لێرەوە زانایان دەفەرمون ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قدوەکان سەرمەشقەکان چ پێغەمبەران بن (علیهم الصلاة والسلام) چ زاناکان و سەرکردەی موسڵمانان بن ئەگەر نەرمی بنوێنن و غەڵەت بکەن لە دیندا دوو ئەوەندەی خەڵکی تر عەزابیان قورسترە و بەهێزتر الله عەزابیان دەدا لەبەر ئەوەی ئەوان دەیزانن وە شارەزانە دەبێ پێداگری بکەن و ئەگەر ئەوان گومڕابن خەڵک و جەماوەر و ئەوانەی بە قسەیان دەکەن ئەوانیش گومڕا دەبن (پەنا بە خوای رب العالمین)، جا لە پێغەمبەر قبوڵ نەکرا الله دەفەرموێ دوو ئەوەندەی خەڵکی ترت عەزاب دەدەم ئەگەر تۆ بتەوێ بۆ سەرنج ڕاکێشانی سەرکردە قورەیشیەکان بۆ ساتێکی کەمیش بێ پشت بکەیتە بیلال و خەباب الله منەتی بە سەرکردە نیە منەتی بە هێز نیە الله بۆخۆی لە هەموو کەس و شتێک بەهێزترە -جل شئنه- منەتی بەوەیە دەبێ الله تعالى منەت بکا بەسەر عەبدەکان نابێ بە ئیمان و ئیسلام بونیان منەت بکەن بەسەر خوای رب العالمین: ﴿قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَيَّ إِسۡلَٰمَكُم بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيۡكُمۡ﴾ [الحجرات ١٧] پێیان بڵێ ئەی موحەمەد (ﷺ) ئێوە منەت مەکەن کە دەبنە موسڵمان بۆخۆتان چاکە بەڵکو الله منەت لەسەرتان دەکا ناز و نیعمەتێکە هیدایەتی داون ئێوە پێی بونە موسڵمان، ئەمڕۆ ئەو غەڵەتانە زۆر دەکرێ دەبێ زۆر ئاگاداربین وەڵاهی چونە بەهەشت ئاسان نیە وەڵاهی ڕێبازە ڕاستەقینەکەی ئیسلام تەتبیق کردنی سەد لە سەد وەکو پێغەمبەر کردویەتی (ﷺ) باجی دەوێ، تۆ بە ئیسراحەتی خۆت

لەبەر کۆندێشن و لە ماڵەکەی خۆت بێ دیعایەت لەدوا نەکرێ و عەزیەت نەدرێی و نەگیرێی و کۆسپت بۆ دروست نەکرێ و تفت لە ڕوو نەکرێ و قسەت پێ نەگوترێ دینێکی وا بکەی وەڵا کافر و بێدین و مورتەد و هەڵگەڕاوەکان ئاماژەی باشت بۆ بکەن بڵێن ئەها دینداری ئەوە باشە بۆ تۆش وەکو ئەو نابی؟ ئا ئەوانە زۆر خەتەرناکە خوای رب العالمین لە پێغەمبەری قبوڵ نەکردوە (ﷺ) جا ئێمە چین لە ئێمە قبوڵ بکا؟ پێغەمبەری سەرزەنشت کرد وە پێغەمبەری (ﷺ) هەڕەشەی ئەوەی لێکرد ئەگەر واتکردبا دوو ئەوەندەی خەڵکی تر لە دونیا و لە قیامەت عەزابم دەدای، ئەوە خاڵی یەکەم و داوا کردنی یەکەمی هێزی کوفرە لە هەموو سەردەمێک واتە دەیانەوێ بەتاڵت کەنەوە لە عەقیدە و بیروبڕوات دەیانەوێ لا ڕێت بکەن لە ڕێبازە ڕاستەقینەکەت پێداگر نەبی خاوەن ڕێبازی وەلاء و بەڕائی ڕاستەقینە نەبی بە هەر فرت و فێڵێک هەبێ دەیانەوێ فێڵت لێبکەن و لا ڕێت بکەن و اللەت لێ تورەکەن -جل شئنە-، ئەگەر تۆ پێت داگرت وەکو پێغەمبەر وایکرد (ﷺ) لەگەڵ سەحابەکانی لاڕێ نەبوی بە قسەت نەکردن ئیسلامەتیەکەت وا جێبەجێ کرد کە الله داوای لێکردبوی -جل شئنە- ئینجا داوا کردنی دوەم دێتە جێ خۆ هەر وازت لێ ناهێنن، لە داواکردنی دوەم سێیەمی لەگەڵدا نیە داواکردنی دوەم ئەوەیە الله دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَادُوا لَيَستَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلأَرضِ لِيُخرِجُوكَ مِنهَا﴾ خۆ نزیک بوو لەدوای ئەوەی تۆ بە قسەی ئەوانت نەکرد لە وەحی و قورئان و ڕێبازە ڕاستەقینەکە لات نەدا بە قسەی ئەبو جەهل و ئەوانت نەکرد و نەرمیت لەگەڵ نەنواندن مەیلت نەبو بۆلای ئەوان و پشتت نەکردە بیلال و خەباب ئا لەو کاتەوە ئیستیفزازت دەکەن هێزی کوفر وازت لێ ناهێنن دەتوروژێنن لێرە و لەوێ قسەت لەسەر هەڵدەبەستن ڕێگات پێ دەگرن وە هەوڵی ئەوە دەدەن کە ئیزعاجت بکەن بتوروژێنن یان ڕووبەڕویان ببیتەوە و ئەو کاتەش فەرمانی ڕووبەڕوبونەوە نەهاتبوو لەلای خوای رب العالمین یان بۆ ئەوە وات لێدەکەن: ﴿لَيَستَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلأَرضِ لِيُخرِجُوكَ مِنهَا﴾ تاوەکو لە وڵات و خاکی ئەوان بڕۆی و بەجێی بێڵی بۆیان وات لێدەکەن

هەتا مەککەیان بۆ بەجێ بێڵی وات لێدەکەن هەتا بڵێن ئەو بەڵایە لە کۆڵ خۆمان دەکەینەوە و با بڕوا و یەخەی ئێمە بەربدا، ئینجا خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَـٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ بەڵام دڵخۆشبە ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەگەر خاک بەدەریشت بکەن ئەوە فەرمانی هیجرەتی پێغەمبەر بوو (ﷺ) واتە کەئەنەهو خوای رب العالمین دەفەرموێ دەستت خۆشبێ ئەی موحەمەد (ﷺ) بە قسەی ئەوانت نەکرد مەیلت نەبو بۆلای ئەوان نەرمیت نەنواند لەگەڵیان عەقیدە و ئیسلامی خۆت تێک نەدا لەسەر ڕێبازە ڕاستەقینەکە ڕۆیشتی با ئیستیفزازیشت بکەن و بتوروژێنن برۆ قەیناکە بەجێیان بێڵە و خاکیان بۆ بمێنێتەوە با بەس: ﴿وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَـٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ من نایان هێڵمەوە لەپاش تۆ زۆر بمێنینەوە لەسەر ئەو خاکەی تۆ ئیلا تۆڵەیان لێ دەستێنمەوە، هەندێک موفەسیرین دەفەرمون تەنها ساڵ و نیوێک لەپاش هیجرەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتە مانای ئەوەیە جەنگی بەدر هاتە گۆڕێ ئەوەی پێغەمبەری بەدەرنا (ﷺ) لە مەککە ئەوەی ئیستیفزازی کرد و ئازاریدا ئەوەی وروژاندی ئەوەی قسەی پێگوت هەموو سەرکردە قورەیشیە خۆیان بە پاڵەوان دەزانی کافرەکان لە جەنگی بەدر هەموو جەنازەیان لەوێ کەوت و الله پاش ساڵ و نیوێک وەعد و بەڵێنی خۆی هێنایەجێ و تۆڵەکەی لێ ستاندنەوە ئینجا خوای رب العالمین دەفەرموێ لەپاش تۆ زۆر نامێنینەوە جەنگی بەدر هات تۆڵەمان لێیان کردەوە: ﴿سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا﴾ ئەوەش فەرمان و ئەمری ئێمەیە خوای رب العالمین دەفەرموێ وە ڕێباز و ڕێگای ئێمەیە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش وامان ڕەوانە کردبوو جێگیربن لەسەر ئیسلام و عەقیدە سەریان دەخەین جا بزانە ئەوە ناگۆڕێ فەرمان و ئەمرەکانی ئێمە بۆ تۆش ئەی موحەمەد (ﷺ) بۆ ئومەتەکەشت هەرکاتێک ئێوە بەردەوام بن لەسەر ئیسلام و عەقیدەی پاک لەسەر الله بەیەکگرتن -جل شئنە- ئەگەر ئازار دران هەرچیتان لێهات سەرکەوتنتان بۆ دەنێرم ناهێڵم زۆر بمێنینەوە کافرەکان ئەگەر وڵات

بەدەریشیان کردن ئیلا توٚڵەیان لێ دەستێنمەوە وەکو خوای رب العالمین لە جەنگی بەدر توٚڵەی لێ ستاندنەوە.

جا ئەوانە بوو بەڕێزان و خوٚشەویستان شاری مەدینە و یەثریب زوٚریان بونە موسڵمان یەک بە یەک پێغەمبەر (ﷺ) موٚڵەتی هاوەڵە بەڕێزەکانی خوٚیدەدا بە نهێنی لە شاری مەککە دەچونە دەر و بەرەو شاری یەثریب هیجرەت بکەن و کوٚچ بکەن ئیلا ئیمامی عومەر نەبێ بە ئاشکرا لێی ڕیوایەت کراوە هیجرەتی کردوە.

**کوٚچکردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی -رضي الله عنهم-**

موشریک و قوڕەیشیەکان هەرکە زانیان پێغەمبەر (ﷺ) دوٚست و خەڵکی پەیدا کردوە لە شاری یەثریب کە بوە شاری پێغەمبەر (ﷺ) مەدینە وە لە دوای ئەوەی لە (الإسراء والمعراج) گەڕایەوە وە زانی موسڵمانەکان هێواش هێواش موسڵمانەکان پێغەمبەر (ﷺ) موٚڵەتی پێدان و فەرموی ئەوەی دەیەوێ بڕوا و بە ئازارە لە دەست قوڕەیشیەکان و کافرەکان با بچێتە شاری یەثریب و شاری مەدینە، ئەوەبوو موسڵمانەکان ابن عبد البر دەفەرموێ یەکەم کەس لە موسڵمانەکان ئەبو سەلەمە بوو کاتێک خێزانەکەی بەناوی ئوم سەلەمەی کچی ئەبی ئومەیە قوڕەیشیەکان و کافرەکان لێیان قەدەغەکرد و پێیان نەدا ڕوٚیشت هیجرەتی کرد کوٚچی کرد بەرەو شاری مەدینە چوو لە قوباء جێگیر بوو، لە دوای ساڵێک ئینجا ماڵە خەزورەکانی و قوڕەیشیەکان موٚڵەتیاندا کە ئوم سەلەمە بچێتە لای خێزانەکەی لە قوباء لە پاشان عامری کوڕی ڕەبیعە و هاوسەرەکەی بەناوی لەیلای کچی حەثمەی کچی غانیم کەواتە ئافرەتێکی سەحابیە بوە ناوی لەیلا بوە وە خێزانی عامری کوڕی ڕەبیعە بوە ئەو دوانەش پێکەوە هیجرەتیان کرد لەپاش ئەبو سەلەمە و وە ماڵ و منداڵەکەی ئەبو سەلەمە، وە لە پاشان ئەبو ئەحمەدی کوڕی جەحش کە زاوای ئەبو سوفیان بوو ئەویشیان کچەکەی ئەبو سوفیانی بەناوی فاریعەی کچی ئەبو سوفیانی لەلابوو ئەو بنەماڵەی بەنو جەحش

چوار بنەماڵە بون و چوار خاو و خێزان بون هەمویان هیجرەتیان کرد ئەبو سوفیان پێیان ڕانەگەیشت هەرکە چوە سەر ماڵەکانیان بینی بەتاڵ بوە و ڕۆیشتون و کۆچیان کردوە.

لە پاشان عومەری کوڕی خەتاب کەوا باوە ابن الأثیر ڕیوایەتی کردوە گوایە ئیمامی عومەر بە ئاشکرایی چوە و هەوڵی ئەوەیداوە کەوا گوتویەتیە قوڕەیشیەکان من وا کۆچ دەکەم و ئەوەی جورئەتی هەیە بابێ لەو دۆڵە خۆی بێوەژن بکات و یان دایکی ڕۆڕۆی بۆ بکات و ونی بکا بابێ خۆی تاقیبکاتەوە بەڵام ئەو ڕیوایەتە لە (أسد الغابة) هاتوە لە (ج: ٤، ص: ٥٢) کە ئەلبانی دەفەرموێ زەعیف و لاوازە و جێگای ئەوە نیە کە بگێڕدرێتەوە لەبەر ئەوەی سێ گومان لێکراو و مەجاهیل لە سەنەدەکەیدا هەیە بەڵام بۆچونی ڕاجیح و پەسەند ئیمامی عومەریش لەگەڵ عییاش لەگەڵ بیست سواری تر لەگەڵ قوڕەیشیەکان لە موسڵمانان هیجرەتیان کرد و ڕۆیشتن بەرەو شاری مەدینە ئەوەبوو کەوا قوڕەیشیەکان هەستیان بەوە کرد موسڵمانەکان ڕێگا و دەرگایان بۆ بۆتەوە و پەناگەیەکیان پەیدا کردوە کەوا ئەنسارەکانن و شاری مەدینەیە لەوێ کەوتنە خۆ و پیلان بگێڕن لە پێغەمبەر (ﷺ)، کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لەگەڵ ئیمامی ئەبو بەکر لەگەڵ ئیمامی عەلی -رضي الله عنهما- وە لەگەڵ هەندێکی تر لە سەحابەکان ئەوانەی پشت و پەنایان هەبوو لەناو قوڕەیشیەکان مابونەوە زۆربەی هەرە زۆریان کۆچیان کرد و بەرەو مەدینە ڕۆیشتن قوڕەیشیەکان کۆبونەوە لە دارونەدوە و پیلانی ئەوەیان داناوە کەوا چی لە موحەمەد بکەن (ﷺ)؟ الله دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَۚ وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ﴾ [الأنفال: ٣٠] دەفەرموێ بزانە ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەوانەی لە دارونەدوە وا دانیشتن و پیلانگێڕیت لێ دەکەن و پیلانت بۆ دادەنێنەوە هەندێکیان بۆچونیان ئەوەیە کەوا بتبەستنەوە و کەلەپچەت بکەن: ﴿لِيُثۡبِتُوكَ﴾ جێگیرت بکەن لە مەککە و زیندانیت بکەن: ﴿أَوۡ يَقۡتُلُوكَ﴾ هەندێکیشیان پیلانیان ئەوەیە کەوا بتکوژن:

﴿أَوۡ يُخۡرِجُوكَ﴾ هەندێکیشیان پیلانیان ئەوەیە وەدەرت نێن و بتنێرنە شوێنێک کە ئاوەدانیەکی ئەوتۆی لێ نەبێ نەفیت بکەن و بەڵاکەی تۆ بە حیسابی خۆیان لەکۆڵ خۆیان بکەنەوە: ﴿وَيَمۡكُرُونَ﴾ ئا ئەوان وا لەو پیلان گێڕیەدان خوای رب العالمین دەفەرموێ و پیلان دەگێڕن بەڵام: ﴿وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُ﴾ تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ) اللهت لە پشتە لە بەرامبەر پیلان گێڕانی ئەوان خوای رب العالمین یش تۆڵەیان لێ دەستێنێتەوە بەوەی هەڵی دەوەشێنێتەوە و پشتگیری تۆ دەکا: ﴿وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ﴾ الله باشترین ئەو زاتانەیە -جل شئنە- کە مەکر و فرت و فێڵ و حیلەکان هەڵبوەشێنێتەوە هی کافر و هی قورەیشیەکان.

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) زانی کار لە کار ترازاوە کاتی ئەوە نەماوە دەبێ موحەمەدیش (ﷺ) کۆچ بکا ڕۆژانەش لەولاوە ئەبو بەکری سدیق دەیدواند دەیفەرموو مۆڵەتە منیش کۆچ بکەم ئەی پێغەمبەر (ﷺ)؟ لە ڕیوایەتی سەحیح هاتوە پێغەمبەریش پێی دەفەرموێ (ﷺ) لەسەرخۆبە ئەی ئەبو بەکری سدیق ئەگەری ئەوە هەیە الله مۆڵەتم بدا و هاوەڵێکی چاکت بۆ پەیدا ببێ بۆ کۆچەکەت واتە موحەمەد (ﷺ) لەگەڵت کۆچ دەکا.

دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ ڕۆژێکیان پێغەمبەرم بینی (ﷺ) لەناکاو گوتیان ئەوە موحەمەدە دەهات بەرەو ماڵی ئێمە کە لەوکاتە دوای نوێژی نیوەڕوان بوو لە گەرمای حیجاز قەت پێغەمبەر نەهاتوەتە ماڵی ئێمە (ﷺ) دەڵێ هەر ئەوەندەش نا بینیمان دور بە دوری دەمامکی خۆیدابوو بەس چاوەکانی دیاربوو، دەڵێ ئیمامی ئەبو بەکر دور بە دوری فەرموی دایکم و باوکم فیدات بێ یا رسول الله وەڵاهی دیارە کارێکی گرنگ ڕویداوە لەبەرئەوە بەو ناکاویەی و لەو کاتە دێی بەرەو ماڵەکەمان، دەڵێ هەرکە هاتە ژورەوە و دەمامکی خۆی کردەوە پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ فەرموی ئەوانە کێن لێرە؟ با بچنە دەر، دەڵێ منیش گوتم هەر ئەهلی خۆتن ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو بەکر دەفەرموێ، دەڵێ ئینجا فەرموی مۆڵەت هاتوە لەلای الله ئەمشەو کۆچ دەکەین ئەی ئەبو بەکری سدیق،

دەڵێ ئەبو بەكریش لە خۆشیان فەرموی یا رسول الله وەڵاهی من دوو وڵاخم ڕاگرتوە یان دوو حوشتر ئەوە چوار مانگە بەخێویان دەكەم قەڵەویان دەكەم بەهێزیان دەكەم بۆ ئەوەی هەردوكیان كۆچی پێبكەین، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئاوا لێت قبوڵ دەكەم كە پارەی یەكیانم لێ وەربگریەوە من بە وڵاخی خۆم یان بە حوشتری خۆم كۆچ بكەم، دەڵێ ئینجا ڕێک كەوتن و لە شەودا كە ئەبو جەهل پیلان ڕێژی ئەوەیكرد بكوژرێ پێغەمبەر (ﷺ) وە سەرە قوڕەیشیەكانی تر پێی ڕازی بون یازدە كەسیان هات لە یەک لە ڕیوایەتەكان دەڵێ بە سەرپەرشتیاری ئەبو جەهل هەریەكیان لە تیرەیەک لە گەنجەكانی بە حیساب كەسیان لەبەر دەستی قوتار نەبێ و كوشتنێكی وا ئەنجام بدەن پێغەمبەریش لە ماڵی خۆی بوو (ﷺ)، پێغەمبەر ئیمامی عەلی هێنا ئەو گەنجە لاوە تازە پێگەیشتوەی كە لە هەموو كەس لەو نزیكتربوو لە ڕوی خزم و كەسایەتی و یەكەم منداڵ بوو موسڵمان بوو بوو، هێنای لە شوێنی خۆی داینا و گوتی یا عەلی لە شوێنی من بخەوە ئەو ئەمانەتانەی قوڕەیشیەكان لەلای منیان داناوە تۆ بە ئەمانەتەوە بە دەستیان بگەیەنەوە چونكە قوڕەیشیەكان لەگەڵ ئەوەی دژایەتیان دەكرد دەیانزانی هیچ دەستێک لە دەستی پێغەمبەر پاكتر نیە (ﷺ) لە هەموو كەس ڕاستگۆترە زێڕ و زیو و موجەوهەڕات و هەرچی هەیانبوو هی ئەو سەردەمە بە ئەمانەت دەیانهێنا لەلای ئەویان دەسپارد و دایاندەنا ئینجا فەرموی ئەو ئەمانەتانە جێبەجێ بكەوە لەپاش ئەوەی من كۆچ دەكەم، ئیمامی عەلی ئەو سەربازە چاونەترسە بەغیرەتە موسڵمانە بوو كە پڕی دەڵی ئیمان بوو لە شوێنی پێغەمبەر خەوت (ﷺ) گوێی بەوە نەدا شمشێرەكان ئەو دەبڕن یانە نا گرنگ ئەوەیە الله لێی ڕازیبێ و گیانی فیدای پێغەمبەر بێ (ﷺ)، ئیسلام ئەو گەنجانە پەروەردە دەكا و پێدەگەیەنێ خاوەن عەقیدەن لەبەر ئەوەیە لە هەموو سەردەمێكدا هێزی كوفر لە گەنجی موسڵمانی خاوەن عەقیدە دەترسێ و چۆكی دەشكێ لەبەرامبەریان.

بەڵێ پێغەمبەری پێشەوا هاتەدەر (ﷺ) خوای رب العالمین ئەمر و فەرمانی وابوو چنگێک لە خۆڵی بەردەرگای خۆیانیدا و پڕژاندی بە دەموچاوی ئەوانەی دەوری ماڵی پێغەمبەریان دابوو (ﷺ) کاتێ کەوا خوای رب العالمین وایکرد لە خەوەکەیان هەڵنەستن و خەویان بەسەردا هات ئاگادار نەبون کە پێغەمبەر ڕۆیشت بە ناویاندا (ﷺ) چوە ماڵی ئەبو بەکری سدیق و بە پشتی ماڵی ئەبو بەکری سدیق بۆ ئەوەی ئێمەش چاوی لێبکەین لەو کاتەی نەخشەسازی هەر کارێکی نهێنی لەپێناو الله تعالی دەکەین ئیقتیدای پێوە بکەین و هەموو شتەکانی نهێنیایەتی بپارێزین و ئینجا لەپشتی ماڵی ئیمامی ئەبو بەکر هەردوکیان دەرچون بەرەو شاخێک لە شاخەکانی مەککە لەوێوە ئەشکەوتێکی لێبوو بەناوی (ثور) چونە ناو ئەو پێغەمبەر (ﷺ)، کاتێک بەهۆش خۆیان هاتنەوە ئەبو جەهل و بە حیساب ئەو پاڵەوانانەی کەوا کافر بون دەیانویست پێغەمبەر بکوژن (ﷺ) هەر یەکێک هەندێک خۆڵی لەسەر سەرە و چاوی خۆی وا لێکرد و گوتیان ڕەنگە نەڕۆشتبێ بەڵام هەرکە بینیان ئیمامی عەلی لەناو جێگایەکەیەتی و لە هەندێک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ عەلییان برد لەلای (کعبة الله) بەستیانەوە هەندێک ئازاریاندا ئینجا لەشکر و مەفرەزە کانیان پەرتکرد بەسەر هەموو ڕێگایە سەرەکیەکان گوتیان دەرنەچێت بەرەو مەدینە و نەچێت بەرەو یەثریب ئەو موحەمەد و ئەبوبەکر چون ماڵی ئیمانی ئەبو بەکریشیان پشکنی هیچیان لێ نەدۆزیەوە و ئەمر و فەرمانی الله وابوو سێ شەو و سێ ڕۆژان پێغەمبەر (ﷺ) لەو ئەشکەوتە مایەوە بەڵام ڕێگای ئەوەیان گرتبوەبەر عەبدوڵای کوڕی ئیمامی ئەبو بەکر ڕۆژانە دەچوو هەواڵی ناو قوڕەیشیەکانی وەردەگرت و ئێواران دەچوو هەواڵەکەی بۆ پێغەمبەر و باوکی دەبرد (ﷺ)، وە لە پاشانەکە ئەسمائی کچی ئیمامی ئەبو بەکر دایکە عائیشە دەفەرموێ بینیم کاتێک بارگەی تێکنا بۆ باوکم و بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەو پشتێندەی لە پشتی بوو کردیە دوو پارچە بوخچەکانی بۆ گرێ دەدان و لەسەری بوخچەکانی بەست کە پێغەمبەر و (ﷺ) ئیمامی ئەبو بەکر لەگەڵ خۆیانیان دەبرد، دەفەرموێ لەو ڕۆژە ناوی لێنرا ئەسماء کونیە و

ناسناوی بەوە دەرکرد کە (ذات النطاقين) واتە خاوەنی دوو پشتێن ئینجا ئەسماء لەو کاتە بوە کە تازە حەملی هەبوە بە عەبدوڵای کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام کاتێک کەوا ئەسمائی کچی ئیمامی ئەبو بەکر ئینجا خواردن و خۆراکیشی بۆ دەبردن بەو ڕەزالەت و زەحمەتیەی زۆر جاران بۆ پێغەمبەر و بۆ باوکی (ﷺ) وە -رضي الله عنه- کاتێک لە شاخەکە مانەوە ئەو سێ شەو و سێ ڕۆژەی.

وە لە پاشان مێگەلە مەڕەکەی ئیمامی ئەبو بەکر هەیبوو بە شوانەکەی خۆی ئیمامی ئەبو بەکر عامری کوڕی فوهەیرە دەیبرد لەوێدا مەڕەکانی دەلەوەڕاند کاتێ کەوا شیرەکەیان لێدەخواردەوە پێغەمبەر و (ﷺ) ئیمامی ئەبو بەکر ئینجا عامر مەڕەکانی دەهێنایەوە بەرەو مەککە ئەمر و فەرمانی الله وابوو قوڕەیشیەکان چونە سەر ئەشکەوتەکەش نەیانتوانی پێغەمبەر ببینن (ﷺ)، ئەوە لەو کاتەیە کە خوای رب العالمين دەفەرموێ هەر یەکێک الله پشتگیری بکا دوژمنی چەند گەورەش بێ دەپارێزرێ ئەمر و فەرمانەکە وایە بەو مەرجەی تەوەکولێکی تەواو لەسەر الله بکەی لەپاش هێنانەجێی سەبەب و هۆکارە شەرعیەکان کاتێک خوای رب العالمين لە سوڕەتی [التوبة: ٤٠] دەفەرموێ: ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ﴾ ئەگەر ئێوە قوڕەیشیەکان و کەس نەبون پشتگیری لە موحەمەد بکەن (ﷺ) سەریبخەن هیجرەت و کۆچی کرد لە پێناو من لەگەڵ هاوەڵەکەی ئەبو بەکری سدیق ئەوە بزانن بە دڵنیاییەوە الله سەریخستوە و وە الله سەری دەخا -جل شئنه-: ﴿إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ﴾ ئەو کاتەی کافر و موشریکەکان ئەوانەی بێ بڕوابون ئەو دوانە کە لەگەڵ یەک ڕۆیشتن موحەمەد و ئەبو بەکری سدیق (ﷺ) ئەبو بەکریش -رضي الله عنه- : ﴿إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ﴾ الله دەفەرموێ هەرکە ئەوانم ناردە ناو ئەوەی بگەنە ئەشکەوتەکەی لەوێ مانەوە: ﴿إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ﴾ ئەوکاتە بوو کە ئیمامی ئەبو بەکر فەرموی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئا ئەوە چاو و سەری قوڕەیشیەکانە وەڵاهی ئەگەر تەماشای بەرپێیان بکەن ئێمە

دەبینن لەناو ئەشکەوتەکە ئەشکەوتەکە ئەوەندە گەورە نیە پێغەمبەریش لە وەڵامی ئەبو بەکری سدیقدا فەرمووی: ﴿لَا تَحزَن﴾ ئەی هاوەڵەکەم ئا ئەوەیە وەڵام بۆ شیعەکانیش کاتێک ئیمامی ئەبو بەکر لە قورئانی پیرۆز موفەسیرینی ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون بڕیاری سەحابایەتی لەگەڵ پێغەمبەر بۆ دراوە (ﷺ) کە الله دەفەرمویَ: ﴿إِذ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ﴾ کە پێغەمبەر (ﷺ) گوتیە هاوەڵ و سەحابەکەی کە ئەبو بەکری سدیق بوو کە گوتی ڕەنگە ئەگەر تەماشای بەرپێیان بکەن ئێمە دەبینن فەرمووی: ﴿لَا تَحزَن﴾ ئەی ئەبو بەکر غەمگین مەبە ترس دات نەگرێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾ الله لەگەڵماندایە هەر کەسێک اللهی لەگەڵدابێ پارێزراوە هەر کەسێک اللهی لەگەڵدابێ سەرکەوتوە هەر کەسێک اللهی لەگەڵدابێ ئیلا ئامانجەکانی دەپێکێ الله پاداشتی دەداتەوە، هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) وەکو لەو ئایەتە هاتوە نەیگوتە ئەبو بەکری سدیق (لا تخف) مەترسە؟ لەبەر ئەوەی ئەبو بەکر ترسی نەبو کەسێک وا تێنەگا ئەبو بەکر لەرزیبێ و ترسابێ ئەبو بەکر یەکێک بوە لە پیاوە هەرە بەغیرەت و جورئەتەکان بەڵام خەمی هەبوو (حزن) لەگەڵ (خوف) دوو شتی لێک جیاوازن، پێغەمبەر فەرمووی (لا تحزن) غەمگین مەبە، ئینجا ئەو موفەسیرانە دەفەرمون واتە ئەبو بەکر خەمی ئەوە دایگرتبوو پێغەمبەر بکەوێتە بەردەستی ئەوان (ﷺ) ئەوان ئازاری بدەن یان دینی ئیسلام کۆتایی پێ بێ لە خەمی ئەوەدا بوو نەک ترسی هەبێ، لەبەر ئەوە پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) وەکو لە ئایەتەکە هاتوە غەمگین مەبە نەی فەرموو مەترسە چونکە ئەبو بەکر نەدەترسا گوتی لەبەر ئەوە غەمگین مەبە چونکە اللهمان لەگەڵە: ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ لَّم تَرَوهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفلَىٰۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلعُليَاۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ جا الله تعالی دەفەرموێ ئارامی و سەکینەتم بەسەریان دابەزاند سەرکەوتوم کردن هەندێک سەربازم بۆ ناردن خەڵکێک نەیدەبینین لە فریشتە و مەلائیکەتەکان و سەربازەونەکانی الله کە سەریانبخا و لەگەڵ موحەمەد دابن (ﷺ) دەڵێ وامکرد خوای رب العالمین کە

وشەی کافر و بێدینەکان و موشریکەکان دابەزێ و ژێر زەوی ببێت و بکەوێ وە وشەی خوایی کە (لا إله إلا الله)یە بەرزبێتەوە و سەرکەوتوو ببێ اللەش عەزیزە واتە زاڵە وە حەکیمە کارلەجێیە لە هەموو ئیش و کارەکانی.

بەڵێ بەڕێزان و خۆشەویستان لە دوای ئەو سێ شەو و سێ ڕۆژە پێغەمبەر بەڕێکەوت (ﷺ) لەگەڵ ئەبو بەکری سدیق پیاوێکیشیان بەکرێ گرت لە یەک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ عەبدوڵای کوڕی ئورەیقیق بوە لەگەڵ عامری کوڕی فوهەیرە ئینجا لەگەڵ ئەبو بەکر و پێغەمبەریش (ﷺ) بەڕێکەوتن بەرەو شاری یەثریب و مەدینە بەڵام لێوار و کەناری دەریایان گرت ڕێگایەکی دورتر بۆ ئەوەی سەلامەتتربن هەتا لە ڕێگا گەیشتنە ئوم مەعبەد، ئەو ئافرەتەی کە لە سەرەتای زنجیرەی (محمد رسول الله (ﷺ)) بۆمان گوتن کە وەسفیپێغەمبەری کرد (ﷺ) وە لەوێدا کەوا لە بزنێکی لەڕ و لاوازی بێ شیر پێغەمبەر (ﷺ) گوانی دەستی پێداهێنا و شیری لێهات و تێر شیریان خواردەوە ئەوەش موعجیزەیەکی پێغەمبەر بوو (ﷺ)، لە ڕێگادا قوڕەیشیەکان هیچیان بەدەستەوە نەما هەموو کافرەکان لە هەموو سەردەمەکان هەر وان ئینجا فەرمانی ئەوەیان دەرکرد و بڵاویان کردەوە لە ڕاگەیاندنەکانیان گوتیان ئەوەی موحەمەد و ئەبو بەکری سدیق چ بە زیندوێتی چ بە مردوێتی بۆمان بگرێ و بهێنێ ئا ئەوەندە ئەوەندە خەڵاتەی دەدەینێ لە یەک لە ڕیواتەکان گوتیان سەد حوشتری پێدەدەین حوشتریش ئەو کاتە زۆر بەنرخ بوو، سوڕاقەی کوڕی مالیک دەڵێ ئەوە چوە مێشکم و لە دورەوە تارماییەکم بینی گوتم باشە نێچیرێک بۆم پەیدابوو سەد حوشترەکەی قوڕەیشیەکان بەدەست دەهێنم زانیم ئەوە موحەمەد و هاوەڵەکەیەتی (ﷺ)، دەڵێ بە ئەسپێکی زۆر چاکم لەگەڵ شیر و تیرم لەگەڵ خۆم برد بەدوایاندا ڕۆیشتم چەند هەنگاوێک مابوو پێیان بگەم لەوێوە پێغەمبەر ئاوڕی سوڕاندەوە (ﷺ) ئەبو بەکر پێی ڕاگەیاند ئەوە کەسێک لە شوێنمانە، لە یەک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ

پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) خوای رب العالمین چۆکی وڵاخەکەی بشکێنی لە زەوی ببەیتە خوار پێیان نەگا ئەو کەسە، دەڵێ لەناکاو سوڕاقە بەخۆی دەگێڕێتەوە دەڵێ لەو ڕاستە ڕێیە وڵاخەکەم زۆر چاک و خێرا دەڕۆیشت چەند هەنگاوێک مابوو پێیان بگەم یەکسەر وڵاخەکەم هەر چوار پەلی کەوتە ناو زەوی هەتا ئەژنۆیەکانی هەرچەندم کرد لەسەر پشتی هاتمە خوار و ڕامکێشا و نەهاتە دەرەوە، دەڵێ زانیم کار لە کار ترازا ئەو موحەمەدە کەسێکی ئاسایی نیە (ﷺ) دەڵێ هاوارم لێکرد گوتم وەڵاهی لەلای منەوە سەلامەت دەبی هەرچیت دەوێ بۆت دەکەم فەرمان بکە وڵاخەکەم بێتە دەرەوە لەبەر تۆ و لە تۆوەیە وڵاخەکەم وای لێهاتوە، دەڵێ ئینجا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەی سوڕاقە بۆچی هاتی؟ گوتی وەڵاهی بۆ ئەوە هاتبوم هەواڵم پێدرابوو کە بتانگرم بەڵام ئێستاکە هەر بەڵێن و پەیمانێک هەیە دەتدەمێ بەس قوتار و ڕزگارم بێ، پێغەمبەریش پێی فەرموو (ﷺ) لە دوای ئێمە هەرچی بەدوای ئێمەدا هات دەستخەڵەتی بدە لێ نەگەڕێی بەدواماندابێ و پارێزگاریمان لێبکە ئەوە بەڵێن بێ ئێستا وڵاخەکەت دەردەچێت لە ژێر زەوی قاچەکانی دەردێت و دێتەوە لات، دەڵێ سوڕاقەش دەڵێ بەڵێنم پێیدا و سوێندیشم بۆی خوارد کەوا دەکەم و بە دڵنیاییەوە، ئینجا سوڕاقە دەگێڕێتەوە دەڵێ من بەیانیە زوەکەی دوژمنی بوم و دەمویست بیگرم لە ئێوارەکەی کە بەسەریڕا گەیشتم بومە پاسەوانێکی تایبەتی موحەمەد (ﷺ) ئەوەی دەیویست ڕوبکاتە ئەو ڕێگایە من پاسم دەکرد و دەستغەڵەتم دەدان و نەمدەهێشت بەدوایاندا بڕۆن، دەڵێ بەڵام پێم گوت ئەی موحەمەد (ﷺ) شتێکم بۆ بنوسە لەنێوان من و تۆبێ ئەگەر ئەو کاتانەی سەرکەوتی و ئەو سەرکەوتنانەی تۆ باسیدەکەی من بێنمیەوە لات و بڕوام پێبکەی، دەڵێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەی ئەبو بەکر (ئەبو بەکریش زۆر خوێندەوارێکی چاک و نوسەرێکی چاک بوو) دەڵێ گوتی شتێکی بۆ بنوسە، لە یەکێک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ لەسەر پارچە ئێسکێک لەوێ بوو لە یەکێکیان دەڵێ پارچە پێستێک بوو لە یەکێکیان دەڵێ پارچە قوماشێک بوو سوڕاقە بە ئەبو بەکریدا

و ئەبو بەکر چەند شتێکی بۆ نوسی و دایەوە دەستی سوڕاقە و پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانی ڕۆیشت و وە سوڕاقەش لەوێوە گەڕایەوە.

جا پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) گەیشتە قوباء لەوێوە ماوە و مزگەوتی دروستکرد پێغەمبەر (ﷺ) لە پاشان دەچێ بەرەو شاری یەثریب کە لە دواتردا ناوی دەرکرد بە شاری پێغەمبەر (ﷺ) مەدینە کە مەدینە پێش چونی ئیسلام تاریک بوو گومڕایی لێبوو بەڵام بە چونی ئیسلام بۆناو مەدینە شاری یەثریب بوە (المدينة المنورة) واتە بوە شاری ڕوناک بە چونی پێغەمبەریش (ﷺ) بوە (المدينة النبي) واتە شاری پێغەمبەر (ﷺ) وە ئێستاش هەر ئەو ناوەی لەسەرە و ئەو ناوە سەحیح و دروستترە بەکار بهێنرێ (المدينة النبي) لەوەی بڵێی (المدينة المنورة) ڕاستە شاری یەثریب بوە شاری ڕوناکی بە چونی ئیسلام بۆ ئەوێ بەڵام بە چونی پێغەمبەر (ﷺ) بوە شاری پێغەمبەر (ﷺ).

ئەو ڕیوایەتەش کەوا دەگوترێ بەڕێزان و خۆشەویستان کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کەوا ئەنساریەکان هەواڵیان پێگەیشت کەوا موحەمەد (ﷺ) بەڕێکەوتوە لە مەککە ئەوەندەی نەماوە بگاتە مەدینە ئەنساریەکان دەفەرمون ڕۆژانە ئێمە دەچوین لە دوای نوێژی بەیانیەکان چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەر بوین (ﷺ) تا گەرمایی گەرما دەیگەڕاندینەوە ماڵەکان بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) هەر لە قوباء کە مایەوە چەند شەو و ڕۆژێک لەوێوە ئەسمائی کچی ئەبو بەکری سدیق پێیان گەیشت ئەسماء بە حەملیەوە عەبدوڵای کوڕی زوبێر لە سکیدا بوو ئا ئەو کوڕەی لە قوبائی لەپاش هیجرەتی لە مەککە لە قوباء داینا و لەدایک بوو، واتە لەپاش هیجرەتی پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم منداڵی سەحابەکان کە لە دایک بوو عەبدوڵای کوڕی زوبێری کوڕی عەوام بوو ئەو سەحابە بچوکە لەوێوە لەدایک بوو، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەنساریەکان دەگێڕنەوە و دەڵێن ڕۆژێکیان جولەکەیەک بەسەر یەک لە قەڵایەکانی خۆیان کەوتبوو لە شاری مەدینە تەماشای دەکرد هەندێک حوشتری

لێ ون بوو بوو له دورەوه بینی ئەوه خەڵکێک وا دێن دوو کەسن له دورەوه لێی دیارن کەوا شمەکی سپیان لەبەره گوتی ئەی گەلی عەرەب و ئەنسارەکان ئەی ئەوس و خەزرەجیەکان ئەوەی ئێوه چاوەڕوانین وا بەدیارکەوت من لەسەری قەڵات وا دەیانبینم، دەڵێ هەمومان ئەوەی چەکمان لەماڵ هەبوو چەکمان له خوٚمان بەست و شمشێر و تیر و ڕم به منداڵ و گەوره و بچوک و ژنەوه هەمومان ڕوٚیشتین چوینه پێشوازی پێغەمبەر (ﷺ).

بەڵام ئەو ڕیوایەت و گێڕانەوەی که دەڵێ سەحابه و ئەنسارەکان دوفیان پێبوو لێیان دەدا (طلع البدر علينا)یان دەگوت ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێ ئا ئەوەیان سەنەدی زەعیفه لەوێوه ئەو ڕوداوه ڕوینەداوه بەڵکو دەڵێ ئەو ڕوداوه لەوکاته ڕویدا کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) سێ هەزار چەکداره هاوەڵه بەڕێزەکانی گەڕانەوه له شەڕی تەبوک هاتنەوه ناو مەدینه لەوێوه منداڵەکان و هەندێک له گەنجەکانی ئەنساریان لەگەڵدابوو دوفیان لێدا و ئەو سرودەیان گوتەوه له پێشوازی سێ هەزار لەشکرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) که به سەرکەوتویی له جەنگی تەبوک گەڕانەوه، ابن القيم جەوزیەش ئەوه تەئکید دەکاتەوه له (زاد المعاد) دەفەرموێ هەر به بەڵگەی ئەوەی که له سرودەکه هاتوه و له شیعرەکه هاتوه (ثنيات الوداع) دەڵێ (ثنيات الوداع) شوێنێکه دەکەوێته سەر ڕێگای بەینی مەدینه و شام بەڵام پێغەمبەر بەو ڕێگایه (ﷺ) به ئیتیفاقی هەموو مێژوو نوسان لەو ڕێگایه نەبو هاته ناو مەدینه، دەڵێ ئەوەش بەڵگەیەکی تره کەوا (طلع البدر علينا) لەو کاته نەگوترا له کاتەکەی تر گوتراوه که لەشکری موسڵمانان له جەنگی تەبوک گەڕانەوه (والله أعلم بالصواب).

## دامەزراندنی مزگەوت و جەنگی بەدر

پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) کوٚچی کرد شاری مەککه که لەلای شیرین و خوٚشەویست بوو وەکو شوێنی له دایکبوونی هەموو کەسێکیش هەر وایه لەپێناو خوای رب العالمين و

عەقیدە و بیروبڕوای خۆی و هاوەڵە بەڕێزەکانی (ﷺ) ئەوانیش -رضي الله عنهم- بەجێیان هێشت چون بەرەو شاری یەثریب، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) یەکەمجار گەیشتە ئەو دێ و گوند و ئاوادانیە کە ناوی قوباء بوو لە جنوب و لە خواروی شاری مەدینە بوو ماوەیەک و مەسافەیەکت دەما بگەیتە مەدینە دەگەیشتیە قوباء لەنێوان مەککە و مەدینەدا، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لەوێ مزگەوتێکی دروستکرد و بۆماوەی چوار ڕۆژ لەوێ مایەوە، لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرەبەیانیەکەی هەندێک مێژونوس دەفەرمون ڕۆژی هەینی بوو قوبائی بەجێهێشت و بەرەو شاری یەثریب کەوتەڕێ هەرکە هەواڵەکەیان زانی و یەکێک لە جولەکەکان بەسەر قەڵایەک لە قەڵاکانی مەدینە کەوتبوو بۆ ئەوەی حوشتری لێ ون بوو بیاندۆزێتەوە لە هاواریدا و گوتی خەڵکی عەرەب و مەدینەی ئەوەی ئێوە چاوەڕوانی بون ئەوە هات بەرەو لاتان پێغەمبەر (ﷺ) خەڵکەکە هەموو تێکڕا چوە پێشوازی لە گەورە و لە بچوکەکان، وە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) کە لە دوازدەی (ربيع الأول) بوو بۆچونی ڕاجیح و پەسەند هیجرەت و کۆچیکرد، ئەو هیجرەت و کۆچەی پێغەمبەر (ﷺ) چەندین خێر و بێری پێوە بوو وەرچەرخانێک بوو لە مێژوی ئیسلامدا وە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلام بوو وە کوژانەوەی شەڕ و ئاژاوە و ئاشوب بوو لە مەدینە لەنێوان ئەوس و خەزرەجیەکان کە نزیکەی یەک لە مێژونوسەکان ئیمامی تەبەریش بۆچونی وایە نزیکەی (١٢٠) ساڵ خوێنڕێژی و دوژمنکاری لەنێوان ئەو تیرانە هەبوو لە شاری یەثریب کە پێی گوترا مەدینەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام بەچونی پێغەمبەر بۆ ئەوێ (ﷺ) الله دڵی نەرمکردن و بۆیەکی هێنانەوە ئینجا پێغەمبەریش (ﷺ) بوە هۆکارێک بۆ پێکهاتن و سوڵح و ئاشتەوایی یەکجارەکی لەنێوان ئەو تیرە و خەڵکانەی شاری مەدینە، وە یەکەم شت پێغەمبەر (ﷺ) کە هەوڵیدا بنیادی بنێ لە شاری مەدینە مزگەوت بوو ئەوەش لەبەر گرنگی مزگەوتە یەکەم شت پێغەمبەر (ﷺ) مزگەوتەکەی خۆی کە پێی دەگوترێ مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) ئێستاش ماوە لە شاری مەدینە ئەوەی بنیادنا لەپێناو

ئەوەی بارەگایەکی تایبەت هەبێ خەڵکی لێ کۆببێتەوە لەپێناو خوای رب العالمین هەم اللهی تێدا بپەرستن وەکو نوێژ و عیبادەت و ئیعتیکافەکان وە هەم تێیدا کۆببنەوە بڕیارە گرنگەکانیان بدەن لەسەر هەر شتێکی دێتە پێشیان، واتە مزگەوت لە یەک کاتدا شوێنی عیبادەت و نوێژ کردن بوو وە لە هەمان کاتیشدا شوێنی پێگەیاندنی هاوەڵەکان بوو دەرس و وانەیان لە پێغەمبەر وەردەگرت (ﷺ) لەنێو مزگەوتدا بەداخەوە کە ئێستا و لە مێژوی ئیسلامیش زۆرجار ئەوانەی چاویان بە ڕوناکی ئیسلام هەڵنایە مزگەوتەکان قەدەغە دەکەن لەو کارە هەمیشەیەی کە مزگەوت لە پێناویدا بنیاد نراوە لەپاش عیبادەتی خوای رب العالمین لە نوێژ کە دەرس و وانە گوتنەوەیە لەناو مزگەوتەکان، ئینجا کۆمەڵێک لە سەحابی بەڕێز پێگەیشتن لە زانکۆی مزگەوتدا و بە عەقیدە و بیروبڕوایەکەیان ئاشنا بون و دەرس و وانەکانیان لێوەرگرت، ئینجا مزگەوت لە هەمان کاتدا شوێنی ئەوەبوو کەوا پێغەمبەر (ﷺ) بۆچونەکانی لێ یەکلایی دەکردەوە و مەشوەرەتی دەکرد بە سەحابەکان، وە مزگەوت شوێنی ئەوەبوو کەوا لەشکری لێ ڕێکدەخسترا لە سەحابیە پاڵەوانە بەهێزەکان بۆ کاتی جەنگ و جیهاد و ڕوبەروبونەوەی دوژمنانی ئیسلام .

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لەلای چەپی مزگەوتەکەی ژورەکانی دروستکرد حوجرەکان بۆ هاوسەرەکانی چونکە لە شاری مەدینە بوو پێغەمبەر (ﷺ) کە ماوەیەکی پێچوو مزگەوتی دروستکرد ئینجا دایکە عائیشەی -رضي الله عنها- گواستەوە، ئینجا لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) برایەتی لەنێوان ئەنسارەکان وە لەگەڵ موهاجیرەکان کە لە مەککە چوبون برایەتی لەنێوانیان دروستکرد، گوتی ئێوە برای یەکن و پێویستە یارمەتی یەکتر بدەن وەکو خوای رب العالمین -جل شئنه- باسی دەکا لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ [الحشر: ٩]

الله دەفەرموێ ئەنسارەکان کە لە شوێنی خۆیان نیشتەجێ بون و لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان بون و لە وڵاتی خۆیان بون کە ئیمان چوبوە ناو دڵیان دامەزرابوو لەناو دڵیان ئا ئەوانە بە خۆشحاڵیەوە و بە خۆشەویستیەوە بۆ ئەوانەی هیجرەت و کۆچیان کرد بۆلایان لە شاری مەککەوە پێشوازییان لێکردن و خۆشیان ویستن و برایەتیان لەگەڵ بەکار هێنان بەبێ ئەوەی لە دڵیان هیچ دودڵیەک هەبێ هیچ ناخۆشیەک هەبێ یان ئەگەری ئەوەی مابێ بڵێن بۆ ئێمە پارەیان پێ بدەین یارمەتیان بدەین لەگەڵیاندابین ماڵ و حاڵی خۆمانیان لەپێش دابنێین کە ئەوانەیان هەموو کرد بە دڵ سافی وە بە دڵخۆشی و بە خۆشحاڵیەوە بەوەی خوای رب العالمین بەوانی دابوو لە دونیا موهاجیرەکانیان یان ئەوانەی کۆچیان کردبوو لە مەککە بۆ مەدینە ئەنساریەکان بە پێش خۆیان دەخستن، بەڵێ ئیثار لەو کاتەوە بۆتە ڕەوشتێکی جوانی موسڵمانان کە الله لە قورئاندا پیایدا هەڵداوە وە پێغەمبەریش وایکردوە (ﷺ) وە هاوەڵە بەڕێزەکانیشی پێشەنگی چاک بون، ئیثار یەعنی لە شتەکانی دونیادا لەو بەشەی لە دونیادا هەتە لە پارە و سامان و هەر شتێکی دونیایی کەوا هەتبێ دڵت پێی خۆشبێ بیدەی بە برا موسڵمانەکەت بە خوشکە موسڵمانەکەت ئەو بەپێش خۆت بخەی لەو بەشەی دونیای خۆت ئەوە ئەوکات ئیثارت کردوە ئیمانت دامەزراوە وە ڕەوشتێکی جوانی سونەتیت نواندوە بەڵام لە عیبادەت و پەرستش نا لە عیبادەت و پەرستش ئیثاری تێدا نیە خەڵکی بەپێش خۆت بخەی دەبێ تۆ لەهەر پێشەوە بی و بەشی قیامەتت زیاتر بوێ، ئیثارەکەش بە مەعنایە ڕاستەکەی کە دونیای خۆت دەدەیتە خەڵکی و بەپێشیان دەخەی لە موسڵمانان بۆ ئەوەیە هەتا بەشت لەقیامەت زیاتر ببێ، ئینجا بەبێ ئەوەی کەوا ڕەزیلی قرچۆکی و ڕژدییان لەناو هەبوبێ ئا ئەوانە الله دەفەرموێ سەرفراز و سەرکەوتوبون ئەنسارەکان بەو ڕەوشتە جوانەی کە نواندیان.

پێغەمبەر (ﷺ) چونكە جولەكەش دەژیان لە شاری مەدینە پەیمانی بەست و نوسیەوە لەنێوان خۆی و جولەكەكان كەوا ئەوانەی لەوێدا دەژیان بەنو قەینوقاع بون بەنو نەزیر بون وە بەنو قورەیزە بون سێ تیرەی جولەكەكان بون، ئا ئەوانە پێغەمبەر (ﷺ) پەیمانی ئەوەی لەگەڵ بەستن هەر دوژمنێک بێتە سەر شاری مەدینە دەبێ ئەگەر دوژمنی ئێمە و موسڵمانەكان بوو ئێوە هاوپەیمان بن لەگەڵمان و بەرگری بكەن ئێمەش گیان و ماڵ و ناموستان دەپارێزین بەڵام بەو مەرجە بوو كەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی لە دەستدا بوو، لەبەر ئەوە هەر هاوپەیمانیەک لەگەڵ هێزی كوفر لەگەڵ جولەكە كە ببەسترێ لەنێوان موسڵمانان و سەركردەی موسڵمانان لەگەڵ ئەوان مەرجی ئەوەی تێدایە دەبێ دەست باڵایی و وە دەسەڵاتی تەواو وە فەرمانی یەكلاكەرەوە لە دەستی موسڵمانان بێ وەكو لە مەدینە لە دەستی پێغەمبەر بوو (ﷺ)، گەورایەتی دەولەی ئیسلامی نەدرایە جولەكەكان یان بگوترێ ئێوە ساڵێک دەسەڵاتتان لەدەستبێ و ئێمە ساڵێک نەخێر ئەوە لە ئیسلامدا نیە و بەڵكو دەبێ دەسەڵاتی باڵا هەر لە دەستی موسڵمانان و سەركردەی موسڵمانان بێ وەكو لە دەستی پێغەمبەر بوو (ﷺ) لە شاری یەثریب و مەدینە.

بەڵام جولەكەكان دیارە ناپاک بون لەبەر ئەوەی جولەكە هەر بە ناپاكی هاتون و خوای رب العالمین وا وەسفی كردون ئەوەبوو یەک لە دوای یەک پیلانی جۆراوجۆریان لە پێغەمبەر گێڕا (ﷺ) لەولاوە بەنو نەزیر جارێک ویستیان پێغەمبەر ئیغتیال بكەن و تیرۆری بكەن (ﷺ).

جا تیرۆر و ئیغتیالكردن و خیانەتكردن ئەوە بەشی جولەكە و كافرەكان بوە وە ئێستاش بەردەوامە و هەتا قیامەتیش جاروبار ڕاگەیاندنەكان بۆیان پەردە پۆش دەكەن ئەگەرنا موسڵمانی خوایی ئەوەی لە الله دەترسێت و لەسەر ڕێبازی الله و پێغەمبەر دەڕوا (ﷺ) بەشی نیە لە خیانەت و لە درۆ و لە تیرۆری ناحەق و ناڕەوا بەڵكو موسڵمانان پاكن چاكن

چاونەترسن ڕواوڕو گیان لەسەر دەستن بۆ دەیفاع و بەرگری لە ئیسلام و لە عەقیدە و بیروبڕوایان.

ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) جوبرائیل ئەوکات بۆی ئاشکرا کرد کە یەک لە جولەکەکان وا لەسەر ئەو بینایە و باڵەخانەیە تۆ لەژێریەوەی دەیەوێت بەردێکت بەسەردا بدا و تۆ لەناوبچی ئەی موحەمەد (ﷺ) بەزوترین کات ئەوێ بەجێ بهێڵە، پێغەمبەر بەجێی هێشت (ﷺ) لەدەستی ئەوان ڕزگاری بوو بڕیاری ئەوەیدا بەنو نەزیر نابێ لەوێدا بمێنێن و پەیمان هەڵوەشایەوە لەگەڵیان.

وە بەنو قورەیزەیش لە کۆتاییەکەی بەدیار دەکەوێ (إن شاء الله) لە داهاتودا چ خیانەتێکیان لە جەنگی خەندەق لەگەڵ پێغەمبەر کرد (ﷺ) وە پێغەمبەریش تۆڵەی لێستاندنەوە (ﷺ) بە فەرمانی خوای رب العالمین.

ئەو شتانەی ڕویدا لەوێ و پێغەمبەر (ﷺ) کە بۆیەکەم جار لە ماڵی ئەبو ئەیوبی ئەنساری میوان بوو ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزە لە شاری مەدینە کە پێغەمبەر چوە ماڵیان (ﷺ) حوشترەکەی هیخ بوو لەکۆڵانی ئەوان و لەبەر دەرگای ئەوان کە حوشترەکەیان بەڕەڵا کرد لەکوێدا هیخ ببێ لەوێ پێغەمبەر میوان ببێ (ﷺ)، ئەبو ئەیوبی ئەنساری پیاوێکی بەرز و بەڕێز دەفەرموێ سوێند بە الله خانوەکەی ئێمە ژورێک لەسەرەوە بوو یەک لە خوارەوە بوو ئێمە حەزمانکرد پێغەمبەر بچێتە سەر بەڵام ئەو فەرموی خەڵک دێت میوانم دەبێ با ئەزیەت نەخۆن ئێوەش ئەزیەتدان پێ نەگا و ئیسراحەتتان لێ تێکنەچێ من لە خوارەوە دەبم، دەڵێ لەگەڵ خێزان و هاوسەرەکەم کاتێک لەسەرەوە بوین وەڵاهی چوبوین لەلایەکی ژورەکە دادەنیشتین چونکە دەمانگوت چۆن دەبێ بەسەر شوێنێکدا بڕۆین کە پێغەمبەری اللەی (ﷺ) لە ژێریەوەیە ئەوەندە ئەدەبمان دەکرد، دەفەرموێ وەڵاهی شتێکمان هەبو ئاومان تێدا هەڵدەگرت لەسەرەوە ئاوی لێ ڕژا تەنها شتێکمان هەبوو کە ڕابخەین یان بەخۆماندا

بدەین ئەومان هێنا دەمانە بەرێ و وشکمان کردەوە بۆ ئەوەی دڵۆپە ئاوێک نەچێ بە پێغەمبەر بکەوێ (ﷺ)، دەڵێ ئینجا لە کۆتاییەکەی توانیمان قەناعەت بە موحەمەد بێنین (ﷺ) پێغەمبەری الله کە بێتە سەرەوە و خوارەوە جێبێڵێ لە دوای چەند شەو و ڕۆژێک.

ئەبو ئەیوبی ئەنساری ئەو پیاوە بەرز و مەزنەی کەوا چوو بۆ قوستەنتینیە ڕزگاری بکا لە وڵاتی تورکەکان لەژێر قەڵا و شورەی قەڵای قوستەنتینیە وەفاتیکرد و ئەجەلی هات کە بەتەمەنیش یەکجار گەورە و مەزن بوو تەنها بۆ ئەوەی ئەو مزگێنیە بە دەست بێنێ کە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەوەی قوستەنتینیە ڕزگار دەکا لەشکرەکە و سەربازەکان و سەرلەشکرەکە باشترین لەشکر و جوندی و سەربازی ئەو سەردەمەن مەدحیکردن پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام بە نسیبی نەبو لەوێ وەفاتیکرد و لەوێ شاردرایەوە.

جا پێغەمبەر (ﷺ) لەشاری مەدینە دەوڵەتی ڕاگەیاند دەستوری دانا پێغەمبەر (ﷺ) کە دەستورەکەی قورئانی پیرۆز بوو، خەڵکێک لێرە و لەوێ ئێستا و لە مێژینەشە هەنە کە دەڵێن چۆن دەبێ قورئان دەستوربێ؟ یان هەیە بە بیانوی ئەوەی دەڵێ چۆن دەبێ ئەگەر دەوڵەتیشت هەبێ قورئان لەوە گەورەترە (کلام الله)یە نابێ بڵێین دەستورە چونکە دەستور نوسینەوەیەکە و ئەگەری هەیە بڕگەی لێ لابدەی و جارێکی تر بڕگەیەکی تر لە شوێنی دابنێی، ئەو بۆچونانە هەموی خۆ دزینەوەیە لەوەی کەوا قورئان ئیش و کار پێنەکەی ئەگەرنا قورئان دەستورێکی تەواوی موسڵمانانە هەر دەوڵەتێکی موسڵمانان کە دامەزرا دەبێ قورئان دەستوری بێ وە لە قورئانەوە هەموو شتەکان وەربگرێ وە حەدیسە سەحیحەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی جێگای ئیجتیهادبێ موجتەهیدەکان مافیان هەیە لە دەوڵەتی ئیسلامی ئیجتیهادی تێدا بکەن بە مەرجە شەرعیەکانی موجتەهیدین وە لەگەڵ ئەوەدا ئەوەی جێگای ئیجتیهاد نیە و بڕاوەتەوە و دامەزراوە و سەپێنراوە ئا ئەوەیان نابێ دەستی لێبدرێ و قسەی لێبکرێ وەکو خۆی دەقاودەق دەبێ جێبەجێ بکرێ.

بەڵێ لە پاشان هەر لەوێ بوو پێغەمبەر (ﷺ) خوای رب العالمین هەندێک لە مێژونوسان دەفەرمون لە مانگی شەعبان بوو ساڵی دوەمی کۆچی بوو بەرامبەر بە (٦٢٤) زاینی خوای رب العالمین فەرمانیدا بە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوگە و قیبلەکەت بگۆڕە ئەی موحەمەد (ﷺ) کە پێشتر ڕوگەی موسڵمانان (بیت المقدس) بوو ئە لەوێوە و لەو مێژوەوە خوای رب العالمین فەرمانیدا فەرموی بیگۆڕە ڕوبکە (كعبة الله) و قیبلەی هەمیشەیی موسڵمانان هەتا قیامەتیان لێ دادێ با ببێتە (كعبة الله).

چەندین سەرییە و وە چەندین غەزوەی کرد پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئەوەی جەنگی گەورەی بەدر دابێ، ئەوانە پێڕانەگەین هەمویان باسبکەین بەڵام هەر ئەوەتان بۆ باس دەکەین غەزوە ئەو جەنگانە بوە کە بە سەر لەشکرایەتی و بەشداری فیعلی پێغەمبەر بوە (ﷺ)، سەرییە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر بون (ﷺ) کۆ دەبونەوە لەسەر فەرمانی ئەو وە مۆڵەتی ئەو دەچون شەڕیان دەکرد دەجەنگان یان دەچونە سەر کافرەکان بەبێ بەشداری فیعلی پێغەمبەر (ﷺ) سەحابەیەک دەبوە سەرلەشکریان و دەچون.

بەڵام لە کۆتایەکەیدا لەساڵی دوەمی کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی ڕەمەزاندا کە مانگی ڕەمەزانیش تەنها ئەو ساڵە واجب و پەسەند کرابوو بۆ ئەوەی موسڵمانان ڕۆژوی تێدا بگرن تا لێی ڕابێن لە گەرماییەکان و ناخۆشیەکان و تینویایەتی فێرە سەبر و ئارامبن لە مەیداندا لنگ چەقیوبن ڕوەو کافرەکان ئەوەبوو خوای رب العالمین ئەو ڕوداوەی هێنایە پێش، ئەبو سوفیان بەخۆی و نزیکەی چل کەسێک لە بازرگانێکی پڕ پارە و پول و بە بەرهەم لە شامەوە دەگەڕایەوە و هەواڵ گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەو قوڕەیشیانە لە ژیانیاندا لە ماوەی سێزدە ساڵ هیچ غەدرێک نەما لە پێغەمبەری نەکەن (ﷺ) لە موسڵمانان نەکەن بەوەی پارەیان لێ بستێنن ئازاریاندەن قسەیان پێ بڵێن لێیاندەن تەنانەت لێشیان بکوژن خوێنیشیان بڕژێنن و بیشیانگرن و زیندانیشیان بکەن، پێغەمبەر (ﷺ) پێی وابوو کەوا

فرسەتێکە بوٚی هەڵکەوتوە هەلێکە نابێ لە دەستیبدا ئەوەبوو بانگیکرد لە موسڵمانەکان سێسەد و هەندێک موسڵمان هەندێک دەڵێن سێزدە هەندێک دەڵێن چواردە هەندێک دەڵێن حەڤدە بوٚچونی جیاواز هەیە ئایە لە سێسەدەکە بە زیادەوە بون موسڵمانان، خوٚیان ڕێکخست و بچن ڕێگا بگرن بەو کاروانەی ئەبو سوفیان توٚڵەی ماڵ و پارە و پول و بەروبومەکانی خوٚیانیان لێبکەنەوە و بیهێنن (بیت المال)ی موسڵمانانی پێ دەوڵەمەندتر بکەن بەڵام فەرمانی الله کە ئەو ڕێگایەی داوە شتێکی تری دەوێ خوای رب العالمین مەرج نیە ئەوەی ئینسان بیری لێبکاتەوە تەنانەت پێغەمبەریش بێ (ﷺ) ئەو بێتەجێ ئەوەی الله دەیەوێ هەر ئەو دەبێ خوای رب العالمین ڕێگای پێدان و موسڵمانەکان بچنە سەر ڕێگایان لەولاشەوە قوڕەیشیەکان هەواڵیان پێگەیشت کە تیجارەت و بازرگانی و قافڵەکەیان کەوتوٚتە مەترسی ئەبو جەهلی لەعینی فیرعەونی ئومەت هەستاوە بانگەوازی کرد بوٚ قوڕەیشیەکان دەبێ بچین قافڵە و کاروانەکەمان ڕزگار بکەین و توٚڵەی بستێنینەوە لە موحەمەد (ﷺ) لە موسڵمانەکان، ئەوانیش نزیکەی بە هەزار کەسەوە لەوپەڕی چەک و تفاق و خوٚئامادەکردنەوە هاتن بەرەو شاری مەدینە پێغەمبەریش (ﷺ) بوٚ جەنگ خوٚی ئامادە نەکردبوو موسڵمانان چەک و تفاقێکی وایان پێ نەبوو هەر بوٚ ئەوە چوبون ڕێگا بەو چل نەفەرە بگرن و وە کاروانەکەیان لێ بستێنن و بەروبومەکە بهێننەوە بوٚ مەدینە ئا لەوێ فەرمانی الله دێت دەبێ جەنگ دەست پێبکا.

ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) بەو لەشکرە کەمەی خوٚی بێ چەک و تفاق بە فەرمانی خوای رب العالمین کافرەکانیش لەولاوە بەو هەموو چەک و تفاقە بەو هەموو خوٚ ئامادەکردنە هاتن بەس خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿بَطَرًا وَرِئَاءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ [الأنفال: ٤٧] ئەبو جەهل بە پێشیان کەوتبوو بەطڕان بوو بوو غروریەت گرتبوی بوٚ ئەوەندەی بوو

کەوا بە خەڵکی پیشاندا هێز و باز و قوەتیان چەندە وە بۆ ئەوە بوو کەوا ڕێگا بە دەعوە و بانگەوازی موحەمەد بگرێ (ﷺ) وە بێتە سەر موسڵمانان.

بەڵام خوای رب العالمین فەرمانی وابوو کە لەوێ لەشکرەکان ڕوبەڕوی یەک بونەوە شەو داهات پێغەمبەر (ﷺ) کەوتە پاڕانەوە لەبەر خوای رب العالمین لەبەر ئەوەی موسڵمان لە هەر تەنگەبەرییەک پێویستە لەسەری بکەوێتە پاڕانەوە لەبەر خوای رب العالمین چونکە هێز هەموی لەلای اللەیە سەرکەوتن هەموی لەلای خوای رب العالمین ە، چەند هێزت هەبێ بەخۆت مەنازە ئیلا ڕوبکە خوای رب العالمین پێغەمبەر (ﷺ) تاوەکو بەیانی ڕیوایەتکراوە نەخەوت سەحابەکان یەک لەوێ و یەک لەوێ و چەند کەسێکیان بە پاسەوان مانەوە هەمویان خەوتن، ئیمامی ئەبو بەکر دەفەرموێ دڵم بە پێغەمبەر سوتا (ﷺ) بینیم هەر دەپاڕایەوە و دەگریا هاواری دەکرد دەیگوت ئەی خوایە ئەگەر ئەو کۆمەڵە کەسە لەناوبچن بەدەستی ئەبو جەهل و قورەیشیەکان جارێکی تر تۆ بەتاک و تەنهایی لەسەر ڕوی زەوی ناپەرستریی خوای رب العالمین ئەو بەڵێنانەی بە منتدا بۆم بێنەحێ سەرم بخە بەسەر دوژمنەکانم، دەڵێ تا عاباکەی ویستی لەسەر شانی بکەوێتە خوار ئەبو بەکر دەڵێ گرتمەوە لەبەر ئەوەی دەستی ئەوەندە بەرز کردبۆوە ژێر کەوشەکانی بەدیار کەوتبوو هەر دەگریا و دەپاڕایەوە، دەڵێ گوتم ئەی پێغەمبەر (ﷺ) وەڵاهی خوای رب العالمین بەفیڕۆت نادا بەڵێنەکانت بۆ دەهێنێتەجێ گیانی من و دایکم و باوکم بە فیدات بێ بەسیەتی بەسیەتی خۆت ئەزیەت مەدە الله لە هانات دێ -جل شئنە-.

جا ابن القیم الجوزیة لە (زاد المعاد)دا دەفەرموێ جا ئەو شەوە بوو خوای رب العالمین وەکو لە قورئاندا باسدەکا کە بەیانیەکەی ڕوبەڕوبونەوە دروست دەبوو خوای رب العالمین بارانی نارد، باران یەکێکە لە سەربازەکانی الله هەندێک جار دەیەوێ خەڵکێکی پێ لەناو ببا خوای رب العالمین وەکو غەزەب دەینێرێ وە خەڵکێکیش پێ دەژێنێنەوە و یارمەتی دەبێ

بۆیان، ئەو بارانە وابوو دوو سەرە بوو، بۆ کافر و موشریک و قورەیشیەکان بوە قوڕ و لیتەی بەرپێیان بوە ناخۆشی و زەحمەتی بۆ لەشکرەکەیان ئەوان پێیوە دۆڕان بەڵام بۆ موسڵمانەکان بوە پاڵپشتی و بەرپێیان پێیوە نەرمتر بوو پێیان لە قوڕا نەدەچوو چاکتر توانیان خۆ ڕابگرن لەو مەیدانەدا لە یەک کاتدا ئەوە تەنها بە الله دەکرێ بارانەکە هەم ڕەحمەت بوو بۆ ئیماندارا‌ن هەم غەزەبیش بوو بۆ کافر و قورەیشی و موشریکەکان.

بەیانی داهاتوو هەردوو لەشکر لەبەرامبەر یەکن، ئەبو جەهل وادەزانێ بردنەوە بە هێزی زۆرە پێغەمبەریش (ﷺ) پشتی قایمە بە خوای رب العالمين دەزانێ بردنەوە بە هێزی دونیای زۆر نیە لەوێوە داوا دەکەن قورەیشیەکان زۆرانبازی بکەن تاک بە تاک سێ پاڵەوانی خۆیان دەردەهێنن عوتبەی کوڕی ڕەبیعە وە کوڕەکەی وەلید و وە براکەی شەیبە بەدوای دەکەون دەڵێن بۆمان وەرنە دەرەوە ئەی لەشکری موحەمەد (ﷺ)، ابن القيم دەفەرموێ سێ لە گەنجانی ئەنساری ڕۆیشتن ڕوەو ڕویان چون تۆڵەی الله و پێغەمبەر (ﷺ) لەو سەرکردە قورەیشیانە بکەنەوە، دەڵێ بەڵام عوتبە ڕوی تێکردن و فەرموی بکشێنەوە پاش ئێوەمان ناوێ ئەوانەی لە خۆمانن لە قورەیشیەکان با ئازابن بێنە دەرەوە، لەوێوە پێغەمبەر فەرمانیدا (ﷺ) نەیگوتە کوڕی خەڵکی ئێوە بڕون بە کوشتن بچن ئێمەش لە ماڵەوە دادەنیشین چەپڵە ئافەرینتان بۆ لێدەدەین خۆم و برازام و کوڕەکانم بەناو با سەرلەشکربن و بەڵام لە مەیداندا با هیچیان بەسەر نەیە و عەزیەت نەبینن ئەوەی نەگوت پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر بۆ خاتری الله بوو، فەرموی حەمزە کە لە حەمزە خۆشەویستر نەبوو لەناو ئەو لەشکرە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە خزمەکانی خۆی حەمزە پاڵەوانە مامی پێغەمبەرە (ﷺ) برایەتی لە شیری زۆری خۆشدەویست پێغەمبەر (ﷺ)،فەرموی حەمزە وەرە دەرەوە، لەولاشەوە تەماشای کرد لە بنەماڵەکەی خۆی ئەوەیتریش کە زۆری خۆشدەویست عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بوو هەم لەلایەک عەلی لە کۆتایی بوە زاوای و وە هەم لەلایەکیتر عەلی

کوڕی ئەبو تاڵیب ئامۆزایەتی و یەکەم منداڵیشە موسڵمان بوە و پەروەردەی بەردەستی پێغەمبەریشە (ﷺ) هەم پێغەمبەر لە سەرەتا کە باپیرەی مرد لە ماڵی ئەوان گەڵیان ژیا وە هەم کە ئیمامی عەلی تەمەنی گەیشتە هەشت نۆ ساڵان پێغەمبەر خەدیجەی گواستەوە و هێنایە ماڵی خۆی و لەگەڵ پێغەمبەر ژییا (ﷺ) فەرموی عەلی تۆش بۆیان بڕۆ دەرەوە، لەولاشەوە پێغەمبەر فەرموی ئەبو عوبەیدەی کوڕی حاریس کە حاریس مامی گەورەی پێغەمبەر بوو (ﷺ) فەرموی تۆش بڕۆ دەرەوە، هەرسێکیان چونە دەرەوە بەرامبەر بە عوتبە و شەیبە و وەلیدی کوڕی عوتبە، هەڵیانکێشا شمشێر ئەوەیە خوای رب العالمين هەندێک لە موفەسیرین دەفەرمون لە سوڕەتی (الحج) فەرموی: ﴿هَٰذَانِ خَصۡمَانِ ٱخۡتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمۡ﴾ [الحج: ١٩] ئا ئەو شەش کەسە دوو تاقم و کۆمەڵن دژایەتی و شەڕی یەکتر دەکەن زۆرانبازی دەکەن لەسەر الله قوڕەیشیەکان شیرک بۆ الله پەیدا دەکەن و موسڵمانەکان دەڵێن شەریکی نیە و تاک و تەنهایی الله ڕادەگەیەنن.

ئینجا لەوێ حەمزەی پاڵەوان یەکەم کەس بوو بە زوترین کات کەس نەدەگەیشتە حەمزە لە ئازایەتی و پاڵەوانیەتی عوتبەی لە عەرزدا و کوشتی، ئینجا عەلی پاڵەوان ڕاستە گەنجە و تەمەنی زۆر نیە بەڵام زۆر ئازایە عەلیش بەرامبەرەکەی خۆی کوشت، بەڵام ئەبو عوبەیدە بۆخۆی تۆزێک بە تەمەندا چوبوو ئامۆزای پێغەمبەر بوو (ﷺ) نەیتوانی بەرامبەرەکەی تەواو بکوژێ بەڵام توانی بریندار بکا و ئەویش توانی ئەبو عوبەیدە بریندار بکا بەڵام ئەوکات وابوو یاسای زۆرامبازی دوانەکەی تر مافیان هەیە پاڵپشتی ئەبو عوبەیدە بکەن لەولایەوە حەمزە و لەولایەشەوە عەلی ڕۆیشتن و کافرەکەی تریشیان کوشت و ئەبو عوبەیدەشیان بە برینداری هێنایەوە ناو لەشکری موسڵمانان.

ئینجا جەنگەکە دەستی پێکرد شەڕەکە دەستی پێکرد و جەنگەکە گەرم بوو، لەولایەوە لە کۆتایەکەی بۆمان دەردەکەوێ ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزە حەمزەی پاڵەوان کاتێک ئومەیەی

کوڕی خەلەف کە دەگیرێ پێغەمبەر (ﷺ) کە جەنگەکە کۆتایی پێدەهێنێ حەفتا لە کافرەکان دەکوژرێن حەفتایان بە دیل دەگیرێن ئینجا ئومەیە دەڵێتە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف کە بەو خۆی پەنا دەدا لەگەڵ عەلی کوڕی دەڵێ بمپارێزە لە دەستی موسڵمانەکان ئێمە شیرێکی زۆرمان هەیە عەبدوڕەحمان تۆ برادەری گیانی بە گیانی من بوی لەپێش هاتنی ئیسلام لە مەککە شیرێکی زۆرت پێدەدەین و فیدیەیەکی زۆرت پێدەدەین، دەڵێ ئینجا عەبدوڕەحمان دەڵێ ئومەیە لە منی پرسی گوتی ئەوەی لەناو شەڕەکەی من نەکەوتە بەرچاوم کێبوو ئەوەی کەوا پەڕەموچەی نەعامەی لەسەر سینگی خۆی چەقاندبوو کێبوو ئەوە؟ دەڵێ وەڵا ئەوە حەمزەی مامی پێغەمبەر بوو (ﷺ)، ئومەیە سەر بادەدا و دەڵێ ئەوەی ئەمڕۆ دەردی بە ئێمە کرد لەو مەیدانە لوتی ئێمەی قوڕەیشی شکاند وەڵاهی ئەو پیاوەبوو بە ڕاست و چەپ پێی نەدەوێراین ئەبو جەهل خۆی تێدەکرد من خۆم تێدەکرد فلان خۆی تێدەکرد ڕاست و چەپی نەدەپاراست و جەنازەی زۆرێک لە سەرکردەکان و قوڕەیشیەکانی لەوێ خست.

ئەوە حەمزە بوو لەبەر ئەوەیە هەندێک لە مێژونوسان دەفەرمون لەبەرچی ئەجەلی حەمزەی حیکمەت چیبوو زوو هات و لە جەنگی ئوحود شەهید دەبێ و دەگەڕێتەوە لای الله؟ هەندێک لە زانایان دەفەرمون چونکە قوڕەیشیەکان وا لەناویان بڵاو بوبۆوە کافرەکان دەیانگوت کاکە موحەمەد هی ئەوە نیە (ﷺ) ئاینەکەی ڕاستبێ و اللەی لەپشت بێ لەبەرئەوە سەربکەوێ حەمزەی لەگەڵە حەمزە لەگەڵ هەر لەشکرێک بێ و لەگەڵ هەر دەوڵەتێک بێ ئەو دەوڵەت و لەشکرە ناشکێ، بۆ ئەوەی خوای رب العالمين نيشانی بدات حەمزەش یەکێکە لەسەبەبەکان هەرچەندێک ئازابێ و پاڵەوانبێ پاداشتی حەمزەی بەوە دایەوە کردیە (سيد الشهداء) کە لە جەنگی ئوحود باسی دەکەین و گەڕایەوە لای خوای

رب العالمین و وە لە پاشان حەمزەش نەما لە مەیدانەکە کە کافرەکان بڵێن پێغەمبەر بەهۆی ئەوەوە سەردەکەوێ (ﷺ) بەڵکو الله سەریدەخست و ڕێبازەکەی ڕاست بوو.

خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ﴾ ئەی موحەممەد (ﷺ) ئێوە هانا و هاوارتان هێنا بۆ خوای پەروەردگارتان الله وەڵامی دانەوە ببینن ئەوە جەنگی بەدر وا کۆتایی پێهات: ﴿أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ﴾ ئەوە نەبێ ئێوە بە لەشکرایەتی خۆتان سەرکەوتبن من هەزار لە مەلائیکەتەکانم یەک لەدوای یەک بە سەرلەشکرایەتی لە فەرمودەی سەحیح هاتوە کەوا جوبرائیل سەرلەشکری فریشتەکان بوو الله فەرموی هەزار فریشتەم بۆتان نارد لەو جەنگە بەشداری کرد لەگەڵتان لوتی ئەبو جەهل و قوڕەیشیەکانیان شکاند: ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ﴾ بەڵام وا تێنەگەی ئەی موحەممەد (ﷺ) ئەی موسڵمانەکان کەوا ئێوە بەهۆی مەلائیکەتەکانەوە سەرکەوتن ئەو مەلائیکەتانە تەنها موژدەبوو بۆ ئێوەم نارد کە پشتگیریتان لێدەکەم: ﴿وَلِتَطۡمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمۡ﴾ وە هەتا دڵتان ئارام بێتەوە ئەوەم بۆ ڕەوانە کردن ئەگەرنا بزانن: ﴿وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ سەرکەوتن نە بە مەلائیکەت و فریشتەیە نە بە هیچ کەس و شتێکە نە بە هێز و قوەتە تەنها سەرکەوتن لەلای خوای رب العالمین ە الله فەرمان بکا کێ سەربکەوێ ئەو سەردەکەوێ ئەوانی تر سەبەب و هۆکارن: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [الأنفال: ٩-١٠] خوای رب العالمین زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا حەکیم و کارلەجێیە لە هەموو شتێکدا.

عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ «لَقَدْ رَأَيْتُنَا يَوْمَ بَدْرٍ» هەریەک لەو مەیدانەبا ئەگەر ئێمەی بینیبا لە جەنگی ئێمەت دەبینی «وَنَحْنُ نَلُوذُ بِرَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)» لە هەمومان ئازاتر پێغەمبەری الله بوو (ﷺ) هەمومان لەکاتی زۆر ناخۆشیەکان و ئەزیەتەکان و ترس هانامان دەبرد بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) پشت بە پێغەمبەر ببەستین (ﷺ) ئەو پەناگەی هەرهەمومان بوو لە هەر هەموشمان ئازاتر بوو «وَهُوَ أَقْرَبُنَا إِلَى الْعَدُوِّ»

پێغەمبەر (ﷺ) لینگی چەقاندبوو لە مەیدانی جەنگەکەدا «وَكَانَ مِنْ أَشَدِّ النَّاسِ يَوْمَئِذٍ بَأْسًا[١]» پێغەمبەر (ﷺ) شمشێری دەوەشاند کافرەکان نەدەوێران نزیکی کەونەوە لە هەمومان نزیکتر لە کافرەکان پێغەمبەر بوو (ﷺ) ئا ئەوە سەرکردەیە لە مەیدانی جەنگ و جیهاد دا نەک کوڕی خەڵکی بنێرێتە پێشەوە و بەخۆی لە ماڵەوە لە ئیسراحەتدابێ پێغەمبەر (ﷺ) بەخۆی لەپێش هەمویان بوو.

ئیمامی عەلی گێڕاویەتیەوە بە سەنەدی سەحیحەوە دەفەرموێ ئێمە ئەوەندەی پێغەمبەر نزیک نەبوین (ﷺ) لە کافر و لە قورەیشیەکان وە ئەوەندەی ئەویش ئازا نەبوین ئەگەر تینهان بۆ دەهات دەچوین لە پەنای پێغەمبەر شەڕمان دەکرد (ﷺ) لە پاشان پێغەمبەر قایدی مەیدان بوو لە هەر هەمویان لە بڕیاردان گەورەتر پێغەمبەر بوو (ﷺ) لە دوای ئەو ئیمامی حەمزە و باقی سەرکردەکانی تر، لەبەر ئەوە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) هەرکە سێ کەسەکە حەمزەی پاڵەوان و عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و عوبەیدەی کوڕی حاریث کە یەکیان مامی پێغەمبەر بوو (ﷺ) حەمزە و دوانەکەی تر ئامۆزای بون، خزمە نزیکەکانی خۆی دەنارد بۆ شوێنەکانی مەترسیدار پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە نیشانەی ئەوەبوو چونکە بڕوای بە جەنگەکان هەبوو چونکە کەسێکی مەبدەئی بوو دەیزانی خێر و بێری قیامەت لەوەدا دەبێ بەڵام دائیمەن هەر سەرکردەیەک بڕوای بە شتەکە نەبێ و هەر پلە و پایەی خۆی بوێ هەر هەوڵی ئەوە دەدا خۆی و دار و دەستە نزیکەکانی و کوڕەکانی و ئامۆزا و برازاکانی سەلامەتبن و کوڕی خەڵکی بە کوشت بدا، پێغەمبەر (ﷺ) لەو مەیدانەدا کاتێ کەوا سەرکردەبوو کە ئەوانە کۆتاییان پێهات عوتبە و شەیبە و وەلید کوژران پێغەمبەر ڕویکردە سەحابەکان ئوسەیدی ساعیدی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) «إِذَا أَكْثَبُوكُمْ فَارْمُوهُمْ، وَاسْتَبْقُوا نَبْلَكُمْ[٢]» فەرموی لێیان مەچنە پێش ئێوە ئەی سەحابەکان ئەگەر کافرەکان

[١] حكم الحديث: إسناده صحيح، مسند أحمد (٦٥٤) (١٠٤٢) (١٣٤٧).

[٢] صحيح البخاري (٣٩٨٤) (٢٩٠٠) (٣٩٨٥)، سنن أبي داود (٢٦٦٣) (٢٦٦٤)، مسند أحمد (١٦٠٦٠).

هێرشیان هێنا و نزیک بونەوە ئێوە تیر بارانیان بکەن شمشێرەکانتان دەرمەهێنن هەتا تەواو نزیک دەبنەوە و بەناو یەک وەردەبن ئەو کاتە بە شمشێر شەڕ بکەن.

لە کۆتایەکەیدا حەفتا لە قورەیشیەکان کوژران ئەوە بۆچونی ڕاجیح و پەسەند و سەحیحە وە حەفتایان بەدیل گیران لەناو کوژراوەکان فیرعەونی ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو جەهل مەیتی کەوتبوو، ئەبو جەهل ئاوا کوژرا کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف دەفەرموێ لە ڕیوایەتی سەحیحدا دەفەرموێ دوو مێرد منداڵەی تازە پێگەیشتوی ئەنساریەکان هاتن هەردوکیان یەکیان ناوی معاذ بوو یەکیان ناوی معوذ بوو دەڵێ معاذ پێیگوتم ئەی عەبدوڕەحمان ئێمە دەمانەوێ مامەگیان پێمان نیشاندەی ئەبو جەهل کێیە، دەیناسی تۆ؟ دەڵێ منیش گوتم ڕۆڵە بۆچیتە ئەبو جەهل؟ ئەبو جەهل کەسێکی وایە و وایە... دەڵێ گوتی سوێند بە الله زانیومانە پێغەمبەری پێشەوای (ﷺ) زۆر عەزیەت داوە و قسەی پێگوتوە لە مەککە دەبێ تۆڵەی الله و پێغەمبەری اللەی لێبکەینەوە (ﷺ)، دەڵێ منیش سەرم سوڕما گوتم چۆن کوڕەکەم؟ گوتی وا ئێمە لێی دەچینە پێش وەڵاهی یان دەبێ ئەو بمانکوژێ یان دەبێ ئێمە بیکوژین، دەڵێ ئەویتریش هات بە چرپە چرپ و نهێنیەوە بەبن گوێی ئاوا چرپاندم دەڵێ زۆر دڵم شادبوو دوو گەنجی تازە پێگەیشتوو مێرد منداڵە ئەو غیرەتەیان هەبێ بۆ دینی الله و بەرگریکردن لە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دەڵێ لەناکاو چاوم گێڕا بینیم ئەبو جەهل شەڕی دەکرد دەڵێ گوتم ئەها ئەو پیاوەی سەر وڵاخەکەی شەڕ دەکا ئەوە ئەبو جەهلە، دەڵێ هەر ئەوەندەم بینی ڕایانکرد بۆ ئەبو جەهل، لە ڕیوایەتێکی تر معاذ کوڕی عمرو کوڕی الجموح دەفەرموێ بەڵکو من گوێبیست بوو بوم کە سەربازی زۆر چاک و پاسەوانی تایبەتی چاکی لەگەڵدایە ئەبو جەهل لێ ناگەڕێن لێی نزیک بنەوە، دەڵێ لەبەر ئەوە بەڵێنم دایە الله تۆڵەی الله و پێغەمبەری اللەی لێبکەمەوە (ﷺ) ئەگەر لەوێش بکوژرێم، معاذ دەفەرموێ لێی نزیک بومەوە هەڵم کێشا شمشێرەکە لە ڕانی ئەبو

جەهلم دا نازانم ڕانەکەم قرتاند یان نا لەسەر وڵاخەکەی کەوتە خوارەوە دەڵێ بەڵام لەولاوە عیکریمەی کوڕی هات هەتا شمشێر گرتی لەسەر شانی منیدا دەڵێ سوێند بە الله شان و پیل و باسکەکەم بەس بە پێستێکی بەشانمەوە مابوو دەڵێ کۆڵم نەدا و دورکەوتمەوە لەبەر ئەوە لە ئەبو جەهل ئینجا معوذ هات لەوێوە ئەبو جەهلی لەخوێندا سورکرد و نەیهێشت ئەبو جەهل ڕاست بێتەوە بەڵام گیانی هێشتا لەبەردا مابوو دەڵێ دور بە دوری چوم پێیەکم لەسەر دەستەکەی خۆم دانا لێم بوو بوە بەڵا، خوێن فڕکەی دەکرد ئەوە غیرەتی موسڵمانانە ئەوە غیرەتی ئەنساریەکان بوو ئەوە غیرەتی پیاوانی پەروەردەی بەردەستی پێغەمبەر بوو (ﷺ) لەبەر ئەوە لە هەموو سەردەم و کاتێکدا گەنجانی خاوەن ئیمانی تەقوا کە لە الله دەترسێن دەیانەوێ تۆڵەی الله و پێغەمبەری الله لە دوژمنانی الله بکەنەوە دوژمنان چۆکیان دەلەرزێ لە بەرامبەریان چونکە گەنج خوێن گەرمە بە ئیمانە پڕە لە ئیسلام دیفاع و بەرگری دەکا گوێی لێ نیە هەرچی بەسەر بێ لەبەر خاتری الله و وە لەپێناو ڕێبازەکەی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، دەڵێ پێیەکم لەسەر باسک و دەستەکەم دانا خۆشم ڕادەکێشا بۆ سەرەوە هەتا باسکەکەم لەکۆڵ خۆم کردەوە و فڕەمدا، ئینجا لە کۆتایی جەنگدا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) کێ دەچێ هەواڵی ئەبو جەهلم بۆ دێنێتەوە دەبێ مابێ یان نا؟ عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەڵێ من چوم، گەڕام بەناو مەیتەکانی قوڕەیشیەکان بینیم ئەبو جەهل گیانی لەبەر مابوو لە ڕیواتێک دەڵێ پێم لەسەر سەری دانا و لە ڕیواتێک دەڵێ لەسەر باسکی دانا شمشێری هێشتا بە دەستەوە بوو بەس کەوتبوو نەیدەتوانی هەڵبستێتەوە، دەڵێ پێم گوت ها حاڵت خۆشە؟ الله ڕسوای کردی ئەی دوژمنی خوای رب العالمین، دەڵێ هێشتا هەر عینادی گرتبوی و گوتی بەڵێ لێرە کەوتوم و بەڵام خۆ بە دەست خزمانی خۆم و خەڵکانی خۆم کوژراوم، کێبوو لە منیدا و منی کوشت؟ هێشتا هەر پرسیاری ئەوەی دەکرد، ئینجا دەڵێ لە کۆتایەکەیدا بە چەندین ڕیوایەت هاتوە عەبدوڵای

کوڕی مەسعود لە ملی دەدا و دەیکوژێ و تەواوی دەکا، ئینجا پێغەمبەر کە دەچێتە سەری (ﷺ) دەفەرموێ ئەوە فیرعەونی ئومەتەکەی من بوو ئەبو جەهل جەنازەی لێرە کەوتوە.

لە پاشان جەنازەی قورەیشیەکانیان کۆکردەوە حەفتا بون و سەرکردەکان بە جیاواز و خەڵکەکەی تر بە جیاواز لە دۆڵێکی هەڵکەنیو و قۆرتێکیان بۆ دانان و خۆڵیان بەسەردا دان پێغەمبەر ئەوانی دواند (ﷺ) فەرموی ئەی سەرە قورەیشیەکان کە منتان ئەزیەت دەدا نەتاندەهێشت دینی الله تەواو بڵاو بێتەوە لە مەککە حاڵتان خۆشە ئێستا؟ ئێستا بینیتان کێ حەق و ڕاستە، خوای من ڕاستبوو یان بتەکانی ئێوە؟ گەیشتن بە شوێنی خۆتان، لێیان پرسی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەوانە مردون بۆچی دەیان دوێنی و قسەیان لەگەڵ دەکەی؟ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) سوێند بە الله لە ئێوە باشتر گوێبیستی قسەکانی منن.

ئینجا لێرەدا ئەهلی سونە و جەماعە بۆچونی جیاوازیان هەیە ئایە مردوەکان ڕاستەوخۆ گوێیان لە دەنگی کەسێکی زیندو دەبێ کە دەیاندوێنێ و قسەیان لەگەڵ دەکا یانە نا؟ بۆچونی ڕاجیح و پەسەند کە قەناعەتمان ئێمەش بەو بۆچونەیە کۆمەڵێکی ئەهلی تەحقیق لە ئەهلی سونە و جەماعە دەفەرمون ئەوە تایبەت بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەو ڕوداوە وەکو موعجیزەیەک ئەگەرنا بە بەردەوام مردو ئاگای لە زیندوەکان نیە و زیندو قسە بکا نایانگاتێ مەگەر خوای رب العالمین سەلامی لێبکەن لە ڕێگای فریشتەکانەوە بیان گەیەنێتێ (والله أعلم بالصواب).

بەڕێزان و خۆشەویستان موسڵمانان سەرکەوتن و سێ ڕۆژ سونەتی پێغەمبەر وابوو (ﷺ) مەیدانی جەنگ و گۆڕەپانەکەی بەجێ نەدەهێشت سێ شەو و سێ ڕۆژان لە بەدر مایەوە هەتا کافرەکانیان شاردەوە وە لە موسڵمانەکانیش ئەوانەی شەهید بوو بون لەسەر ڕیوایەتێک دەڵێ سێزدە لەسەر ڕیواتێک دەڵێ چواردە لە بەینی ئەوەندانە بون موسڵمانەکان کە شەهید بوو بون ئا ئەوانیشیان هێنایەوە لەنێو شەهیدەکان باوکی

حوزەیفەی تێدابوو، لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە شاری مەدینە بەسەرکەوتویی وە کافرەکان سامیان لێ نیشت لە دەوروبەری مەککە و مەدینەدا وە هەموو عەشیرەتەکان هەولی ئەوەیاندا پەیمان ببەستن لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی هێرشیان نەکرێتە سەر خوای رب العالمین لوتی کافرەکانی وا لە جەنگی بەدر شکاند.

## جەنگی ئوحود

لەپاش چەند ڕوداوێکی تر لە ساڵی سێیەمی کۆچی لەسەر بۆچونی ڕاجیح و پەسەند لە ناوەڕاستی مانگی شەوال کافرەکان خۆیان ئامادە کرد و کۆکردەوە بۆ ئەوەی تۆڵەی جەنگی بەدر بکەنەوە بەسەرپەرشتی ئەبو سوفیانی گەورەی قورەیشیەکان کافرەکان سێ هەزار چەکداریان کۆکردەوە و چەندین ژنیشیان لەگەڵ خۆیان هێنا بۆ ئەوەی هاندەربن بۆ پیاوەکان و هاتنە مەیدان هاتنە دەوروبەری مەدینە، پێغەمبەریش (ﷺ) پرسی کرد ڕاوێژی کرد بە سەحابەکان بۆچونی کۆتا لەوە سەریدەر کرد کە بچن بەر لە کافر و موشریکەکان بگرن و نەگەنە ناو شاری مەدینە، پێغەمبەر (ﷺ) سەرەتا هەزار کەس بون لە چەکدارەکانی سەحابەکان بەڵام هەندێک مونافقیان لەگەڵدا بون بەسەرکردایەتی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول کە سەرکردەی مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکان بوو، لە ڕێگادا سێ سەد کەسی هاندا عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول لە لەشکری پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانەی گەڕاندەوە و تەواو نەچونە مەیدانەکە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) تەنها حەفسەد چەکداری لەگەڵما پێغەمبەر (ﷺ)، کە ڕوبەڕوبونەوە لە جەنگی ئوحود پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاریدا ئەی عەبدوڵای کوڕی جوبەیر بڕۆ سەر ئەو لوتکە شاخە و ئەو شوێنە بەرزاییە و گردیلە بەجێ مەهێڵە خۆت و پەنجا لە تیر هاوێژان ئەگەر ئێمە سەرکەوتین و ژێرکەوتین ئێوە ئەوێ بەرمەدەن، ئەوەبوو چون لەوێ پەیدابون و سەحابەکان خۆیان جێگیر کرد لەسەر فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام لە پاشان پێغەمبەری

پێشەوا (ﷺ) کاتێک کەوا ئەو فەرمانەیدا و شەڕ و جەنگ دەستی پێکرد موسڵمانەکان سەرەتا وایانکرد کە کافرەکان ببەزن و پاشەکشە بکەن، هەرکە ئەوانەی سەر گردەکە بینیان وا سەحابەکان بەرەو پێش دەچن و کافرەکان پاشەکشە دەکەن گوتیان بردمانەوە هەندێک خۆیان بە خۆوە نەگرت گوتیان ئێمەش دەچین غەنیمە کۆدەکەینەوە و جەنگ کۆتایی پێهات هەرچەندە عەبدوڵا لەبەریان پاڕایەوە وەرن فەرمانی پێغەمبەر مەشکێنن (ﷺ) بەڵام خۆی و تەنها دە کەس لە سەحابەکان مانەوە لە پەنجاکە لەوێ ئەوانیتر هەموو شوێنەکەیان بەجێهێشت و ڕۆیشتن، لەولاشەوە سەرکردەی سوارچاکەکانی قوڕەیشیەکان ئەوانەی کەوا شەڕیان دەکرد خالیدی کوڕی وەلید بون لەسەر پشتی وڵاخ ئەو ئەوەی بینی و لەپشتی موسڵمانان سوڕایەوە و لەوێدا تەواو جەنگی ئوحود ناخۆشی و زەحمەتیەکان ڕویدا کە پێغەمبەر (ﷺ) کەوتە تێو قوڕەیشیەکان لەگەڵ چەند پاسەوانێکی تایبەتی خۆی (ﷺ) لەوێوە شەڕ دەستی پێکرد بە تەواوەتی، پێغەمبەر ئەو پاڵەوانە بوو لە یەک لە ڕیوایەتەکان شمشێرە نۆ کیلۆیەکەی پێبوو، نۆ کیلۆ بە قسە خۆشە بە سەعات شەڕی پێبکەی بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) بەو شمشێرەی و دەستی ڕاست بە (بسم الله، الله أكبر)ەوە کۆڵی نەدا ڕاست و چەپ لە کافرەکانی دەدا و لە خۆی و لە موسڵمانانی پاس دەکرد، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس لە لایەک شەڕێکی وایدەکرد کەوا کەس نەیدە بینی ڕم و تیرەکان چۆن دەهاوێژێت یەک لە دوای یەک نزیکەی هەزار تیر و ڕمی هاوێشت لەو ڕۆژەدا سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس پاڵەوانەکەی خاڵەوانانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا ئەبو تەڵحەش لەلایەکی تر تەنانەت سەرە پەنجەکانیشی لەگەڵ ڕمی کافرەکان پەڕی کاتێک کەوا بۆ پێغەمبەریان هاوێشت (ﷺ) ئەو دەستی دایە بەر، ئینجا ئەبو دوجانەش سینگ و سەر و مل و گیانی هەموی دانابوو لەبەر ئەو تیر و ڕمانەی کە بۆ پێغەمبەر دەهات (ﷺ)، بەڵام لەولاوە نەسیبەی ئوم عەمارەی ئەنصاریە ئەو ئافرەتە پاڵەوانە کە هەزار پیاوی ئەو سەردەمانەی ئێستا بەهیچ نەوعێک باری نابەن بە سەدان پیاوانی سەردەمی خۆشی

نەیاندەتوانی ڕوە و نەسیبە بوەستن هەرکە ئاوی دەدایە بریندارەکانی موسڵمانان دەیویست تیماریان بکا و تەداویان بکا چاوی کەوت بەوەی لەشکری قورەیشیەکان دەوری پێغەمبەریان داوە (ﷺ) گیانی خۆی فیداکرد بۆ پێغەمبەر ئاوەکەی فڕەدا دەیرمانەکانی فڕەدا ڕوە و پێغەمبەر چوو دەستیکردە شمشێر نەسیبە ڕاست و چەپ لە کافرەکانیدا، هەتاوەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ سوێند بە الله «ما التفتُّ يمينًا وشمالا يوم أحد إلا ورأيتها تقاتلُ دوني» دەفەرموێ ڕاست و چەپ ئاوڕم دەدایەوە لە ڕاست و چەپ نەسیبەم دەبینی شەڕیدەکرد وەکو حیمایەیەکی تایبەتی پاسەوانی لە من دەکرد، لە پاشان پێغەمبەر بینی پیاوەکەی نەسیبەش هاریکاری نەسیبە دەکا وە کوڕەکەشی لەگەڵیەتی لەبەر ئەوە لەناو گەرمە گەرمی شەڕدا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «اللهم اجعلهم رفقائي في الجنة بارك الله عليكم أهل البيت» فەرموی ئەی ئەهلی بەیت ئێوە عائیلە و بنەماڵەیەکی تەواو بە مێرد و ژن و منداڵەوە پاسەوانی لە پێغەمبەر دەکەن (ﷺ) خوایە لەبەرت دەپاڕێمەوە بیانکە ڕەفیق و هاوەڵی من لە بەهەشتدا، بەڵێ بەڕێزان و خۆشەویستان ئا ئەو ڕۆژە بوو دوانزە برینی لە لاشە و جەستەی پەیدابوو بە ڕم و تیر و شمشێری قورەیشیەکان لەلاشەی نوسەیبەی کچی کەعبی ئەنساریەی پاڵەوان.

بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) لەناو ئەو گەرمە گەرمەی شەڕ بوو بۆچونی پەسەند لەگەڵ ئەوەدایە ئوبەی کوڕی خەلەف بوو کاتێک لە مەککە گوتی وڵاخێکم ڕاگرتوە قەڵەوی دەکەم بۆ ئەوەی لەسەر پشتی وڵاخەکە بتکوژم ئەی موحەمەد (ﷺ)، پێغەمبەر فەرموی بە پشتیوانی الله من دەتکوژم، ئا لەو گەرمە گەرمە کە پاسەوانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەنساریەکان حەوت بون پاسەوانە تایبەتیەکانی یەک لە دوای یەک شەهید بون پێغەمبەر بۆخۆی مابویەوە (ﷺ)، وەڵاهی ئیمامی عەلی دەفەرموێ من گومانی ئەوەم برد بینیم لەولایە کوژراوەکانن بەناویاندا گەڕام پێغەمبەری تێدانەبوو (ﷺ) لەولاوە ئاوڕم دایەوە

لەنێو موسڵمانەکان پێغەمبەرم نەدەبینی بەپێوەبێ و شەڕبکا دەڵێ گوتم هەبێ و نەبێ وەڵاهی پێغەمبەر بە غیرەتە و ڕاناکا و هەڵنایە بەڵام ئیلا الله وەکو عیسا هەڵیکێشاوەتە ئاسمان غەزەبی لە ئێمە گرتوە کە نەمان توانیوە تەواو پاسەوانی لێبکەین نەمان توانیوە تەواو غیرەتی خوٚمان بسەلمێنین، دەڵێ هەرکە چومە پێش بینیم پێغەمبەر لە ناوەڕاستی قوڕەیشیەکان بوو دایک و باوکی خوٚمم فیداکرد و بە شمشێر هێشتا هەر شەڕی دەکرد دەڵێ هەڵمکێشا شمشێرەکە چاوم هیچی نەبینی ڕاست و چەپ کافرەکانم کوشت هەتا گەیشتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ).

ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحیش دەفەرموێ هەمومان قەدەمهان شکا هەرکە هەواڵ پەیدا بوو گوتیان موحەمەد کوژراوە بەڵکو پێغەمبەر نەبو موسعەبی کوڕی عومەیر بوو چونکە توٚزێک بە پێغەمبەر دەچوو (ﷺ) شەهید کرابوو دەڵێ منیش لەولاوە چوم هاوارم کرد گوتم ئەگەر پێغەمبەر کوژرابێ دەبێ ئێمەش بکوژرێین ئەگەر نەکوژرابێ دەبێ پاسەوانی بین، دەڵێ گوێم لێبوو پێغەمبەر دەیفەرموو هاوەڵە بەڕێزەکانم الله سەرمان دەخا و من لێرەم وەڵاهی ماوم نەمردوم من محمد رسول اللهم (ﷺ) دەڵێ دایک و باوکی خوٚمم فیداکرد ڕوەو پێغەمبەر چوم (ﷺ) بەڵام هەرکە بینیم پێغەمبەر ڕیشی تەڕ بوو بوو لە خوێنی سوردا هەموو ڕیشی تەڕ بوو بوو عبدالله کوڕی قومئەی موجریم هاتبوو لەولاوە شمشێرێکی لە کڵاوی پێغەمبەر دابوو (ﷺ) دوو ئاڵقەی ئاسنین کەوتبونە سەر کوڵمەی و تێی چوبونە خوارەوە نەزیف بوو بوو ڕیشی هەموی سور بوو بوو لە خوێندا، دەڵێ دایک و باوکم بە قوربان کرد گوتم ئەوە کێ وای لێکردی؟ گوتی عبدالله کوڕی قومئە خوای رب العالمین بیڕزێنێ و پارچە پارچەی بکا، دەڵێ شمشێرێکیشی لەسەر شانیدابوو دەستی ڕاستەی نەیدەتوانی شمشێر بگرێ پێغەمبەر (ﷺ)، فەرموی پێغەمبەری الله سوێند بە الله ئەگەر دوو هێلەک و درعم لەبەر نەبا وەڵاهی ئەگەری ئەوەی هەبوو پیلم لە بنەوە پەلدرابا

و لێبوباوە بۆ یەک مانگ نەیدەتوانی دەستی تەواو بەرز کاتەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو هەموو ئازارانەی بینی، ددانەکانی کەوتە خوار پێغەمبەر (ﷺ)، هەردو سەر چۆکەکانی تەواو داماڵرابون و خوێنی لێدەهات، ئەبو عوبەیدە دەڵێ چاوم هیچی نەبینی هەر ئەوەندەم پێکرا زمانم دەنا بە ڕومەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو دەمارانەی خوێنی لێدەهاتە خوار دەم لێسایەوە بۆ ئەوەی زیاتری لێ نەیەت لەلایەکیش دەچوم شمشێرم دەردەهێنا و لەگەڵ کافرەکان شەڕم دەکرد هەتا نزیک نەبنەوە، دەڵێ لەو ناکاوە بوو کاتێک سوارێک لەولاوە هات ڕمێکی بە دەستەوە بوو پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) بەرمدەن ئەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس دایکم و باوکم فیدات بێ بهاوێ بەڵام ئەو سوارە بۆ من لێبگەڕێ، لە ڕیوایەتێکی تر دەڵێ حەربەیەکیان دایە دەست پێغەمبەر (ﷺ)، لە ڕیوایەتەکەی تردا دەڵێ تیرێک بوو یان ڕمێک بوو داینا نیشانەی گرت لە گەردنی ئوبەی کوڕی خەلەف ئەوەی لە مەککە گوتی دەتکوژم لەسەر پشتی ئەو وڵاخە ئەی موحەمەد (ﷺ)، ئا لەو کاتەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی (بسم الله، الله أكبر) ڕمەکەی هاوێشت یان حەربەکە لە گەردنی ئوبەی کوڕی خەلەف چەقی لەسەر وڵاخەکەی کەوتە خوار دەیبۆڕاند وەکو هێستر و مانگا وە لە زەڕینی دەدا وەکو گوێدرێژ هاوار هاواری بوو، گوتیان بۆ وای برینەکەت یەکجار بچوکە؟ گوتی نازانن کێ لە منی داوە و ئێشەکەی زۆرە و پێیوە دەچم.

ئینجا لە کۆتایی جەنگەدا کاتێک کەوا کافرەکان توانیان حەفتا لە سەحابەکان لەوانە حەمزەی پاڵەوان مامی پێغەمبەر (ﷺ) بکوژرێن و الله بە شەهیدی قبوڵ کردبن، ئینجا عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب دەفەرموێ سوێند بە الله نەمان دەزانی چیبکەین لە برینەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆتایدا پارچەیەک حەسیرمان دۆزیەوە لە یەک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ بەسەر کوڵمەماندا تاواندەوە هەتا نەزیفیەکەی خوێنی کوڵمەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕاوەستا.

پێغەمبەر ئەگەر وا ئازار و ئەزیەت و ئەشکەنجەی بینیبێ خوێنی لێهاتبێ لەسەر ئیسلام ئێمە چین؟ ماموستایان دەبێ زۆر ئامادەبن زۆر لەوە زیاتر لەسەر حەق و ڕەوایەتی لەسەر بڵاوکردنەوەی دەعوەی پێغەمبەر (ﷺ) وە لەسەر سەرخستنی ئیسلام و بەرچاو ڕونکردنەوەی جەماوەر و میلەت لە حەقیقەت و ڕاستیەکان بەسەریان بێ و ئارام بگرن لە کۆتایەکەیدا سەرکەوتن بۆ پێغەمبەر بوو (ﷺ).

ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) کۆڵی نەدا لەو مەیدانەدا لەگەڵ ئەو برینانەشیدا بیلال دەفەرموێ وەڵاهی من خۆم دابوە لە شانێکێ پێغەمبەر (ﷺ) بن پیلم خستبوە سەر شانم وە عەلیش لە لایەکی ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) لە ماندبون و شەکەتیان دەیتوانی شاقاو بهاوێ و بڕوا ئەگەرنا نەیدەتوانی ئەوەندە ماندوبوو بوو لە پێناو خوای رب العالمين.

کوا ئێمە چیمان کردوە بۆ الله ئەی ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ)؟ پێغەمبەرەکەت وابوو، کوا ماموستایانی ئاینی کە ئێمە دەڵێین میراتگری پێغەمبەرین (ﷺ) چیمان لێهاتوە لەسەر ئیسلام؟ کوا برینەکانی لاشەمان؟ کوا ئازار و ئەشکەنجەمان؟ داخوا دە قسەمان پێگوتراوە یانە نا، دوو دیعایەت لە شوێن کراوە یانە نا، ئەویتر هەر هەموی تۆ لە مەیدان بوی و هیچت پێنەکراوە ئەگەر پێشت کرا دەبێ ئارام بگری و ئیقتیدا بکەی بە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ).

جا پێغەمبەر هاتە سەر جەنازەکان کە بینی حەمزەی پاڵەوانیشی تێدایە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر غەمگین بوو فەرموی ڕازیم بە قەزا و قەدەری الله، لە پاشان فەرموی کۆیان بکەنەوە جەنازەی موسڵمانەکان نە بیانشۆن نە نوێژیان لەسەر بکەن بە شمەک و جل و بەرگە خوێناویەکەی خۆیان بیاننێژن دوو دوو سێ سێ لە یەک قەبریان دانێن فەرموی «أيُّهم أكثرُ أخذًا للقرآن» لە پێش پێشەوەبێ و ڕوەو قیبلە ئەو دابنێن، وە لە پاشان فەرموی هاوەڵە بەڕێزەکانم ئێوەش پێ شاهێدبن «أنا شهيد على هؤلاء يوم القيامة[١]» وەڵاهی منیش شاهێدی

[١] صحيح البخاري (١٣٥٣)

ده‌ده‌م له‌سه‌ر ئه‌وانه‌ که‌ له‌پێناو خوای رب العالمین گیانی خۆیان به‌ختکردبوو، وه‌ له‌ پاشانه‌که‌ فه‌رموی «إنِّي فَرَطٌ لَكُمْ، وأَنا شَهِيدٌ علَيْكُم[1]» فه‌رموی من له‌ پێشی ئێوه‌دام ئه‌ی سه‌حابه‌کان ده‌گه‌ڕێمه‌وه‌ لای خوای رب العالمین و وه‌ له‌سه‌ر حه‌وزی که‌وسه‌ر ده‌بم و له‌پێشی ئه‌وانیش ده‌چمه‌ به‌هه‌شت به‌ڵام بزانن من شاهێدی بۆ ئه‌وانیش ده‌ده‌م.

ئینجا أنس کوڕی النضر و حه‌مزه‌ی پاڵه‌وان و شێری الله و پێغه‌مبه‌ری الله و (ﷺ) یه‌مانی باوکی حوزه‌یفه‌ له‌ جه‌نگی ئوحود بوو نه‌ک به‌در وه‌ عه‌مری کوڕی جه‌موح و عه‌بدوڵای کوڕی جه‌حش و موسعه‌بی کوڕی عومه‌یر له‌و مه‌یدانه‌دا شه‌هید بون.

موسعه‌بی کوڕی عومه‌یر ئه‌و کوڕه‌ و پیاوه‌ ده‌وڵه‌مه‌نده‌ی مه‌ککه‌ به‌ڵام ئه‌وه‌نده‌ فه‌قیر و هه‌ژار بوو بوو به‌س به‌ ئیمان ده‌وڵه‌مه‌ند بوو بوو کۆڵی نه‌ده‌دا له‌و مه‌یدانه‌ی که‌ شه‌هید ده‌بێ کفن نیه‌ پێی کفن بکه‌ن هه‌تا وه‌کو ده‌یهێنن شمه‌ک و جل و به‌رگه‌که‌ی خۆی ته‌واو دایناپۆشێ هه‌تا له‌گه‌ڵ خوێنه‌که‌ی بیشارنه‌وه‌ به‌ڵکو هه‌ندێک له‌ په‌لکه‌ دار ده‌هێنن له‌سه‌ر قاچ و پێی داده‌نێن و ته‌واو هه‌تا بیشارنه‌وه‌ به‌ڵام بردیه‌وه‌ و شه‌هیدێک بوو له‌ شه‌هیده‌کانی ئیسلام.

ئینجا پێغه‌مبه‌ر فه‌رموی (ﷺ) ئه‌ی هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌کانم ئه‌بو سوفیان لوتی زۆر به‌رز بۆته‌وه‌ قوڕه‌یشیه‌کان واده‌زانن ته‌واو بڕایه‌وه‌ و سه‌رکه‌وتوبون من داواتان لێده‌که‌م ناگه‌ڕێینه‌وه‌ مه‌دینه‌ به‌ڵکو بچین بۆ (حَمْراءُ الأَسَد) له‌وێدا جارێکی تر به‌رگری بکه‌ین و هێزی خۆمان نیشان بده‌ین بۆ ئه‌وه‌ی کافره‌کان جورئه‌تی ئه‌وه‌ نه‌که‌ن بێنه‌وه‌ سه‌ر مه‌دینه‌ ئینجا خوای رب العالمین فه‌رموی: ﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ [آل عمران: ١٧٢] ئه‌وانه‌ی وه‌ڵامی پێغه‌مبه‌ریان دایه‌وه‌ له‌ هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌کان له‌گه‌ڵ ئه‌و ماندوبون و شه‌که‌تیه‌ی له‌ جه‌نگی ئوحود بینیبویان فه‌رموی ئیلا

[1] صحيح البخاري (١٣٤٤) (٣٥٩٦) (٤٠٤٢)، صحيح مسلم (٢٢٩٦)، سنن النسائي (١٩٥٤).

ئەوانەشم دەوێ کە لە جەنگدا لە گەڵمدا بون نەک سەربازی نوێم بۆ بێ هەتا بزانن ئێمە ورەمان بەرزە و پەشیمان نین قورەیشیەکان بزانن خوای رب العالمین دەفەرموێ ئەوانەی بە دەنگ پێغەمبەرەوە چون (ﷺ) کە لە جەنگەکە بەشدارییان کردبوو لە پاش ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجە و برینداریەی بەسەریاندا هاتبوو الله دەفەرموێ چاکەیان کرد ئەوانە لە الله ترسان فەرمانی پێغەمبەریان جێبەجێ کرد (ﷺ) پاداشتێکی مەزن و گەورەیان دەبێ.

لە دوای جەنگی ئوحود جولەکەکانی نێو مەدینە و دەرەوەش وە کافرەکان و موشریکەکانیش جورئەتی ئەوەیان پەیداکرد ئەوانەی بەڵێن و پەیمانیشیان هەبوو هەندێک هەڵیان وەشاندەوە گوتیان تەواو کۆتایی دەوڵەتی ئیسلامە کۆتایی موحەمەدە (ﷺ)، جا لەو پێناوەدا ڕوداوی ڕەجیع ڕویدا کە کۆمەڵێک لە سەحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەوانە خوبەیبی کوڕی عەدی و عاسیمی کوڕی ثابیت ئەوانە تێیدا شەهید بون و گیانیان لەدەستدا الله بە شەهیدی قبوڵ کردبن، ئینجا بیئری مەعونە کاتێک چەند بەناو بانگە و دەیەها سەحابیش لەوێدا نزیکەی حەفتایان تێدا شەهید بون لە باشترین سەحابەکان بون کە لەوێدا خیانەتیان لێکرا لەلایەن کافرەکان، لە پاشان بەنو نەزیریش پیلانی ئەوەیان داناوە یەکێکیان چوە سەر بەرزاییەک لە بینایەکان کە پێغەمبەر لەژێر ئەو بینایە ڕاوەستابوو بەردێکی بەسەردا بدا و پێغەمبەر بکوژێ (ﷺ) بەڵام پێغەمبەری الله (ﷺ) جوبرائیل هەواڵی بۆ هێنا و لەوێ لاچوو و لە پاشان تۆڵەی لە بەنو نەزیر ستاندەوە بەوەی بە دەرینان لە ئاوەدانیەکانی مەدینە و پەیمانی لەگەڵ هەڵوەشاندنەوە، ئینجا جەنگی بەدری دوەم داهات کە بەدری بچوک بوو، ئینجا غەزوەی دومة الجندل داهات.

## سێ گوچکەی غەدر و ناپاکی (کەعبی کوڕی ئەشرەف و حویەی کوڕی ئەخطەب و سەلامی کوڕی باوکی حوقەیق)

ئەو سێ پیاوە سێ سەرکردەکەی جولەکەکان بون کە پیلانگێڕیەکی بە تەواوی و ئاشکراییان دەکرد لە دژی پێغەمبەر (ﷺ) و وە لە دژی موسڵمانان زۆر کینە لەدڵ بون، یەکەمیان کەعبی کوڕی ئەشرەف کە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی جولەکەکان کە دایکی لە بەنو نەزیر بوو باوکیشی عەرەب بوو لە عەشیرەتی (طەی) بوو بەڵام بە دایکی زیاتر ناو هەڵدەدران جولەکەکان و ئەوەی دایکی جولەکەبا بە جولەکەیان حیساب دەکرد لەبەر ئەوە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی جولەکەکان وە دایکی لە بەنو نەزیر بوو، ئینجا کەسێکی شاعیر بوو، ئینجا بازرگان و دەوڵەمەند بوو، قەڵایەکی هەبوو قەڵایەکی حاسێ وە گەورە و مەزن دەکەوتە نێوان بەنو نەزیر و بەنو قوڕەیزیەکان لە جولەکەکان، ئەو پیاوە زۆر حقد لە دڵ بوو بەرامبەر بە پێغەمبەر و (ﷺ) بەرامبەر بە ئیسلام، ئەوەبوو لە کۆتایەکەی بە درێژی باسی دەکەین چۆن پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای پیلان گێڕانەکانی لە دوای جەنگی بەدر کە چوو قوڕەیشیەکانی هاندا لە پێغەمبەر و (ﷺ) وە بوە مایەی ئەوەی جەنگی ئوحود بەرپا ببێ ئەوەیە پێغەمبەر بڕیاری کوشتنی دەدا (ﷺ).

وە دوەمیان حویەی کوڕی ئەخطەب باوکی سەفیەی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) دایکی ئیمانداران لە دوای کەعبی کوڕی ئەشرەف ئەو بوە گەورەی جولەکەکان، حویەی کوڕی ئەخطەب ئەویش لە بەنو نەزیر بوو کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) بەنو قەینوقاع و بەنو نەزیری دەرکرد لە شاری مەدینە لەسەر ناپاکی و خیانەتەکانیان خۆیان گرتەوە لە شوێنەکانی خەیبەر ئا لەوێوە حویەی کوڕی ئەخطەب پیلانی دەگێڕا لە پێغەمبەر و (ﷺ) لە موسڵمانان لە کۆتایەکەیدا بە دەست هەڵکێشی پاڵپشتی -ئەبو ڕافیعی- سەلامی کوڕی باوکی حوقەیق کە هەردوکیان دوو سەرکردەی جولەکە بون حویەی و ئەو، ئەوەبوو غطفانیان هەڵخەڵەتاند و هانیاندان لەگەڵ قوڕەیشیەکان و باقی عەرەبەکانی تر جەنگی خەندەقی لێ

پەیدا بوو، لەولاشەوه حویەی کوڕی ئەخطەب که ئەویش قەڵای هەبوو دەوڵەمەندیش بوو کەسێکی سەرکردەش بوو ئەوەبوو توانی بەنو قوڕەیزەیش قەناعەت پێبێنێ که ناپاکی بکەن له پەیمانەکەیان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) که له جەنگی خەندەق وا بڕیار بوو ناپاکیەکه جێبەجێ بکەن بەڵام پێغەمبەر سەرکەوت (ﷺ) ئەو تۆڵەی ساندەوە له بەنی قوڕەیزە کاتێک دەورەی گرتن حویەی کوڕی ئەخطەب لەوێدابوو لەگەڵ جولەکەکانی بەنو قوڕەیزە گیرا و پێغەمبەر (ﷺ) سەعدی کردە حەکەم و بڕیاری ئەوە دەرچوو لەسەریان بدرێ و لەوێوە کوژران.

ئینجا بوکی ڕافیعیش که ناوی سەلامی کوڕی باوکی حوقەیق بوو گەورەی جولەکەکانی خەیبەر بوو، ئا ئەو پیاوەش یەکجار دەوڵەمەند بوو بازرگانیەکی گەورەی دەکرد له سەردەمی خۆی لەبەرئەوەی زۆربەی سەرەکانی قوڕەیش و عەرەبەکان لەگەڵی دۆست بون هاوپەیمان بون قسەیان لێوەردەگرت، ئا ئەوەش ئەوەی قۆستەوە بۆ ئەوەی هانیان بدا له دژی پێغەمبەر (ﷺ) بەشداریکرد له هەموو پیلانەکان له دژی پێغەمبەر و موسڵمانان (ﷺ)، ئەوەبوو له کۆتاییەکەی پێغەمبەری پێشەوا بڕیاری کوشتنی ئەویشیدا مەفرەزەیەکی بۆ ساز کرد و لەناو قەڵاکەی خۆی کوژرا که له داهاتودا به درێژی بۆتان باس دەکەین.

ئەوانە سێ کوچکەی خیانەت و ناپاکی و غەدر بون له دژی دەوڵەتی ئیسلام و پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ئێستاش با بێین به درێژی باسی کەعبی کوڕی ئەشرەف بکەین، چۆن پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاریدا بکوژرێ لەناو قەڵاکەی خۆیدا؟ وه چۆن کوژرا و کێ کوشتی و دەرئەنجامەکەی چیبوو؟

ئەو پیاوە زۆر حقد له دڵدا بوو که موسڵمانەکان له جەنگی بەدر سەرکەوتن نەحەواوە له ماڵەکەی خۆی سەرە جولەکەکانی بانگی ناو قەڵای خۆی کرد و کۆبونەوەی پێکردن،

گوتی ئێوە چیدەڵێن بەرامبەر بە موحەمەد (ﷺ)؟ ئەوانیش بە یەکدەنگی گوتیان دەنگمان دەنگی تۆیە تۆ چ بڕیارێک بدەی ئێمە ڕازین، گوتی پێموایە دژایەتی بکەین و وای لێبکەین کەوا ئەو سەرکەوتنە خەیر لێ نەبینێ ئەگەر وا زاڵ بێ موحەمەد هیچ حیساب بۆ ئێمەش نامێنێتەوە جا پێتان دەڵێم ئەگەر بمکەنە نوێنەری هەموتان من نوێنەرایەتیتان دەکەم لە دژایەتیکردنی پێغەمبەر (ﷺ)، هەموو گوتیان تۆ نوێنەری ئێمەبە، هەستا بارگەی کۆکردەوە و چوە لای قوڕەیشیەکان لەوێ ئەبو سوفیان و هەموو سەرە قوڕەیشیەکانی هاندا برینی کولاندنەوە یەک بە یەک بە ماڵەکاندا گەڕا کەوا لێیان کوژرابوو لە جەنگی بەدر هانی دەدان و برینی دەکولاندنەوە هەتا وای لێکردن قەناعەتیان هات دانەنیشن ئەوەبوو خۆیان کۆکردەوە بۆ جەنگی ئوحود هەروەکو لە ڕابردو باسمانکرد جەنگی ئوحود چۆن بەرپابوو و چۆن ڕویدا و وە چی بەسەر سەحابە و پێغەمبەر هات (ﷺ)، ئینجا شاعیریش بوو شیعری دەنوسیەوە و دەیگوت بە تایبەت لەسەر ناموس و ئافرەتانی موسڵمانان وە خەڵکی هاندەدا تەشقەرە بکەن بە ناموسی موسڵمانان و ئافرەتان وە جوێنی دەدا بە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لە شیعرەکانیدا، پێغەمبەر هەستیکرد (ﷺ) ئەو پیاوە هیچ خەیرێکی پێوە نەماوە دوژمنێکی دڵ ڕەقە و لەناو مەدینە و لە دەوروبەری مەدینەش ماوە لەبەر ئەوە ترسناکی زۆرە لەسەر دەوڵەتی ئیسلام، پێغەمبەر بڕیاریدا (ﷺ) ڕۆژێک لەناو هاوەڵەکانی فەرموی «مَنْ لِإِبْنِ الْأَشْرَفِ؟» کێ هەیە کوڕی ئەشرەف کە کەعبە بۆم بکوژێ؟ بەڵێ پێغەمبەر ئەو بڕیارەی دەرکرد (ﷺ)، لەبەر ئەوەی کەعبی کوڕی ئەشرەف قەڵایەکی زۆر حاسێی هەبوو حیمایە و پاسەوانی زۆری هەبوو وە لەبەرئەوەی ئاسان نەبوو کەسێک بیگاتێ و بیکوژێ کەم لە سەحابەکان لە خۆیانڕا بینی بڵێن ئێمە دەیکوژین بەڵام لەولایەوە کە گوێبیستی بڕیاری پێغەمبەر بوو (ﷺ) موحەمەدی کوڕی مەسلەمە کە لە شیردا برای کەعبی کوڕی ئەشرەف بوو لە ئەوسیەکان بوو شیری خواردبوو لە ئافرەتێک لەگەڵ کەعبی کوڕی ئەشرەف ئەو هەستاوە و گوتی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) بەسەر چاو و سەر

من بۆت دەکوژم، بەڵام ماوەیەکی پێچوو بیری کردەوە موحەمەدی کوڕی مەسلەمە کە ئەو کارە ئاسان نیە لەبەر ئەوە هاتەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی یا رسول الله (ﷺ) پێویستە مۆڵەتم پێبدەی هەرچی بڵێم لەلای ئەو گوناح نەبێ پێویستە من دوژمنکاری خۆم بەرامبەر بە تۆ لەلای ئەو ئاشکرا بکەم لەسەرەوە بڵێم ڕقم لە موحەمەد هەستاوە (ﷺ)، پێغەمبەریش فەرموی بڕۆ مۆڵەتبێ بۆ تۆ گوناحت لەسەر نیە هەرچی دەتەوێ بیڵێ بەڵام کەعبی کوڕی ئەشرەف م بۆ بکوژە، کە پێغەمبەر ئەو بڕیارەیدا (ﷺ) موحەمەدی کوڕی مەسلەمە دڵی خۆشبوو لەلای ئاسانتربوو، ئەوەبوو مەفرەزەیەکی پێکهێنا ئەو مەفرەزەیە چوار کەسیتر لەگەڵ موحەمەدی کوڕی مەسلەمە کە ئامر مەفرەزەکەیان بوو بونە پێنج کەس، ئەوانەش ناوی ئەندامەکانی مەفرەزەکە بون کە چون بڕیار بوو کەعبی کوڕی ئەشرەف بکوژن (یەکیان ناوی سەلیکانی کوڕی سەلامە کە ئەبو نائیلەی پێدەگوترا ئەوەشیان لە شیرەوە برای کەعبی کوڕی ئەشرەف بوو شیری لەگەڵ خواردبوو، سێیەمیان عوبادی کوڕی بشر بوو، وە چوارەمیان حاریثی کوڕی ئەوس بوو، پێنجەمیشیان ئەبو عەبسی کوڕی جەبر بوو، کە یەکەمینیشیان ئامیرکریان موحەمەدی کوڕی مەسلەمە بوو).

ئەوەبوو موحەمەدی کوڕی مەسلەمە وەکو ئەو گێڕانەوە لە سەحیحی بوخاریش تۆمار بوە بەڵام ئەوەی ئێمە بۆ ئێوە دەیڵێین بە دور و درێژترە لە کۆتایەکەیدا سەرچاوەکانتان پێ دەڵێین هەمویمان کۆکردوەتەوە تەنها کورتە پوختێک لە سەحیحی بوخاری باسی کراوە، ئینجا موحەمەدی کوڕی مەسلەمە دەچێتە لای کەعبی کوڕی ئەشرەف ئەویش پێی سەیر دەبێ لەوەتەی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە بوەتە موسڵمان هاتوچۆی کەعبی کوڕی ئەشرەف نەدەکرد، کەعب پێی دەڵێ بۆچی هاتوی؟ دەڵێ چیت لێ بشارمەوە دڵم تەنگ بوە پارە و پولێکی ئەوتۆمان نەماوە لەوەتەی بەدوای ئەو موحەمەدە کەوتوینە ئێستا لێی هەست پێدەکەم هەر داوای سەدەقە و خێرمان لێدەکا دەیەوێ بە سەدەقە و خێر خەڵکەکە

بژێنێ پێم وایە دەیەوێ پارەکانمان لێ ببا، کەعب بەوە دڵی خۆشبوو وایزانی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە لە ڕقدا چوە بەرامبەر بە پێغەمبەر (ﷺ)، گوتی ئەی پێم نەدەگوتن موحەمەدی کوڕی مەسلەمە کەوا ئەو موحەمەدە ڕاستگۆ نیە ئاوایە ئاوایە...؟ موحەمەدی کوڕی مەسلەمەش هیچی نەگوت بۆ ئەوەی ئاشکرا نەبێ، گوتی بۆچی هاتی بۆلام کەعب پێی گوت؟ گوتی بۆ ئەوە هاتوم ئەگەر هەندێک خورمام بە قەرز و سەلەم بدەیتێ ماڵ و منداڵم پێ بژێنم، گوتی بەسەرچاو و سەر زۆرم هەیە، گوتی دەباشە با ئەوە لە بەینمان بێ جارێکی تر دەگەڕێمەوە لات بۆ ئەوەی لێت وەربگرم ئەوە ئێستا نێوانمان بویەوە، موحەمەدی کوڕی مەسلەمە گەڕایەوە و ئەمجارە سەلیکانی کوڕی سەلامەیان نارد کە بە ئەبو نائیلە مەشهور بوو ئەویش چوە لای و سەلامی لە کەعبی کوڕی ئەشرەف کرد و پێی سەیر بوو ئەویش چۆتە لای ئەویش بەهەمان شێوە پێیگوت کەوا من وادەزانم موحەمەد (ﷺ) پارە و نانمان لێ دەخوات و ڕاستگۆیەکەی تەواو نەبێ، کەعب دڵی پێی خۆشبوو بە قسەی ئەبو نائیلە هەر بەویشی گوت ئەی پێم نەدەگوتن ئاخیری واتان بەسەردێت؟ بەڵام ئەبو نائیلە گوتی ئەوە نهێنی بێ لە بەینمان کەعبی کوڕی ئەشرەف ئەی برای شیریم من هاتوم هەندێک خورمام بە قەرز و سەلەم بدەیتێ خەڵکێکی تریشم لەگەڵدایە ئەوانیش ئەو بۆچونەیان هەیە، گوتی دەرگاکانی من هەموی کراوەیە لەسەر ئێوە ئەوانەی دژایەتی موحەمەد بکەن لێی هەڵبگەڕێنەوە کەعبی کوڕی ئەشرەف بە ئەبو نائیلەی گوت.

لە کۆتایەکەیدا ئەبو نائیلە و موحەمەدی کوڕی مەسلەمە و سێ کەسەکەی تر لە سەحابەکان پێکرا دەچنە لای کەعبی کوڕی ئەشرەف و داوای خورمای لێدەکەن بە سەلەم و قەرز بیانداتێ، ئەویش دەڵێ لە بەرامبەردا چی لە ڕەهن دادەنێن؟ دەڵێن تۆ بڵێ ئەی کەعب بۆ ئەوەی دڵنیابێ و هیچ گومان دروست نەکا، گوتی ئافرەتەکانتان کەعبیش پیاوێکی باڵا بەرزی بەرچاو بوە بۆ ئەوکات گوتیان تۆ شاعیری و بەرچاوی ئافرەت نابێ

لەلات دابنێین چونکە لە سەردەمی جەهالەت وابوو هەندێکجار ئافرەتیان لە ڕەهن دادەنا لە پێناو بە دەستهێنانی شتە مادیەکان (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەوە ڕێزی هێز و بیروبۆچونە نەفامیەکان بوو ئێستاش لەگەڵدابێ لە هەندێک شوێن هەیە بەرامبەر بە ئافرەتان موسڵمانان و ئیسلام ئەوانی ڕزگار کرد و ڕێزی لە ئافرەتان نا، ئێ گوتی باشە منداڵەکانتان موحەمەدی کوڕی مەسلەمەش گوتی ناکرێ دوایەکە دەڵێن ئێوە لەبەرامبەر ئا ئەوەندە خورما باوکتان ئێوەی کردبوە ڕەهن پێوەی دەشکێنەوە لە داهاتودا ئەی کەعب، ئێ گوتی باشە چی دادەنێن بە ڕەهن فەرموو من ئامادەم؟ موحەمەدی کوڕی مەسلەمە گوتی چاکەکانمان چەکیش ئەو کاتە بەنرخ بوو بە ڕەهن دادەنرا بەڵام موحەمەدی کوڕی مەسلەمە مەبەستێکی تری هەبوو ئەبو نائیلەش مەبەستێکی تری هەبوو مەبەستیان ئەوەبوو ڕۆژێک بتوانن بە چەکەوە بچنە لای بڵێن ئەوە چەکەکانمان بۆ هێنای هەتا بتوانن بە ئاسانی بیکوژن چونکە پاسەوانی زۆری هەبوو لەبەر دەرگا و لە دەورەی قەڵاکەی، گوتی من ڕازیم ڕۆژێک لە ڕۆژەکان وەرن چەکەکانتان بێنن و خورماکەتان ببەن، هەرکە هاتنەوە مەفرەزەکەی پێغەمبەر (ﷺ) هەر پێنج کەسەکە هەواڵەکەیان بۆ پێغەمبەر هێنایەوە (ﷺ)، پێغەمبەری پێشەوا زۆر دڵخۆش بوو شەوی چواردەی (ربیع الأول) لە ساڵی سێیەمی کۆچی ئەوە بۆچونی پەسەند و ڕاجیحە لە نوێژی عیشادا مەفرەزەکە هاتن نوێژیان لە دوای پێغەمبەر کرد (ﷺ) ئینجا گوتیان پێغەمبەری پێشەوا بڕیارمان داوە و وا دەچین بۆ کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف ئەو دوژمنەی ئیسلام و تۆ لە کۆڵت دەکەینەوە، پێغەمبەر زۆر دڵی خۆشبوو (ﷺ) لە دوای نوێژەکە لەگەڵیان ڕۆشت هەتا لای دەرگای مزگەوت دوایە فەرموی هەتا ئێرە بەس نیە سوێند بە الله لەگەڵتان دێم هەتا بەقیع لە بەقیعەوە دەستی لەپشت دان فەرموی شێرە کوڕەکانی ئیسلام پاڵەوانەکانی ئیسلام دۆعای خەیرتان بۆ دەکەم ئومێد دەکەم بە سەری کەعبەوە بۆم بێنەوە و کەعبتان کوشتبێ ئەمشەو نەمابێ لەسەر ڕوی زەوی، ئەو مەفرەزە یەکجار تەڕجیح بوو بە قسەکانی

پێغەمبەر (ﷺ)، هەر پێنجیان چەکیان لەخۆیان بەست و ڕۆیشتن بەرەو قەڵاکەی کەعبی کوڕی ئەشرەف لە مێژودا دەڵێ کەعبی کوڕی ئەشرەفیش ژنێکی نوێی هێنابوو بۆنی خۆی زۆر خۆشکردبوو لەگەڵ ئەو خێزانە نوێیەی کە تازە بوک بوو خۆی ئامادە کردبوو لە کۆشکی خۆی لە قەڵاکەی خۆی ڕابواردنی دەکرد و ژیانی بەسەر دەبرد خۆی زۆر بۆن خۆش کردبوو، بەڵام کاتێک لە دەرگاکە ئەبو نائیلە هاتە قسەکردن گوتی دەرگامان لێبکەنەوە هاتوین بۆلای کەعب، گوتیان شەوە و بۆچی هاتون بۆلای کەعب؟ گوتیان ئێمە کارمان لەگەڵی هەیە و ئەبو نائیلە دەنگی خۆی بەرز کردەوە گوتی کەعبی کوڕی ئەشرەفی برام تۆ برامی لە شیری ئێمە لەسەر بەڵێنەکەمان هاتوین و چەکیشمان پێیە، کەعبیش کە دەنگەکەی گوێ لێبوو ئەوەندە حاقید بوو بەرامبەر بە پێغەمبەر و ئیسلام (ﷺ) گوتیە بوکەکە دەستی لێبەردا و گوتی دەچم بەدوای دەنگی ئەبو نائیلەی برام، بوکەکە پێیگوت ئەو دەنگە ئەوەندەی من شارەزابم خوێنی لێ دەتکێتەوە دە مەچۆ کەعب من وا دەزانم بەڵایەکت بەسەردێ، گوتی نەخێر گوێ ناگرم لەو قسانە من دەزانم بۆچی دەچم دەمەوێ خەڵکەکە لە دەوروبەری موحەمەد لابدەم (ﷺ) وە لێی بکەمەوە، کەعبی کوڕی ئەشرەف هاتە خوارەوە لە قەسرەکەی و بوکی بەجێهێشت خۆی بۆنخۆشتر کرد و جلوبەرگەکانی لەبەر کرد، ئینجا کە ئەبو نائیلە و موحەمەدی کوڕی مەسلەمە و سێ سەحابەکەی تر بۆلای چون، ئەبو نائیلە پێی گوت و زۆر زۆرزان بوو ئەو سەحابە بەرز و بەڕێزە گوتی بۆ نایەی مانگ لە چواردەیە و شەوێکی خۆشە ئەی کەعبی برام لەمێژیشە یەکترمان نەبینیوە ئەوە چەکەکانیشمان هێناوە بە ڕەهن لەلات دایبنێین و تا خورماکەمان ببەین بەڵام بۆچی لە قەڵاکە نایەیتە دەرەوە بچینە شوێنێک کە ناوی (شرط العجوز) بوو کە شوێنێک بوو باخ و باخاتی لێبوو زۆر دور نەبوو لە قەڵاکە وە شوێنێکی زۆر دڵگر بوو، گوتی لەوێوە دادەنیشین و نێوانمان دەبڕێنینەوە و چەکەکانت پێدەدەین و لە پاشان تۆش خورماکەمان بۆ ئامادە بکە بەیانی دێین دەیبەین، کەعب گوتی زۆر ڕازیمە و من لە ئێوە ئەمینم، دەستی

لەناو دەستی ئەبو نائیلەی ناو وە دەستێکیشی لەناو دەستی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە ناو ڕۆیشتن بەرەو ئەو شوێنە، لەوێوە ئەبو نائیلە گوتی پیاسە بکەین خۆشە مانگەشەوە پێویست نیە دابنیشین کەعبی کوڕی ئەشرەف پیاسەیان کرد چەند جارێک بەهێواش و هێمنی لە پشتەوە ئەبو نائیلە دەستی بردە بن پرچی کەعبی کوڕی ئەشرەف کەوا پرچی درێژ بوو بۆنێکی زۆر خۆشی لێدەهات گوڵاو و عەتری لێدابوو بەڵام نەیزانی بوو ئەوە کۆتا جارێتی گوڵاو و عەتر لەخۆی بدات کەعبی کوڕی ئەشرەف، دەستی بردە بن پرچی و هێنایە دەرەوە گوتی کەعب ئەو بۆنە خۆشە چیە لە سەرت دێ؟ بۆنێکت لە خۆت داوە قەت بۆنی وام نەکردوە، کەعبیش ئەوەندەی تر غروریەت گرتی گوتی ئەو بۆنانەی بۆ من دێ و لەخۆمی دەدەم کەس نیەتی لەسەر ڕوی زەوی، جارێکی تریش دەستی تێنایەوە و دەستی خۆی بۆنکرد ئەبو نائیلە، بۆجاری سێیەم کە ڕۆیشتن دەستی لەبن پرچی کەعب نا گوتی حەزدەکەم سەرت نزمکەیتەوە تەواو بۆنەکەی هەڵمژم و بۆنی بکەم، کەعب تۆزێک سەری خۆی نزمکرد لەپشتەوە بنی پرچی گرت زۆر بە توندی سەری هێنایە خوارەوە هاوەڵە بەڕێزەکانی تریش شمشێریان هەڵکێشا ئا ئەوە جفرە بوو لە نێوانیاندا و هەڵیانکوتایە سەر کەعبی کوڕی ئەشرەف بە شمشێر چەندین برینیان تێکرد و لەو ساکە گۆڕەی کەوت، بەڵام کەسێکی خورت بوو کەسێک بوو ئەویش شەڕ و شتی وای بینیبوو شمشێرەکەی هەوڵدا لە دەست بستێنێ لە یەک لە سەحابەکانیدا بەناوی ئەبو عەبس کاتێ کەوا برینداری کرد هەوڵی ئەوەیدا ڕابکا دەنگێکی لێوەهات کەعب، موحەمەدی کوڕی مەسلەمە دەڵێ یەک بە دەنگی لە هاواریدا و هاواری کرد ئەو باخ و باخاتە هەژاوە لەولاشەوە ژنەکەی هاواری کرد وەڵامی دەنگی کەعبی دایەوە، ئەوەبوو دەڵێ ئاگرەکان و ڕوناکیەکان هەمویان هەڵکران لە قەڵاکان وە لەناو ماڵ و ئاوەدانیەکانی جولەکەکان، موحەمەدی کوڕی مەسلەمە دەڵێ هێشتا کەعب تەواو نەبوو بوو خوێنی لەبەر دەڕۆیشت دەڵێ لەبەر ئەوەی بەڵێنەکە بۆ پێغەمبەر بێنمەجێ (ﷺ) من ئامیر مەفرەزەکەم موهیمەکەی بە تەواوی بکەم

دەڵێ نەمزانی چیبکەم بەڵام ئاسنێکی نوک تیژم پێبوو میغوەڵێکم پێبوو لە پشتی شمشێرە کەمەوە دەرم هێنا لەسەر ناوکیم دانا بەهێز بردمە ژورەوە هەتاوەکو سەر زەکەری هەڵم زڕاند ئینجا خوێنی تەواو لێ ڕۆیی و دەنگێکی ئەوتۆی نەما کەعب، لە ڕیواتی ابن سەعدیش دەگێڕێتەوە دەفەرموێ بەڵکو موحەمەدی کوڕی مەسلەمە لەپاش ئەو برینە گەورە لە کەعبی کرد سەریشی بڕی و سەرەکەی لەگەڵ خۆی هێنا.

ئینجا جولەکەکان کۆبونەوە و ئەوە چی قەوماوە و چی بوە؟ ئەو مەفرەزە هەمویان ڕۆیشتنەوە بەرەو مەدینە چونکە قەڵاکانی جولەکەکان و نیشتەجێ بونیان ماوەیەک لە مەدینە دوربون وەکو کۆمەڵگایەکان ئێستا چەند کیلۆمەترێک کە لە شاری هەولێر دورن، ئینجا لە ڕێگادا موسڵمانەکە کەوا بریندار بوو بوو ڕویکردە مەفرەکە فەرموی (ئەوانە ئاوا ئیثاریان هەبوو ئاوا گیانی خۆیان لەپێناو الله بەخت دەکرد) ڕوی تێکردن و فەرموی لەبەر برینەکانی من من ناتوانم وەکو ئێوە بڕۆم با ئێوە لەسەر من هیچ بەڵایەکتان بەسەر نەیە تخوا با ئەو هەواڵە خۆشە بگاتە پێغەمبەر (ﷺ) بە زوترین کات با ئەمنیش ببمە قوربانی لێرە بەجێم بێڵن با جولەکەکان بمگرن بەڵام موسڵمانەکانی تر بەتایبەت ئامیر مەفرەزەی موسڵمانان موحەمەدی کوڕی مەسلەمە دەزانێ ئەوە ئەمانەنەتە لە ئەستۆی ئەودا و بەجێی ناهێڵێ و دەفەرموێ براکەم وەڵاهی یان هەمومان دەکوژرێین یان تۆش لەسەر ملمان بار دەکەین و دەتبەینەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ژێر کەوشی دەگرن و لەپشتی خۆیانی دەکەن و هێواش هێواش دەڕۆنەوە بەرەو شاری مەدینەی پێغەمبەر (ﷺ)، کاتێک دەگەنە بەقیع لەوێدا موحەمەدی کوڕی مەسلەمە تەکبیر لێدەدا هەمویان بە یەک دەنگ مەفرەزەکە دەفەرمون (الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر) پێغەمبەر لە شەو و نوێژدا دەبێ (ﷺ) هەرکە دەنگیان دەبیستێ لە وەڵامدا لە ماڵی خۆی پێغەمبەریش دەفەرموێ (الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر)، هەر پێنج کەسەکە لەسەر ڕیوایەتی ئیبنو سەعد سەری کەعبیشیان پێیە

هاتن بەرەو دەرگای ماڵی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر دەرگای لێکردنەوە و ڕوی تێکردن پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «أفلحت الوجوه» خوایە ئەو دەموچاوانە گەش بکەیتەوە و سەرفرازیانکەی لە دونیا و قیامەت کە ئەمری پێغەمبەری اللەیان جێبەجێ کرد (ﷺ)، ئەوانیش بە یەک دەنگەوە ڕویان کردە پێغەمبەر گوتیان «وَجْهُكَ مفلح يَا رَسُولَ اللَّهِ» دەموچاوی تۆ سەرفرازە و سەرکەوتوە ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)، جا پێغەمبەر فەرموی ئەی ئەوە ئەبو عەبس چی لێهاتوە؟ گوتیان شمشێری پێ کەوتوە و خوێنی لێ دەتکێتەوە و نەزیف بوە، فەرموی بۆ ئێرەی بێنن لێمی نزیک بکەنەوە، کات ئەو کاتەیە کە دۆعا قبوڵ دەبێ کێش دۆعا دەکا؟ محمد المصطفى (ﷺ)، هەرکە برینەکە دەهێننە بەر دەستی هەندێک لە تفی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر برینەکەی دادەنێ پەنجەی پێوە دەنێ دەفەرموێ خوای رب العالمين خوێنی ئەو هاوەڵەم ڕابگری، دەست بەجێ خوێنەکە ڕادەوەستێ و وەڵاهی ئەبو عەبس دەفەرموێ هەتاوەکو وەفاتی کردوە دەفەرموێ هیچ جاری تر شوێنی ئەو برینەم نەئێشا و زۆر بە زوترین کات برینەکەشم قەپات بوو، پێغەمبەر دۆعای بۆکرد (ﷺ)، ئا ئەوانە مەفرەزەکانی پێغەمبەر بون (ﷺ).

جا لەنێو جولەکەکان دەنگوباس بڵاو بویەوە گوتیان ئەوە هاوەڵانی موحەمەد ئەوەی کوشتوە، ئەوەبوو خەڵکێکیان پێکهێنا نوێنەرایەتی جولەکەکان بکا و هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای چەند ڕۆژێک بەڵام پێغەمبەر کە نوێژی بەیانی بوو لەو ڕۆژە هاتە مزگەوت مژدەی بە موسڵمانەکاندا فەرموی کەعبی کوڕی ئەشرەف ڕۆیشت و تازە نەما سەریان بۆ من هێنا یان لەو ڕیوایەتانەی تر فەرموی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە و فڵان و فڵان لە سەحابەکان کوشتیان، کە جولەکەکان لە دوای چەند ڕۆژ هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتیان هاوەڵەکانی تۆ کەعبی کوڕی ئەشرەفی ئێمەیان کوشتوە ئەوە غەدر و خیانەتە ئەی موحەمەد لە بەڵێنەکان، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) با وەڵامیان بدەمەوە، گوتیان کەعب

کەسێکی باش بوو هیچ خیانەتی لەگەڵ تۆ نەکردبوو ئەی موحەمەد (ﷺ)، پێغەمبەر فەرموی بەڵکو خیانەتکار بوو من ئاگام لە هەموو خیانەتەکانیانە بەڵکو جوێن فرۆش بوو بەرامبەر بە موسڵمانان و پێغەمبەری الله (ﷺ) بەڵکو چوو قورەیشیەکانی لە ئێمە هاندا ئینجا پێی فەرمون پێغەمبەر (ﷺ) جولەکەکان چاک چاک بزانن ئەوەی ڕێی کەعب هەڵبژێرێ لە خیانەت و جوێن فرۆشتن سوێند بە الله مەسیر و دەرئەنجامی کەعب چاوەڕوانی دەکا زۆر بە تورەییەوە ئەوەی پێگوتن، جولەکەکان لەجێی خۆیان دەڵێ لەرزین و هیچ قسەیەکیان بۆ نەماوە و گەڕانەوە و ترسیان لێ نیشت زانیان ئەوە بە فەرمانی پێغەمبەر بوە (ﷺ).

ڕوداوێکی بچوکی پاڵەوانی ئامیر مەفرەزەکە موحەمەدی کوڕی مەسلەمە:

ئەو پیاوە ژییا لە ئەوسیەکان بوو وە باقی ئەندامەکانی تری موفرەزەکەشی لە ئەوسیەکان بوو هەتا سەردەمی مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان لە ژیاندا بوو بە تەمەندا چوبوو بەڵام ئەو کاتەی کە مەعاویە مەڕوانی کوڕی حەکەمی کردە والی لەسەر مەدینە ڕۆژێک لە ڕۆژەکان موحەمەدی کوڕی مەسلەمە دەچێتە کۆڕ و مەجلیسەکەی مەڕوانی کوڕی حەکەم دەبینێ بونیامینی جولەکەی بەنو نەزیریەکان کە یەکێک بوە لە جولەکەکان وا لە کۆڕ و مەجلیسەکەی مەڕوانی کوڕی حەکەمە، جا مەڕوانی کوڕی حەکەم ڕوو دەکاتە موحەمەدی کوڕی مەسلەمە دەڵێ ئەوە کەعبی کوڕی ئەشرەف چۆن کوژرا تۆ ئامیر مەفرەزەکە بوی چۆنتان کوشت ئەی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە؟ جا جولەکەکە لەوێ غیرەی جولەکایەتی هەڵدەستێ دەمارگیرایەتی هەڵدەستێ و ڕودەکاتە مەڕوانی کوڕی حەکەم پێش ئەوەی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە جواب داتەوە دەڵێ بە غەدر و خیانەت کەعبی کوڕی ئەشرەف کوژرا، یەکسەر لەوێ موحەمەدی کوڕی مەسلەمە ئیمانی دەجوڵێ بەرز دەبێتەوە ڕودەکاتە مەڕوانی کوڕی حەکەم دەڵێ ئەوەی کوشتی من بوم لەگەڵ

هاوەڵەکانم بە فەرمانی پێغەمبەر کوژرا (ﷺ)، ئایە پێغەمبەر دەکرێ بە غەدر و خیانەت لە کۆڕ و مەجلیسەکەت مەڕوانی کوڕی حەکەم ناو ببردرێ؟ لە پاشان ڕودەکاتە جولەکەکە و دەڵێ سوێندبێ بە الله سوێند دەخۆم ئەو یەمینە لەسەرمبێ لە هەر شوێنێک لە کۆڵانەکانی مەدینە و غەیری مەدینە بەو پیریەی خۆم ئەگەر شمشێرم بە دەست بوو بتگەمێ بنیامین دەبێ تۆڵەی پێغەمبەرت لێبکەمەوە ئەو سوکایەتیەت پێکرد لەو کۆڕ و مەجلیسە دەبێ بتکوژم، دەڵێ بنیامین حەجانی نەما لەبەر ئەوەی دەیزانی هاوەڵانی پێغەمبەر ڕاستگۆن (ﷺ) بەتایبەت لە بەرگریکردن لە پێغەمبەر (ﷺ) ئیمانیان بەرزە گیانیان بەخت دەکەن، دەڵێ بنیامین هەر جارێک بیویستبا بچێتە ناو شاری مەدینە کە لە نزیک شوێنەکاتی بەنو قورەیزە کاتی خۆی بنیامین لەوێ نیشتەجێبوو وە موحەمەدی کوڕی مەسلەمەش ماڵی لە نزیک مزگەوتەکەی پێغەمبەر بوو (ﷺ) لە مەدینە، دەڵێ هەرکاتێک بنیامین دەیویست بچێتە بازاڕ کەسێکی لەپێش خۆی دەنارد دەیگوت ڕێگاکەم بۆ کەشف کەن بزانن موحەمەدی کوڕی مەسلەمە لەسەر ڕێگایە یانە نا؟ لە بازاڕە یانە نا؟ بەخێرایی دەچوو شتەکانی خۆی جێبەجێ دەکرد و دەگەڕایەوە ماڵەوە ترسی وا لێ نیشتبوو، تەنها ڕۆژێکیان ئافرەتێکی سەحابیە وەفات دەکا موحەمەدی کوڕی مەسلەمەش بەدوای جەنازەکەیدا دەڕوا بۆسەر بەقیع کە ئافرەتەکە دەشارنەوە موحەمەدی کوڕی مەسلەمە ئاوڕ دەداتەوە بەلای ڕاستەی دەبینێ دوربەدوری و چەند هەنگاوێک لێی دورە بنیامینەکەی کە وەعدی پێدابوو شمشێری لە دەست بێ دەیکوژێ ئەوەی گوتی کەعبی کوڕی ئەشرەف بە غەدر و خیانەت کوژرا غەدر و خیانەتی پاڵداوە لای پێغەمبەر (ﷺ) وا لەوێ ڕاوەستاوە موحەمەدی کوڕی مەسلەمە ئیمانی فول بوو بەرز بوەوە وەعدەکەی خۆی و اللەی بەبیر هاتەوە ویستی سوێندەکەی نەشکێنێ شمشێری لەدەستدا نەبوو هاوەڵەکان دەڵێن بینیمان نەمانزانی موحەمەد چەند بەخێرایی ڕۆیشت بۆسەر گۆڕێک لە گۆڕەکان کەوا دارخورمای لێ چێنرابوو شەتڵ بون ئێستا حەیزەرانێک و دارخورمایەکی

دەرهێنا ڕای کرد بۆ بنیامین، بنیامین له شوێنی خۆی جوله‌کە ترسنۆکن لەرزۆکن ئیلا ئەگەر بەهێزبن زۆربن لەگەڵ یەکدابن و موسڵمانان یەکبێ ئەو کات خۆیان بە جورئەت دەکەن، دەڵێ لەرزی لەبەر دەستی و موحەمەدی کوڕی مەسلەمە بەسەری ڕاگەیشت بەو دارە لە تەوقی سەری دەدا له قاچی دەدا لە پشتی دەدا، دەڵێ هەتا سەحابەکان هەموو گەیشتنێ بۆ وای لێدەکەی؟ فەرموی تۆڵەی پێغەمبەری اللەی لێ دەستێنمەوە (ﷺ)، دەڵێ هەتا دارەکە هەموی لە دەستی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە پارچە پارچە بوو بەڵام هەموو لاشە و گیانی بنیامینیش ڕۆچوو لە خوێندا و خوێنی لەبەر دەڕۆیشت و لەهۆش خۆی چوو دەڵێ ئینجا چەند سەحابەیەک موحەمەدی کوڕی مەسلەمەیان گرت و لە باوەشی خۆمانمان ناو بردمانەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.

بەڵێ سەحابەکان ئاوا بەرگرییان لە الله و پێغەمبەری الله دەکرد (ﷺ) ئاوا ئەگەر کەسێک سوکایەتی کردبا بە پێغەمبەر تۆڵەی الله و پێغەمبەری اللەیان لێ دەستاندەوە ئەو سەحابە بەرز و بەڕێزە -رضي الله عنه- ئاوای ئەنجامدا و ئاوایکرد.

سەرچاوەکان کە ئەو سود و کەڵکانەی لێوەردەگیرێ لە سەحیحی بوخاری تۆمارە، وە لە پاشان کتابێکی سەردەمی یەکجار نایاب هەیە هی دکتۆر صلاح عبد الفتاح الخالدي کە لە (دار القلم دمشق) چاپکراوە (صور من جهاد الصحابة عمليات جهادية تنفذها مجموعات خاصة من الصحابة) کە ئەویش لەوێوە کورت و پوختی کردوەتەوە دەڵێ ئەو ڕوداوەی کەعبی کوڕی ئەشرەف و کوشتنەمەی لە کتێبی (المغازي) محمد بن عمر الواقدي و لە (السيرة النبوية) ابن هشام وەریگرتوە و لە (تاريخ الأمم والملوك) الطبري و لە (دلائل النبوة) للبيهقي و لە (البداية والنهاية) ابن كثير و لە (قادة النبي (ﷺ)) هی دانەری بەڕێز محمود شيت خطاب و لە (قصص من حياة الرسول (ﷺ) وأصحابه) محمد علي دولة.

یەکێکی تر لەوانەی کەوا سەری جولەکەکان بوو بەناوی ئەبو ڕافیع کە هەندێک لە زانایان دەفەرمون ناوی سەلامی کوڕی ئەبی حوقەیق بوە کە لە سەحیحی بوخاریش باسەکە بەکورتی و پوختی هاتوە، وە هەندێکیش دەڵێن ناوی عەبدوڵای کوڕی ئەبی حوقەیق، بوە جا ئەو پیاوە بازرگانێکی گەورە بوو وە سەرکردەیەکی سیاسی بوو وە سەرۆکی جولەکەکانی خەیبەر بوو وە خاوەنی قەڵایەکی بەهێزی حاسێ بوو، ئەو کەسە بوو کەوا لە دژایەتی پێغەمبەر (ﷺ) شان بە شانی کەعبی کوڕی ئەشرەف و وە شان بەشانی حویەی کوڕی ئەخطەب کە لەڕابردوش ئاماژەمان پێدا پیلانگێڕی دەکرد لە پێغەمبەر (ﷺ)، بەتایبەتی لەو کاتەی بەنو قەینوقاع و بەنو نەزیر کە پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە لەسەر خیانەتەکانیان وە دەریێی نان و چون لە خەیبەر خۆیان گرتەوە و ئەو پشتی بەوان ئەستورتر بوو وە زیاتر کەوتە پیلانگێڕی لە دژی پێغەمبەر (ﷺ)، جا لە شاری مەدینەش ئەوش و خەزرەج هەبون ئەوسیەکانیش موسڵمانی زۆر چاک بون خەزرەجەکانیش موسڵمانی زۆر چاک بون، بە هەردوکیان ئەنساریەکانیان پێک هێنابوو کە لە مەدینە دەژیان لە کاری چاک و خێر مونافەسە و بەربەرەکانێی یەکتریان دەکرد ئا ئەوەشیان شتێکی شەرعیە ئەوسیەکان ئەگەر خێرێکی چاکیان ئەنجامدابا پاڵەوانێتیەکیان بۆ ئیسلام تۆمار کردبا خەزرەجیەکان دەیانگوت با ئێمەش بەپێش برایەکانی ئەوسیەکانمان بکەوینەوە خێرێکی لەوان چاکتر بکەین پاڵەوانێتیەکی گەورەتر بۆ ئیسلام و بۆ پێغەمبەر نیشان بدەین (ﷺ)، ئەوەبوو لە ڕابردودا باسمانکرد ئەوسیەکان بون بە سەرپەرشتی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە و ئەبو نائیلە و سێ سەحابەکەی تر هەر پێنجیان ئەوسی بون کاتێ کەوا چون بۆ کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف و لە خوێن گەوزاندیان و تۆڵەی الله و پێغەمبەریان لێکردەوە (ﷺ)، ئەمجارە خەزرەجیەکان هەر بیریان دەکردەوە گەنجە خەزرەجیەکان چی بکەن بۆ ئیسلام باشە وەکو ئەوەی ئەوان کردیان، دەڵێ عەبدوڵای کوڕی عەتیك ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزە بیری دەکردەوە ڕۆژێک

هاتە خەیاڵی گوتی خۆ من بیستومە ئەبو ڕافیعی سەلامی کوڕی ئەبی حوقەیق زۆر دژایەتی پێغەمبەر دەکا (ﷺ) با منیش بیر لەوە بکەمەوە ڕێگایەک دابنێم هەندێک لە خەزرەجیەکانی تر ئامادە بکەم پێیان بڵێم بەڵکو بچین بیکوژین ئەگەر پێغەمبەر ڕازیبێ (ﷺ) بەو پاڵەوانێتیە لە الله نزیک دەبینەوە زیاتر -جل شئنە-. دەڵێ ئەویش چوو هەندێک لە سەحابەکانی تری بانگکرد لە خەزرەجیەکان لەوانە عەبدوڵای کوڕی ئونەیس و مەسعودی کوڕی سینان و حاریثی کوڕی ڕەبعی و ئەسوەدی کوڕی خوزاعی بونە پێنج کەس، عەبدوڵای کوڕی عەتیك بۆچونەکەی خۆی پێیان گوت هەمویان ڕازیبون، عەبدوڵای کوڕی عەتیك چوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گوتی ئێمە ئەوەندە کەسەمان بیرمان کردوەتەوە ئەگەر مۆڵەتمان بدەی بچین ئەبو ڕافیع لە کۆڵت کەینەوە و لە کۆڵ موسڵمانان کەینەوە و بیکوژین، پێغەمبەریش (ﷺ) دڵی خۆشبوو بەو پاڵەوانیەتیە و ئازایەتیەی گەنجەکانی موسڵمانان فەرموی وەرە ئەی عەبدوڵای کوڕی عەتیك پێم بڵێ چۆن دەتوانن بچن بیکوژن لە قەڵایەکی وا حاسێدایە و دورە لە شاری مەدینە لە خەیبەر دادەنیشێ؟ گوتی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) تۆ ئێمە ناناسی ئێمە پاڵەوانین لە پێناو خوای رب العالمین یان دەچین دەکوژرێین و شەهیدین یان دەیکوژین و ئەوکات موژدەکەت بۆ دەهێنینەوە ئەگەر دڵت لەسەربێ و ڕەوانەمان بکەی و ڕێگامان پێنەگری، پێغەمبەریش فەرموی (ﷺ) فەرمون خۆتان ئامادەکەن و لە ڕۆژی ڕۆیشتنتان ئاگادارم کەنەوە وەرنە لام لەگەڵتان کۆدەبمەوە و ئینجا بەڕێتان دەکەم، عەبدوڵای کوڕی عەتیك دەڵێ پێم وابوو ئەو ڕۆژە تازە لە دایکی خۆم بە وەلد بومە ئەوەندە دڵم خۆشبوو پێم وابوو جەژنە، دەڵێ سەحابەکان وا پاڵەوان بون کاتێک کارێکی گرنگیان پێ دەسپێردرا خاوەن ئیمان بون اللەیان تەواو ناسیبوو دەیانزانی بەهەشت حەقیقەتە و ڕاستە فەرمانەکانی پێغەمبەریان سەد لە سەد (ﷺ) جێبەجێ دەکرد دەڵێ، هەواڵەکەم خێرا خێرا گەیاندە چوار هاوەڵەکەی ترم لە خەزرەجیەکان دەڵێ ئەوکاتە ئەوانیش ڕازیبون و ڕۆژێکیان دانا کە لە نیوەی مانگی

(ذو الحجة)ی ساڵی پێنجەمی کۆچی بوو، دەڵێ چوینە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گوتم پێغەمبەری الله ئێمە لە ئامادە باشیداین فەرمان بکە و چەکمان لە خۆمان بەستوە و وا دەڕۆین، پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵیان هاتە دەرەوە و ئامۆژگاریکردن فەرموی تەقوای اللەتان هەبێ لە الله بترسن دڵم پێتان خۆشە بە پشتیوانی خوای رب العالمین دۆعای خەیرتان بۆ دەکەم بەڕێکەون، مەفرەزەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بە گەورایەتی و سەرپەرشتی عەبدوڵای کوڕی عەتیك بەڕێکەوتن، پێغەمبەریش فەرموی (ﷺ) بە عەبدوڵای کوڕی عەتیك ئامیر مەفرەزەکەتان بێ ئەمرەکان لە ئەو وەربگرن، پیاوێکی لێزانی ئازا بوو وە لەبەر دوو هۆ مێژوو نوسەکان دەفەرمون عەبدوڵای کوڕی عەتیك کرایە ئامیر مەفرەزەکە:

یەکەمیان لەبەر ئەوەی عەبدوڵای کوڕی عەتیك لە شاری مەدینە شیری ئافرەتێکی جولەکەی خواردبوو ئەو ئافرەتە جولەکە کە دایکی شیری عەبدوڵای کوڕی عەتیك بوو لەو کاتەدا لە خەیبەر دەژیا بۆ ئەوەی لە ڕێگای دایکە شیریەکەی بگاتە ناو قەڵای خەیبەر. دوەمیان عەبدوڵای کوڕی عەتیك وەکو جولەکەکان بە عیبری قسەیان دەکرد ئەویش وەکو ئەوان بە ئاسانی هەر وایان دەزانی جولەکەیە کاتێک بە عیبری قسەی دەکرد و لە عیبری تێدەگەیشت.

لەبەر ئەو دوو هۆکارە بوو وە زۆریش ئازابوو پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) با ئەوە ئامیر مەفرەزەکەبێ و سەرپەرشتیارتان بێ و وەلی ئەمرتان بێ.

مەفرەزەکە بەڕێکەوتن گەیشتنە نزیک خەیبەر لە نزیک خەیبەرەوە لەبەر ئەوەی خەیبەر قەڵایەکی پۆڵاین بوو شورەیەکی گەورەشی بە دەورەدا کرابوو وە چەندین قەڵا و قەسری حەسینی مەنیعی وە حاسێی تێدابوو وە سەرپەرشتیارانی سەر قەڵاکە و پاسەوانەکان هەردەم هۆشیار بون لەبەر ئەوەی کەعبی کوڕی ئەشرەف کوژرابوو لە ڕابردوو وە حویەی کوڕی ئەخطەبیش کوژرابوو لەبەر ئەوە بە ئاسانی نەیانتوانی کاتەکە ڕوناک بوو ڕۆژ

بوو بچنە ناو قەڵای خەیبەر، لە نزیک قەڵای خەیبەر باریان خست و ئەو پێنج کەسە کۆبونەوە، گوتیان چیبکەین باشە؟ عەبدوڵای کوڕی عەتیك گوتی من هەواڵێک دەنێرم بۆ دایکە شیریەکەم منی ئەوەندە خۆشدەوێ بە دڵنیاییی لە دوای هەواڵەکەم دێ، هەواڵێکی بۆ ڕەوانەکرد و دایکە شیریەکەی کە زانی عەبدوڵای کوڕی عەتیکە و وا دێ لێی میوان دەبێ کوڕە شیریەکەی خۆیەتی ماوەیەکە نەیبینیوە بە هەندێک قەسپەوە هاتە پێشوازی و بینی چوار کەسی تریشی لەگەڵدایە، عەبدوڵای کوڕی عەتیك دڵنیابوو لە دایکی کەوا ڕاستگۆیە لەگەڵی دایکە شیریەکەی وە دەشیزانی دایکە شیریەکەی لەو جولەکانەیە کە زۆر ڕقی لە ئەبو ڕافیعی سەرپەرشتیاری قەڵای خەیبەرە لەبەر ئەوە کەیفی پێ نایە و حەزی لێیە لەناو بچێ، جا لەبەر ئەوە هەواڵەکەی ڕاستەوڕاست پێگوت، گوتی ئەی دایەی شیریم من هاتوم لەگەڵ ئەو چوار کەسانە ئەبو ڕافیعتان لەکۆڵ کەمەوە لەکۆڵ ئەو جولەکانەیش کە ڕقیان لێی دەبێتەوە، ئەویش دڵی زۆر خۆشبوو گوتی کوڕی شیرینم ڕاستە وا دەڵێی بەڵام ئاسان نیە ئەبو ڕافیع ئەو هەموو پاسەوانەی هەیە وەڵاهی دڵم پێت دەسوتێ و پێم ناخۆشە کوڕە شیریەکەم بکوژرێ هیچیشی پێ نەکرێ لەلایەکیش پێم خۆشە ئەبو ڕافیع بکوژرێ نازانم چیت پێ بڵێم، ئەویش گوتی دایە من یەک داوام لە تۆ هەیە داواکەم ئەوەیە نەگەڕێیەوە ئێستا هەتا بەرەو تاریکایی مەغریب و شەو دەچێ ئەوکات تۆ ئافرەتێکی جولەکەی من عیبریش دەزانم پێکەوە ئەو نەفەرانەش لەگەڵ خۆمان بە عیبری قسە دەکەین لەگەڵ پاسەوانەکان وا تێبگەن هەمومان جولەکەین و بێینە ناو قەڵاکە خەمی کوڕی خۆت نەبێ ئەوکاتە من دەزانم چۆن شمشێر دەوەشێنم لە عەبدوڵا یان لە سەلامی کوڕی ئەبی حوقەیق ئەبو ڕافیع، دەڵێ گوتی باشە ڕۆڵەی شیریم، کاتێ بەرەو مەغریب داهات و تاریکایی هاتە سەر زەوی ئەو ئافرەتە جولەکە بەپێشیان کەوت و پێنج کەسەکەی تر لە دوای ڕۆیشتن لە دەرگای پاسەوانەکە گوتیە ئافرەتە جولەکەکە بەرەو کوێ؟ گوتی من خەڵکی ئێرەم دەچمەوە ماڵی خۆم ئەوانەش میوانی منن، جا یەکسەر

عەبدوڵای کوڕی عەتیکیش بە عیبریەوە هاتە گفتوگۆ و قسەکردن پاسەوانەکە دڵی داکەوت گوتی دیارە هەمویان جولەکەن و فەرمون بڕۆنە ژورەوە و ئینجا دەرگاکەی داخست، هەرکە چوە ژورەوە چەند ڕۆژ و ماوەیەک مانەوە لە ماڵی ئەو ئافرەتە دایکی شیری عەبدوڵای کوڕی عەتیك لەوێوە ڕۆژانە چاودێرییەکی چڕ و پڕی سەر ئەبو ڕافیعیان دەکرد چۆن هەڵدەستێ و چۆن دادەنیشێ و پاسەوانەکانی چیدەکەن و لە شەودا چۆن دەخەوێ هەتا مەعلوماتی تەواوی بەدەستهێنا عەبدوڵای کوڕی عەتیك ئامیر مەفرەزەکە، ئینجا ڕۆژێکیان گوتی وەرن کۆببنەوە ئەمشەو ناوی اللەی لێدەهێنین و دەچین بە پشتیوانی خوای رب العالمین عەبدوڵا یان سەلامی کوڕی ئەبی حوقەیق دەکوژین، دەڵێ یەکسەر کەوای پێگوتن دڵیان خۆشبوو کاتێ نزیک کاتی نوێژی مەغریب بوو کەوا تاریکایی بکەوێتە سەر زەوی ئینجا لەوکاتەوە هەر پێنجیان ڕۆیشتن بەرەو قەڵا و قەسرەکەی سەلامی کوڕی ئەبی حوقەیق، دەڵێ لە نزیک قەسرەکەی تەماشای کرد عەبدوڵای کوڕی عەتیك فەرمانی پێدان فەرموی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس با لەگەڵ من بێتە ژورەوە و ئێمە هەردوکمان دەچین دەیکوژین ئێوە سیانەکەی تر ئەی سەحابەکان بڕۆن لە دەرەوەی قەڵاکە هەتا دەرگای قەڵا پێوە نەدراوە چاوەڕوانمانبن لەلای فڵان کانی و ئاو، بەڵکو ئێمە ئەگەر هاتین و هەڵاتین و قوتارمان بوو ئێوە دوربەدوری تیر هاوێژی بکەن لەوانە ئەگەر بە شوێنمان کەوتبون و هەتا قوتارمان ببێ، گوتیان باشە.

ئینجا گوتیە عەبدوڵای کوڕی ئونەیسیش گوتی با سەرنج بدەین بزانین ڕێیەک نادۆزینەوە بچینە ناو قەسرەکە و پاسەوانەکان هیچمان لەگەڵ نەڵێن بە عیبری ئەگەر قسەی لەگەڵ بکەم، بینی کۆمەڵێک لە پیاوانی قەڵاکە پیاوانی ئەبو ڕافیع هاتنە دەرەوە و دەگەڕان بە عیبری ئەو گوێی لێبوو و لێیان تێگەیشت گوتیان گوێدرێژ و کەری ئەبو ڕافیع بزربوە بەدوایدا دەگەڕێین و دەبینینەوە، عەبدوڵای کوڕی عەتیك گوتی عەبدوڵای کوڕی

ئونەیس فرسەتە و هەلە بۆمان هەڵکەوتوە بڕۆ خۆت وەگەڵ ئەو پیاوانە بخە و هیچ قسەیان لەگەڵ مەکە ئەوانە زۆرن لەگەڵ ئەوان بگەڕێ بەدوای گوێدرێژەکە کە ئەوان چونەوە ژورەوە خۆت لەگەڵ ئەوان ببە ژورەوە و وادەزانن تۆش هەر لە پیاوانی ئەبو ڕافیعی، گوتی زۆر باشە، گوتی ئینجا بچم لەوێ لەکوێ چاوەڕێ بکەم؟ گوتی لەکوێ ئەگەر کەرەکەیان دۆزیەوە بەستیانەوە لەو دەوروبەرە چاوەڕوانم بکە ئەگەرنا لە نزیک دەرگای قەسرەکەی ئەبو ڕافیع چاوەڕوانم بکە و من پێت دەگەم، دەڵێ کاتێک گوێدرێژەکەیان دۆزیەوە و هەمویان ڕێکەوتن و چونەوە ژورەوە عەبدوڵای کوڕی عەتیکیش دور بەدوری لەبەر چاوی پاسەوانەکان عاباکەی لە خۆی ئاڵاند و کردیە پەنا دانیشت بە چیچکان وای نیشاندا کەوا قەضای حاجەت دەکا و ئینجا لە دورەوە پاسەوانەکان پێیان گوت بە عیبریەوە تۆ ئەگەر جولەکەی و هی قەڵای ئێمە وا دەرگاکە دادەخەین دە خێراکە زوبە قەضای حاجەکەت بکە و وەرە ژورەوە هەتا دەرگاکەمان دانەخستوە، ئەویش بە عیبریەوە وەڵامی دانەوە چاوەڕوانم بن ئەوە هاتم.

نەخشە سازیەکەی عەبدوڵای کوڕی عەتیك لێزانی پاڵەوان سەریگرت، ئەویش چوە ژورەوە گوێدرێژەکەش دۆزرابویەوە و لەلای وڵاخ و گوێدرێژەکان عەبدوڵای کوڕی ئونەیس چاوەڕوانی عەبدوڵای کوڕی عەتیکی دەکرد لەوێ بەیەک گەیشتنەوە، گوتی وەرە با خۆمان بخافڵێنین و خەڵکێکی زۆر لێرەیە وادەزانن ئێمەش خەڵکی ناو قەڵای نزیک قەسرەکەین و پیاوی ئەبو ڕافیعین تۆ قسە نەکەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس هەر من بە عیبری قسەیان لەگەڵ دەکەم با سەریان لێ بشێوێ، گوتی باشە، لە چاوەڕوانیدابون پێشتریش ئەوەی زانیبوو کە هەموو شەوێ هەتا نیوەی شەو چەند پیاوێکی قەڵاکە لە جولەکەکان لە کۆشک و لە تابقی دوەمی سەربانەکەی قەسری ئەبو ڕافیعی لەگەڵ ئەبو ڕافیع دادەنیشتن و ئینجا لە دوای نیوە شەو هەموو پەرت دەبون و هیلاک دەبون و

دەخەوتن، ئینجا عەبدوڵای کوڕی عەتیك كە نیوە شەو داهات جوان جوانیش تەماشای کردبوو کلیلی دەرگاکان لە کوێدا هەڵدەواسن لەناو قەسرەکەی پاسەوانەکان، لەبەر ئەوەی ئەویش لەناو ژورەکەیدا بوو شوێنی کلیلەکانیشی پێ زانیبوو ئەو مەعلوماتانەی هەموو وەرگرتبوو، كە نیوە شەو داهات خەڵکەکە پەرتەیکرد و ئەبو ڕافیع چوو بخەوێ لە تابقی دوەمی ماڵەکەی، ئەویش چوو عەبدوڵای کوڕی عەتیك عیبری دەزانی گوتی ئەگەر بە قسە هاتن دەڵێم منیش یەکێکم لە پاسەوانەکان بە عیبری قسە دەکەم شەو تاریکە، کلیلێکی هێنا و دەرگاکەی کردەوە و لەپاش خۆی لەودیوەوە دەرگاکەی کلیلدا بۆ ئەوەی پاسەوانەکان نەتوانن لێی بێنە ژورەوە چەند دەرگایەک بوو ئاوا کردیەوە و کلیلی دایەوە لە دوای خۆی هەتا گەیشتە نزیک ژورەکەی ئەبو ڕافیع تێیدا خەوتبوو، عەبدوڵای کوڕی ئونەیسیشی لەگەڵدایە، ئەو دوو پاڵەوانە پڕ ئیمانە بە فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) دەیانەوێ دوژمنێکی الله و پێغەمبەر (ﷺ) لەو چرکە ساتەدا لەناو جێگایەکەی لە خوێنی وەردەن و گیانی وەبەر نەهێڵن اللەش یارمەتیان دەدات و شەو تاریکە، کاتێ کەوا چونە ژورەوە بینیان ئەبو ڕافیع زۆر هیلاکە و خەوێکی تەواوی لێکەوتوە و پشم و هوڕیەتی هی خەو و پێناچێ هەڵبستێ بە ئاسانی بەڵام ژنەکەی جوڵا، کاتێک عەبدوڵای کوڕی ئونەیس بینی ژنەکەی وا دەجوڵێ و هەستاوە بە خشپە خشپی ئەوان هەستێکی کردوە عەبدوڵای کوڕی ئونەیس هەڵیکێشا شمشێر و پشتە ملی ژنەکەی گرت بەڵام بەبیری هاتەوە كە پێغەمبەر فەرموبوی (ﷺ) هەتا بۆتان دەکرێ ئافرەتان مەکوژن منداڵان مەکوژن پیرە پەککەوتەکان مەکوژن ئەوە ئەخلاقی پێغەمبەر بوو (ﷺ) ئیلا ئەوەی موستەحیقی کوشتنە كە وازناهێنێ و دڵ ڕەقە دژی ئیسلام و موسڵمانانە الله ڕێگای پێداوم بیکوژین و لە خوێندا بیگەوزێنین، دەڵێ عەبدوڵای کوڕی ئونەیس دەڵێ هەرکە ئەوەم بەبیر هاتەوە شمشێرەکەم لەجێی خۆی داناوە و بەس پشتە ملم گرت لەبن گوێچکەی بە ئیشارەتیش پێمگوت دەنگت لێ نەیەتە دەرەوە، دەڵێ بردم لە شوێنێکی ژورەکەی من ڕاوەستام لەسەر سەری ئافرەتەکە بۆ ئەوەی

قسە نەکا ژورەکەش تەواو تاریکە، عەبدوڵای کوڕی عەتیکیش هەڵیکێشا شمشێرەکەی نەیزانی بزەبت لە کوێیە ئەبو ڕافیع بەڵام بە عیبڕانی قسەیەکی کرد و ئەبو ڕافیع هەر لەناو خەوەوە ئاگای تەواو لەخۆی نەبوو کە قسەیەک و دەنگێکی لێوەهات ڕایکردە سەری و بە شمشێر چەند شمشێرێکی لێدا، ئینجا هاوارێکی لێ هەستا، ئینجا دەنگە دەنگ پەیدا بوو پێدەچوو پاسەوانەکانیش بەخۆ هاتبنەوە و هەستابن، ئەبو ڕافیع هێشتا تەواو نەبوە بەڵام عەبدوڵای کوڕی عەتیك ئەوەندە لێزان و بەجورئەتە خۆی نەشێواند لەو ژورە تاریکە نازانێ بزەبت ئێستا عەبدوڵا لەکوێیە بە زمانی عیبریەوە لەپاش چەند دەقەیەک ئەبو ڕافیعی دواند بۆ ئەوەی ئەبو ڕافیع وا هەست بکا یەکێکە لە پاسەوانەکانی هاتوەتە هانای، بە عیبری پێیگوت ئەی ئەبو ڕافیع ئەوە چیبوە و چی قەوماوە و ئەو هاوارەت لەچیبوو؟ ئەبو ڕافیعیش بە دەنگ و گریانەوە پێیگوت وەڵا ئەوە لەناو خوێنیان سور کردوم نازانم کێیە، وا لەسەر جێگام ناتوانم هەڵبست، هەرکە گوێی لە دەنگی بوو عەبدوڵای کوڕی ئونەیسیش خۆی پێ ڕانەگیرا بۆ ئەوەی ئەو خێر و بێرەی پێ بگا بە دەستی ئەویش ئەبو ڕافیع بکوژرێ هەر بە دەستی عەبدوڵای کوڕی عەتیك نەبێ، ژنەکەی بەجێهێشت و ڕایکرد بەدوای دەنگەکەی، عەبدوڵای کوڕی ئونەیس دەڵێ شمشێرم لەلای کۆڵەکەی سینگی لەسەر مەعیدەکەی دانا و خۆم بەسەردا داو بردمە خوارەوە هەتا سەر زەکەریم هەڵزڕاند، ئینجا دەڵێ شمشێرەکەم دەرهێنایەوە و لە کالانمان دانایەوە و گوتم عەبدوڵای کوڕی عەتیك وابزانم تەواو با بڕۆین، دەڵێ دەنگە دەنگ بوو دەرگاکان داخرابون لەدواوە کلیلەکانی پێ دەزانی عەبدوڵای کوڕی عەتیك بە کلیل ئەو دەرگایانەی کردەوە کە دەنگە دەنگی زۆر لەدواوە نەدەهات یەک بە یەک دەرگاکانی کردەوە و ڕایکرد، جولەکەکان لە مشەوەشیدا و پاسەوانەکان کەسیان نەبینی هەموی هەر ڕاکردن بوو بۆ ژورەکەی ئەبو ڕافیع و ئینحا عەبدوڵای کوڕی ئونەیس بەخێراتر لەپێش عەبدوڵای کوڕی عەتیك لە قادرمەکان هاتە خوارەوە و ڕۆیشت بەرەو دەرەوە بەڵام عەبدوڵای کوڕی عەتیك لە کۆتا

قادرمەکان کە هەنگاوی هاوێشت وایزانی کۆتایە هێشتا قادرمەیەک مابوو تەقدیری الله وابوو پێی هەڵزەلی و ڕۆیی یەک لە قاچەکانی شکا، بەڵام پارچەیەک لە مەندیلەکەی خۆی کە لەسەری بوو لێی کردەوە و لە قاچی خۆی پێچا و قاچەکەی لە دوای خۆی ڕاکێشا و ئەویش گەیشتەوە سێ پاڵەوانەکەی تر، وە عەبدوڵای کوڕی ئونەیسیش و لەدەوروبەری ئاوێک باریان خستبوو ئاویان خواردەوە و سوجدەی شوکریان بۆ الله برد.

تا ئێرە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە بەڵام تەماشای پاڵەوانێتی موسڵمانان بکە تەماشای پاڵەوانێتی سەحابەکان بکە لەبەر ئەوە کافرەکان خۆیان لەبەر نەدەگرتن خاوەن ئیمان بون بۆ اللەیان دەکرد ئیلا بەشی قیامەتیان دەویست و دونیایان نەدەویست، تەماشا بکە عەبدوڵای کوڕی ئونەیس دەڵێ کورە کوڕینە وەڵاهی قەوسەکەی کەوانەکەم کەوانەکەی تیرم پێ دەهاوێشت لەو جێی گوێدرێژەکەیان لێ بەستەوە لەبیرم چوو لە خۆشیان عەبدوڵای کوڕی عەتیك کە تۆ بە من گەیشتی و بچین ئەبو ڕافیع بکوژین، گوتیان ئینجا چی دەڵێی؟ گوتی وەڵا دەچم دەیهێنمەوە چۆن دەبێ کەوانی من بۆ جولەکەیەک بێ بەیانی بێ شەڕی موسڵمانانی پێبکا؟ کورە کاکە ڕاوەستە ئاخر وەزعەکە هی ئەوە نیە ئێستا جولەکە هەموو کۆبونەتەوە ئەبو ڕافیع ماوە نەماوە داخۆ چیبوە، گوتی وەڵاهی غیرەتم قبوڵ ناکا، چۆن بە شەرمەزاری بچمەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ عەبدوڵای کوڕی ئونەیس کوا کەوانەکەت؟ پێی بڵێم بەجێم هێشت بۆ جولەکەکان بێن دوایی شەڕی ئێمەی پێبکەن؟ وەڵاهی ئەوە ناکەم ئەگەر بشکوژرێم بەس تۆ ئەمیرمانی ئەی عەبدوڵای کوڕی عەتیك مۆڵەتم پێبدە داوات لێدەکەم ڕجات لێدەکەم، ئەویش فەرموی وەڵاهی ئەگەر تۆ غیرەتت وایە ئێمە خەمی تۆمانە دەبڕۆ بە پشتیوانی خوای رب العالمین بەڵکو الله ڕزگاریشت بکا، دەڵێ دەنگە دەنگ بوو هاوار هاوار بوو جولەکە هەڵدەهاتن و خۆیان کۆدەکردەوە بەرەو قەڵاکەی قەسرەکەی ئەبو ڕافیع ئەویش لەگەڵ ئەو قەرەباڵغیەدا چوو کەس ئاگای لە ئەو

نەبوو لەلای گوێدرێژەکەی کەوانەکەی دانرابوو دەستی دایە و لە ملی خۆیکرد و لەگەڵ حەرەس و جولەکەکان هاتەوە دەرەوە و خۆی نەشێواند، لەبەر ئەوەی ئاوا تێک شڵەژابون و خەمیان هەبوو سەریان لێ شێوابوو نەیاندەزانی چیبکەن جولەکەکان، دەڵێ هاتەوە دەرەوە گوتی ئەوەتا کەوانەکەم هێنایەوە نەمگوت خۆم شەرمەزاری الله و پێغەمبەر ناکەم (ﷺ)، ئینجا عەبدوڵای کوڕی عەتیك فەرموی کوڕینە چۆنە ئێمە بچینەوە؟ ئایە کوژراوە ئەبو ڕافیع یان نەکوژراوە بچینەوە بە پێغەمبەر چی بڵێین (ﷺ)؟ برا ئەوسیەکانمانتان بینی کەوا ئەوان بە تەواوەتی هەواڵیان هێنایەوە و لە ڕیواتێک دەڵێ گوتی سەری کەعبی کوڕی ئەشرەفیان هێنایەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)؟ ئێستا ئێمە بچینەوە بڵێین وەڵا لێماندا بەس نازانین مردبوو یان نا؟ گوتیان وەڵاهی قسەی تۆیە عەبدوڵای کوڕی عەتیك، چیبکەین باشە؟ ئەسوەدی کوڕی خوزاعی گوتی من بۆ ئەو کارە باشم، دەی من بنێرن دەچمە ناویان دەچمە سەری لەگەڵ جولەکەکان بزانم کوژراوە یان نا هەواڵی یەقینتان بۆ دەهێنمەوە ئەگەر منیش کوژرام دۆعام بۆ بکەن الله بە شەهیدی قبوڵ کردبم، گوتیان ئێمە ڕازین دەبڕۆ، ئەویش خۆی پێچایەوە و خۆی خزاندە ناو جولەکەکان قەرەباڵغیەکی زۆر بوو نزیک کۆشکەکە بویەوە بینی وا خێزانەکەی ئەبو ڕافیع لەخۆی دەدات و هاوار دەکا دەڵێ ئەوەتا من گەیشتمە سەری ئەبو ڕافیع سوێندی بۆ ئەوان خوارد، لە هاواریدا ژنەکە هێشتا ئەبو ئەسوەدی خوزاعی تەواو نەگەشتبوە سەر سەری ئەبو ڕافیع لەگەڵ جولەکەکان گوتی ئەوە من وا لەسەر جەنازەی پیاوەکەمم سوێند بە خوای موسا نەماوە و مردوە، ئەبو ئەسوەدی خوزاعی گوتی الحمدلله خوایە بۆ تۆ لە نیوەی ڕێگا منت گەڕاندەوە و هەواڵم دەستکەوت هاتەوە ناو سەحابەکان و لەوێوە خۆیان کۆکردەوە و بەرەو شاری مەدینە گەڕانەوە.

جا جولەکەکان بەيانی تەواو بەخۆيان کەوتن کە بگەڕێن بە دوایاندا و کەسیان نەدۆزیەوە و کە هاتنەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵەکەيان بۆ پێغەمبەری پێشەوا هێنایەوە (ﷺ) پێغەمبەر پێشوازی لێکردن (ﷺ) فەرموی دەستان خۆش شێرە کوڕانی ئیسلام هاتنەوە هەواڵی چیتان پێیە موژدەم پێبدەن؟ گوتیان سوێند بە الله (ﷺ) کوشتمان، فەرموی بیهێنن با ئاسەوارەکەی ببینم کامتان کوشتتان؟ عەبدوڵای کوڕی عەتیك گوتی من کوشتم پێغەمبەری الله (ﷺ)، عەبدوڵای کوڕی ئونەیس گوتی نەوەڵا من تەواوم کرد پێغەمبەری الله (ﷺ)، فەرموی وەرن مەردە کوڕانی ئیسلام شمشێرتان هەڵکێشن با ببینم بزانم کامتان کوشتوتانە، دەڵێ لەبەر چاوی سەحابەکان و پێغەمبەر (ﷺ) عەبدوڵای کوڕی عەتیك شمشێری هەڵکێشا هەموی خوێن بوو ئاسەواری پێوە مابوو، فەرموی بەڵێ تۆ کوشتوتە، عەبدوڵای کوڕی ئونەیسیش شمشێرەکەی دەرهێنا هەندێک لە خواردنەکانی ناو مەعیدەی ئەبو ڕافیع چونکە لەسەر مەعیدەی دانابوو وە هەندێک پارچە گۆشتەکانی مەعیدەشی پێوە مابوو، جا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) بەڵێ هەردوکتان کوشتوتانە دەستان خۆشبێ، فەرموی ئەوە قاچت بۆ بەستراوەتەوە ئەی عەبدوڵای کوڕی عەتیك؟ فەرموی ئەی پێغەمبەری الله لە کۆتاییەکەی کە هاتمە خوارەوە لە قادرمە پێم ڕۆیی ئەو قاچەم شکا، فەرموی بێنی بۆ ئێرە و لێمی نزیک بکەوە، پێغەمبەر دەستی پێدا هێنا (ﷺ) فەرموی خوایە شیفای عەبدوڵای کوڕی عەتیك بدەی، لەوێوە شیفای بۆ هات و بە تەواوەتی چاک بوەوە پێغەمبەر (ﷺ) دۆعای خێری بۆ کردن و فەرموی مەوعیدمان إن شاء الله تعالی جارێکی تر لەگەڵ جولەکەکان وا دەبێ ئاوا سەرەکانیان لەناو دەبەین لەناو جێگا و بالینگانی خۆیان ئەگەر دوژمنایەتی الله و پێغەمبەری الله بکەن (ﷺ).

جائەوەيان لە سەحیحی بوخاری وەرمان گرتوە، لە کتابی (مغازي) الواقدي و (السيرة النبوية) ابن هشام و (تاريخ الرسل والملوك) الطبري و (دلائل النبوة) للبيهقي و (البداية

والنهاية) ابن كثير و (قادة النبي (ﷺ)) محمود شيت خطاب و وه پەرتوكه نایابەکەی دكتۆر صلاح عبد الفتاح الخالدي كه له ڕابردوو باسمان كرد.

ئایه هەر جولەکەکانی وا دەکوشت پێغەمبەر (ﷺ) یان موشریکەکانیش؟ نەخێر موشریکەکانیشی وا لێدەکرد ئەوەتا سوفیانی کوڕی خالیدی هوذەلی له بۆچونی پەسەند و ڕاجیح لەلای ئیمامی بەیهەقی واقیدی که ناوی سوفیانی کوڕی خالیدی هوذەلی بوه یەکێک بوه له سەرکرده گەورەکانی موشریک و بتپەرستەکان لەلای ابن کثیر و ابن ئیسحاقیش دەڵێ بەڵکو ناوی خالیدی کوڕی سوفیان بوه نەک سوفیانی کوڕی خالید دکتۆر صلاح خالیدیش دەفەرموێت سوفیانی کوڕی خالید ڕاستتره، ئەوه خەڵکی زۆر کۆکردەوه عەرەبەکانی هاندا موشریکەکانی هاندا بەنو خوزاعەی هاندا چەندین هەزار کەسی کۆکردەوه هەواڵ به پێغەمبەر گەیشت (ﷺ) لەنێوان مەککە و مەدینە دادەنیشت له نزیک عەرەفات له شوێنێک که پێی دەگوترا نەخله ئەو پیاوه ئەو هەموو کافر و موشریکانەی کۆکردەوه و هانیدان شاعیر بوو زمانزان بوو دەوڵەمەند بوو گوتی دەچم هێرش دەکەمە سەر مەدینە و موحەممەد ناهێڵم (ﷺ)، که پێغەمبەر هەواڵەکەی زانی زۆر دڵی تەنگ بوو بەوەی ئەو کافر و موشریکەکانه بتوانن لەناکاو بەسەر مەدینەدا بدەن، ئەوەی به دەستەوه مابوو پێغەمبەر (ﷺ) بانگی عەبدوڵای کوڕی ئونەیسی کرد ئەوەی کەوا بەتەواوەتی شمشێرەکەی له مەعیدەی ئەبو ڕافیع دابوو چونکه عەبدوڵای کوڕی ئونەیس نمونەی نەبوو لەناو سەحابەکان لەڕوی پاڵەوانێتی و ئازایەتی ترس بەلاشەیدا نەدەهات قەت قەت نەیدەزانی ترس چیه، دەستی گرت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی کارێکی زۆر گرنگم پێته ئەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس ئەگەر ئەوەم بۆ بکەی ئۆخشنی دڵم دێ، فەرموی یا رسول الله لەبەر ئەمرت ڕاوەستاوم، فەرموی وەڵاهی سوفیانی کوڕی خالیدی هوذەلی موشریک خەڵکێکی زۆری کۆکردوەتەوه دەیەوێ لەناکاو هێرش بکاته سەر

مەدینە چارەم ئەوە لە دەست ماوە ئەگەر بچی وەکو پیاوان مەردبی بۆ الله بچی لەناو خێمەکەی خۆیدا بیکوژی و ئیغتیالی بکەی، گوتی بەسەرچاو و سەر پێغەمبەری الله (ﷺ)، بەڵام من ئەو پیاوەی نەبینیوە چۆن بیناسمەوە؟ گوتی ئاگاداربە لەشکرێکی زۆری کۆکردوەتەوە زۆر بە حەزەر و هێواشی دەبێ بچی ئەو پیاوەش وەسفت بۆ دەکەم، وەسفێکی سەیری بۆ کرد، گوتی پیاوێکی بە هەیکەلە وە هەرکە دەشیبینی سام و هەیبەتی هەیە سوێند بە الله شەیتانە ترست دەهێنێتە دڵ هەرکە بینیت بەناو ئاو و ئارەقە دەکەوی تۆ عەبدوڵای کوڕی ئونەیس، گوتی باشە پێغەمبەری الله (ﷺ) بڕۆم و جێبەجێی کەم؟ فەرموی بەڵێ، چوەوە ماڵەوە و شمشێری هێنا، وابون سەحابەکان نەک بڵێ منداڵم وردە خێزانم بێوەژن دەبێ تازە خانوەکەم کڕیوە ئەی چیبکەم؟ لەپاش من کێ ماڵ و منداڵم بژێنێ؟ پێغەمبەری الله کەسی تر نیە بینێری هەر من؟ یان فلانم لەگەڵ بنێرە ئەوانە نەبوو، لەبەر ئەوە سەحابەکان سەردەکەوتن لەبەر ئەوە دوژمنانی ئیسلام و کافرەکانیش چۆکیان دەشکا کاتێک هەواڵی ئەوەیان پێدەگەیشت سەحابەیەکی پاڵەوان هێرش دەکاتە سەریان، ئەویش بەڕێکەوت ڕۆیشت، بەس گوتی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) لەوێ ئەگەر قسە بەتۆش بڵێم با گوناحبار نەبم دۆعام بۆبکە بۆئەوەی پێی بگەم و فێڵێکی لێبکەم هەتا دەیکوژم، گوتی هەرچی گوتت بیلێ لەڕێگایش وا بڵاو بکەوە و لەلای ئەویش بڵێ من پیاوێکم لە بەنو خوزاعە چونکە خوزاعیەکان زۆرن هەمویان یەکتر ناناسنەوە ئەوانیش پاڵپشتی سوفیانی خالیدی هوذەلی دەکەن، گوتی زۆر باشە، لە ڕێگادا گەیشتە بەنو خوزاعیەکان گوتی من یەکێکم لە ئێوە ئەوە چیدەکەن خوزاعیەکان ئێوە لێرە؟ بۆ منتان نەهێناوە بۆ شەڕ؟ ئەوانی وا هەڵخەڵەتاند و گوتیان وەرە برا خوزاعیەکەمان تۆش هاتی؟ گوتی بەڵێ، گوتی بەڵام من ناگەڕێمەوە من شیعر دەزانم ئەوەندە ئازام ئەوەندە شەڕم کردوە ئیلا دەبێ بگەمە لای سەرکردەی ئەو لەشکرە ئەویش سوفیانی کوڕی خالیدی هوذەلیە، گوتیان وەڵا ئەو لێرە دورە ئەها لەو خێمانەی ئەوسەر دادەنیشێ پاسەوانی تایبەتی هەیە و ئەو لە ئێمە هەموان

گەورەترە و ئەو ئێمەی کۆکردوەتەوە، گوتی قەیناکە، ئەوانی بەجێهێشت و نوێژی نیوەڕوانی کرد گوتی با نوێژم نەچێ و کەس نەی بینی کافرەکان ئینجا بۆ دوای نوێژی عەسر گەیشتە لای خێمە نزیکەکانی سوفیانی کوڕی خالیدی هوذەلی، فیعلەن پیاوێکی بینی خەڵکێک بە دەوروبەریوە بون پاسەوانی بون چەند ئافرەتێکیش لەگەڵیدا دەڕۆیشتن و کۆیدەکردنەوە پیاوێکی بە سام و هەیبەت بوو عەبدوڵای کوڕی ئونەیس دەستی کرد بە ئارەقە کردن کەوتە ژێر ئاو و ئارەق ترسێک لە دڵی نیشت، ئینجا قسەکەی پێغەمبەری بەبیر هاتەوە (ﷺ) شەیتانی بە لەعنەت کرد و (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ)ی گوت زانی شەیتانە ترسە خستویەتیە دڵی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس زانی ئەو پیاوەش ئەوە چونکە عەبدوڵا نیشانەکانی بۆ دەرکەوت، ئینجا عەبدوڵای کوڕی ئونەیس لێی چوە پێش و چاک و چۆنی لەگەڵ کرد گوتی من یەکێکم لە بەنو خوزاعە بڕۆ لێشیان بپرسە ئەوان لەبیریان چوبوو من ئاگادار بکەنەوە و بمهێنن بۆ جەنگ کردن لەگەڵ موحەمەد (ﷺ)، جا بشزانە هەندێک شیعرت بۆ دەخوێنمەوە بزانە دڵت دەیگرێ ئەی سوفیانی کوڕی خالیدی هوذەلی؟ دەستی بە شیعر خوێندنەوە کرد چونکە شاعیر بوو عەبدوڵای کوڕی ئونەیس، ئەویش شیعرەکان زۆر لەلای جێگای سەرسوڕمان بوو دەستی توند گرت و گوتی وەرە لەگەڵم بۆ بن خێمەکە ئەی برا خوزاعیە ئازایەکە ئەی شاعیرە لاوەکە، لەگەڵ خۆی بردیە ژێر خێمەی خۆی، بەڵام نەیزانی چیبکات دەڵێ خەمی نوێژی عەسری بوو پێش ئەوەی بگاتە ژێر خێمەکە زانی کەوا سەڵاتی خەوف دەکرێ گوتی بۆ ئەوەی نوێژەکەم نەچێ و ناتوانم لەلای ئەویش نوێژ بکەم لە ڕێگادا نیەتی ئەوەی هێنا نوێژی عەسر دەکا بەرەو خێمەکە دەڕۆیشت و فاتیحە و ئەوانەی خوێند و ئەوە سەڵاتی خەوفە لەکاتی تێکەڵبوونی کافر و موشریکەکان لە موهیمەی وا گەورەدا ئەگەر ڕوی لە قیبلەش نەبێ لەسەر بۆچونی پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە نوێژەکەی قبوڵە و بەڵگەی سەحیحی لەسەرە و الله ئەو مۆڵەتەی داوە -جل شئنە- نوێزەکەی خۆشی نەچواند، هەرکە ڕۆیشتنە ژێر خێمە و دانیشتن

مه‌غریب داهات خواردنیان بۆ هێنان ته‌نها ئافره‌ته‌کان و ئه‌وانه‌ی پاسه‌وانه‌ تایبه‌ته‌کان بون له‌ ده‌وروبه‌ری خێمه‌که‌ مانه‌وه‌، ئه‌ویش هه‌ر شیعر بۆ ده‌گوت هه‌تا گێژی کرد له‌گه‌ڵ شیعر گوتن هه‌ر قسه‌ی خۆشی بۆ ده‌کرد و مه‌دحی ده‌کرد هه‌تا هۆشی له‌خۆی برا ئه‌و پیاوه‌ طاغوته‌ کافره‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ طاغوت و کافره‌کان حه‌زیان لێیه‌ له‌ هه‌موو سه‌رده‌مه‌کان پێیان هه‌ڵبده‌ی ده‌خه‌ڵه‌تێن به‌وه‌ ئه‌گه‌ر به‌ درۆش بێ هه‌ر ڕازین به‌خشیشت ده‌ده‌نێ هه‌ندێک جار چونکه‌ هیچ و پوچن هیچ نین، له‌به‌ر ئه‌وه‌ ده‌ڵێ لێی چوه‌ ژوره‌وه‌ و له‌بن خێمه‌که‌ شان به‌ شانی ئه‌و کاتێ که‌وا بینی وا ده‌بۆرژێ و خه‌وی دێت سوفیانی کوڕی خالیدی هوذه‌لی، گوتی وه‌ڵا من زۆرم خه‌و دێ، ئه‌ویش گوتی وه‌ڵا من جارێ خه‌وم نایه‌ من وا ڕاهاتوم له‌ هه‌موو شه‌ڕه‌کان که‌م ده‌خه‌وم، گوتی ده‌ تۆ که‌یفی خۆته‌ من لێره‌ پاڵ ده‌ده‌مه‌وه‌ و ده‌خه‌وم برا خوزاعیه‌که‌م، گوتی ده‌ بنوو، ئۆخشنی دڵی هات که‌ ئه‌و که‌وته‌ خه‌و ژنه‌کانیش خه‌ویان لێکه‌وت هه‌رکه‌س له‌ لایه‌ک ته‌ماشای کرد پاسه‌وانه‌کانیش خه‌ویان لێکه‌وت، گوتی هه‌لێکی زێڕینه‌ هه‌ڵیکێشا شمشێره‌که‌ی و ترس له‌ دڵیدا نه‌مابوو (بسم الله، الله أكبر)ی کرد له‌جیاتی له‌ هه‌ر شوێنێکی بدا گوتی باشترین فورسه‌ت و نیشانه‌ بۆ ئه‌وه‌ی بگه‌ڕێمه‌وه‌ لای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) بزانێ کوشتومه‌ سه‌ره‌که‌یه‌تی له‌گه‌ڵ خۆم ببه‌م شمشێری له‌ مل نا به‌ (بسم الله، الله أكبر)ه‌وه‌ سه‌ره‌که‌ی لێکرده‌وه‌ پرچه‌که‌ی گرت و له‌دوای خۆی ڕایکێشا له‌بن خێمه‌که‌ ده‌رپه‌ڕی به‌و تاریکه‌ شه‌وه‌ ڕایکرد بۆلای شاخه‌کانی ده‌وروبه‌ری نه‌خله‌ له‌وێوه‌ چوو به‌سه‌ر شاخێک که‌وت و ئه‌شکه‌وتێکی بچوکی لێبوو خۆی له‌ ئه‌شکه‌وته‌که‌ حه‌شاردا، کاتێ که‌وا ئافره‌ته‌کان هه‌ستانه‌وه‌ وا خوێن ده‌ڕوا قیره‌ بڕی کردوه‌ سه‌رکرده‌که‌یان به‌بێ سه‌ر له‌وێ ماوه‌ لاشه‌یه‌که‌ و خوێنی له‌به‌ر ده‌ڕوا پاسه‌وانه‌کانیان ئاگادار کرده‌وه‌ و ئاگریان هه‌ڵکردن و هه‌رچی هات به‌بێ سه‌ر سوفیانی کوڕی خالیدی هوذه‌لی بینی خۆیان ڕێکخست و به‌ره‌و شاخه‌کان به‌ره‌و هه‌موو ڕێگاکان، عه‌بدوڵای کوڕی ئونه‌یس ده‌ڵێ سوێند به‌ الله ئه‌شکه‌وته‌که‌ بچوک بوو سه‌ره‌که‌م ئه‌وه‌نده‌ مه‌راق بوو هه‌ر له‌ناو ده‌ستمدا

بوو له باوەشی خۆمم نابوو بۆ ئەوەی سەرەکەم له دەست نەچێ خۆم بەبنی ئەشکەوتەکە حەشار دابوو دەڵێ یەک له کافرەکان هاتە لای ئەشکەوتەکە منی لێبوم دەیگوتە ئەوانی تر ئەوە چاو دەگێڕم و کەس نابینم، دەڵێ بەڵام ئەوەندەم تینوو بوو ڕێی مەدینەش هەندێک دور بوو بینیم ئاوێکی زۆر چاکی لەلایە ئەو کافرە هەندێک خواردنیشی لەگەڵ خۆی هێناوە، دەڵێ وام هەستکرد خوای رب العالمین یارمەتیدام کافرەکانی تر شۆڕبونەوە بچنە خوارەوە ئەوە گوتی من بەدواتاندا دێم بەس لێرە وا دەمەوێ قەزای حاجە بکەم و میزێک بکەم، دەڵێ ئاو و خواردنەکەی لەبەر دەرگای ئەشکەوتەکە دانا و تۆزێک چوە خوارتر میز بکا ئەمری خوای رب العالمین وابوو دەڵێ من سەرەکەم تورەکەیەکم پێبوو لەناو دانا و له پشتی خۆم هەڵدا خواردن و ئاوەکەشم دەستدایە تێرم له ئاوەکە خواردەوە هەندێک خواردنیشم لەگەڵ خۆم برد و ڕاست ڕامکرد و بەودیوی شاخەکەی هاتمە خوارەوە، دەڵێ ئینجا هاتمەوە گەیشتمەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، دەڵێ پێغەمبەر پێشوازی لێکردم (ﷺ) فەرموی یاخوا بەخێر بێیتەوە ئەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس موژدەت بە دەم و چاوەوە دیارە، دەڵێ گوتم بەڵێ پێغەمبەری الله نیشانەشم بۆ هێنای کەوا فەرمانەکەم سەد له سەد جێبەجێ کردوە، گوتی نیشانەکە دەبێ چیبێ؟ دەڵێ تورەکەکەم کردەوە و سەری سوفیانی کوڕی خالیدی هوذەلیم لەپێش پێغەمبەر دانا (ﷺ)، دەڵێ پێغەمبەر ئەوەندە دڵخۆش بوو توند دەستی گرتم دۆعای خەیری زۆر بۆ کردم ئینجا فەرموی ئەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس ها من ئەو حەیزاران و گۆپاڵەت دەدەمێ له دەستتدابێ لەسەری دەڕۆی لەناو بەهەشتدا لەوێ بتناسمەوە، ئەوە چیت کردوە بۆ الله و پێغەمبەر (ﷺ)؟ دەڵێ منیش گۆچانەکەم لەدەست گرت و مەوت و شوجاعەی پێغەمبەری (ﷺ) وەرگرت پاڵەوانی ئیسلام، دەڵێ لەسەری دەڕۆیشتم نەمدەزانی ئەو گۆچانە تێنەگەیشتم پێغەمبەر بۆ داویەتیە من (ﷺ) له خۆشیان و له دۆعایە خێرەکانی بۆ منی کرد، دەڵێ سەحابەکان لێیان پرسیم ئەو گۆچانە چیبوو پێغەمبەر دایە تۆ (ﷺ)؟ دەڵێ چومەوە لای گوتم باوکم و دایکم

فیداتبێ یا رسول الله (ﷺ) ئەو گۆچانەت بۆ دایە من؟ فەرموی لە بەهەشتدا کەم کەسێک هەن گۆچان بە دەست بن ئەوان تایبەتن لەناو بەهەشتدا پێی دەسورێنەوە عەبدوڵای کوڕی ئونەیس ئەو گۆچانە نیشانەبێ لەنێوان من و تۆ لە بەهەشتدا کە پێی بسوڕێیتەوە و خۆتی بەسەردا بدەی لەوێ هەتا بتناسماوە تۆ ئەو شێرە کوڕەی ئیسلام بوی سەری سوفیانی خالیدی هوذەلیت بۆمن هێنا گیان و دڵی ئێمەت موڕتاح کرد ئەو لەشکر کێشیەی کافرانت شکاند ئەی پاڵەوان کە دەیانویست بێنە سەر مەدینە، دەڵێ ئینجا عەبدوڵای کوڕی ئونەیس کاتێک پێش وەفات دەکا وەسیەت دەکا دەڵێ ئەو گۆچانە لەناو کفنەکەم لەگەڵ من بیشارنەوە پێغەمبەر بەبەلاشی وا نەگوتوە (ﷺ) بەڵکو لە بەهەشتدا پێی بسوڕێمەوە هاتا بمناسێتەوە.

خەڵکێک وا دەزانێ پێغەمبەر (ﷺ) تەنها لە مزگەوتدا عیبادەتی کردوە و ئیلا دڵ نەرم بوە و ئەگەر کافر و موشریکیش ویستبیان غەدر لە موسڵمانان و ئیسلام بکەن یان لە پێغەمبەر بکەن گوتویەتی قەیناکە و بەزوترین کات هەموجارێ عەفوی کردونە هەموو جارێک وا نەبوە، ڕون بویەوە پێغەمبەر (ﷺ) بە دەستی خۆی لەپێناو الله خەڵکیشی کوشتوە وەکو ئوبەی کوڕی خەلەفی کوشت وە فەرمانیشی داوە کافر و موشریکەکان لەناو جێگای خۆشیان بکوژرێن لەو کاتانەی دەبنە مەترسی لەسەر دەوڵەتی ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانان ئینجا زۆر دڵ نەرمیش بوە و لە داهاتوودا بۆتان ڕوندەبێتەوە دڵ نەرمیەکانی لە شوێنێ خۆی بەکار هێناوە عەفوەکان وە ڕق لێبونەوە و توڕەبونەکانیشی لەپێناو الله و ئەمر و فەرمانی کوشتنی کافرەکانیشی لە شوێنی خۆی بەکار هێناوە چونکە لەوپەڕی حیکمەت حیکمەتی هەبوو هیچ ئیشێکی پێغەمبەر بێ حیکمەت نەبوو (ﷺ).

## جەنگی خەندەق (ئەحزاب) لەگەڵ بەنو قورەیظه

که پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) له مانگی شەوال بوو هیچ ئیختیلافێک لەسەر مانگەکە نیه بەڵام ئایه ساڵی چوارەم بوو یان پێنجەم بوو؟ دوو بۆچون هەیه لەلای زانایان، هەندێکیان دەڵێن له ساڵی چوارەمی کۆچی که ئەوە بۆچونی موسای کوڕی عوقبەیه و وه ابن حەزمیش ئەوەی ڕاجیح و پەسەند کردوە که هەندێکی تریش له زانایان، وه هەندێکی زۆریش جمهوری عولەما دەفەرمون لەوانه ابن ئیسحاق و وه ابن سەعد و ابن حەجەری عەسقەلانی و ئەبو عوبەید و وه ابن القیم الجوزیة و ئیمامی بەیهەقیش وه ابن کەسیریش بۆچونی وایه که جمهوری زانایانن دەفەرمون له ساڵی پێنجەمی کۆچی ڕویدا جەنگی خەندەق، جەنگی خەندەق بەوە دەستی پێکرد که جولەکەکان ئەبو ڕافیعی سەلامی کوڕی ئەبی حوقەیق کاتێک لەگەڵ هەندێک له سەرکردەکانی تری جولەکەکان غەطەفانیان هاندا قورەیشیەکانیان هاندا لەوەی بێن هێرش بکەنه سەر شاری پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەبوو ده هەزار کەس کۆبونەوە له جەنگی ئەحزاب له کافر و موشریک و بێدینەکان هاتن دەوری مەدینه بگرن، که پێغەمبەریش ئەوەی زانی (ﷺ) یەکێک له هاوەڵە بەڕێزەکانی که لەسەر هەندێک بۆچونەکان دەڵێ سەلمانی فارسی بوە لەسەر زۆرێکیش ناوی دیار نیه پێشنیاری ئەوەی کرد که خەندەق لێبدەن خەندەقێک لێبدەن له دەوری مەدینه هەتا کافرەکان نەتوانن بپەڕنەوە، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) ئەو فەرمانەی جێبەجێ کرد، ڕۆژانه هاوەڵە بەڕێزەکان دەهاتن ئەنساریەکان شەو و ڕۆژیان لێک بەستابویەوە لەگەڵ موهاجیرەکان که خەندەقیان لێدەدا و حەفریان دەکرد بۆ ئەوەی کەوا کافرەکان نەتوانن لێی بپەڕنەوە پێغەمبەریش لەگەڵ ئەوان بەشداری دەکرد (ﷺ)، که لێی گێڕدراوەیە پێغەمبەر (ﷺ) ئەنەس دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ جارێکیان پێغەمبەر هات (ﷺ) ئەنساریەکان و موهاجیرەکان حەفری خەندەقیان دەکرد و قۆرتەکەیان لێدەدا دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) که بینی ئەوانه وا ماندو و شەکەتن ئارەقه دەڕێژن برسیتیان یەکسەر فەرموی:

(اللَّهُمَّ إِنَّ العَيْشَ عَيْشُ الآخِرَهْ

فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالمُهَاجِرَهْ)

فەرموی خوایە بە دڵنیاییەوە هەمومان دەزانین کەوا ژیان ژیانی دوارۆژە لە دونیادا هەر ماندوبونە و ناخۆشیە بەڵام خۆشبە خوای رب العالمین ببورە لە ئەنساریەکان و خەڵکی مەدینە وە لە موهاجیرەکانی کە لە مەککەوە هاتون.

جا ئەوانە هەموو دڵیان خۆشبوو لە وەڵامیدا گوتیان:

(نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا

علَى الجِهَادِ ما بَقِينَا أَبَدَا)

گوتیان ئێمەین بەڵێن و پەیمانمان داوەتە موحەمەد (ﷺ) بەردەوام بەردەوام ببین لەسەر جەنگ و جیهاد و تێکۆشان هەتا گیانمان مابێ.

جارێکیتر پێغەمبەر (ﷺ) بۆخۆشی بەشداری کرد و لە یەکێک لە جارەکان لە ڕیوایەتێک هاتوە کەوا دەفەرمون سەحابەکان بەردێکی گەورە هاتە سەر ڕێگامان ئا ئەو بەردە نەمان توانی بیشکێنین و دەری بێنین بەڵام بانگی پێغەمبەرمان کرد (ﷺ)، دەڵێ ئەویش دەستی دایە ئەو کەل و پەل و ئامرازەی کەوا زەویيان پێ قۆرت دەکرد پێغەمبەر (ﷺ) بە (بسم الله، الله أكبر)ەوە ئەو بەردە گەورەی شکاند (ﷺ) بەڵام زۆر ماندو بوو بوو چەندین موژدەیشی پێغەمبەر (ﷺ) دایە سەحابەکان، فەرموی «بسمِ اللهِ، فضرب ضربةً فكسر ثُلُثَها» پێغەمبەر (ﷺ)گوتی بەناوی الله ئەوەی لە دەستی بوو وەشاندی لە بەردەکە و سێیەکی بەردەکەی شکاند و لێی کردەوە ئینجا فەرموی «اللهُ أكبرُ أُعْطِيتُ مَفاتيحَ الشامِ» فەرموی گەورەیی بۆ الله الله لە هەموو شت و کەسێکی گەورەتر و مەزنترە کلیلەکانی شامم پێدرا واتە سەرکەوتوو دەبم و شام دەکەوێتە ژێر حوکمی ئیسلام فەتحی دەکەین

ئێمەی موسڵمانان، ئا لەو تەنگەبەریەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو موژدانەیدا هەموشیان موعجیزە بون هاتنەجێ لە کۆتایەکەیدا و خوای رب العالمین پێی نیشاندا ئەوها وەرەی سەحابەکان و خۆی بەرز کردەوە قەت بێ ورە نەبوە پێغەمبەر (ﷺ)، وە لە جاری دوەم فەرموی «واللهِ إني لَأُبْصِرُ قصورَها الحُمْرَ الساعةَ» فەرموی وەڵاهی من وا ئێستا کەئەنەهو لەبەرچاومە دەبینم قەسرە سورەکانی شام دەکەوێتە بەردەستی ئێمە، لە پاشان ئەو ئامرازەی بڵند کرد کە لە دەستیدا بوو پێغەمبەر (ﷺ) دوبارە فەرموی (بسم الله، الله أكبر) ئەمجارە سێیەکێکی تر لەوەی مابۆوە لەبەردەکە لێی کردەوە واتە تەنها سێیەکێک مایەوە لەبەردەکە و شکاندی، فەرموی «اللهُ أكبرُ، أُعْطِيتُ مفاتيحَ فارسٍ» فەرموی گەورەیی بۆ الله الله لە هەموو شت و کەسێک گەورەتر و مەزنترە کلیلی فارسەکانیشم پێدرا «واللهِ إني لَأُبْصِرُ قصرَ المدائنِ أبيضَ» فەرموی ئێستا وا لەبەرچاومە قەسر و کۆشکی کیسرا لە مەدائین واتە لە سەلمان پاکی ئێستای عێراق کە قەسر و کۆشکی سپی ئەوکاتەی کیسرا لەوێ بوو فەرموی ئەوە لەبەر چاوم دیارە قەسر و کۆشکە سپیەکەی مەدائین کە پێمان دەدرێ و دەکەوێتە بەردەستی موسڵمانان، لە پاشان فەرموی پێغەمبەر (ﷺ) سێیەم جار دوبارە ئامرازەکەی بڵند کرد و لەبەردەکەیدا و (بسم الله) فەرموو ئینجا بەردەکەی ورد و خاشکرد و هیچی نەما، فەرموی «اللهُ أكبرُ أُعْطِيتُ مَفاتيحَ اليَمَنِ» گەورەیی بۆ الله الله لە هەموو کەسێک گەورەترە پێم بەخشرا کلیلەکانی وڵاتی یەمەن یەمەنیش دەکەوێتە بەردەستی موسڵمانان، فەرموی «واللهِ إني لَأُبْصِرُ أبوابَ صنعاءَ من مكاني هذا الساعةَ[1]» فەرموی سوێند بە الله ڕاستان لەگەڵ دەڵێم وا لەبەرچاومە قەسر و کۆشک و دەرگاکانی شاری سەنعائی یەمەنم لەبەرچاوە و وا ئێستا دەیبینم و الله پێی نیشاندام -جل شئنه-.

[1] أخرجه النسائي في ((السنن الكبرى)) (٨٨٥٨)، والروياني في ((المسند)) (٤١٠)، والبيهقي في ((دلائل النبوة)) (٤٢١/٣).

پێغەمبەر لەو ماندوبون و شەکەتیەدا بوو جابر بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ وەڵاهی هەرکە پێغەمبەرم بینی (ﷺ) هەموو لاشە و جەستەی ئارەقە بوو وە بینیم لە سکی خۆیدا بەردی بەستابوو واتە برسی بوو وە هاوەڵە بەڕێزەکانیش ماوەیەکی زۆربوو ئەو حەفرەیان لێدەدا هیچ نەبوو بخۆن و بخۆنەوە، دەڵێ لەبەر ئەوە دڵم بە پێغەمبەر سوتا (ﷺ) نەمزانی چی بۆبکەم، هەر ئەوەندەم پێکرا چومەوە ماڵەوە بڵێم چیمان هەیە؟ هاوسەر و خێزانەکەم گوتی ها ئەو ئاژەڵەمان هەیە بەرخێک بوە یان بزنێک بوە وا تازە پێدەگا و تەواویش قەڵەو نەبوە لەگەڵ هەندێک ئاردی جۆمان هەیە و یان ئاردی گەنمان هەیە لە ماڵەوە کەمێکی کەمە، فەرموی دە ئەو ئاژەڵە سەردەبڕین و ئاردەکەش بکە نان پێغەمبەر بانگ دەکەم (ﷺ) زۆر ماندو بوە ئارەقەی ڕشتوە برسیەتی، ئەویش گوتی بڕۆ بانگیکە، دەڵێ چومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) هەرکە بە پێغەمبەری اللهم گوت (ﷺ) لەبن گوێی بە هێمنی و بە لەسەر خۆییەوە چونکە سەحابەکان زۆربون هەزار کەس دەبون دەڵێ زانیم من نانی ئەوانەم هەموو پێ نادرێ باس بۆ پێغەمبەرم ئامادە کردوە (ﷺ) گوتم لە ماڵی ئێمە نانت بۆ ئامادە کراوە ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، دەڵێ پێغەمبەریش یەکسەر لە هەڵایدا و ئاشکرای کرد گوتی هاوەڵە بەڕێزەکان ئێمە لە ماڵی جابر دەعوەتین، جابر دەڵێ زۆر بەسەر خۆمدا شکامەوە زۆریش ترسام ئێ ئەوەندە نانە چۆن باشی ئەوان دەکا؟ دەڵێ بەخێرایی چومەوە ماڵەوە گوتم ئەی ئافرەت شتێکی زۆر هەڵەمان کرد هەر تەنها ئەوەندە خواردنەیە وا هەمانە؟ هەزار کەسی لەگەڵدایە پێغەمبەر (ﷺ) بە هەموانی گوت دەعوەتین، دەڵێ ئافرەتەکە گوتی سەبرت هەبێ پێغەمبەر بە بەلاش وا نافەرموێ (ﷺ)، دەڵێ ئاخیری کە پێغەمبەر هات (ﷺ) ئافرەتەکە بینی گوتی مادەم خۆی هاتوە و بە پێشیان کەوتوە وە تۆش پێت گوتوە هەرتۆ دەعوەتی ئیلا پێغەمبەر (ﷺ) نیازی شتێکی هەیە، دەڵێ هەرکە هاتە ماڵمان پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) هەویرەکە بێنن ئاردەکە بێنن لە یەک لە ڕیوایەتەکان کە لە سەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوە تفی پێغەمبەر موبارەک بوە (ﷺ) عیلم و خەڵکی

ئێستا و بێدینان هەر چیمان پێ بڵێن ئێمە تفەکەمان پێ بەرەکەت بوە و موبارەک بوە و ئەمری الله وابوە لە یەک لە ڕیوایەتە سەحیحەکان دەڵێ تفەکەی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) لە ئاردەکەی هەڵسوی و لە هەویرەکەی هەڵسوی ئینجا لە پاشان (بسم الله) لێکرد و ئینجا لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی چەلاو و گۆشتەکەش بێننە بەردەستی من، هەرکە هێنایان (بسم الله) لێکرد جابر دەفەرموێ سوێند بە الله هەر هەزار سەحابەکە وە ماڵی ئێمەش وە پێغەمبەری اللەش (ﷺ) لێمان خوارد خواردنەکە هێشتا هەندێک مابۆوە بۆ دەر و دراوسێکان ڕەوانەی بکەین، ئەوە موعجیزەی پێغەمبەرە (ﷺ) ئێمە حەقمان بە قسەی کەسدا نیە پێغەمبەری الله پێغەمبەری الله بوە (ﷺ) ئەوە عەقیدەی ئەهلی سونە و جەماعەیە هەر ڕیوایەتێکی سەحیح جێگیر بوبێ ئێمە بە عەقڵ بیری لێ ناکەینەوە سەرەتا وەریدەگرین و ئینجا عەقڵی سەلیم لەگەڵی دەگونجێ و تەسلیمی دەبین و بڕوای پێدەهێنین و بڵاویشی دەکەینەوە.

ئینجا کافرەکان هاتن سەریان سوڕما تەماشایان کرد نەیان بینیبوو هیچ کاتێک ئەو نەوعە نەخشە سازیە نەبوو کە خەندەق لێبدرێ لە جەنگەکان، هاتن و نەیانتوانی کەوا بپەڕنەوە تەماشایان کرد و سەریان سوڕما لەولاشەوە حویەی کوڕی ئەخطەب کە باسمانکرد باوکی سەفیەی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) کە سەرکردەی جولەکەکان بوو لە دوای کەعبی کوڕی ئەشرەف وە بە تەنسیق لەگەڵ سەلامی کوڕی ئەبی حوقەیق ئەوانە چوبون قوڕەیظێ کانیان هاندا بوو لە جولەکەکان لەناو مەدینە پەشیمانیان کردبونەوە لە بەڵێنەکەیان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)، جولەکەش هەر ئاوا هەموو سەردەمەکان خیانەتکار بونە و بەڵێن شکێن بونە الله وا باسیان دەکا و وە بکوژی پێغەمبەران بونە (علیهم الصلاة والسلام)، ئینجا دەڵێ بەنو قوڕەیظەش حویەی کوڕی ئەخطەب لەناویان مایەوە و هانی دەدان و بەوەی ئەگەر بێو قوڕەیشیەکان و عەرەبەکان و غەطەفان و موشریکەکان سەرکەوتن بەدەست بێنن

داخیل ببنە ناو شاری مەدینە قورەیظیەکانیش لە پشتەوە لە موسڵمانەکان بدەن و تەواو موسڵمانەکان نەهێڵن و پاکیان بکەنەوە لە مەدینە بەڵام هەیهاتە هەیهات کەسێک کە اللەی لەگەڵدابێ -جل شئنە- الله پشتگیری بکا و پێغەمبەری اللەبێ (ﷺ) ئەو پیلانە نگریسانە چۆن سەردەگرێ بەسەر موسڵمانانەوە؟ هەتا موسڵمانەکان ڕاستە ترسی زۆریان گەیشتێ لە یەک لە ڕیوایەتەکان و بۆچونەکان دەڵێ موسڵمانەکان بیست شەو و ڕۆژ لەوێدا مانەوە جولەکەکان لە پشتەوە و وە موشریکەکان و ئەحزابیش لە دەوروبەری مەدینە و لەودیوی خەندەقەکە ئابلۆقەیان دابون هەندێکیش دەڵێن بیست و چوار ڕۆژ بوە و وە هەندێکیش دەڵێن مانگێک بوە کە مانگەکە بۆچونی قەتادەیە و وە بیست ڕۆژەکەش بۆچونی موسای کوڕی عوقبەیە.

جا موسڵمانەکان زەحمەتی زۆریان بەسەردا هات ئەوەتا خوای رب العالمین دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ لە قورئانی پیرۆز سورەتی (الأحزاب) ئایەتی (١٠) کە ئەو سورەتە بەناوی ئەو جەنگە دابەزیی و هاتە خوارەوە ئەحزاب واتە حیزبە کافرەکان کۆمەڵە کافرەکان تاقمە کافرەکان کە کۆبوبونەوە و هاودەنگ بون لەسەر ئەوەی هێرشی سەر مەدینە بکەن و موسڵمانان لەناو ببەن الله دەفەرموێ: ﴿إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ﴾ [الأحزاب: ١٠] دەفەرموێت ئەوکات وابوو موسڵمانەکان زۆر زەحمەتیان بەسەردا هات ئەوکاتە بوو کە لە سەرەوە بۆتان هاتبون لە ژێرەوە و لە پشتەوەش ناپاکیتان لەگەڵ کرابوو ئا ئەوکاتە چاوەکانتان ئەبڵەق بوو بوو وە دڵەکانتان دەلەرزی پێتان وابوو کەوا ڕزگارتان نابێ ئەی موسڵمانەکان لە چرکەساتی کۆتایدا خوای رب العالمین داوا دەکات و ئەو کاتە بەسەریاندا زاڵ دەبن موسڵمانەکان ئێستا دەیگەینێ و بۆتان دەگێڕینەوە، هەندێک لە زانایان دەفەرمون: ﴿مِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ﴾ دەفەرمون مەبەستی

پێ ئەبو سوفیانی کوڕی حەڕب بوو بە سەرکردایەتی کافر و موشریکا قوڕەیشیەکان لەولاوە بۆیان هاتبون.

لە یەکێک لە ڕیوایەتەکان ابن سەعد و ابن ئیسحاق ڕیوایەتیان کردوە بەس بە سەنەدی وەکو حەدیس دەست موسڵمانان نەکەوتوە کە ئەوە دەگێڕدرێتەوە گوایە پێنج لە موشریکەکان توانیان بپەڕنەوە لە خەندەق و حەفرەکە بەڵام لەولاوە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب چوو یەکێکیانی کوشت کە بەناوی عمرو بن عبد ود بوو وە لە پاشان نەوفەلی مەخزومیش زوبێری کوڕی عەوام کوشتی و سیانەکەی تریش کشانەوە و هەڵهاتن، بەڵام ئەوە هیچ سەنەدێکی نیە تەنها ئەهلی مەغازی ابن سەعد و ابن ئیسحاق گێڕاوێتیانەوە.

ئینجا لە پاشان وایان بەسەرهات موسڵمانەکان نوێژی عەسریان پێ نەکرا هێشتا باسی (صلاة الخوف) و نوێژی ترسی ناو جەنگ و جیهادیش دانەبەزیبوو لەسەر بۆچونی پەسەندی زانایان لەبەر ئەوەبوو نوێژی عەسری موسڵمانەکان چوو نەیاندەتوانی لە شوێنی خۆیان سێ هەزار موسڵمان بون بەرامبەر بە دە هەزار لە موشریکەکان وە پشتیشیان بەنو قوڕەیظە خۆیان ئامادە کردبوو ئینجا موسڵمانەکان نەیانتوانی نوێژی عەسر بکەن لەپاش مەغریب لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) کە تاریکی داهات توانیان کەوا بچن دەستنوێژ بگرن و لەوێوە نوێژەکەی خۆیان هی عەسریش بگێڕنەوە (والله أعلم بالصواب).

وە لەو ڕیوایەتەش کە دەڵێ نوعەیمی کوڕی مەسعودی کوڕی عامر موسڵمان بوو لەناو لەشکری موشریکەکان هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وە پێغەمبەری الله (ﷺ) پێیگوت تۆ تەنهای پێویستە تۆ بڕۆی و دوربکەویتەوە بچیەوە ناو کافرەکان پەرتەوازەیی بخەیە نێوانیان وە بەنو قوڕەیظیەکانیش پەشیمان بکەیتەوە لەوەی کەوا بڕوا بێنن بە قوڕەیشیەکان ئەوەی پێ ئەنجامدا و چوو کردی، ئەوەیشیان هیچ سەنەدێکی سەحیح نیە کە زانایان دەفەرمون بەڵکو بۆچونی پەسەند لەسەر ئەوەیە خوای رب العالمین ئەحزابی

تێک شکاند بەوەی کە دەفەرموێت: ﴿رِيحًا وَجُنُودًا﴾ [الأحزاب: ٩] واتە بە بایەکی زۆر بەهێزی ساردی هەڵکرد خوای رب العالمین وە سەربازی خۆی نارد بۆ ئەوەی کەوا موشریکەکان تێک بشکێنن و جەنگی ئەحزاب کۆتایی پێ بێت.

موسڵمانان نزیکەی یەک مانگ لەو حەسارەدا بون لەسەر ئیختیلافی ڕیوایەتەکان یان بیست و چوار ڕۆژ بوە یان یەک مانگ بوە لەو زەحمەتی و ناخۆشیەدا بون کە نەیاندەتوانی دەگێڕنەوە زاناکان لە ڕیوایەتدا سەحابەکان دەڵێن نەماندەتوانی بچین قەزای حاجەت بکەین هەر لە شوێنی خۆمان هەستابایینەوە تیر باران دەکراین کافرەکانیش ویستبایان بێنە پێش لە شوێنی خۆمان خۆمان قایمکردبوو تیر بارانمان دەکردن دەکشانەوە پاش، لەو زەحمەتی و ناخۆشیەدابوو کاتێک موناف‌ق و دەغەڵ و دوڕوەکان ئەوانەی بۆ دونیا بەگەڵ کەوتبون ئەگەر موسڵمانان سەرکەون مەبەستی دونیاییان هەبوو نەک قیامەت موناف‌ق بون دەغەڵ بون دوڕو بون ئا ئەوکاتە هەستان لەناو موسڵمانەکان دەیانگوت ئا ئەوە وەعدەکانی موحەمەدە ئەوە موحەمەد ئەو ئامرازەی دەوەشاند لە بەردەکە پێ دەکەنین بە پێکەنینەوە دەیانگوت گوتویەتی کلیلی شامم دراوەتێ و کلیلی لەولایە فارسیم دراوەتێ و یەمەنم دراوەتێ و لەگەڵ ئەوەدا ئێمە ئێستا باری ئەوانە وا نابەین وا ناتوانین لە شوێنی خۆمان هەڵبستینەوە بچین قەزای حاجەت بکەین ئا ئەوە وەعدەکانی موحەمەدە بە ئیستیهزا و گەمە کردنەوە وایاندەگوت، خوای رب العالمین لە کۆتایی ئەوانی سەر شۆڕ کرد و ئەمر و فەرمانی خۆی نارد خوای رب العالمین بەوەی کە دەفەرموێ: ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيۡظِهِمۡ لَمۡ يَنَالُواْ خَيۡرٗاۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلۡقِتَالَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزٗا﴾ [الأحزاب: ٢٥] الله بڕیاریدا بەسە شەڕ و کوشتن و زەحمەتی و ناخۆشی جەنگی خەندەق بەسە خوای رب العالمین دەفەرموێ کۆتایی پێ هێنا خوای رب العالمین بەهێز و زاڵە بەسەر هەموو شتەکان.

بەوەی خوای رب العالمین کاتێک نارد بۆ موسڵمانەکان و هەڵیکرده بایەکی یەکجار سارد ئەو بایە دەڵێ خێمەی قورەیشیەکانی لە بنەوە ئەو ئەستوندانەی کەوا قایمیان کردبوو خێمەکانیان پێ بەستبووەوە لە عەرز دەردەهات نەیاندەزانی چیبکەن وە نەیاندەتوانی تەواو بڕۆن لە شوێنی خۆشیان تەواو دابنیشن، خوای رب العالمین ئەو کاتە بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) کە الله وایلێکردن فەرموی کێ هەیە دەچێ دەنگوباسی قورەیشیەکانم بۆ بێنێ؟ حوزەیفەی کوڕی یەمان دەفەرموێ سوێند بە الله ئێمە هیچمان جورئەتمان نەکرد وەڵام بدەینەوە لە سەرمایی ئەو شەوەدا ئەوەندە سارد بوو وە ئەوەندەش زەحمەت بوو چونە ناو قورەیشیەکان، دەڵێ جاری دوەم فەرموی و جاری سێیەمیش فەرموی، دەڵێ لە سێیەم جار کە کەس وەڵامی نەدایەوە فەرموی هەستە حوزەیفە فەرمانی پێدام و ناوی هێنام گوتی بڕۆ ناو قورەیشیەکان هەواڵ و خەبەر بێنە بەس لە منیان ئاگادار مەکەوە دەست نەوەشێنی و هیچ نەکەی هەر بزانە چیدەکەن و بڕیاریان چیە، حوزەیفە دەڵێ هەستامەوە زۆر زۆر سەرمام بوو دەلەرزیم لە سەرمان وە لە ساردییان وە لە بێهێزیان بەڵام پێغەمبەر دەستی لەسەر پشتم دانام و دۆعای بۆکردم دەڵێ وەڵاهی وا دەرچوم وەکو کۆتر لە شەقەی باڵان دەدا و دەفڕێ هیچ لەرزینم نەما زەحمەتیم بەسەردا نەما ڕۆیشتم بەرەو ناو قورەیشیەکان، دەڵێ لەناو قورەیشیەکان کەوا دابەزیم دەڵێ ئەوکاتە ئەبو سوفیانم بینی پشتی لەمندابوو ویستم تیرێکی تێبگرم لێی بدەم و بیکوژم بەڵام قسەکەی پێغەمبەرم بەبیر هاتەوە (ﷺ) دەڵێ گوتم نا لێی نادەم و بە ئاگایان ناهێنم، دەڵێ چوم لەوێدا هەواڵەکە تێگەیشتم کە موشریکەکان زۆر شپرزە بونە بەو بایەی خوای رب العالمین ناردویەتی دەڵێ یەکسەر گەڕامەوە لای پێغەمبەر (ﷺ)، کە گەیشتمەوە خزمەتی و هەواڵەکەم بۆ گێڕایەوە دوبارە لەرزەکە منی گرتەوە دەڵێ شتێکی لەلابوو پێغەمبەر پێیدا دام (ﷺ)، دەڵێ هەتا بەیانی خەوم لێکەوت بەیانی پێغەمبەر (ﷺ) پەنجەی دەیگەیاندمێ و دەیگوت ئەو خەوە هەموی

چیبوو؟ حوزەیفە هەستەوە بەسە ئیسراحەتت نەکرد؟ دەڵێ لە ناکاو بە خەبەر هاتم و گەیشتمەوە سەحابەکان.

پێغەمبەر (ﷺ) لەو جەنگەدا دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ شوێنێکی شورەی هەبو وەکو باخ بوو من چومە ناو ئەو شوێنە لەگەڵ موسڵمانەکان دەرچوبوم لەو جەنگە دەڵێ بینیم پیاوێکی بە هەیکەل خۆی بەستابوو ئا ئەو پیاوە بە هەیکەلە بینیم عومەری کوڕی خەتاب بوو تیر و شمشێری پێبوو دەڵێ عومەر هەرکە منی بینی سەرزەمشتی کردم، گوتی ئای ئەوە لێرە چی دەکەی؟ ڕاستە تۆ بەغیرەتی ئەی عائیشە ئەوە بۆ هاتیە ئێرە؟ ئێرە زۆر ترسناکە لە هەموو شوێنەکان نزیکترە لە دوژمنانی ئیسلام، دەڵێ منیش گوتم بۆ ئەوە هاتوم بزانم موسڵمانەکان و سەحابەکان چیدەکەن؟ دەڵێ ئەوەندەی سەرزەنشت کردم لە دوایی کەوا یەک لە سەحابەکان بە وەڵام هات گوتی وازی لێبێنە بەڵکو دایکە عائیشە هاتوەتە ئێرە ئێمە دڵمان پێی بەهێزتر بوە وە چاکتر لنگ دەچەقێنین، دەڵێ ئینجا لەناکاو بینیم تیرێک هات لەلای کافرەکانەوە بە سەعدی کوڕی موعاز کەوت گەورەی ئەوسیەکان، سەعد لەوێوە بریندار بوو دەڵێ لە پاشان کەوا سەعدیان هێنایەوە لەو جەنگەی کە سەعد سەرۆکی ئەوسیەکانی ئەنساریەکان بریندار بوو، پیاوێکی یەکجار بە جورئەت بوو سەعد پیاوێکی بە مەوقیف بوو بەغیرەت بوو، دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) هێنایانەوە ماڵەوە سەعدی کوڕی موعاز و جەنگەکە بەوە کۆتایی پێهات کەوا کافرەکان کشانە وە بەنو قوڕەیظەش ترسیان لێ نیشت و موسڵمانەکان قوتاریان بوو خوای رب العالمین سەرکەوتنی بۆ ناردن وە مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکانیش قسە پڕو پوچەکەیان بە بەتاڵ چوو و ڕوو ڕەشیان بۆ مایەوە.

ئینجا دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) هاتەوە ماڵەوە و خۆی شۆرد زۆر ماندو و شەکەت بوو ئارەقەیەکی زۆری کردبوو دەڵێ من پێغەمبەرم

بینی (ﷺ) كه له ماڵەوه جوبڕائیل هاته لای، دەڵێ جوبڕائیل فەرموی دایكه عائیشه لەو ڕیوایەته دەفەرموێ «كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى الْغُبَارِ سَاطِعًا فِي زُقَاقِ بَنِي غَنْمٍ مَوْكِبَ جِبْرِيلَ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِ حِينَ سَارَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ[١]» دەڵێ جوبڕائیل هاته ماڵەوه گوتیه پێغەمبەر (ﷺ) یا رسول الله ئەوه چەكت له خۆت كردوەتەوه و له ماڵەوه دانیشتوی؟ دەڵێ ئەویش فەرموی بەڵێ ئەی جوبڕائیل، فەرموی دەنا ئێمەی فریشته و مەلائیكەتەكان چەكمان له خۆمان نەكردوەتەوه و دانەنیشتوین، فەرموی بەرەو كوێ یا جوبڕائیل؟ فەرموی ئەمر و فەرمانی اللهیه بەرەو ناپاكەكانی جولەكەكان بەرەو بەنو قوڕەیظه نابێ ئەوەیان بەسەر بچێ الله فەرمانی كردوه دەبێ تۆڵەی ئەوەیان لێ بستێندرێتەوه كه له پشتەوه ناپاكیان نواند كه بەڵێنیان دابوو به قوڕەیشیەكان له پشتەوه له موسڵمانان بدەن، دەڵێ پێغەمبەر كەوته خۆی (ﷺ) چەكی لەخۆی بەست گیانمان فیدای بێ، دەڵێ بانگی سەحابەكانی كرد و دایكه عائیشه -رضي الله عنها- دەفەرموێ سوێند به الله من تەماشام دەكرد لەشكرەكەی جوبڕائیلم وا بینی تۆز و غوباری پەیدا كردبوه له بەنی غەنم كه دەڕۆیشت بەرەو بەنو قوڕەیظه له خزمەت پێغەمبەر (ﷺ).

جا پێغەمبەر (ﷺ) ڕویكرده سەحابەكان و فەرموی «لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلَّا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ[٢]» فەرموی هیچێك له ئێوه نابێ نوێژی عەسر دوابخا ئیلا دەبێ له بەنو قوڕەیظه نوێژەكەی بكا، جا هەندێك له لەشكری موسڵمانان خێراییان كرد و بۆ نوێژی عەسر گەیشتنه قەڵای دەوروبەری بەنو قوڕەیظه لەوێدا نوێژەكەیان كرد و هەندێكیش گوتیان ئێمه نوێژ ناكەین هەتا دەگەینه ئەوێ پێغەمبەر وا فەرمانی كردوه ئەوەبوو نوێژەكەیان چوو دوایی كردیان، پێغەمبەر هی هەردوو لایانی به ڕاست و دروست دانا.

[١] صحيح البخاري (٤١١٨) (٣٢١٤)، مسند أحمد (١٣٢٢٩).

[٢] صحيح البخاري (٩٤٦) (٤١١٩).

ئینجا ئیمامی عەلی لەپێش پێشەوەی لەشکری موسڵمانان بوو ئاڵاکە بە دەستی ئیمامی عەلی بوو پێغەمبەریش لە دوای ئاڵاکە دەڕۆیی (ﷺ) سەحابە و موسڵمانەکانیش بەدوای ئەوانەوە بون، لە پاشان موسڵمانان چون دەورەی جولەکەکانی بەنی قورەیظەیان گرت، ئا لەوێوە ئەبو لوبابە کە دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ نزیکەی بیست و پێنج شەو موسڵمانان دەورەی بەنی قورەیظەیان گرت و لەوێدا مانەوە و بەنی قورەیظە تەنگیان پێ هەڵچنرا و لەوکاتەوە بوو ئەبو لوبابە کاتێک کەوا ئەبو لوبابەی کوڕی عەبدو مونذیر کاتێک جولەکەکان پێی دەڵێن ئەگەر ئێمە تەسلیم ببین دەبێ موحەمەد چیمان لێبکا؟ ئەو سەحابە بەڕێزەش ئاماژەیەکی وا دەکا لە دەستی دەردەچێ دەست لەسەر ملی دادەنێ واتە سەرتان دەبڕێ و یان دەتانکوژێ، ئا ئەوانیش ترسی زۆریان لێ دەنیشێ بەڵام ئەبو لوبابە لەوەی خۆی خۆشنابێ دەچێ بەخۆی خۆی عقوبە دەدا دەڵێ ئەو نهێنیەی پێغەمبەرم ئاشکرا کرد وەنەمزانی نەدەبوا وابڵێم، ئینجا لەوێوە موسڵمانەکان کە دەورەیان لێدان جولەکەکانی بەنی قورەیظە ترسێکی زۆریان لێ نیشت بەڵام هیچیان بە دەستەوە نەما لە کۆتایەکەیدا گوتیان ئێمە ڕازین ئەی موحەمەد (ﷺ) سەعدی کوڕی مەعاز ئەوەی بریندار بوو بوو گەورەی ئەوسیەکان چونکە پێشان برادەرمان بوە و بەڵێنمان لەگەڵ ئەوسیەکان هەبوە ئەو ببێتە حەکەم هەر بڕیارێکیدا ئێمەش پێی ڕازی دەبین، جا پێغەمبەریش فەرموی (ﷺ) بڕۆن بە چوار دەستە چونکە بریندار بوو سەعد سەعدم بۆ بێننە ئێرە، سەعدیان لەسەر پشتی وڵاخێک بە چوار دەستە هێنا ئینجا کە گەیشتە ئەوێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ» هەستنەوە بڕۆن بیهێننە خوارەوە بەرەو پیلی گەورەکەتان بڕۆن کە سەعدی کوڕی موعازە، سەعدی کوڕی موعازیان بە چوار دەستە هێنایە خوارەوە سەحابەکان ئەگەر بریندار بوبان و ئێشیشیان هەبا ئەمر و فەرمانی پێغەمبەری اللەیان نەدەشکاند (ﷺ) بە گیان و بە ماڵ لە خزمەت الله و پێغەمبەردا بون (ﷺ)، جا پێغەمبەر فەرموی ئەوە بەنی قورەیظە بە حوکمی تۆ ڕازین ئەی سەعدی کوڕی موعاز بزانم تۆش چیدەکەی، سەعدی

کوڕی موعازییش فەرموی پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەوەی من بۆی دەچم ئەوانە ناپاک بون، ئەوانەی چەک بە دەستبن و توانای چەک هەڵگرتنیان هەبوبێ و وە توانای شەڕ و جەنگیان هەبوبێ لەنێو بەنی قوڕەیظە فەرمان و ئەمرم وایە لەسەریان دەین و بیانکوژین، وە ئەوانەی کەوا منداڵ و ژنەکانیانن بیانگرین، وە ئەوانەی تریش ماڵ و سەروەت و سامانەکانیشیان بە غەنیمەت بێ بۆ موسڵمانان، دەڵێ پێغەمبەر ڕوی تێکرد و فەرموی «قَضَيْتَ يا سعد بِحُكْمِ اللَّهِ[1]» یان «بِحُكْمِ رسول الله (ﷺ)» فەرموی ئەی سەعد تۆ حوکمت کرد بە حوکمی خوای رب العالمین یان بە حوکمی پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، ئینجا جولەکەکانیان دەرهێنا ئەوانەی پێگەیشتبون و باڵغبوبون و توانای چەک هەڵگرتنیان هەبوو خۆیان بەستابوو بۆ شەڕی موسڵمانەکان بە غەدر و خیانەت و ناپاکی ئەگەر قوڕەیشیەکان سەرکەوتبان ئەوانەیان هێنا و موسڵمانەکان لەسەریاندان و ئەوانەیان کوشتن، لە ڕیوایەتێک دەڵێ سێ سەد بون و یەک دەڵێ چوار سەد بەڵام ئەوەیان زیاتر لە سەحیح نزیکترە زانایان دەفەرمون لەنێوان حەوت سەد و هەشت سەد کەسدا بون کاتێ کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد لەسەر حوکمەکەی سەعدی کوڕی موعاز لەسەریان بدرێ.

کاتێ کە سەعدی کوڕی موعازیان هێنایەوە پێغەمبەر (ﷺ) خێمە و خیوەتێکی لە نزیک مزگەوت بۆ هەڵدا هەر لەوێدا بمێنێتەوە و هەواڵی لە نزیکەوە بزانێ سەعد چی بەسەر دێ، ئەوە کۆتا حوکم و بڕیاری سەعد بوو چونکە لە یەک لە ڕیوایەتەکان دەڵێن سەعدی کوڕی موعاز کاتێ کەوا بریندار بوو داوای لە الله کرد و پاڕایەوە گوتی ئەی خوای رب العالمین من تەمەنم هەر بایی ئەوەندە دەوێ ئەگەر لەپێناو تۆ شەهید دەبم بمهێڵەوە هەتا ببینم موسڵمانەکان لە جەنگی ئەحزاب سەردەکەون و وە بەنو قوڕەیظەش تۆڵەیان لێ

[1] صحيح البخاري (٤١٢١) (٣٠٤٣) (٣٨٠٤)، صحيح مسلم (١٧٦٨)، سنن أبي داود (٥٢١٥).

بستێندرێتەوە بەبەر چاوی خۆم من ببینم ئەی خوای رب العالمین، الله ئەوەندە عومری سەعدی درێژ کردەوە و بە برینداری مایەوە دایکە عائیشە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ ئەبو بەکری باوکم لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب لەسەرینگانی سەعد دانیشتبون بە فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ)، دەڵێ من گوێبیست بوم کاتێک لە هاڕژنی گریانێیاندا دەنگی ئەبو بەکری باوکم جیا دەکردەوە لە دەنگی عومەری بەڵام هەردوکیان دەگریان زانیمان کەوا سەعد گیانی لە دەستداوە و وەفاتی کردوە، دەڵێن دایکە عائیشە ئەی پێغەمبەر چیدەکرد؟ دەڵێ پێغەمبەر وانەبوو(ﷺ) بە ئاسان نەدەگریا ئەگەر خەمێکی زۆری هەبا ڕیشەکەی خۆی دەگرت بە دەستی ڕاستە و سەری خۆی تۆزێک نزم دەکردەوە و دادەما پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوە غەمە هەرە گەورەکەی بوو کە دایدەگرت دەڵێ هی سەعدیشمان بینی وایکرد پێغەمبەر (ﷺ) لە پاشان فەرموی «اهْتَزَّ عَرْشُ الرَّحْمَنِ لِمَوْتِ سَعْدِ بنِ مُعاذٍ[١]» فەرموی بارەگای الله لەرزی لەگەڵ گیان دەرچوونی سەعد، واتە سەعد ئەوەندە بەڕێز بوە لەلای خوای رب العالمین، بەڵێ سەعد ئەو کەڵە پیاوە بوو وە بەنو قوڕەیظەش ئاوا کۆتاییان پێهات ئەسەدی کوڕی کەعبی سەرکردەی بەنی قوڕەیظەکان وە لەگەڵ حویەی کوڕی ئەخطەبی باوکی سەفیەی سەرکردەی بەنو نەزیریەکان و وە سەرکردەی جولەکەکانی تریش لەپاش کەعبی کوڕی ئەشرەف لەناو گیراوەکاندا بون و لەوێ ئەوانیش لەسەریاندرا و کۆتاییان پێهات و موسڵمانان سەرکەوتن بەسەر خیانەتی جولەکەکان و وە بەسەر پیلانی موشریک و کافرەکان و موسڵمانەکان حەسانەوە، ئەوکات بوو پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) تەواو لەمڕۆوە سەحابەکان بزانن ئێمە سەرکەوتوین جارێکی تر قوڕەیشیەکان و کافر و جولەکەکان ناتوانن هێرش بکەنە سەر مەدینە لەمەودوا ئێمە ڕێگامان پێدراوە و پێ دەدرێ هێرشیان بکەینە سەر.

[١] صحيح البخاري (٣٨٠٣).

## جەنگی بەنی موستەڵیق

جەنگی المريسيعيشی پێ دەگوترێ لەبەر ئەوەی ئاوێک هەبوو کە موسڵمانان گەیشتنە سەر ئاوەی هی بەنی موستەڵیق بوو ئەوە ئاوە پێی دەگوترا مورەیسیع هەر دوو ناوەکەی هەیە، وە چەند ڕوداوێکی گرینگ لەو جەنگە و لە دوای ئەو جەنگە ڕویدا پێویستی بە باسکردنە یەک لەوان بوختانکردن بە ناموسی پێغەمبەر (ﷺ) بە دایکە عائیشە، وە لە دوایدا عەسەبیەت و دەمارگیرایەتی بۆ هۆز و تیرایەتی لەبەینی موسڵمانەکانی موهاجیرین و ئەنسار، لە پاشان ڕۆڵی مونافیق و دەغەڵ و دوڕوەکان لە ڕووداوەکاندا، دەمانەوێ ئەوانەتان هەموو بخەینە بەر گوێچکە بە کورتی و پوختی.

بەنو موستەڵیق تیرەیەک بون لە تیرەکانی خوزاعیەکان کە خوزاعیەکانیش بەشێک بون لە عەرەب لەسەر بۆچونی پەسەندی مێژو نوسەکان قەحتانی یەمەنی بونە، ئینجا ئەو جەنگە لە چ ساڵێک دەستی پێکرد؟ جیاوازی هەیە لەنێوان زانایان، سێ بۆچون هەیە:

یەکەمیان دەڵێ لە ساڵی شەشەمی کۆچی بوو ابن ئیسحاق و خەلیفەی کوڕی خیاط و ابن جەریری تەبەری و وە لە پاشان ابن حەزمی ئەندەلوسی و وە ابن عبد البر و ابن العربي و وە ابن الأثير و ابن خلدون ئەوانە ئەوە بۆچونیانە.

بۆچونی دوەم دەڵێ لە ساڵی چوارەمی کۆچی بوو ئەوەش المسعودي لەگەڵ ابن العربي المالكي ئەوە بۆچونیانە و هەندێکی تریش.

بۆچونی سێیەم کە ئەوەیان پەسەند و سەحیحە دەڵێ لە ساڵی پێنجەمی کۆچی بوو بەڵام لە هەر سێ بۆچونەکان لە مانگی شەعبان بوە بەڵام بۆچونی سێیەم دەڵێ لە ساڵی پێنجەمی کۆچی بوو کە موسای کوڕی عوقبە و وە ابن سعد و ابن قتيبة و وە لە پاشان ئیمامی الذهبي و ابن القيم الجوزية و ابن كثير و ابن حجر العسقلاني وە لە سەردەمیەکانیش محمد الغزالي و بوطی و أبو شهبة و ساعاتی و محمد أبو زهرة و سید قطب و محمد علي الصابوني

و جگە لەوانیش ئەوە بۆچونیانە کە ساڵی پێنجەمی هیجری بوە ئەو جەنگە ڕویدا لە مانگی شەعبان.

لەبەرچی ئەو بۆچونەمان پەسەند کرد و ئێمەش پێمان وابوو ئەوە ڕاجیح و پەسەندە؟ لەبەر ئەوەی زۆرینەی زانا و مێژو نوسەکانی کە ئەهلی تەحقیق بونە کە ناومان هێنا هی هەندێکیان لە سەردەمیەکان و کۆن ئەوە بۆچونیان بوە، وە لەبەر ئەوەش لە ڕیوایەتی سەحیحدا هاتوە کە سەعدی کوڕی موعاز ئەوەی لە ڕابردو باسمانکرد کە گەورەی ئەوسیەکان بوو کە لە جەنگی بەنو قوڕەیظە لەپاش ئەوە وەفاتی کرد سەعد هەبوە کاتێ کەوا بوختان بە دایکە عائیشە کرا و پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر میمبەرەکەی مەدینە پاکانەی کرد و وە بۆچونە تەواو و ئەوەی ناو دڵی خۆی گوت کەوا چەند ئەزیەتی دەدەن دەربارەی ناموسی و هاوسەرەکەی و ئینجا لە پاشان سەعد هەڵدەستێتەوە دەڵێ ئەگەر مەبەستت ئەوەیە پیاوێک لە ئێمە وا دەکا لە ئەوسیەکانە هەتا بە دەستی خۆم بیکوژم ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر لە خەزرەجیەکانە و لە کەسی تریشە هەر فەرمانێکمان پێبکەی جێبەجێی دەکەین، کەواتە سەعد لە ژیاندا بوە لەبەر ئەوە ئەوە ڕاجیح دەکات کەوا جەنگی بەنو موستەلیق لەپێش جەنگی بەنی قوڕەیظەدا ڕویداوە و بوە کە ئەوە لە ڕیوایەتی سەحیحدا هاتوە، وە جەنگی بەدریش لە مانگی شەعبانی بەدری دوەم لە مانگی شەعبانی ساڵی چوارەمی کۆچی بوە ئا ئەو بۆچونانە هەموی ئەوە دەگەیەنێ کەوا بەڵێ جەنگی بەنی قوڕەیظە لەسەر قەولی ڕاجیح لە مانگی (ذو القعدة)ی ساڵی پێنجەمی هیجری بوو، کەواتە بەڵێ جەنگی بەنی موستەڵیق موڕەیسیع لە مانگی شەعبانی ساڵی پێنجەمی کۆچی بوە ئەو بۆچونە پەسەند و ڕاجیحە.

هۆکاری ئەو جەنگە ئەوەبوو کە بەنی موستەڵیقیەکان لە خوزاعیەکان بون خوزاعیەکانیش تیرەیەکی گەورە بون لەنێو عەرەبەکان و زۆر شەڕاوی بون ئینجا یەک

بون لەگەڵ قورەیشیەکان لە دژایەتی پێغەمبەر (ﷺ)، وە لە پاشان ئەوان دەستیان گرتبوو بەسەر هێڵ و ڕێگایە سەرەکیەکەی نێوان مەککە و مەدینە کاتێ کە موسڵمان ئەگەر بیانویستبا دەعوە و نفوظیان بڕوا بەرەو مەککە لەوێ ڕێگری هەبوو بەنی موستەڵیق وایاندەکرد و دەستیان بەسەر ئەو ڕێگایەدا گرتبوو، وە هۆکاری سەرەکیش ئەوەبوو کەوا بەنی موستەڵیق خۆیان کۆکردەوە خەڵکێکی تریش لەگەڵ خۆیان لەناکاو هێرش بکەنە سەر پێغەمبەر (ﷺ) و وە شاری مەدینە، پێغەمبەر (ﷺ) دەستپێشخەری کرد کە ئەو هەواڵەی زانی هاوەڵە بەڕێزەکانی کۆکردەوە ژمارەی موسڵمانەکان (٧٠٠) چەکدار بون لەگەڵ (٣٠) سوار بەگەڵ یەک کەوتن و لە ڕۆژێک لە ڕۆژەکان کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی دیاریکردبون ڕۆژی دوشەمە بوو وە دوو شەو ڕۆیشتبوو لە مانگی شەعبان ساڵی پێنجەمی کۆچی پێغەمبەر بەڕێکەوت (ﷺ) بەرەو هێرش کردن بۆسەر بەنی موستەڵیق، ئیمامی بوخاری و موسلیم بۆمان دەگێڕنەوە و فەرمودەکە سەحیحە کە دەفەرمون «أَن رسول الله (ﷺ) أَغارَ عَلَيهم، وَهُمْ غَارُّونَ» پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵە بەڕێز و چەکدارەکانی هێرشی کردە سەر بەنی موستەڵیق لە ناکاودا دەستپێشخەری کرد و وە بەشەو چوە سەریان و ئەوان ئاگایان لە خۆیان نەبوو، لەبەر ئەوەیە زانایانی فیقهی بەو بەڵگەیەوە چەندین بەڵگەی تریش دەفەرمون دروستە موسڵمانان وە ئەمیری موسڵمانان کاتێک بزانن دوژمنەکانیان هێرشیان بۆ دەکەن یان ترسناکیان هەیە لەسەر موسڵمانان لە ناکاو و شەو بەسەریاندا بدەن پێغەمبەر وایکرد (ﷺ)، وە لەو ڕیوایەتە هاتوە دەفەرموێ «وَأَنْعَامُهُمْ تُسْقَى عَلَى الْمَاءِ» ئەوان مەڕەکانی خۆیان و حوشترەکانی خۆیان ئاو دەدا لەسەر ئاوی موڕەیسیع و ئاوەکانی هەیان بوو لەناکاو بوو نەیانزانی پێغەمبەر (ﷺ) بەسەریاندا دەدا لەبەر ئەوە پێغەمبەر بە لەو ناکاویەی کە بەسەریدا دان سەرکەوتوو بوو «فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ، وَسَبَى ذَرَارِيَّهُمْ، وَأَصَابَ يَوْمَئِذٍ جُوَيْرِيَ بنت الحارث بن أَبي ضرار[1]» پێغەمبەر (ﷺ)

[1] صحيح البخاري (٢٥٤١)، صحيح مسلم (١٧٣٠)، سنن أبي داود (٢٦٣٣).

چەکدارەکانی ئەوەی لەسەر ئەوێدا بون و پاسەوان بون گرتنی و کوشتنی له پاشان منداڵەکانی هێنا و وه عائیله و ئافرەتەکانی گرت به جاریه لەگەڵ خۆی هێنایانیەوه، له پاشان هەر لەو جەنگەدا بوو جوەیریەی کچی حاریث کەوا سەرکرده و گەورەی بەنی موستەڵیق بوو ئەو ئافرەته بوه هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ)، هاوسەرایەتی لەگەڵ پێغەمبەر ئاوا ڕویدا (ﷺ)، جا پێغەمبەر به ماوەیەکی زۆر کەم و کورت سەرکەوتوو بوو گەڕایەوه، جوەیریه کەوتبوه بەشی ثابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماس یان کوڕە مامەکەی ئەو وەکو جاریایەتی و بەش به نسیبی ئەوان بوو بوو بەڵام جوەیریه ئافرەتێک بوو کچه سەرکرده بوو زۆر بەرچاویش بوه زۆریش خاتون بوه لەبەر ئەوه بڕیاریدا گوتی خۆم دەکڕمەوه به چەندی دادەنێن بۆ ئەوەی له کۆیلایەتی ڕزگارم ببێ و به جاریه نەمێنمەوه؟ ئەوانیش ئەوەیان بۆ دیاریکرد بەو مەبەسته جوەیریه چوه خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، گوتی ئەی موحەمەد (ﷺ) هاتومه دەرگات من جوەیریەی کچی حاریثم سەرکردەی بەنو موستەلیق هاتوم ئەگەر یارمەتیم بدەی دەمەوێ خۆم بکڕمەوه و نەبمه جاریه، جا پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو هەرچیت دەوێ بۆت دەکەین یارمەتیت دەدەین بەڵام شتێکی لەوه باشترت ئەگەر بۆ پێشنیار بکەم پێوەی ڕزگاریش دەبی له دونیا و له قیامەت دەتەوێ؟ ئەویش گوتی چیه؟ گوتی ئەگەر ڕێزی ئەوەت لێبنێم بتکەمه هاوسەری خۆم ئەگەر تۆ ڕازی بی هەم ئازاد دەبی له جاریایەتی وه هەم له قیامەتیش کاتێک دەبیته موسڵمان به دڵنیاییەوه سەرفراز دەبی و داوات لێدەکەم ببیته موسڵمان و ببیته هاوسەرم، دەڵێ جوەیریه دەڵێ دڵم زۆر زۆر خۆشبوو سەنگ و گەورایەتی پێغەمبەرم بۆ بەدیار کەوت (ﷺ) خۆ ئەوه ئەگەر باوکم با هەر سەرکردەیەکی تربا بەرامبەر به دوژمنەکەی قەت ئەو ڕێزەی لێنەدەنا و قبوڵی نەدەکرد ئابڕووی دەبرد که ناموسی کەوتبا بەردەستی زانیم ئەو پیاوه پیاوێکی عادەتی نیه زۆر به ڕەوشت و ئەخلاقه زۆر سەنگین و گەورەیه و لێبوردەیه، دەڵێ زۆر به دڵ خۆشیەوه و دڵم زۆر موڕتاح بوو گوتم ڕازیم هەزار جار ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) دەڵێ ڕوم تێکرد

و پێم گوت (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أنك رسول الله) بوه موسڵمان، پێغەمبەر مارەیکرد (ﷺ)، بزانن ئەوانەی دوژمنانی ئیسلامن بوختان بە پێغەمبەر هەڵدەبەستن (ﷺ) وەکو لە سەرەتاش باسمان کرد ئایە پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی ڕابواردن و شەهوەت دامرکانەوە بوە؟ نەخێر حاشا لیلا، بەڵکو تەنها هەر هاوسەرایەتیەکی کردبێ لەگەڵ هاوسەرەکانی ئیلا هەر هاوسەرگیرایەتیەکی بەستابێ لەپێناو چەندین حیکمەت و کاروباری خەیر بوە بۆ ئیسلام و ئومەتەکەی، دەڵێ جوەیریە کاتێک دەبێتە هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) بڵاو دەبێتەوە بەناو موسڵمانان دەڵێن پێغەمبەر جوەیریەی مارەکرد (ﷺ) هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەریان زۆر خۆشدەویست -رضي الله عنهم- (ﷺ) وە دڵسۆز بون بۆی وە زۆر ڕێزیان لێدەنا، گوتیان باشە چۆن دەبێ خزم و کەسەکانی ماڵە خەزورانی پێغەمبەر (ﷺ) لەلای ئێمە جاریەبن یان کۆیلەبن؟ بڕۆن ئەی هاوەڵە بەڕێزەکان هەمومان بە یەک دەنگ هەموو جاریەکان وە هەموو کۆیلەکان ڕزگار دەکەین و ئەوە ئازادمان کردن، هیچ ئافرەتێک نەبوە خەیری بەنێو چاوانەوە بوبێ مێژونوسان دەفەرمون وەکو جوەیریە خەیری بەنێو چاوانەوە بوو بۆ گەل و هۆز و قەبیلەکەی، سەد کەس لە بەنو الحاریث و بەنو موستەلیق ئازاد کران، ئینجا حاریسی باوکی جوەیریە کە هەڵهاتبوو لە جەنگ و شەڕەکە بەبەر دەستی موسڵمانان نەکەوتبوو ئەویش ئەوەی بیستوو هاتەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گوتی ئەوەی تۆ کردوتە ئەی موحەمەد هیچ کەڵە پیاوێک لە مێژودا نەیکردوە ئێمە ئەوەندە بێڕێز بوین لەگەڵت دوژمن بوین لەگەڵت دەمانویست لەناکاو هەرچی خراپە بەسەرت بێنین تۆ ڕێزم لێدەنێی و کچەکەی من دەکەیتە هاوسەری خۆت و هەموو شتت کەوتوەتە بەردەست ئینجا کۆیلەکان و جاریەکان هاوەڵە بەڕێزەکانت ئازادیان دەکەن، ئەوە چیە تۆ هێناوتە لەلای الله؟ ئەویش گوتی ئیسلامە وەرە تۆ موسڵمانبە ئەی حاریث، حاریشیش دەست بەجێ دەفەرموێ (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أنك رسول

الله) موسڵمان بون، له مێژوی ئیسلامدا هیچ تیره و قەبیلەیەک بە یەکەوە و بە یەکدەستی جەماوەرەکەیەوە موسڵمان نەبوە وەکو بەنو موستەلیق موسڵمان بون.

بابێین ئەلێرەوە ئەو ڕووداوانە باسکەین کە لەو جەنگە ڕویدا و پەیوەستی هەڵوێستە لەسەر کردنە:

یەکەم لەو ڕوداوانە کە جێگای پەند و وانەیە دەبێ لێی تێبگەین و حاڵییبین موناڧیق و دەغەڵ و دوڕووەکان وە جاسوسەکان لەنێوان موسڵمانان ئەگەر لەسەرەوە موسڵمانێتی نیشان دەدەن لە دڵدا دڵ بۆگەن و ڕزیون هەردەم لە هەلێک دەگەڕێن یەک قسە یەک پەلە لەنێو موسڵمانان دروست ببێ ئەوان بیقۆزنەوە و زیاتری لەسەر دابنێن ئەگەر پەڕەموچەیەک ئاگر بگرێ ئەوان فوی لێدەکەن ئاگرەکە خۆش ببێ فیتنە و ئاشوبەکە هەموو موسڵمانان بگرێتەوە و ئیسلام و موسڵمانان شکست بێنن بەڵام هەی هاتە هەی هات دینێک کە خوای رب العالمین ناردبێتی پێغەمبەرێک (ﷺ) کە الله پشتگیری کاریبێ وە لە هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان سەنگینتری کردبێ لەلای خۆی و بەڕێزتربێ، چۆن فوو بە ئاگر کردنی موناڧیق و دەغەڵ و دوڕووەکان سەردەگرێ؟ بەڵێ لەو جەنگە بوو کاتێ کەوا بۆمان دەگێڕنەوە سەحابە بەڕێزەکان کە ابن حەجەریش لە (فتح الباري)دا دەفەرموێ ابن ئیسحاق فەرموی ئەو غەزوە و جەنگەی کە لە سەحیحی بوخاری هاتوە و وە لە هەندێک ڕیوایەتی تریش هاتوە کەوا عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول کاتێک دەنگی لێوە هات لەو ڕوداوەی کە ئێستا بۆتان دەگێڕینەوە گوتی: ﴿لَئِن رَّجَعنَا إِلَى ٱلمَدِينَةِ لَيُخرِجَنَّ ٱلأَعَزُّ مِنهَا ٱلأَذَلَّ وَلِلَّهِ ٱلعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلمُؤمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلمُنَٰفِقِينَ لَا يَعلَمُونَ﴾ [المنافقون: ٨] سەرۆکی موناڧیقەکان عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول کاتێک موهاجیرێک لەگەڵ ئەنسارییەک «فَكَسعه» لە ڕیوایەتەکە هاتوە واتە بە پێلاقە پێیەکی لە پاشەری ئەویتردا، ئەویش گوتی بۆ وام لێدەکەی من ئەنسارم تۆ موهاجیری؟

ئەنساریەکە گوتی «يا لَلأَنْصارِ» ئەی ئەنساریەکان لە هانام وەرن موهاجیرە لێیدام شەیتان ئەو فێڵەی لێکرد، کۆمەڵێکی زۆر لە مونافیق و دەغەڵ و دوڕوەکان لەو جەنگەی لەگەڵدا بون عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولیش کە سەرکردەیان بوو ئەویش لەگەڵدا بوو، دەڵێ موهاجیرەکەش هاواری کرد گوتی «يا لَلْمُهاجِرِينَ» ئەی موهاجیر و کۆچکەرەکان ئەوە ئەنساریە و بانگی ئەنساریەکان دەکا تۆڵەم لێ بستێننەوە، دەڵێ لەوە دەمە قاڵێ پەیدابوو لەنێوان ئەو دوو هاوەڵانە، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول کە گوێبیست بوو پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵامی هاوەڵەکان کە هەواڵی پێگەیشت فەرموی ئەوەی ئێوە هاواری لێدەکەن «دَعُوها فإنَّها مُنْتِنَةٌ» کە تۆ دەڵێی ئەنساریەکان بێنە هانام من ئەنساریمە و ئەوە دەڵێ موهاجیرەکان بێن من موهاجیرینم، ئەوە وازلێبێنن ئەوە گەندەڵ و بۆگەنە ئەو دەمارگیریە ئەو تەعەسوبە بۆ عەشیرەت و هۆزی خۆت سەرتبخا ئێوە هەموتان موسڵمانن موسڵمان لەگەڵ موسڵمان برایە نابێ پشت بە عەشیرەتەکەی ببەستی و تەعەسوب و دەمارگیریەت بیگرێ چونکە دەمارگیریەت شتێکی گەندەڵ و بۆگەنە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ)، جا عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول لە ڕیوایەتەکان هاتوە کەوا یەکسەر وایگوت کە گوێبیستی پێغەمبەر بوو (ﷺ) گوتی ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە شاری مەدینە ئەوانە هیچ نەبون موهاجیرەکان ئێستا هاتونە و لێرە خۆیان زۆر کردوە و بەسەر سەری ئێمە ئەنسارەوە قسەی زل زل و گەورەش دەکەن، ئەگەر بچینەوە شاری مەدینە ئەوکات دەبینن خەڵکە بە عیزەتەکان خەڵکە زەلیل و ژێر دەستەکان دەردەکا مەبەستی پێ پێغەمبەر و (ﷺ) موهاجیرین بوو.

کاتێک ئەو ڕوداوە ڕویدا بزانن هەڵوێستەکانی کەسی موسڵمان ئەگەر ئیمانی لە دڵدابێ لێرە وەلاء و بەڕاء دەردەکەوێ لێرە ئەوە دەردەکەوێ ئەگەر کەسێک لە قەوم و نەتەوە و گەل و هۆزی خۆشتدابوو تەنانەت ئەگەر باوکیشت بوو قسەی گوت بە ئیسلام و بە

پێغەمبەر (ﷺ) ئەوکاتەی تۆ ئیماندارى ڕاستەقینەی قبوڵی نەکەی هەڵوێستێکی مەردانەت هەبێ وەکو عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هەڵوێستی نواند کە کوڕەکەی کەسێکی ئیماندارى ڕاستەقینە بوو، چوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئەی پێغەمبەرى الله بیستومە چونکە زەیدی کوڕی ئەرقەم کە گوێی لەو قسەبوو هات بۆ پێغەمبەرى گێڕایەوە (ﷺ) گوتی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول پێغەمبەرى الله وایگوت کاتێک تۆ وتت واز بێنن ئەوە شتێکی گەندەڵ و بۆگەنە تەعەسوبیەت بۆ هۆز و عەشیرەت گوتی بگەڕێینەوە مەدینە دەزانن بە عیزەتەکان زەلیلەکان دەردەکەن مەبەستی تۆ بوو ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، جا زەید کە وایگوت پێغەمبەر (ﷺ) بانگی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی کرد لەناو خەڵکەکە گوتی قسەی وات کردوە عەبدوڵا؟ مونافق و دەغەڵ و جاسوسەکان درۆ لەلایان زۆر ئاسانە بەڵام بێئاگان لەوەی خوای رب العالمین ڕاست و درۆیەکان لە پاشان هەڵدەوەشێنێتەوە و هەموی بەدیار دەخا، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی سەد سوێندی خوارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گوتی قسەی وا لە زمانی من دەرنەچوە شتی وام نەگوتوە، زەیدی کوڕی ئەرقەم دەڵێ زۆر بەسەر خۆمدا شکامەوە سوێند بە الله گوێم لێبوو ئەو وایگوت دەڵێ من خەتابار دەرهاتم و چومەوە ژێر خێوەتەکەی خۆم بەڵام پێغەمبەر پاش ماوەیەک بانگی زەیدی کرد (ﷺ) فەرموی وەرە ئەی زەید «إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ يَا زَيْدُ[١]» فەرموی خوای رب العالمین بێگومان تۆی بەڕاست دانا ئەی زەید ئەو درۆیکرد سوڕەتی (الْمُنَافِقُونَ)م بەسەردا دابەزی سوڕەتی (الْمُنَافِقُونَ) ئەوە سەبەب نزولی بوو کە الله تعالى فەرموی: ﴿إِذَا جَاءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ﴾ ئەگەر مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکان بێن دەڵێن شایەتی دەدەین تۆ ڕەوانەکراو و پێغەمبەرى اللەی: ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ﴾ جا الله دەزانێ بە چاکی ئەو ئەو بڕیارەی داوە تۆ پێغەمبەرى ئەوی و ڕەوانەکراوی ئەوی (ﷺ) بەس: ﴿وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ

[١] صحيح البخاري (٤٩٠٠) (٤٩٠١) (٤٩٠٣)، صحيح مسلم (٢٧٧٢)، سنن الترمذي (٣٣١٢) (٣٣١٤).

لَكَٰذِبُونَ﴾ [المنافقون: ١] بەڵام الله شاهێدی ئەوەش دەدا مونافق و دەغەڵ و دوڕوەکان ڕاستت لەگەڵ ناڵێن ئەوان درۆزنن، ئینجا ئیمامی عومەر هەڵیکێشا شمشێر فەرموی «يَا رَسُولَ اللَّهِ، دَعْنِي أَقْتُلْ هَذَا الْكافر والْمُنَافِقَ» فەرموی لێم گەڕێ با بچم سەری بپەڕێنم هی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول ئەو مونافیقە کافرە ئەوە بۆ وە دەڵێ و وا دەکا؟ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «عَلَى رِسْلِكَ على رِسْلِكَ يَا عُمَرُ» لەسەرخۆبە لەسەرخۆبە عومەر، ناکرێ دوایە بڵاو بێتەوە لەناو خەڵکی خەڵک نازانن ئەوە چ مونافقێکە بڵێن موحەمەد هاوەڵی خۆی دەکوژێ (ﷺ) بۆ پاراستنی ئەو سومعە ئەوە حیکمەتە کەوا نەیکوژین و لێیگەڕێ، ئا ئەو کاتە بەڵێ دیارە غیرەتیان دەجوڵێ سەحابەکانی ئەنساریش لەوانە کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول کە ناویشی عەبدوڵا بوو دێتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ بیستومە ئایەت دابەزیوە ئەی ڕەسول الله وە زانیویشمە باوکم چی بە تۆ وتوە سوێند بە الله یەک داوام هەیە داواکەم ئەوەیە حەزناکەم کەسێک باوکم بکوژێ چونکە باوکمە نەوەک ئەو موسڵمانە دوایی من غیرەتم بجوڵێ ڕقم لێی بێتەوە وەڵاهی ئەمر بکە دەزانم ئەوە مونافقە و قسەکانی زۆر نا ڕێگە سوێند بە الله ئەگەر بە ئەمری تۆ بێ ئێستا باوکم دەکوژم لە کۆڵ تۆی دەکەمەوە، ئەوە مەوقیف و هەڵوێستی ئینسانی ئیماندارە خاوەن وەلاء و بەرائی ڕاستەقینە ئەوەی قیامەتی کەوێ و دونیای لەلا هیچ نیە، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) نەخێر ئەی عەبدوڵا بەڵکو ئەوەم لەتۆ داوایە لەگەڵی چاکبە چونکە باوکتە با لەسەری قەرزار نەبیتەوە بۆ قیامەت لەگەڵی چاکبە عومرێکی ماوە با ئەو عومرە لەگەڵمان بژی و لێی دەگەڕێین قەیناکە هەرچی دەکا با بیکات ئاوام پێ چاکترە، ئینجا دەڵێ لەشکرەکە کاتێک دەگەڕێتەوە بەرەو مەدینە عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول پاڵەوانە موسڵمانەکە کوڕی سەرۆکی مونافقەکان لە دەرگای مەدینە شمشێر هەڵدەکێشێ دەچێتە پێش باوکی دەڵێ سوێند بە الله باوکە تۆش دەزانی کە من سوێندم خوارد پەشیمان بونەوەی نیە ئا لێرەدا دەبێ بیسەلمێنی ئایە تۆ زەلیلەکەی دەچیەوە ناو

مەدینە و پێغەمبەر بە عیزەتە ئەگەر ئەوە نەڵێی بەو شمشێرە لە سەرت دەدەم و زەلیلترت دەکەم، دەڵێ بە دەنگ وابڵێ با خەڵک گوێیان لێبێ، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بە دەنگ دەڵێ کاکە من زەلیلم ئەو قسە ئەگەر لە دەمیشم دەرچوە مەبەستم بوو ئێمەی زەلیل بەعیزەتەکان دەرمان دەکەن کە موحەممەد و سەحابەکانن (ﷺ)، ئینجا عەبدوڵای پاڵەوانی کوڕی سەرۆکی موناقیقەکان گوتی ئێستا بۆت هەیە بچیتە ناو مەدینە پێغەمبەر بەعیزەتە (ﷺ)، ئەوە هەڵوێستی ئیمانانەیە.

ئینجا ڕوداوێکی تر بەڕێزان لە دوای ئەو جەنگە و لەنێو ئەو جەنگە کەوا ڕویدا زۆر مەشهور و بەناو بانگە زۆرجار گوێبیستی بوینە کە جابر بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) «غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)» ئێمە لە جەنگێکدا بوین لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)، کە مێژونوسان دەفەرمون جەنگی بەنو موستەلیق بوو، دەڵێ لە گەڕانەوەکەی «فَلَمَّا أَدْرَكَتْهُ الْقَائِلَةُ وَهُوَ فِي وَادٍ كَثِيرِ الْعِضَاهِ» دەڵێ کە گەیشتینە دۆڵێکی ناوی قائیلە بوو لەوێد داری زۆر لێبوو سێبەری هەبوو دەڵێ پێغەمبەر دابەزی (ﷺ) لەژێر سێبەری دارێک ئارەقەی کردبوو بۆ ئەوەی پشوو بدا و وە سەرخەوێک بشکێنێ، دەڵێ ئێمەی هاوەڵانیش پەرت و بڵاو بوین بەدەوروبەری ئەوێدا و پێغەمبەرمان جێهێشت (ﷺ) دەڵێ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) شمشێرەکەی بە لکی دارێکەوە کردبوو دەڵێ کاتێک ئێمە لەناو هەر چوین ئەوەندەمان بینی کەسێکی ئەعرابی دەشتەکی لە کافر و موشریکەکان لەبەر دەستی پێغەمبەر دەلەرزی و دانیشتبوو (ﷺ)، دەڵێ پێغەمبەر فەرموی «إِنَّ هَذَا أَتَانِي وَأَنَا نَائِمٌ» فەرموی من خەوتبوم هاوەڵە بەڕێزەکان ئێوەش لێرە نەبون ئەوە هاتو شمشێرەکەی منی دەستدابویە و هەڵیکێشابوو لە کالانەکەی لەسەر سەرم وەستابوو پێی گوتم ئەی موحەممەد (ﷺ) «مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟» کێ لە دەستی من تازە قوتارت دەکا موحەممەد؟ هەلە بۆم هەڵکەوتوە و دەتکوژم، پێغەمبەریش دەفەرموێ (ﷺ)، پێغەمبەر

ئیماندارە پڕە لە غیرەت و لە حیکمەت و لە ئیمان پشتی بە الله بەهێزە ئینسانی موسڵمان ئەگەر تاکە کەسیش بێ لە بەرامبەر هەموو کافر و بێ بڕواکان وە لە زیندانیش بێ لەبەر دەستی ئەوانیش بێ وە تفەنگی بەرامبەر ڕاگرن یان شمشێر ئیمانەکەی پاڵی پێوە دەنێو تەوەکول دەکاتە سەر الله اللەی خۆی ناسیوە دەزانێ الله دەتوانێ قوتاری بکا، ئەگەر ئەمری اللەش ئەوەبێ شەهیدبێ ئەوەشیان هەر سەرکەوتنە لەبەر ئەوە موسڵمان قەت بێعیزەت نابێ بە عیزەتەوە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەی جابر و سەحابەکان ئا ئەو کەسە بوو وای بە من گوت، دەڵێ منیش لە وەڵامیدا من لەسەر پشت خەوتبوم من ڕاکشابوم ئەویش شمشێری ڕوتی منی بە دەستەوەیە و لەسەر سەری ڕاگرتومە دەڵێ «مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟» کێ لە دەستی من قوتارت دەکا؟ دەڵێ منیش بە یەک دەنگم پێم گوت الله الله الله، دەڵێ لەرزی کافرەکە لە بەرامبەرم و شمشێرەکە کەوتە خوارەوە لە دەستی، لەبەر ئەوە لە هەموو جەنگێک وابوە لە مێژوی ئیسلامەتیدا چەکی گەورەی موسڵمانان تەکبیر و (الله أكبر)ە ئەگەر پشتیان بە الله بەست و ناوی اللەیان هێنا کافر و موشریکەکان هەر چەکێکی قورس و زۆریشیان پێبێ ئیلا دەلەرزن هیچیان پێ ناکرێ دەستەوسان دەبن لە بەرامبەر موسڵمانەکان مێژوو شاهێدە، جا پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) چۆکی شکا ئەو کافرە من دەستمدایە شمشێرەکەی لە یەک لە ڕیوایەتەکانی تر دەڵێ گوتم «مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي أَيُّهَا الْكَافِرْ؟[1]» ئەی تۆی کافر کێ لەبەر دەستی منت قوتار دەکا؟ ئەوە من الله قوتاری کردم، دەڵێ ئەویش زۆر زانبوو گوتی ڕەحم و بەزەیی و سۆزی تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ) گەورەیی و پیاوەتی تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ).

ئینجا ئەوە دەردەکەوێ لەو ڕیوایەتەش کە الله فەرموی بە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ [المائدة: ٦٧] الله دەتپارێزێ پاسەوانەکانت بنێرەوە ماڵەوە لە مەدینە،

[1] **صحيح البخاري** (٢٩١٠) (٢٩١٣) (٤١٣٤)، **صحيح مسلم** (٨٤٣)، **مسند أحمد** (١٤٣٣٥) (١٤٩٢٨) (١٥١٩٠).

بەڵێ الله هەموو جارێک پێغەمبەری خۆی ئاوا پاراست (ﷺ)، وە ئیمان بەهێزی پێغەمبەر دەردەخا (ﷺ) وە تەوەکولی لەسەر خوای رب العالمين، جا ئێمەش دەبێ چاوی لێبکەین لە هەموو تەنگانە و ناخۆشیەکان مەلەرزە کەسی موسڵمان هەرچیت پێدەڵێ کافر و بێدین ئەو کاتە ڕوەوڕوی بوەستە بڵێ من پشتم بە الله بەستوە الله لە هانام دێ الله ئەگەر ئەمری وابێ لە دەستت قوتارم دەبێ بەڵکو خوای رب العالمين قوتارت بکا.

کۆتا ڕوداو لەو جەنگەدا بوختانەکەی بە ناموسی پێغەمبەر کرا (ﷺ) ئەو بوختانەی کەوا کافر و مونافیق و دوڕوەکان بڵاویان کردەوە لە دژی پێغەمبەر (ﷺ) کە گوایە دایکی ئیمانداران (پەنا بە خوای رب العالمين) کەوا زینای کردوە و خراپەی کردوە، کاتێ کەوا لەو جەنگە بوو دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە -رضي الله عنها- زانایان دەفەرمون لەو جەنگە بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) دایکە عائیشەی لەگەڵدا بوو، کاتێ کەوا بارگەیان تێکنا موسڵمانەکان و پێغەمبەری الله (ﷺ) کەوا بگەڕێنەوە دایکە عائیشە دەفەرموێ ملوانکەیەکم هەبوو «عِقْدٌ لِي مِنْ جَزْعِ أَظْفَارٍ قَدِ انْقَطَعَ» دەفەرموێت من ملوانکەیەکم هەبوو کەوا ئەو ملوانکەیە لە مورو دابون موروەکانی ڕەش و سپی تێکەڵ یەک بون ئەوە مەشهورە و دەڵێ لە یەمەن زۆر بەنرخ بوە و بەناو بانگ بوە کە لەیەک لە ڕیوایەتەکان هاتوە نەجاشی داویەتیە خوشکی دایکە عائیشە لە حەبەشەوە ئەویش کردبویە هەدیە بۆ دایکە عائیشە دەڵێ زۆر لەلام بەنرخ و بەقیمەت بوو، کاتێ کەوا ئەوەم لێ ون بوو بوو چوم قەزای حاجەت بکەم بەدوایدا گەڕام هاتمەوە نزیک خێوەتەکەی خۆم موسڵمانەکان بێئاگابون لەوەی من لەناو هەودەجەکەدا نیم، ئەوەی لەسەر پشتی حوشتر دادەنرێ و پەردەی پێدا دێتە خوارەوە و ئافرەتان لەناویدا سوار دەبن، دەڵێ من ئەو کاتە گەنجیش بوم ئەوەندە گۆشتن نەبوم و قەڵەو نەبوو بوم کە بە سوکیش حوشترەکە هەستاوە و هەودەجەکان هەڵیان گرتبوو سەحابەکان هەستیان بەوە نەکرد کەوا بۆ ئەوەندە سوکە هەر

وایاندەزانی منی تێدایە و ڕۆیشتبون و بەڕێکەوتبون، دەڵێ هاتمەوە لای خێوەتەکە بینیم موسڵمانەکان لەوێ نەماون دەڵێ گوتم ئیشێکی خراپ ڕویدا بەڵام با لێرە چاوەڕوان بکەم بەڵکو موسڵمانەکان دەگەڕێنەوە ئەگەر هەر هەست بکەن من لەناو هەودەجەکەدا نیم، دەڵێ یەکسەر پاڵم دایەوە و لە خەم و خەفەتان بۆرژانێکم بەسەردا هات و خەوتم دایکە عائیشە دەفەرموێ -رضي الله عنها-، دەڵێ لەناکاو بینیم بەوە بە خەبەر هاتم کە صەفوانی کوڕی موعەطەلی سولەمی کە یەکێک بوو لە سەحابە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) شاهێدی خەیریەتی بۆ داوە دەفەرموێ ئەو پیاوە بەڕێزە کاتێک ئەویش مابۆوە بینی تارماییەک هەیە و هاتبوە نزیک من ئەو خێوەتە کە هی ئێمە بوو، دەڵێ منی ناسیەوە لەپێش ئەوەی پێچە و حیجاب دابەزێت بەسەرمان لەلای خوای رب العالمین منی بینیبوو زانی من دایکە عائیشەی دایکی ئیماندارانم دەڵێ هەر ئەوەندەم گوێ لێبوو لە دەنگی ئەو بە خەبەر هاتم گوتی (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيهِ رَجِعُونَ) دیاربوو زۆر خەمی خوارد هیچ قسەیەکی تری لەگەڵ من نەکرد، حوشترەکەی خۆی هێنا و لەبەر دەرگای ئەو شوێنەی کە من لێی بوم و خەوتبوم هیخی کرد و بە ئاماژە پێی گوتم ئەی دایکی بەڕێزم وەرە سەر پشتی حوشترەکە، و دەڵێ ئەویش جڵەوی حوشترەکەی گرت و ڕۆیشتەوە بەرەو ناو موسڵمانان، لە دورەوە مونافیق و دەغەڵ و دوڕوەکان ئەلەو کاتەوە هەلیان بۆ هەڵکەوت بە حیسابی خۆیان دوبارە دیعایەیان بڵاو کردەوە گوتیان عائیشە لەگەڵ ئەو پیاوە لەو عاقارە چی دەکرد و بۆ مابۆوە؟ گومانیان لەسەر دروستکرد هێواش هێواش ئاوایان خەڵک تێگەیاند مونافیق و دەغەڵ و دوڕوەکان کەوا دایکە عائیشە (پەنا بە خوای رب العالمین) بۆ کاری خراپ مابۆوە لەوێ لەگەڵ ئەو سەحابیە بەڕێزە حاشاکی دایکە عائیشە -رضي الله عنها-.

بەڵێ لێرەدا دەمەوێ هەڵسوکەوت لەسەر ئەوە بکەین کە موسڵمانەکان بونە چەند بەش لەو ڕوداوەدا زانایان دەفەرمون، موسڵمانەکان لەو ڕوداوەدا بونە چوار بەشی سەرەکی

خەڵکەکە بە تێکڕا بە کافر و مونافیق و موسڵمانانەوە، هەندێکیان لە موسڵمانەکان ئەو ڕووداوەیان کە بیست نە بە چاک نە بە خراپ قسەیان لێنەکرد وە دایاندەپۆشت و گوێیان لێ ڕانەدەگرت حەزیان بەو شوێنانە نەبوو کە ئەو دەنگوباسەی لێبوو، وە بەشی دوەم لە موسڵمانەکان ڕەتیانکردەوە و گوتیان ئێمە سەدا هەزارین دایکە عائیشە کاری وای نەکردوە و ئەو سەحابە بەڕێزە ئێمە لێی ئەمینین لەوانە أبو أيوب الأنصاري و أم أيوب الأنصارية ئاوایان فەرموو، وە بەشی سێیەمیان لە موسڵمانەکان هەر ئاوا بڕوایان نەکردبوو سەدا سەد بەس قسەی مونافیق و دەغەڵ و دوڕوەکانیان بیستبوو جاروبار لەناو خۆیان دەیانگوتەوە، وە بەشی کۆتایی لە خەڵکەکە مونافیق و دەغەڵ و دووڕوو بێ بڕواکان بون ئا ئەوانە برەویان پێدەدا و ئاگریان خۆش دەکرد و بڵاویان دەکردەوە و دڵی پێغەمبەری اللەیان توند دەکرد (ﷺ).

جا دایکە عائیشە دەفەرموێ -رضي الله عنها- دەفەرموێ سوێند بە الله من ئاگاداری هیچ نەبوم هەرکە هاتمەوە لەو جەنگە نەخۆش کەوتم، نەمدەزانی چ دەنگوباسە بەڵام هەر ئەوەندەم دەزانی پێغەمبەر وەکو جاران خۆی تێنەدەگەیاندم (ﷺ) سوعبەت و قسەی خۆشم لەگەڵ بکا، هەر دەهات و دەیفەرموو «كَيْفَ تِيكُمْ؟» ئێوە چۆنن؟ هەر ئەوهای دەگوت جاران ناوی دەهێنام و دەهاتە لام و دادەنیشت و قسەی خۆشی لەگەڵ دەکردم و لە پاشان دەڵێ دەڕۆیشت و بەجێی دەهێشتم، دەڵێ لەوەوە دڵم توند بوو هەستیشم بە هیچ نەدەکرد دەنگوباسەکەم بۆ نەهاتبوو، دەڵێ هەتا ڕۆژێکیان دایکی میسطەحی کوڕی ئوساسە کە دایکی میسطەح دەڵێ کچی ئەبو ڕوهمی کوڕی عەبدومەناف بوو دایکی میسطەح لەگەڵ دایکی ئیمامی ئەبو بەکر خوشک بون دەڵێ میسطەحیش سەحابەیەکی هەژار بوو ئیمامی ئەبو بەکر یارمەتی مانگانەی بۆ بڕیبووەوە و یارمەتی دەدا ئینجا خزمیشی بوو کوڕە پلکی بوو، لە پاشان دەڵێ دایکی میسطەح لەگەڵ من دەهات بۆ ئەو شوێنانەی دەچوم بۆ قەزای

حاجەت ئەو کات دەفەرموێ لەلای خۆمان وەکو ئێستا ئاودەستی پێ دەڵێن کونوف لە زمانی عەرەبیدا دایکە عائیشە دەفەرموێ «وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الْكُنُفَ» پێشی ئەوەی لە نزیک ماڵەکانی خۆمان و لە حەوشەکانی خۆمان شوێنی قەزای حاجەت دابین بکەین لە دور بە دوری وەکو عەرەبەکان دەچوین لە دوری ماڵەوە قەزای حاجەتمان دەکرد، دەڵێ دایکی میسطەح من نەخۆشبوم لەگەڵم دەهات هەموو جار دەڵێ ئەمجارە لەگەڵمدا هات و ساتمەیەکی کرد لە ساتمەکەیدا یەکسەر گوتی «تَعِسَ مِسْطَحٌ» ئەی بە هیلاک چی میسطەحی کوڕم، دەڵێ منیش گوتم ئای ئای دایکی میسطەح بە سەحابەیەک وا دەڵێی کە جەنگی بەدری بینیوە؟ چونکە لە جەنگی بەدر خوای رب العالمین فەرموی ئەی موحەمەد (ﷺ) بڕۆ ئەوانەی جەنگی بەدریان بینی پێیان بڵێ «اعْمَلُوا ما شِئْتُمْ» هەرچی دەکەن بکەن بە کەیفی خۆتان الله تازە لە ئێوە خۆشبوە، مانای وا نیە سەحابەکانی بەدریش خراپەیان کردبێ مانای ئەوەیە پلە و پایە و نەوت و مەدالیایەکی گەورەیە الله تعالی بەوانی بەخشیوە، دەڵێ یەکسەر دایکی میسطەح ڕوی تێکردم و گوتی «یَا هَنْتَاهْ» لە زمانی عەرەبیدا بە مەعنای ئەوە دێ ئەی بێئاگا ئەوە تۆ ئاگات لە چیە عائیشە؟ ئاگات لێ نیە هەواڵی چی بڵاو بوەتەوە؟ گوتم نەوەڵا هیچم نەزانیوە، دەڵێ گوتی هەواڵ بڵاو بوەتەوە کەوا تۆ خراپەت کردوە لەبەر ئەوە مابویەوە و تاخیربوی لە لەشکرەکەی پێغەمبەر (ﷺ)، دەڵێ نەخۆشیەکەم زیادیکرد و ڕەنگم تێک چوو یەکەم جار بوو ئەو هەواڵە بزانم، دەڵێ ئینجا لە پاشان گوتی میسطەحیش گوێبیستی ئەو قسە بوە و گوتویەتیەوە لەبەر ئەوە من وام بە میسطەحی کوڕی خۆشم گوت، دەڵێ لە پاشان هەستمکرد و زانیم دەڵێ دەگریام شەو و ڕۆژ هیچم پێ نەدەکرا مۆڵەتم خواست لە پێغەمبەر (ﷺ) وەحیش تاخیر بوو نەهات، گوتی خوای رب العالمین پێغەمبەری وا تاقیکردەوە (ﷺ)، دەڵێ گوتم دەچمە ماڵی باوکم ئەگەر مۆڵەتم بدەی؟ دەڵێ پێغەمبەر مۆڵەتیدام (ﷺ)، دەڵێ لە پاشان چومەوە بە دایکم گوت بە گریانەوە گوتم دایکی خۆشەویستم ئەوە لە من دەوەشێتەوە؟ ئەوە چیە بەسەر من

هاتوە؟ دەڵێ دایکیشم گوتی ئەی کچی خۆشەویستم هیچ کچێک نیە وەکو تۆ جوان و بەرچاوبێ هەویەشی هەبێ ئیلا قسەی زیادی لەسەر دەکرێ و عەیب و عاری لێ دەبینرێتەوە، دەڵێ من نەمتوانی تەحەمول بکەم هەر دەگریام خواردنم پێ نەدەخورا ئا لەو کاتە بوو پێغەمبەری پێشەواش (ﷺ) هیچی بە دەستەوە نەما بانگی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی کرد لەگەڵ ئوسامەی کوڕی زەید گوتی وەرن پرس و ڕاتان پێبکەم لەو ڕوداوە، ئوسامە گوتی وەڵاهی لە خەیر زیاتر من لە دایکە عائیشەم نەبیستوە و نەبینیوە ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) قەت قەت ئەو قسە باوەڕ ناکەم، ئیمامی عەلیش فەرموی ئەی پێغەمبەری الله سەبر و ئارامت هەبێ با ئەو لە ماڵی باوکی بێ ئەو کاتە ئافرەت زۆرن بۆ تۆ ئەگەر وا دەرچوو ئەگەر واش دەرنەچوو ئەو کاتە عائیشە هاوسەرتە و خێزانتە و بابێتەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەو کاتە بوو کە چوو بەسەر میمبەر کەوت فەرموی «یا معشر المسلمین» دڵی زۆر توند بوو پێغەمبەر (ﷺ)، چونکە پێغەمبەر دەفەرموێ وەڵاهی دەمزانی عائیشە بەریئە بەس نەمدەزانی چ بەڵگەیەک بێنمەوە و بیسەلمێنم بۆ موسڵمانان؟ لەبەر ئەوە دیعایە خەتەرناکە ترسناکە کاتێک مونافیقێک عەلمانیەک بێدینێک کافرێک لە دژی موسڵمانان دیعایە بڵاو دەکاتەوە خەتەرناکە موسڵمانەکان نابێ ئاسان گوێی لێ ڕابگرن و وە نابێ بە ئاسانی هەڵبخەڵەتێن و بیڵێنەوە لەبەر ئەوەی دڵی موسڵمانانی پێ توند دەبێ ئەو کاتە زەرەر دەکەن موسڵمانەکان، لەو پێناوەدا پێغەمبەر (ﷺ) بە دڵ توندی بەسەر میمبەر کەوت گوتی ئەی گەلی موسڵمانان «مَنْ يَعْذِرُنِي مِنْ رَجُلٍ قَدْ بَلَغَنِي عَنْهُ أَذَاهُ فِي أَهْلِي؟» کێ هەیە ئێستا پشتیوانیم بکا؟ بە تەواوەتی عوزرم تەواو بێنێتەوە بۆ ئەوەی پیاوێک هەیە کەوا ئازاری ماڵ و منداڵەکەی منیشی داوە تەداخولی ناموسی منیشی کردوە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «فوَاللَّهِ، مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي إِلَّا خَيْرًا» سوێند بە الله هەتا ئەو چرکەش لەخێر زیاتر هیچی ترم لە ئەهلی خۆم و عائیشە نەبینیوە «وَلَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلًا أَلأَنصاري فقال: یا رسول الله» هەندێک دەڵێن پیاوێکی ئەنساری هەستایەوە گوتی

«مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ إِلَّا خَيْرًا، وَمَا كان يَدْخُلُ عَلَى أَهْلِي إِلَّا مَعِي» گوتی بەڵێ پێغەمبەری الله (ﷺ)، هەندێک دەڵێن صەفوانی کوڕی موعەطەلی مەبەست بوو پێغەمبەر (ﷺ)، گوتی دەربارەی پیاوێکی ئەنساریش قسە کراوە من وەڵاهی لە خەیر زیاتر لەو پیاوەشم نەبینیوە قەت باوەڕ ناکەم شتی هەڵەی کردبێ ئەوە ئەگەر هەر جارێک هاتبێتە ماڵی من لەگەڵ من هاتوە و قەت بە تەنها نەچوەتە ماڵی من پێغەمبەر فەرموی (ﷺ)، ئینجا سەعدی کوڕی موعاز هەستایەوە و فەرموی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) «يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا أَعْذِرُكَ، منه إِنْ كَانَ مِنَ الْأَوْسِ ضَرَبْتُ عُنُقَهُ» فەرموی من گەورەی ئەوسیەکانم ئەگەر لە ئەوسیەکانە بۆم دیاریبکە ئەو پیاوەی وا تۆی عەزیەت داوە و قسە دەربارەی ناموسی تۆ دەکا سوێند بە الله من لەسەری دەدەم «وَإِنْ كَانَ مِنْ إِخْوَانِنَا مِنَ الْخَزْرَجِ» ئەگەر لە خەزرەجیەکانیشە ئێمە تەنها «أَمَرْتَنَا فَفَعَلْنَا أَمْرَكَ» ئەگەر چیمان پێ ئەمر بکەی ئەوە جێبەجێ دەکەین، لەولاشەوە دیارە گەورەی خەزرەجیەکان هەستایەوە و شەیتان، ئا ئەو فیتنانەی لێ دروست دەبێ دیعایەکان ئەوەی موسڵمانە و ئیمان لاوازە نابێ گوێ بگرێ لە کافر و موناڤیق و جاسوسەکان چونکە دیعایە سەرەتا ڕاستە ئاسانە کە دەکرێ و بڵاو دەبێتەوە بەڵام کە کەوتیتە ناوی ئاسان نیە لێ دەرچونی ئەو کاتە تۆڵەت لێ دەستێنرێتەوە هەم لەلای الله وە هەندێک جار فیتنە و ئاژاوە و ئاشوبی گەورەی لێ دەکەوێتەوە وەکو لەوێوە ئەوس و خەزرەجیەکان لێک بڵند بون، دەڵێ پێغەمبەر دانیشت لەسەر میمبەرەکەی (ﷺ) هەر دۆعای ئەوەی کرد خوێن نەڕژێ، موسڵمانان وایان لێهات هەموو لێک بدەن لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) وە لەسەر أهل البيت پێغەمبەر (ﷺ) بە دیعایەی موناڤیقەکان، موسڵمان دەبێ هۆشیار و ئاگاداربێ، سەعدی کوڕی عوبادەش سەرۆکی خەزرەجیەکان هەستایەوە و پێیگوت ئەی سەعدی کوڕی موعاز تۆ بەرپرسی لە ئەوسیەکان ناتوانی دەست بگەیەنیتە خەزرەجیەکان، ئا لەوێوە فیتنەکە ویستی گەورەبێ و پێغەمبەر (ﷺ) دۆعای کرد و وە دایکە عائیشەش دەفەرموێ فیتنەکە لەوێ کوژایەوە و بەڵام من لە ماڵەوە هیچ

خەوم لێ نەدەکەوت، دەڵی وەڵاهی چەند شەو و ڕۆژان لەسەر یەکتر نەخەوتم هەتا پێغەمبەر هات (ﷺ)، یەک مانگ خوای رب العالمین وەحی تاخیر کرد و نەینارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، دایکە عائیشە دەڵێ پێغەمبەر ڕوی تێکردم و فەرموی ئەی عائیشە سوێند بە الله من هەر خێرم لە تۆ بینیوە وە هیچ شەڕم لە تۆ نەزانیوە ئەوەی ڕویداوە زۆر ناخۆشە ئەگەر شتێک هەیە و ڕویداوە و هەڵەیەکت کردوە داوای لێبوردن لە الله بکە و تەوبە بکە و بگەڕێوە لای خوای رب العالمین ئەو عەبد و بەندەیەی داندەنێ بە گوناحەکانی و تەوبە دەکات هیچی لەسەر نامێنێ، ئەگەر هیچیشت نەکردوە بە دڵنیایی خوای رب العالمین بەڕائەتت ڕادەگەیەنێ، دایکە دەڵێ گریام و هیچم پێ نەگوترا هەر ئەوەندەم گوت ئەی دایکە ئەی باوکە ئەوانیش لە کۆڕ و مەجلیسەکە بون من چی بڵێم و هیچم نیە «فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ» وەکو یەعقوبی باوکی یوسف دەڵێم ئارامیەکی جوان دەگرم لەسەر خۆ دەبم هەر تەنها الله پشتیوانمە لەو هەڵە و کەم و کورتیانەی بە منیان هەڵبەستاوە و دیعایەکانی بە منیان کردوە و لە دوای منیان کردوە، دەڵێ ئینجا چوم لەسەر جێگای خۆم پاڵم دایەوە وەڵاهی بیرم دەکردەوە دەمزانی خوای رب العالمین یارمەتیم دەدا بەڵام دەڵێ خۆم ئەوەندە پێ بەرز و گەورە نەبوو خوای رب العالمین لە قورئاندا ناوم بێنێ و بەڕائەتەکەم ڕابگەیەنێ دەڵێ پێم وابوو پێغەمبەر ڕەنگە خەونێک ببینێ (ﷺ) بەڕائەتم بۆ بێ، دەڵێ هەر لەو کۆڕ و مەجلیسەدا بوین کاتێک پێغەمبەر هەستم کرد دەموچاوی گۆڕا قورس بوو لاشەکەی کاتێک وەحی بەسەر دادەبەزی وای لێدەهات دەفەرموێ «فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَاءِ» بەوەی کە وەحی بۆ دەهات چی بەسەر دەهات وای لێهات «حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِنَ الْعَرَقِ» ئارەقە وەکو لوئلوء و مەرجان لەسەر دەموچاو و لاشەی پێغەمبەر پەیدا دەبوو دڵۆپەکانی کاتێک وەحی بەسەر دادەبەزی و لە قورسایەتی وەحی، دەڵێ ئینجا پێغەمبەر ڕوی تێکردم دەستی کرد بە پێکەنین فەرموی ئەی عائیشە ئەوە جوبڕائیل بوو هات ئایەتی دابەزاند لە سورەتی النور ئایەتی (١١-٢٠)

فەرموی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡ﴾ خوای رب العالمین فەرموی ئا ئەوانەی بوختانیان کرد بە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) تاقم و کۆمەڵێک بون لەگەڵ ئێوەدا بون موونافیق و دەغەڵ و دوڕوەکان بون: ﴿لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ﴾ ئەی موحەمەد (ﷺ) وا تێمەگە بۆ تۆ خراپە بێ کە ئێمە وەحیشمان نەدەنارد: ﴿بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ﴾ بەڵکو ئەوە چاکە بوو ئینتیحان و تاقیکردنەوە بوو بۆ دایکە عائیشە و بۆ تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ) بۆ تێکڕای موسڵمانەکان: ﴿لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ﴾ کەسیش با خۆی پاک دەرنەهێنێ هەریەک لە موسڵمان و مونافیقەکان بەشی خۆیان کە بەشدارییان کردوە لە دیعایە و گوناحەکە توٚڵەیان لێ دەستێندرێتەوە و گوناحەکەیان لەسەرە: ﴿وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾ بەڵام ئەوەی خۆی بە زل دەزانێ و سەری هەموو دیعایە و بێ دینیەکان بوو عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول ئا ئەوە عەزابێکی زۆر مەزنی بۆ هەیە لەلای خوای رب العالمین.

ئینجا خوای رب العالمین لە ئاخیریەکەیدا دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ ئەوەی لەگەڵت کرا ئەی دایکە عائیشە و ئەی پێغەمبەر (ﷺ) خوای رب العالمین پێیان دەفەرموێ هەموو فەزڵ و بەخشش‌ی خوای رب العالمین بوو وە ڕەحم و بەزەیی الله بوو وە بزانن بە دڵنیاییەوە خوای رب العالمین ڕەئوف و ڕەحیمە، ئینجا پێغەمبەر بە پێکەنینەوە فەرموی ئەی عائیشەی هاوسەرم سوێند بە الله دەمزانی بەریئی ئەوە الله بەڕائەتی لە ئاسمانەکان ناردە خوارەوە دەڵێ یەکسەر دایکم و باوکم پێیان گوتم ئەی عائیشە ڕاکە باوەشی پێغەمبەر (ﷺ) چیتر دڵی توند مەکە بڕۆ با دڵی پێغەمبەر موڕتاح و خۆشبێ (ﷺ) بڕۆ لای عائیشە، عائیشە دەفەرموێ من زۆر غەمگین بوم و زۆریش تورە بوو بوم لەبەر ئەوە بە قسەی دایکم و باوکم نەکرد دەڵێ گوتم من ئێستا هیچ ناکەم و ناڵێم ئەوەی من دەیکەم و دەیڵێم بەس سوپاسی الله دەکەم کە بەڕائەتی بۆ ناردم، دەڵێ

ڕوی خۆم لەولا کرد و پشتم لەوان کرد لەسەر جێگاکە لە خۆشییان گریام لەپێناو خوای رب العالمین.

دەڵێ بەڵام لەولاشەوە دایکە عائیشە دەفەرموێ زەینەبی کچی جەحش ئافرەتی ئیماندار دەبێ وابێ ئەگەر هەویەش بێ لەگەڵ ئافرەتەکەی تر ئەگەر دیعایەی لەشوێن کرا و قسەی لەشوێن هەڵبەسترا هەڵوێستی دەبێ وەکو دایکە زەینەبی کچی جەحش بێ، عائیشە دەفەرموێ پێغەمبەر چوو بوو لە دایکە زەینەبی پرسیبوو تۆ لەگەڵ عائیشە دەژیای هەویەی ئەو بوی کچە پوری منی چیت لە عائیشە بینیوە لە هەڵەکانی؟ دەڵێ زەینەبیش ڕویکردە پێغەمبەر (ﷺ) گوتی «أَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي، وَمَا عَلِمْتُ إِلَّا خَيْرًا[1]» سوێند بە الله هەوێمە غیرە لێرەدا نابێ کارم تێبکا وەڵاهی زمانم و چاوم و گوێم دەپارێزم لە گوناح و تاوان و زیادەڕەوی وەڵاهی لە خەیر زیاتر لە عائیشەم نەبینیوە ئەی موحەمەد ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)، دەڵێ لە کاتەکانی تر زەینەب لە هەمویان زیاتر غیرەی لەگەڵ دەکردم و وە غیرەی هەویایەتی لەگەڵم بەکاردەهێنا و دەجوڵا بەس لەوێ بردیەوە لەپێناو خوای رب العالمین و ئیماندار بوو، بەڵام حەمنەی کچی جەحش کە خوشکی زەینەب بوو ئەویان تێوەگلا لە موسڵمانەکان بە زمان دیعایەکەی گوتبوو وە بڵاوی کردبۆوە وە یەک لەوان حەسانی کوڕی ثابیتیش ئەوەی لەسەر بوو وە میسطەحیش کوڕی ئوثاثە ئەو سەحابە بەڕێزانەش ئەوەیان کەوتە سەر ئینجا مونافیقەکانیش لەگەڵ، خوای رب العالمین ئایەتی قەذفی لەو ئایەتانە دابەزاند کە دەبێ تۆڵەی بوختانیان لێ بکرێتەوە و هەشتا جەڵدەیان لێ بدرێ هەریەکە تەنها پێغەمبەر لە عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی نەدا ئیمامی قورتوبی کە لە تەفسیرەکەی دەیهێنێتەوە و دەڵێ ئەوە بۆچونی ڕاجیح و پەسەندە بۆ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) عەزابەکەی لەسەر کەم نەکاتەوە الله فەرموی بۆخۆمان عەزابێکی

[1] صحيح البخاري (٤٧٥٠) (٢٦٣٧) (٢٦٦١)، صحيح مسلم (٢٣٣٣) (٢٧٧٠)، سنن أبي داود (٤٧٣٥).

گەورەی ئەو کەسە دەدەین کە عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولە بۆ ئەوەی فیتنەشی لێ دروست نەبێ.

ئینجا لە کۆتایدا پەند و وانەی ئەوەی دەبێ لێ وەربگرین ئێمە ئاگاداری خۆمان بین کە موسڵمان بین ڕێبازی الله و پێغەمبەر بگرینەبەر مادەم دیعایە لە دوای پێغەمبەری الله کرا (ﷺ) لە دوای هەر موسڵمانێکی تریش ئەگەری هەیە بکرێ چەند تۆ سەرکردەی موسڵمانانبی قدوەبی ماموستابی داعی بی زیاتر ئەوەت پێ هەڵدەبەسترێ و دەگوترێ بەس گرینگ ئەوەیە تۆ لای الله بەرنەدەی پشتت بە الله بەهێزبێ -جل شئنە- وە لە ڕێبازە ڕاستەقینەکەی پێغەمبەر لانەدەی (ﷺ) لە کۆتایی الله بەڕائەتت دەنێرێ وە ئەوانەی لە موسڵمانان بە نەزانی کردویانە تۆڵە لەوانیش دەسێنێتەوە وە لە مونافیق و دەغەڵ و کافرەکانیش بە هەمان شێوە دەبێ سەبر و ئارامیت هەبێ، بزانن زانایانی بەڕێز چی دەفەرمون لەسەر ئەوەی کە میسطەح ئیمامی ئەبو بەکر مەعاشەکەی لێبڕی گوتی قسەی لەسەر ناموسی من کردوە بەڵام کە الله ئایەتی نارده خوارەوە جارێکیتر ئیمامی ئەبو بەکر دڵی نەرم بوەوە و وە مەعاشەکەی دایەوە.

بەڵام لێرە دەمانەوێ ئەوەتان پێ ڕابگەیەنین زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی هەر یەکێک قسە بە هاوسەرانی پێغەمبەر بڵێ (ﷺ) ئەو کاتە ئەو کەسە بۆچونی ڕاجیح و پەسەند تەمێ دەکرێ تەعزیر دەکرێ لێیدەدرێ گەورەی موسڵمانان بڕیاری لەسەر دەدا بەڵام هەر کەسێک بەڕائەتی دایکە عائیشە ڕانەگەیەنێ بڵێت دایکە عائیشە شتێک هەبوە و ڕویداوە (پەنا بە خوای رب العالمین) بە ئیجماعی زانایان ئیمامی قورتوبی ئیمامی نەوەویش لە شەرحی موسلیمدا هێناویەتیەوە دەفەرمون ئیجماعی موسڵمانان لەسەر ئەوەیە کەسەکە کافر دەبێ لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە وە بۆچونی پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعەش (یقتلوا) ئەگەر ئەوەش بکا حەدی ئەوەیە لە ئیسلامدا دەکوژرێت ئەو کەسەی کەوا بڵێ

دایکه عائیشه بەریی نەبوه لەبەر ئەوەی عینادی و بەربەرەکانێی قورئانی کردوه و ئایەتی قورئان دابەزی بە بەرائەتی دایکه عائیشه -رضي الله عنها-.

## (صلح الحديبية) و ڕوداوەکانی

باسی (صلح الحديبية) دەکەین کە پلە و پایەیەکی گرنگی هەیە لە مێژوی ئیسلامدا و لە سیره و ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) کە ناوی دەبردرێ بە (الفتح المبين) واتە ڕزگارکردنێکی ڕون و ئاشکرا و ئازادیکردن وە ئازادیکردنی مەککەشی بەدوادا هات، زانایان یەک دەنگن لەسەر ئەوەی کە ڕۆژی دوو شەممە بوو یەکەم ڕۆژی (ذو القعدة) ساڵی شەشەمی هیجری بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) شەو خەونی بینی لەو خەوەدا وایزانی چوەتە ناو مەککە و عومرە دەکا لەگەڵ سەحابەکان، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی بۆ گێڕانەوە و هانیدان و ئامادەی کردن فەرموی با بڕۆین بەرەو شاری مەککە و (كعبة الله) لەوێوە عومرە بە عەمەلی و کرداری جێبەجێ بکەین، ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) لەپێش خۆیدا بشری کوڕی سوفیانی خوزاعی نارد وەکو چاودێرێک بزانێ قوڕەیشیەکان چی دەڵێن و چی دەکەن وە ڕێگایەکە چۆنە و چۆن نیە کەوا پێیدا بڕوا بەرەو مەککە، وە لە پاشان کۆمەڵێک لە خەڵکی نارد لە سەحابەکانی کە ئەوانە نزیکەی (٢٠) کەس بون لە ئەنساریەکان و لە موهاجیرەکان بە سەرۆکایەتی و سەرکردایەتی عوبادی کوڕی بشر ئەو کاتە ڕۆیشتن بۆ ئەوەی ئەگەر لە ڕێگادا کەمینێک هەبێ و شتێک هەبێ لە پێغەمبەر (ﷺ) و لە موسڵمانەکان ڕێگا خۆش بکەن و وە لەکاتی ناکاودا هەر شتێک بێتە سەر ڕێگا لێ نەگەڕێن ئازار و ئەزیەتی پێغەمبەر (ﷺ) و سەحابەکانی لێبکەوێتەوە، ئینجا دەچن لە (ذو الحليفة) دادەبەزن لەوێوە هەرکە دەگەنە ئەوێ ئیمامی عومەر دەفەرموێتە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ باشە چۆن بچینە ناو ئەو قوڕەیشی و موشریکانەی کە دوژمنمانن ئەی پێغەمبەر (ﷺ) چ ئەمن و ئەمانەتێک هەیە بۆ ئەوەی بپارێزرێین ئێمە بەبێ چەک بچین و هیچ چەکێکی وامان لەلا

نەبێ بەرگری پێ لەخۆمان و لە موسڵمانان بکەین؟ لەوێوە پێغەمبەر قسەکەی ئیمامی عومەر بە هەند وەردەگرێ و دەنێرێتە مەدینە و دەفەرموێ با بێن چەندین چەکدار بە چەکەوە بێن لەگەڵماندا بن و بڕۆن خۆیان ببەستن نەوەک لەوێ توشی شتێکی نەخوازیاربین، ئینجا پێغەمبەر دەگاتە عوسفان (ﷺ) لەوێوە بشری کوڕی سوفیان هەواڵدەداتە پێغەمبەر (ﷺ) کە پێغەمبەر لەپێش خۆی ئەوی ناردبوو هەواڵی بۆ بێنێتەوە و دەڵێ ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) قورەیشیەکان دەنگوباسی تۆیان زانیوە کەوا لەگەڵ هاوەڵە بەرێزەکانت ڕوە و مەکە بەڕێکەوتی لەبەر ئەوە ئەوان کەوتونەتە خۆیان لەشکریان ئامادە کردوە و ئەگەری ئەوەی هەیە ڕێگات پێ بگرن و وام بیستوە دەڵێن ئەگەر موحەمەد بیەوێ (ﷺ) بە شەڕ بێتە ناو مەککە لێ ناگەڕێین و کوشتاری لەگەڵ دەکەین و ڕێگای پێ دەگرین، جا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «یا ویح قریش» ئەوە قورەیشیەکان چیان دەوێ بە هیلاک چونیان دەوێ شەڕ و شۆڕەکان نیوەی ئەوانی خوارد هەموو جارێ هەر دەدۆڕان، لە کۆتایەکەیش ڕویکردە سەحابەکان فەرموی «فما تظن قريشٌ؟ واللهِ إني لا أزال أجاهدُهم على الذي بعثني اللهُ له» فەرموی وەڵاهی چیان دەوێ و گومانی چیان هەیە قورەیشیەکان؟ جا من سوێند بە خوای رب العالمين بە بەردەوامی جەنگ و جیهاد و بەربەرەکانێیان دەکەم شەڕیان لەگەڵ دەکەم ئەگەر شەڕیان بوێت لەپێناو ئەوەی خوای رب العالمين منی پێوە ناردوە کە پەیامەکەمە وە فەرموی هەتاوەکو یان کەسیان نامێنێ و یان وازبێنن باشە، لەوێوە پێغەمبەر (ﷺ) وەکو پیشە جوانەکەی هەمیشەیی خۆی مەشوەرەتی کرد و پرسیکرد بە سەحابە بەڕێزەکان فەرموی ئێوە بۆچوونتان چیە و قورەیشیەکان خۆیان بەستوە و ئامادەکردوە؟ هاوەڵە بەڕێزەکانیش هەندێک فەرمویان با ئێمە بچین ئەحابیشەکان لەسەر ڕێگان و ئاسانترن بەسەریاندا بدەین منداڵ و ژنەکانیان بگرین و سام و هەیبەتێک دەبێ بۆسەر قورەیشیەکان و دەگەڕێینەوە بە دەسکەوتی چاک، وە هەندێکیش بۆچونیان ئەوەبوو نەگەڕێنەوە و ڕێگای خۆشیان نەگۆڕن بەرەو مەککە بڕۆن

ئەگەر قورەیشیەکانیان بینی لەسەر ڕێگادا بیانکوژن، بەڵام پێشەوا ئەبو بەکری سدیق - رضي الله عنه- فەرموی ئێمە دەڕۆین لە ڕێگای خۆمان پێغەمبەری الله (ﷺ) ئێمە دەستپێشخەری شەڕ و جەنگ و کوشتار نابین بەڵام هەرکەسێک هاتە سەر ڕێگامان ویستی بمانکوژێ و ڕێگامان پێ بگرێ و دەستی کرد بە خوێن ڕشتن و شەڕکردن ئێمەش ڕوە و ڕوی دەوەستینەوە و جەنگی لەگەڵ دەست پێدەکەین، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەوەیان باشە، جا لە پاشان لەشکری قورەیشیەکانیش هاتنە دەرەوە لە مەککە و نزیک بونەوە لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و -رضي الله عنهم- وە لە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، ئینجا پێغەمبەر لە عوسفان بوو کە (صلاة الخوف)ی بۆ کردن واتە نوێژی ترس بەو شێوازەی کە خوای رب العالمين فێری کردبوو لە قورئان مۆڵەتی بۆ دابوو کە لەگەڵ جەنگ و جیهاد و ڕوبەڕوبونەوەکان (صلاة الخوف) هەیە کاتێک ئەگەر نەکەونە ناو یەک و شەڕ دەستی پێنەکردبێ بەڵام لە ئامادەباشی و لە ئینزاردابن ڕوبەڕوی یەکبن ئەوکاتە پێشەوا و ئیمامێک دەچێ ڕادەوەستێ پێش نوێژیان بۆ بکا لەوێ پێغەمبەر بوو (ﷺ)، ئینجا چەکدارەکانیش دەبنە دوو سەف سەفێکی یەکەمیان لەگەڵ پێشەوا و ئیمامەکەی دەچێتە ڕکوع و وە سەفەکەی دواتر چاودێر دەبێ و ناچێتە ڕکوع دەمێنێتەوە هەتا ئیمام و سەفی یەکەم لە سوجدە و کڕنۆش هەڵدەستنەوە بۆ ڕکاعەتی دوەم ئینجا ئەوانەی پشتەوە ڕکاعەتی یەکەمیان تەواو دەکەن و ئینجا دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان هەتا نوێژەکە کۆتایی پێدێ ئەوە (صلاة الخوف)ە، وە جۆرێکی تریش لە (صلاة الخوف) کاتێک کافر و موشریکەکان لەگەڵ موسڵمانان ئەگەر بکەونە ناو یەک گرم و هوڕی شەڕ بێت جەنگ دەست پێبکا ئەوکاتە ئاگایان لەوە ناتوانن بمێنێ بە جەماعەت نوێژەکانیان بکەن هەر ئەوەیان بۆ دەبێت ڕێگا و ڕێگا لەناو شەڕ و جەنگەکە ئەگەر ڕویان لە ڕوگە و قیبلەش نەبێ نوێژەکانیان بکەن لێیان قبوڵ دەبێ ئەوە مۆڵەت و ڕوخسەتی خوای رب العالمين بوو بۆ موسڵمانان، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) کە لە نوێژەکەی بویەوە فەرموی با بچین ڕێگامان بگۆڕین، ڕێگای

خۆیانیان گۆڕی، زانایان دەفەرمون پێغەمبەر لە ترسدا نەبوو (ﷺ) بەڵکو محمود شیت خطاب کە بە خۆشی سەرکردەیەکی سەربازی بوە و نوسەرێکی موسڵمان و داعیە دەفەرموێ لە کیتاب و پەرتوکەکەی باشترین خوتەی پێغەمبەر بوو (ﷺ) بۆ ئەوەی کەوا ڕێگاکەی گۆڕی وە باشترین بەڵگەش لەسەر ئەوەی پێغەمبەر نەترسا (ﷺ) چونکە کە ڕێگای گۆڕی خۆ بەدور نەکەوتەوە بەڵکو ڕێگایەکی تری ئەمینتری گرتەبەر تا زیاتر نزیکتر بێتەوە لە قورەیشیەکان چوو لە حودەیبیە پێغەمبەر (ﷺ) باری خستوو لەوێدا مایەوە، هۆکاری بارخستنەکەی پێغەمبەریش ئەوەبوو (ﷺ) پێغەمبەر حوشترەکەی خۆی قەسوائی پێبوو حوشترێک بوو لە حوشترەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، کاتێک کە چونە حودەیبیە لەوێ حوشترەکەی پێغەمبەر سەربەخۆ هیخ بوو (ﷺ)، ئا ئەو کاتەی کەوا هیخ بوو سەحابەکان گوتیان «ما خلعت ما خلأت القصواء وما ذاك لها بخلق» پێغەمبەر لە وەڵامی ئەوان فەرموی کاتێک گوتیان «خلأت القصواء» واتە سەربەخۆ بەبێ ئەوەی هیچ عەیبێکی هەبێ ئەوە بۆ هیخ بوو حوشترەکەی پێغەمبەر (ﷺ)؟ پێغەمبەریش گوتی ئەوە لە قەسوائی حوشترەکەی من ناوەشێتەوە سەربەخۆ هیخ بێ بەڵام لە وەڵامتاندا پێتان دەڵێم «ولكن حبسها حابس الفيل» بەڵکو ئەوەی فیلەکانی ئەبرەهەی حەبس کرد و نەیهێشت بەرەو پێش بچن کە خوای رب العالمین ە ئەویشە فەرمانی کردوە بە حوشترەکەی من لێرە هیخ بێ حیکمەتی تێدایە واتە، پێغەمبەر (ﷺ) لەوێ مایەوە ئاوێکی لێبوو بیرەکە ئاوەکەی یەکجار کەم بوو هاوەڵە بەڕێزەکان چونە سەر ئاوەکەی ئاوەکە بەشی نەدەکردن هاتنەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، گوتیان پێغەمبەری الله هیچ ئاوێکی ئەوتۆی تێدا نیە ئەو بیرە چۆن باری لێرە بخەین؟ دەست نوێژ بەچی بشۆین؟ لەچی بخۆینەوە؟ شوێنێکی باش نیە، لە دوو ڕیوایەت و بۆچون هاتوە کە ابن حەجەری عەسقەلانی لەسەر ڕیوایەتەکەی ئیمامی واقیدی و وە ڕیوایەتێکی تریش هەیە جەمع و تەوفیق دەکا لەبەینی دوو ڕیوایەتەکە کە لە ڕیوایەتێکیان پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) تیرێکی هەڵکێشا لە تیرەکانی

لەگەڵ خۆی هەڵیگرتبون کە خۆی پێ بەستبوو ئەو تیرەی دایە موسڵمانێک فەرموی بە (بسم الله) ئەو تیرە بهاوێژە ناوبیرەکە بەڵکو ئاوەکە بتەقێتەوە و پڕ ببێ، لە یەک لە ڕیواتەکانی تریش دەڵێ پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەو دۆلکەیە بێنن کەوا ئاوی پێ هەڵدەچنن لە بیرەکە هەندێک بۆم بێننە پێش، دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئاوەکەی لە دۆلکەکە دابوو لە بیرەکە دەریان هێنابوو لە دەمی خۆی وەرکرد لەگەڵ تفی خۆی تێکەڵی کرد و هاوێشتیەوە ناو دۆلکەکە و لە پاشان فەرموی بە (بسم الله) بیرژێننەوە ناو بیرەکە، سەحابەکان دەفەرمون سوێند بە الله هەرکە دۆلکە ئاوەکە تفی پێغەمبەری لەگەڵ تێکەڵ بوو بوو (ﷺ) بە (بسم الله) لەناو بیرەکەمان کرد هەر بینیمان بیرەکە پڕ ئاو بوو، دەڵێ ئینجا چوین ئاومان بە تێری لێ هێنا هەم لێمان دەخواردەوە، ئەوە موعجیزەیەک بوو لە موعجیزەکانی کە لە (صلح الحديبية) ڕویدا بۆ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، هەر لەو جەنگەش بوو کاتێ کەوا ئاویان لێ دەبڕێت بۆ دەستنوێژ جارێکی تر پێغەمبەر (ﷺ) (بسم الله) دەکا و پەنجەکانی دەخاتە ناو ئاوەکەی هێناویانە بۆ دەستنوێژ کە دەستی خۆی بەرز دەکاتەوە لە بەینی پەنجە موبارەکەکانی وەکو بەلۆعە ئاوی لێ دێتە خوار و هاوەڵە بەڕێزەکان لێی سودمەند دەبن و دەستنوێژی پێ دەشۆن و وە لێی دەخۆنەوە و بەکاری دەهێنن، ئەوانە بۆ پێغەمبەر ئاسانە (ﷺ) ئەو پێغەمبەری اللەیە موعجیزەی هەیە موعجیزەش واتە ئەو شتانەی کە (خارق العادة)یە بە ئینسانی ڕوە عادەتی ناکرێ و وە لە عادەت بەدەر دەبێ هی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) فەرقی لەگەڵ کەرامەت ئەوەیە دەتوانن تەحەداشی پێبکەن ئەو کاتەی ویستیان داوا لە الله بکەن موعجیزەکە ڕودەدا بەڵام هی وەلیەکان ئەگەر کەرامەتیشیان هەبێ ناتوانن تەحەدای پێبکەن وە ناشتوانن ئەوکاتە داوای بکەن خوای رب العالمين پێیان بدا لەناکاو وەلیەکان هەندێک جار وایە ئەوە پێی دەڵێن کەرامەت (خارق العادة) شتێک لە دەستیان هیجاد دەبێ و ڕودەدا.

جا قورەیشیەکان زانیان کار لە کار ترازاوە پێغەمبەر (ﷺ) تازە وازناهێنێ و لەوێدا باری خستوە هەستان بەوەی کە نوێنەریان بنێرن بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، یەکەم نوێنەر کە ناردیان بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی بوو کە بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی لە بەنو خوزاعیەکان بوو زۆر بە قسە زانا بون وە خەڵکی چەکدار و شەڕکەریان هەبوو لەگەڵ هەندێک لە خەڵکەکەی خۆی چوە لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش بەخێری هێنا و ڕێزی لێنا گفتوگۆی لەگەڵ کرد تێی گەیاند کەوا ئەی بودەیل ئێمە نەهاتوین شەڕی مەککە بکەین شەڕی قورەیشی و کافرەکان بکەین تەنها هاتوین زیارەتی (کعبة الله) بکەین بچین لەوێدا کەوا لە خزمەت (کعبة الله) عومرە بکەین و ئەنجامی بدەین، جا پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەوەی خواست و داوای کرد بودەیلیش قەناعەتی دڵی هات و گەڕایەوە، لە پاشان قورەیشیەکان بەوە نەوەستان دڵیان ئاوی نەخواردەوە بە قسەی بودەیل بەڵکو عڕوەی کوڕی مەسعودی ثەقەفییان نارد بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) کە کەسێکی قسەزان بوو لای کیسرا و سەرکردەکانی ئەو سەردەمەی دونیای بینیبوو زۆر زۆر زان بوو لە قسەکردندا ئەویش کاتێک دەچێتە لای پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، هەڵوێستەیەکی لەسەر دەکەین بزانن چی ڕویدا کاتێ کەوا دەچێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) عڕوەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی و پێغەمبەر پێشوازی لێدەکا (ﷺ)، ڕودەکاتە پێغەمبەر بە قسەکانی بە بەلاغەتەوە پێی دەڵێ ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەو هەواڵەی تۆ قورەیشیەکان زانیویانە ئیزنت نادەن بچیتە ناو مەککە مەگەر بەسەر لاشە و مەرگیاندا بڕۆی بکوژرێن و بمرن ڕەنگە شەڕێکی گەورە دروست ببێ پێم وایە ئەوانەی لە دەوروبەری تۆشن ئەی موحەمەد چەند چاو دەگێڕم خەڵکێکی ئاوا نین جێگای پشت پێ بەستان بن لەگەڵت بێن بۆ ناو مەککە ئەگەر شەڕ و شۆڕ و ناخۆشیت توش بوو بەڵکو خەڵکێکن جێی چاوانیان تێدا نیە ڕەنگە پەرت ببن و وازت لێ بێنن و بە تەنها لێرە بتهێڵنەوە، بەو زمانە لوسەی ویستی سەحابەکان سارد بکاتەوە و پێغەمبەریش (ﷺ) قەناعەتی دڵی بێ و بگەڕێتەوە، بەڵام لەولاوە ئەبو بەکری

سدیق هەستایەوە سەر پێ ڕوە و عڕوە هات و پێیگوت ئەی عورڕوە ئەوە تۆ چی دەڵێی؟ «امْصُصْ بَظْرَ اللاّتِ! أنحن نَفِرُّ عنه ونَدَعُه؟!» لێرەدا زانایان دەفەرمون لە کاتی ڕوبەڕوبونەوە و توندیدا ئەگەر موسڵمانێک کافرێک ویستی بیانشکێنێتەوە ئەگەر قسەیەکیشی لە زمان دەرچوو قسەکە وەکو جوێنیش دەرهات بە کافرەکان بدا بۆ شکستی کافرەکە کە قسەکە لەجێی خۆیبێ وەکو ئیمامی ئەبو بەکر کردی دروستە و ڕێگا پێدراوە لە مەیدانی جەنگ و جیهاد و ڕوبەڕوبونەوەدا، لەبەر ئەوەیە ئیمامی ئەبو بەکر کە فەرموی «امْصُصْ بَظْرَ اللاّتِ! بَظْرَ اللاّتِ!» (بَظْرَ) بەوە دەگوترێ لە زمانی عەرەبیدا بۆ ڕونکردنەوەی شەرع و وانەکان شەرم لە دیندا نیە ئەو پارچە گۆشتەی لە دامێنی ئافرەتان دەبڕدرێ لەکاتی سونەت کردندا کە فڕە دەدرێت ئا لەو کاتە ئەوە پێی دەگوترێ (بَظْرَ)، جا ئیمامی ئەبو بەکر ڕویکردە عڕوە و گوتی تۆ بخۆی و بمژی ئەو پارچە گۆشتەی لات کە ئێوە دەیپەرستن وەکو بت، یەکسەر عڕوە لەجێی خۆی سارد بویەوە و نەیزانی چی بڵێت و ڕوی تێکرد نەیزانی ئەوە ئەبو بەکری سدیقە گوتی ئەوە کێیە پێم دەڵێ؟ ئینجا ئیمامی ئەبو بەکر گوتی وات داناوە ئێمە ڕابکەین و هەڵبێین و موحەمەد لێرە بەجێ بێڵین (ﷺ) سوێند بە الله هەریەک لە ئێمە گیانمان بەخت دەکەین ئەگەر هەمومان بوینە جەنازە ئینجا ئەگەر دەستان بگاتە موحەمەد (ﷺ) بڕۆ قسەکەی خۆت بخۆوە عڕوە، عڕوەش بەسەر سامیەوە و بەسەر خۆشیدا شکایەوە گوتی ئەوە کێیە ئاوا دەمدوێنێ؟ گوتیان ئەبو بەکری سدیقە گوتی سوێند دەخۆم عڕوە ئەگەر لەناو ئێمە و ئێوە شتێکمان لەبەین نەبا و قەرزارتان نەبوینایە ئەی ئەبو بەکر هی تیرەکەی ئێوە ئێستا قسەیەکی ترم دەبوو لە وەڵامتدا، لەولاوە عڕوەی کوڕی مەسعود نزیک بویەوە لە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) عادەت وابوو ئەوکات ئەگەر دوژمنێک دوژمنێکی ببینایە بیویستبا تەواو تێی بگەیەنێ ڕیشی دەگرت و دەیگوت جوان گوێم لێ ڕابگرە قسەکان بە کەڵکە و کە دەتدوێنم و قسەت لەگەڵ دەکەم، جا عڕوەی نا موبارەک لەو کاتەوە لە پاشانەکە موبارەک دەبێ کە دەبێتە موسڵمان عڕوە

دێت و ڕیشی پێغەمبەر دەگرێ (ﷺ) پێی دەڵێ ئەی موحەمەد من بۆ تۆمە و وات پێدەڵێم بەڵام لەپشت پێغەمبەر (ﷺ) موغیرەی کوڕی شوعبە کە برازای عڕوەیە تازە بوەتە موسڵمان و زۆریش خوێن گەرمە خۆی پێچاوە و شمشێرەکەی لە شانە وە دەموچاوی خۆی پێچاوە و بەس کونی چاوی دیارە ئەو پاسەوانە تایبەتەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕێک لەپشت پێغەمبەر وەستاوە کاتێک عڕوە دێت و دەست دەگەیەنێتە ڕیشی پێغەمبەر (ﷺ)، لەوێوە موغیرەی کوڕی شوعبە هەڵدەکێشێتە شمشێر و نوکی شمشێرەکەی لەسەر سنگی دادەنێ دەڵێ بکشێوە پاش بکشێوە پاش ئەگەر دەتەوێ ئەو شمشێرە نەتبڕێ جارێکی تر دەست نەدەی لە ڕیشی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەگەر دەشتەوێ شمشێرەکە لەتتکات و بتبڕێ فەرموو ئازابە دەست بگەیەنەوە ڕیشی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەری الله زۆر دڵی خۆشبوو ئاوڕی سوڕاندەوە ئەوە موغیرەی کوڕی شوعبەیە و چەند ڕۆژێکە موسڵمان بوە ئەوەی کەوا هاتوەتە پێشیش لە پێغەمبەر و موغیرە شمشێری لەسەر داناوە و وای پێ دەڵێ مامی موغیرەیە عوڕوەی کوڕی مەسعودە، پێکەنینی هات بە زەردەخەنەوە و عڕوەش گوتی ئەوە کێیە لە پشتت ڕاوەستاوە ئەی موحەمەد (ﷺ)؟ پێغەمبەر بە زەردەخەنەوە فەرموی (ﷺ) عڕوە نەتزانیوە ئەوە برازاکەتە موغیرەی کوڕی شوعبە ئەوە ئەوە وا لەپشتم ڕاوەستاوە پاڵەوانە و موسڵمانە ئەمڕۆ، دەڵێ ئەویش بەربوە جوێندان و قسە پێگوتنی گوتی هەر تۆ نەبوی دزیت دەکرد لەناو ئێمە؟ چەند جار من شەڕی تۆم کوژاندوەتەوە؟ ئێستا ڕاتکردوە و خۆت کردوەتە پاڵەوان و موسڵمان شمشێر لەسەر من دادەنێی لەسەر موحەمەد؟ ئەویش خۆی نەجوڵاند و هیچ قسەیەکی نەکرد، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەوەی ڕابردوو هەر گوناحێکی هەبێ الله لێیخۆشبوە ئیلا مەگەر پارە و پولی خەڵکی لەلابێ ئەو حەقەش دەداتەوە کەوا موسڵمانە، و ئینجا دەڵێ لەوێوە زانی کار لە کار ترازاوە و هیچی پێ لەگەڵ موسڵمانان ناکرێ ئەوەندە پێغەمبەریان خۆشدەوێ (ﷺ)، زانایان دەفەرمون ئەوەش وەلاء و بەڕائی تەواوە کە مامی خۆی نرخی نابێ لەلای کە ئەزیەتی پێغەمبەر بدا (ﷺ) تەهدیدی

دەکا بە کوشتن، ئینجا عروەش گەڕایەوە ناو قورەیشیەکان سوێندی بۆ خواردن گوتی بە هەرچی پێم بڕوا دەکەن با وابکەین موحەمەد بە ئاشتەوایی بێتە ناومان وەڵاهی ئەوەی من لەوم بینیو لە دەوروبەرەکەی لەگەڵیدابون ئا ئەو پیاوانە زۆر موحەمەدیان خۆشدەوێ (ﷺ) هەموو گیانیان فیدایە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) پێویست ناکا بە هیچ نەوعێک و هیچ جۆرێک ئێمە شتێکی وابکەین کەوا شەڕ ببێ و خوێن بڕژێ، ئەویش بە قسەی عروەشیان نەکرد و ئەمجارە حولەیسی کوڕی عەلقمەیان نارد قورەیشیەکان، وە لە پاشانەکە میکرەزی کوڕی حەفصیان نارد کە دور بە دوری پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئەوە پیاوێکی تاوانکاری خراپە هات لەناو قسەکردندا بوو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا سوهەیلی کوڕی عەمر ناردیان قورەیشیەکان کە پیاوێکی قسەزان بوو بە نوێنەرایەتی قورەیشیەکان چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) قسەی بە میکرەزی قورەیشی و کافر بڕی گوتی من هاتوم لەگەڵت یەکلا بکەمەوە ئەی موحەمەد (ﷺ)، جا پێغەمبەریش لەولاوە (ﷺ) دڵی ئاوی نەخواردەوە بە قسەی نوێنەری قورەیشیەکان کە چونەوە ناو قورەیشیەکان و هەر نوێنەر لە دوای نوێنەر دەینێرن لەبەر ئەوە فەرموی منیش نوێنەری خۆم دەنێرم بۆناو قورەیشیەکان خیراشی کوڕی ئومەیەی خوزاعی نارد پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام قورەیشیەکان لە دەرگای شاری مەککە کە چوە ژورەوە ڕێگایان پێگرت و ویستیان بیکوژن بەڵام ئەحابیشەکان نەیانهێشت و قوتاریانکرد و گەڕاوە لای پێغەمبەر (ﷺ)، و ئینجا پێغەمبەر فەرموی عومەری کوڕی خەتاب تۆ دیاریدەکەم بڕۆ بە نوێنەرایەتی من بۆلای قورەیشیەکان تۆ ئازا و پاڵەوانی، ئیمامی عومەریش عوزری هێنایەوە و بیانوی شەرعی هێنایەوە فەرموی من هیچم لە هیچ نەهێشتوەتەوە لەگەڵ قورەیشیەکان ئەی پێغەمبەر (ﷺ) سوێند بە الله من بچمە ناویان گوێبیستی قسەکانم نابن دەبێتە شەڕ لەگەڵیان چونکە من کاتی خۆی توند بومە لەناویان کەس نیە پشتگیری کارم بێ هەر بۆ ئەوەشمە من نەچم تا قسەکانی تۆ ئەوان گوێبیست بن و نەفەوتێ، گوتی ئەی کێ بنێرم باشە؟ فەرموی عوسمانی کوڕی

عەفان بنێره ئەو پاڵپشتی هەیه لەوێ نەرم و نیان بوه کاتی خۆی وەکو من نیه بەڵکو قسەکانت بگەیەنێته قورەیشیەکان، جا پێغەمبەر (ﷺ) عوسمانی کوڕی عەفانی نارد، عوسمانیش دیاره له ڕێگادا -رضي الله عنه- ئەبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص پێی دەگات و پەنای دەدا لەپەنای خۆی دەبیات بەرەو شاری مەککه لەوێوه عوسمانی کوڕی عەفان دیاره هەواڵەکەی پێغەمبەر (ﷺ) و پێیان دەگەیەنێ و وه نوێنەرایەتیەکەی به جوانی جێبەجێ دەکا، قورەیشیەکان دەڵێن عوسمان فەرموو ڕێگا دەدەین تۆ تەوافی (کعبة الله) بکەی، عوسمانیش دەفەرموێ نەخێر من نایکەم مەگەر پێغەمبەری الله بێ بیکا (ﷺ) من بەپێش ئەو ناکەوم له تەوافی (کعبة الله) لەوێ قەدەغه دەبێ و نایکا، بەڵام هەواڵ بڵاو دەبێتەوه کەوا گوایه قورەیشیەکان ئیمامی عوسمانیان شەهید کردوه، لەبەر ئەوەیه پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری ئەوه دەدا وەرن بەڵێن و پەیمان ببەسترێ بەڵێن و پەیمان لەسەر ئەوەی تۆڵەی عوسمانی کوڕی عەفان بکەینەوه، ئا ئەو بەیعەت و پەیمانه بوو له ژێر دارەکه که خوای رب العالین له قورئاندا باسیدەکا پێیان هەڵدەدا ئەوانەی بەیعەتیان دایه پێغەمبەر (ﷺ)، وه پێغەمبەریش ڕویان تێدەکا ئەویش به هەمان شێوه دەفەرموێ «أَنْتُمْ خَيْرُ أَهْلِ الْأَرْضِ[1]» دەفەرموێ ئەی ئەوانەی بەیعەتتان داوه من لەژێر دارەکه که (١٤٠٠) سەحابه بون جابر دەگێڕێتەوه یەک بەیەک بەیعەتیان دایه پێغەمبەر (ﷺ)، یەکەم پیاوێک که بەیعەتەکەی دەست پێکرد ئەبو سینانی عەبدوڵای کوڕی وەهەبی ئەسەدی بوو جا له پاشان سەلەمەی کوڕی ئەکوەعیش سێ جار بەیعەتی دایه پێغەمبەر (ﷺ)، لەسەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایەکەیدا پێغەمبەر دەستی خۆی لەناو دەستی خۆینا فەرموی ئەو دەستەی ڕاستەم دەستی عوسمانی کوڕی عەفانه بەڵێن و پەیمانی خۆشمی پێدەدەم ئێوەش وەرن بەڵێن و پەیمان بدەن هەتا ئێمه مابین ئیلا دەبێ تۆڵەی عوسمانی کوڕی عەفان بستێنینەوه یان هەر هەمومان دەکوژرێین و شەهید دەبین لەپێناو خوای رب العالمین، جا خوای رب

[1] صحيح البخاري (٤١٥٤) صحيح مسلم (١٨٥٦)، مسند أحمد (١٤٣١٣).

العالمین ئایەتی دابەزاند: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيۡهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾ [الفتح: ١٠] خوای رب العالمین دەفەرمویّ بەڕاستی و بێگومان ئەوانەی بەیعەت و بەڵێن و پەیمانیان پێدای لە ژێر دارەکە ئەی موحەمەد (ﷺ) ئا ئاوانە بەیعەت و بەڵێن و پەیمانیان داوەتە خوای رب العالمین دەستی الله بەوەی لە الله دەوەشێتەوە ئەهلی سونە و جەماعە فەرمویانە (یلیق بجلاله وعظمته) لەسەر دەستی ئەوانەوەیە لە بەیعەتەکە واتە ڕازیمە بە بەیعەتەکەی کە دایان ئەوەی بەیعەتەکەش بشکێنێ و یان پاشگەزبێتەوە و جێبەجێی نەکا ئەوە بە دڵنیاییەوە خوای رب العالمین لێی وەرناگرێ و تۆڵەی لێ دەستێنێتەوە ئەوەش کەوا بەو عەهد و بەڵێنەی داویەتیە خوای رب العالمین بیگەیەنێتەجێ خوای رب العالمین لە داهاتودا و لە قیامەتیش ئەجر و پاداشتێکی مەزنی دەداتەوە.

وە هەروەها الله تعالی فەرموی: ﴿لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ الله تعالی بێگومان و بە دڵنیاییەوە ڕازیبوو سەدا سەد لەوانەی کەوا بەیعەتیان بە تۆدا لە بڕوادارەکان ئەی موحەمەد (ﷺ): ﴿إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ﴾ [الفتح: ١٨] الله زانی چیان لە دڵدایە لە ئیمان و لە ئیسلام لە ژێر دارەکە کە بەیعەتیان بە تۆدا ئەی پێغەمبەر (ﷺ).

با بزانین سوهەیل لەگەڵ پێغەمبەر گەیشتە چی (ﷺ)، ئیمامی عوسمان هەواڵهات کە قوڕەیشیەکان زانیان وا پێغەمبەر بەیعەتی بەستاوە (ﷺ) بە زوترین کات ئامادەبن بۆ ئەوەی کەوا سوهەیلیشیان نارد و کە پێک بێن لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) شەڕ ڕونەدا، هەواڵیش گەیشتەوە کە ئیمامی عوسمان سەلامەتە و نەکوژراوە، جا پێغەمبەر (ﷺ) سوهەیل هەرکە هاتە لای گوتی قوڕەیشیەکان داوایان ئەوەیە تۆ نەیەیتە ناو مەککە

ئەمساڵ ئەی موحەمەد (ﷺ) ساڵێکی تر بۆت هەبێ بێیتە ناو مەککە و عومرەکەی خۆت بکەی، لە کۆتایەکەیدا لەسەر ئەو بەندانە ڕێککەوت لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ):

یەکەمجار پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) بنوسن کە ئەوە نوسراوێکە لەنێوان (محمد رسول الله) بەڵام ئەوان ڕازی نەبون (ﷺ) قوڕەیشیەکان و نوێنەری ئەوان سوهەیل گوتی ئێمە تۆمان پێ (رسول الله) نەبوە پێمان وایە ئەوە ڕەشبکرێتەوە شتێکی تر بنوسرێ بەڵکو نوسیان (بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ).

ئینجا لە پاشان خاڵی دوەم نوسیان ئەوە ئاشتەواییە لەنێوان موحەمەدی کوڕی عەبدوڵا (ﷺ) لەگەڵ سوهەیلی کوڕی عەمرو.

ئینجا خاڵێکی تر لەسەر ئەوە بوو شەڕ و جەنگ کۆتایی پێبێ لەنێوان موشریک و قوڕەیشیەکان لەگەڵ پێغەمبەر و موسڵمانەکان (ﷺ) تا دە ساڵان شەڕی یەکتر نەکەین.

ئینجا لە پاشان گوتیان هەرکەسێک لە ئێوە هەڵگەڕایەوە بوەوە کافر و هاتەوە مەککە ئەوکاتە بە دڵنیاییەوە ئێمە نایگێڕینەوە بۆتان هەرکەسێک لە ئێمە بوە موسڵمان و هاتە مەدینە نابێ تۆ قبوڵی بکەی ئەی پێغەمبەر (ﷺ).

وە لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ڕێککەوت لەسەر ئەوەی کە موسڵمانەکانیش بچن لەوێ حەجی ماڵی الله بکەن و عومرەش بکەن قوڕەیشیەکان لێیان بگەڕێن.

ئینجا گەیشتنە سەر ئەو بەندانە کە سوهەیلی کوڕی عەمر ئەو هەموو خاڵانەی بردەوە بۆ قوڕەیشیەکان و ڕازیبون، موسڵمانان ئەوەیان کەوتە نێوان لەبەر ئەوە موسڵمانەکان هەندێکیان پێیان وابوو ئەوە زەلیلیە و زۆریان پێ ناخۆشبوو لەوانە عومەری کوڕی خەتاب کاتێک دەهات و دەچوو لەبەر دەرگای خێوەتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو بەکری سدیق دەڵێ عومەر پێیدەگوتم ئەوە چیە و چی ڕودەدا؟ ئێمە چەکمان لەدەستە موسڵمانین هاتوین بۆ ئەوەی زیارەتی (كعبة الله) بکەین بۆچی بگەڕێینەوە بە زەلیلی و زەبونی؟

پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی ئەبو بەکریش بە ئیمامی عومەری فەرموو ئەوە پێغەمبەری اللەیە (ﷺ) لە کۆتایدا پێغەمبەر پێی ڕاگەیاندن (ﷺ) ئەوەی من کردومە شتێکی ڕاست و ڕەوا و دروستە، پێویستە لێرە هەدیەکانی خۆمان سەرببڕین بگەڕێینەوە خاوەنی عەهد و بەڵێنەکانمان بین لەگەڵ قورەیشیەکان الله بەوە لە ئێمە ڕازییە -جل شئنە- بەڵام دیارە هەندێک لە سەحابەکان چەندێک پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) کەس نەچوو هەدیەکانیان سەربڕێ لە یەکێک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ ئوم سەلەمەی دایکی دایکی ئیمانداران لەو جەنگە و لەو ڕۆیشتنەی بەرەو عومرە و مەککە کە (صلح الحديبية)ی لێکەوتەوە لە خزمەت پێغەمبەردا بوو (ﷺ)، پێغەمبەر چوەوە لای (ﷺ) گوتی دایکی ئیمانداران پێیگوت ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەوە بۆچی ئاوا ڕەنگت تێکچوە و بۆچی غەمگینی؟ فەرموی وەڵاهی لەوە دەترسێم خوای رب العالمين عەزاب بنێرێ بۆ سەر ئومەتەکەم و سەحابەکان لەبەر ئەوەی هیچ کەسێک نیە لە ئومەتەکان سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەرەکەی اللەیان کردبێ (ﷺ) ئیلا خوای رب العالمين عەزابی داون، منیش پێیان دەڵێم هەدیەکانتان سەربڕن (ئاژەڵەکانتان) لێرەوە خوای رب العالمين بە عومرە بۆتان قبوڵ دەکا و بگەڕێنەوە ئەوان سەرپێچی دەکەن و هیچیان نەچونە هەدیەکەیان سەربڕن، جا ئومە سەلەمە فەرموی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) من ئەو بۆچونەت بۆ دەردەبڕم تۆ بڕۆ بە کرداری ئاژەڵەکە سەربڕە بە دڵنیاییەوە ئەوان قسەی تۆ ناشکێنن و شوێنی تۆ دەکەون بەڵام دیارە ئەوان پێیان وایە هێشتا مەجالی تێدا ماوە لەبەر ئەوەیە خۆیان ئاوا دوادەخەن و بە قسە ناچن حەیوان و ئاژەڵەکەیان سەربڕن، کە پێغەمبەر وایکرد (ﷺ) یەک بەدوای یەک سەحابەکان هەر هەمویان چون ئیقتیدایان کرد بە پێغەمبەری پێشەوا و (ﷺ) ئاژەڵ و حەیوانەکانیان سەربڕی، جا لێرەوە خوای رب العالمين ڕێ خۆشکردن بوو بۆ ئەوەی فەتحێکی گەورە ڕوبدا ئەویش فەتحی مەککە بوو.

## ئازادکردنی مەککە و پێشەکیەکانی

لە دوای (صلح الحديبية) ئەو خێر و بێرە هات بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کە نامەی نوسی بۆ سەرکردەکانی جیهان بۆ زلهێزەکان و ئیقلیمیەکانی دەوروبەری، بەبێ ترس پێغەمبەر (ﷺ) مێژونوسان دەڵێن ئەوە خاڵێکی زۆر گرینگە لە سەرکردە و قاعیدەکان بێتەجێ قائیدی موسڵمانان پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر خەڵکێکی ترسنۆک لە دەوروبەریبا ئەو کاتە ڕەنگە دەیانگوت ئەو نامانە چیە؟ بۆ خۆت وا ئاشکرا دەکەی؟ هێشتا تۆ هێزت ئەوەندە زۆر نیە بۆچی نامە دەنوسی بۆ هەریقەلی گەورەی ڕۆمەکان نامە بۆ گەورەی فارسەکان کە وەکو ڕوسیا و ئەمریکای ئێستا و بەهێزتریش بون؟ ئینجا بۆچی نامە دەنوسی بۆ دیمەشق و بۆ بەحرێن و بۆ وڵات و شوێنەکانی تر داوایان لێدەکەی بە ئاشکرا ئەوان دینیان هەڵەیە و ببنە موسڵمان؟ پێغەمبەر (ﷺ) بە جورئەتەوە نامەکانی نوسی لەوانە بۆ هەریقەلی گەورەی ڕۆمەکان کە دەحیەی کەلبی کە جوبڕائیل دادەبەزی هەندێک جار لەسەر وێنەی ئەو کە خۆی دەهێنایە سەر وێنەی مرۆڤ و بەنو ئادەمەکان ئەو سەحابە بەڕێزە بۆی برد، وەڵامێکی زۆر خراپی نەبوو تێفکری هەریقەل بەڵام نەبوە موسڵمانیش، بۆ کیسرای گەورەی فارسەکانیشی نارد بە عەبدوڵای کوڕی حوزافەی سەهەمی کاتێک کیسرا نامەکەی پێغەمبەری دڕاند (ﷺ) پێغەمبەریش دۆعای لێکرد کە موڵک و دەسەڵاتەکەی پارچە پارچەبێ بە فعلی پارچە پارچە بوو الله لەناوی برد، نامەی نارد بۆ نەجاشی پاشای حەبەشە بە عەمری کوڕی ئومەیەی زەمری، وە نامەی نارد بۆ موقەوقیسی حاکمی میسری ئەوکات، وە نامەشی نارد بۆ المنذر بن حارث کەوا سەرپەرشتی دیمەشقی دەکرد بە شوجاعی کوڕی وەهەب، وە نامەشی نارد بۆ المنزى کوڕی ساوی عەبدی کە ئەمیری بەحرێن بوو لەوکات بە ئەبو العلائی حەزرەمی، وە چەندین نامەی تریشی نارد پێغەمبەر (ﷺ)، لەوانە هەندێک وەڵامی باشیان هەبوو بەڕێزەوە ئەگەر نەبوونە موسڵمانیش، هەندێکیش وەکو باسمان کرد وەکو کیسرای گەورەی فارسەکان بەبێ ئەدەبانە وەڵامی پێغەمبەریان دایەوە (ﷺ)، ئینجا

موقەوقیسیش هەندێک دیاری و نامەی نارد لەسەر بۆچونی پەسەندی ڕیوایەتەکان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هەرچەندە نەبوە موسڵمانیش.

وە ڕوداوێکی تر لە ساڵی حەوتەمی کۆچی لە نێوان (صلح الحديبية) و وە فەتحی مەککەی ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) چوو عومرەی کرد لەگەڵ سەحابە بەڕێزەکانی کە پێغەمبەر (ﷺ) جگە لە منداڵەکان وە جگە لە ئافرەتەکان دوو هەزار موسڵمانی لەگەڵدا بوو، چەکی تەواویان لەخۆیان بەستبوو نەوەک قورەیشیەکان خیانەتیان لێبکەن بەڵام تەنها بە مەبەستی عومرەکردن بەرەو مەککەی پێغەمبەر (ﷺ) کەوتە ڕێ کە لە مێژودا ناودەبرێت بە (عمرة القضاء)، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئەوەی بگاتە ناو مەککە میکرەس هاتە لای قورەیشیەکان ناردیان لەگەڵ هەندێک خەڵک گوتیان تۆ بەڵێنت لەگەڵ ئێمە هەیە بە چەکێکی وا زۆر نەیەیتە ناو مەککە مەبەستت خوێن ڕشتنە؟ فەرموی نا تەنها مەبەستم عومرە کردنە چەکەکانم لێرە بەجێ دێڵم بەڵام تەنها دوو سەد سوارچاکی پاسەوانی تایبەت پێغەمبەر (ﷺ) فەوجێکی تایبەتی لە دوو سەد کەس پێکهاتبوو بە سەرکردایەتی و ئامیر فەوجایەتی موحەمەدی کوڕی مەسلەمە پێغەمبەر ئەوانی هەر لەگەڵ خۆیبرد (ﷺ) چونکە لەپێشتر خیانەتی زۆر لەگەڵ کرابوو ئەو دوو سەد کەسە پاسەوانی تایبەتی پێغەمبەر و کەژاوەکەی پێغەمبەریان دەکرد (ﷺ) هەتا داغڵی مەککە بون، ئینجا خێر و بێری ئەوەی پێوەبوو ئەو عومرەی پێغەمبەر کردی (ﷺ) کچی ئیمامی حەمزە کە بە کافرایەتی مابۆوە و لەوێ لەبەر دەستیشیان بوو موسڵمان بوو، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) کە ئیمامی عەلی پێی دەفەرموێ بۆچی نایخوازی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ببێتە هاوسەرت؟ پێغەمبەریش ڕوی تێدەکا دەفەرموێ «إِنَّهَا ابنةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ[1]» دەفەرموێ ناشێ و ناگونجێ بۆمن چونکە حەمزە برام بوو لە شیری ئەوە دەکاتە کچی برامە لە شیری، ئینجا لە پاشان هەر لەو نێوانەدا

[1] صحيح البخاري (٤٢٥١) (١٨٤٤) (٢٦٩٨)، صحيح مسلم (١٧٨٣)، سنن أبي داود (١٨٣٢).

بوو پێشی فەتحی مەککە کە موسڵمانان ئەوها بینران ئەوەندە زۆرن بە حەماسەتەوە تەلبیە و (لَبَّیْكَ اللَّهُمَّ لَبَّیْكَ) دەڵێن ئەو هەموو سوار چاکانەی پاسەوانە تایبەتیەکانی پێغەمبەر بینران (ﷺ) لەوپەڕی ئازایەتی و سینگ کردنەوە لە پێناو خوای رب العالمین کە منەتی هیچ کەسیان نەدەزانی پشتیان بە الله بەستبوو لە کوشتن نەدەترسان خالیدی کوڕی وەلید لەناو مەککە ئەوانی بینی و سەرنجی زۆر ڕاکێشرا بەرەو ئیسلام، ئینجا لەولاشەوە بەڕێزان عەمری کوڕی عاس کە گاڵتە نەبوو عەمری کوڕی عاس پیاوێکی زیرەک و دانا و وە زۆریش ئازابوو، ئینجا عوسمانی کوڕی تەڵحەش، ئەو سێ پاڵەوانە لە دوای ئەو عومرەیەوە ئیسلامیان کەوتە دڵ و هاتن لە مەککە موسڵمان بون و بەگەڵ لەشکری موسڵمانان کەوتن.

لە پاشان پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) فەتحی خەیبەر ڕویدا و وە سریەیەکی موئتەی نارد کە سێ سەرکردەکەی لەو جەنگی سریەی موئتەدا کە یەکەمیان زەیدی کوڕی حاریسە و عەبدوڵای کوڕی ڕەواح و جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵیب بوو، پێغەمبەر لەوێوە موعجیزەیەکی لێ بەدیار کەوت (ﷺ) کە ناردی دیانەکان لە دیمەشق و شامەوە ئەوانی بیزەنتیان هێنابون وە خەڵکەکانی ڕۆمەکان و دیانەکانیان سەرنج جوڵاند بون دژایەتی موسڵمانان و ئیسلامیان دەکرد لەشکریان کۆکردەوە دوو سەد هەزار کەس پێغەمبەر (ﷺ) سێ هەزار سەحابەی بە سەرکردایەتی ئەو سێ سەرکردە نارد ڕێگایان پێ بگرن لە ساڵی هەشتەمی هیجری و کۆچی بوو، ئینجا لەوێوە ئەو سەحابە بەڕێزانە موعجیزەکە بەوە بەدیارکەوت پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) با لە سەرەتادا زەیدی کوڕی حاریسە سەرکردەتان بێ ئەگەر ئەو ئاڵای لە دەست دەکەوتە خوارەوە و شەهید دەبوو با جەعفەری کوڕی ئەبو تاڵیبی مامم لەجێی ببێتە سەرکردە ئەگەر ئەویش شەهید کرا با عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە ببێتە سەرکردە، بەو تەرتیب و ناوانە پێغەمبەر هێنای (ﷺ) یەک لە دوای یەک ئەوانە

شەهید بون پێغەمبەر (ﷺ) وەکو موعجیزەیەک ئەوەی زانیبوو ئەو هەواڵە نهێنیەی پێ درابوو، ئینجا خالیدی کوڕی وەلید بە لێزانی و سەرکردایەتی خۆی موسڵمانەکانی قوتار کرد و لوتی دوو سەد هەزار لە جەیش و لەشکری کافرەکانی شکاند، بەوەی هەندێکی جودا کردنەوە بە شەوی تاریک کە ڕۆمەکان هەستیان پێنەکرد گوتی ئێوە زۆر دورکەونەوە وە ئێمەش بەیانی لێیان دەچینە دەست و ئیشیان لەگەڵ دەکەین و شەڕ لەگەڵیان بەرپا دەکەین لەدورەوە ئێوە لەپاش ماوەیەک وەرن و تۆز بکەن تۆزێکی زۆر هەتا وابزانن لەشکر لە هانامان هاتوە و پشتگیریمان دەکا بەڵکو ڕابکەن و بڕۆن ڕۆمەکان، ئەو نەخشە سازیەی خالیدی کوڕی وەلیدی پاڵەوان سەریگرت و ئەوەبوو موسڵمانەکان بەڵێ گەڕانەوە مەککە هەندێک شەهیدیان پێبوو لەوانە سێ سەرکردەکە و وە موسڵمانان لەوێ ئاوا سەرکەوتن و ڕۆمەکان دۆڕاندیان.

لە فەتحی خەیبەریش دەمانەوێ ئەوەتان بۆ باسکەین کە قەڵای خەیبەری جولەکەکان پێغەمبەر ویستی (ﷺ) جولەکە ئەوەندە ناپاک و خائین بون تەسفیەیان بکات لە دەوروبەری مەدینە و نەیان هێڵێ ئینجا چوە سەر خەیبەر و لەوێدا ئاڵاکەی دایە دەست ئیمامی عەلی بەو ڕیوایەتەی کە دەگێڕدرێتەوە ئیمامی عەلی چاوی ئێشا و فەرموی بەیانی پێغەمبەر (ﷺ) چونکە سونەتی وابوو بە شەو گەیشتە نزیک خەیبەر سونەتی پێغەمبەریش وابوو بە شەو هێرشی نەدەکرد بەیانی نوێژەکەی دەکرد دوای نوێژی بەیانی ئینجا هێرشی دەکرد، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) بەیانی پیاوێک کە الله و پێغەمبەری اللەی خۆشدەوێ و ئەوانیش خۆشیان دەوێ ئاڵاکە دەدەمە دەستی و فەتحی خەیبەری پێدەبێ، ئەوەبوو ئیمامی عەلی هات و فەرموی عەلی لە کوێیە؟ گوتیان چاوی دێشێ، فەرموی عەلیم بۆ بانگ کەن و پێغەمبەر تفی کردە ناو چاوی ئیمامی عەلی بە تفە بە

بەرەکەتەکەیەوە خوای رب العالمین شیفای چاوی ئیمامی عەلیدا و ئاڵاکەی هەڵگرت و چوو فەتحی خەیبەری کرد.

فەتحی خەیبەر لەسەری ناوەستین بۆ ئەوەی پێرا بگەین بەڵام ڕوداوێکی گرنگی فیقهی لەوێ ڕویدا کە ئێستاش لەناو ئێمە باس و خواس دەهێنرێتە گۆڕ لەلایەن ئەو کەسانەی دوژمنن بە ئیسلام و شوبهە دروست دەکەن و ڕەخنەش دەگرن یان ئەوانەی کە لایانداوە لە ڕێبازە ڕاستەقینەکەی الله و پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) شیعە و ڕافیزەکان ئەویش حوکمی موتعەیە، ئافرەتێک بێنی بە کاتی و لەگەڵی ڕابوێری ناوی لێبنێی زەواجی شەرعی، ئا ئەوەیان حەرامی موتڵەقە، ئەوەتا زانایان دەفەرمون لە جەنگی خەیبەر بە تەواوەتی خوای رب العالمین فەرمانیدا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە لە پێشتردا بەڵێ ڕێگا درابوو لە دوایدا خوای رب العالمین حەرامی کرد و نەیهێشت ئەو حوکمە بمێنێتەوە، جمهوری زانایان لە مالیکیەکان و شافیعیەکان و حەمبەلیەکان وە زۆرێکی تر لە زانایانی ئەهلی تەحقیق لە هەموو مەزهەبەکان فەرمویانە حەرامە نیکاح و هاوسەرگیرایەتی موتعە بە نیکاحێکی شەرعی دانانرێت و حەرامی کولییە و لە جەنگی خەیبەردا بە تەواوەتی حەرامکرا، ئەو ڕیوایەتەش کە ڕیوایەت دەکرێ گوایە ابن عەباس و هەندێک لە زانایان پێیان دروست بوە دوایە کە ئەوەش هەڵدەوەشێنرێتەوە بەوەی ئیمامی عەلی ڕەخنە دەگرێ لە ابن عەباس ابن عەباسیش تێدەگەیەنێ بەوەی کەوا حەرامە و تاوانە و نابێ بکرێ و ئەنجام بدرێ، ئەوەتا پێغەمبەر فەرموی (ﷺ): «يا أَيُّها النّاسُ، إنيِّ قدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ في الاسْتِمْتاعِ مِنَ النِّساءِ» ئەی خەڵکینە من لە پێشتردا ڕێگام بە ئێوە دابوو نیکاحی موتعە هەبێ بەڵام ئێستا پێغەمبەر فەرموی «وإنَّ اللَّهَ قدْ حَرَّمَ ذلكَ إلى يَومِ القِيامَةِ» بەڵام الله فەرمانی پێکردم هەر لە ئێستاوە لەدوای جەنگی خەیبەر هێشتا نەگەڕابونەوە موسڵمانەکان فەرموی الله ئەمری پێکردم پێغەمبەر (ﷺ) ئا ئەو کار و هاوسەرگیرایەتی و موتعە حەرامکرا لەسەرتان هەتا

ڕۆژی قیامەت «فَمَن كانَ عِنْدَهُ منهنَّ شيءٌ فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهُ» ئەگەر هەریەک لە ئێوە ئافرەتێکی بە هاوسەرگیرایەتی موتعە لەلایە و هەر دەستبەجێ و ئێستا دەستی لێ هەڵبگرێ و وازی لێبێنێ «ولا تَأْخُذُوا ممّا آتَيْتُمُوهُنَّ شيئًا[١]» هیچیشیان لێ وەرمەگرنەوە لەوەی پێتان داون لە بەرامبەر ئەوەی کە بە کاتی شویان بە ئێوە کردوە و نیکاحی موتعەیان لەگەڵ ئێوە هەبوە.

ئینجا ئەو زانایانە دەڵێن بەو ئایەتانەش نیکاحی موتعە حەرامە کە ئێستا نوێکراوەتەوە بەداخەوە شیعەکان شیعەی ئیمامیەکان بە تایبەتی بڕوایان پێی هەیە لە ئێران و لە نەجەف و لە زۆرێک لە شوێنەکان شیعە ئیمامیەکان ئێستاش دەیکەن وە لە پاشان هەواڵمان زانیوە لێرە و لەوێ لەناو ئێمەی میلەتی کوردیش جێی داخ و نیگەرانیە ئەو شتانە هەوڵی بۆ دراوە هەندێک سەرنجی گەنجەکانی کە ئاگادارنین لە دین و عەقیدە و بیروبڕوایان لە شەریعەتی ئیسلام پێیوە ڕابکێشێن ڕافیزە و شیعەکان بیانبەن بەو ناوەیەوە بۆ ئەوەی ببنە شیعە یان ببنە ڕافیزە یان لایەنی کەم ئەخلاق و ڕەوشت لە دەست بدەن و ئیلتیزام نەکەن بە ئیسلام و شەریعەتی ئیسلام خەتەرناکە کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ هُم لِفُرُوجِهِم حَٰفِظُونَ﴾ ئیماندارە ڕاستەقینە سەرفرازەکان ئەوانەن کەوا داوێنیان دەپارێزن: ﴿إِلَّا عَلَىٰٓ أَزوَٰجِهِم أَو مَا مَلَكَت أَيمَٰنُهُم فَإِنَّهُم غَيرُ مَلُومِينَ﴾ ئیلا تەنها لەگەڵ هاوسەرەکانیان کە بە مەرجە شەرعیەکان هاوسەرگیرایەتیان لەگەڵ دەکەن بەکاری دەهێنن یان لەگەڵ ئەو سەرارییانەی کە جارییە ئەگەر جەمع بوی لەگەڵی پێی دەڵێن سەراری یان لەگەڵ ئەوانەوە جەمع دەبن ئەو کاتە هیچ لۆمە و سەرزەنشتێکیان لەسەر نیە تەنها ئەو دوو ڕێگایە هەیە بۆ ئەوەی ئەوانە لە ڕێگای شەرعیەوە جەمع ببن: ﴿فَمَنِ ٱبتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلعَادُونَ﴾ [المؤمنون: ٥-٧] هەریەک جگە لەو دوو ڕێگایە خوای رب العالمین دەفەرموێ

[١] صحيح مسلم (١٤٠٦) (١٤٠٦)، سنن أبي داود (٢٠٧٢) (٢٠٧٣)، سنن النسائي (٣٣٦٨).

شەهوەتی خۆی دابمرکێنێتەوە و جەمع ببێ و کۆببێتەوە لەگەڵ ئافرەتێک تەنانەت هەندێک لە زانایان دەفەرمون بە دەستی خۆشی شەهوەتی دابمرکێنێ و ئاوی خۆی بێنێتەوە ئەو ئایەتە هەر دەکەنە بەڵگە ئەو زانایانەش خوای رب العالمین دەفەرموێ ئا ئەوانە سەرپێچیان کردوە و تەجاوزیان کردوە و بە گوناح لەسەریان حیسابە، کەواتە دەبێ ئاگاداربین ئەو جۆرە نیکاحە حەرامکراوە جائیز نیە دروست نیە نابێ بکرێ لەناومان.

لە پاشان دێینە سەر ئەوە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) فەتحی مەککە دەکا، پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ناوی اللهی لێ هێنا و مۆڵەت هات لەلای خوای رب العالمین بە غەدر و خیانەتی کافر و موشریکەکان بوو ڕاستە پێغەمبەر عەهد و بەڵێنی هەبوو (ﷺ) لەگەڵ قورەیشیەکان لە (صلح الحديبية)وە کە شەڕ نەکا بەڵام لەولاوە بەنو بەکر کاتێک کەوا تەحالوفی هەبوو لەگەڵ قورەیشیەکان ئاواش بەڵێن بوو بەندێک لە بەندەکانی (صلح الحديبية) ئەگەر هەر تیرەیەک هەر هاوپەیمانیەک ببەستێ لەگەڵ قورەیشیەکان پێغەمبەر (ﷺ) پاڵەپەستۆیان نەخاتە سەر وە هەر تیرەیەکیش لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانان هاوپەیمانێتی ببەستێ قورەیشیەکان پاڵەپەستۆی نەخەنە سەر، ئەوەبوو بەنو خوزاعە لەگەڵ موسڵمانان و پێغەمبەر (ﷺ) هاوپەیمانێتیان بەستبوو، لەولاشەوە بەنو بەکر هاوپەیمانێتیان لەگەڵ قورەیشیەکان بەستبوو، بەڵام موشریکەکان خیانەتیان کرد وە کافرەکانیش وە بەنو بەکریش، کاتێ کەوا هێرش دەکەنە سەر خوزاعیەکان بۆ ئەوەی هەندێکیان لێ بکوژن و بە حیسابی خۆیان هەندێک مەرامی دونیای خۆیان بە دەست بێنن، کە پێغەمبەر ئەو هەواڵەی زانی ئەو هاوپەیمانیەتیەی هەبوو زۆر توڕەبوو لە کافر و لە موشریکەکان گوتی بەڵێنیان شکاندوە، خۆی ئامادەکرد لەگەڵ لەشکری موسڵمانان بەرەو ڕزگارکردنی تەواوی یەکجارەکی مەککە و حیجاز، بەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەو هەواڵەی بە کەس نەگوت نەیگوت بەرەو کوێ دەچین، لەبەر ئەوە بوە مێژونوسان دەفەرمون هەتا

هەواڵ نەگاتە قورەیشیەکان، ئەگەر قورەیشیەکان ئەوە بزانن ئەگەری ئەوە هەیە خۆیان تەواو ئامادە بکەن شەڕی زۆر قورس و خوێنی زۆر بڕژێت لەناو مەککە و حیجاز ئەوەی پێ خۆش نەبوو پێغەمبەر (ﷺ)، فەرموی لە ئامادەباشیدابن هاوەڵە بەڕێزەکانم جەنگێکی گرنگ هەیە و دەڕۆین، هەمویان بەگەڵی کەوتن و لە خزمەتیدا بون کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشتنەکەی بەرەو مەککە بوو، لەوێوە یەک لە سەحابە بەڕێزەکان حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە نامەیەکی نوسی بۆ قورەیشیەکان کە پێغەمبەر نیازێکی وای هەیە (ﷺ) جا هەرکە نامەکە لە ڕێگا بوو هێشتا بە قورەیشیەکان نەگەیشتبوو خوای رب العالمین هەواڵی بە پێغەمبەردا (ﷺ) لەلای یەک لە سەحابەکان نامەیەک ڕەوانە کراوە زوو مەفرەزەیەک بنێرە و پێڕا بگە و نامەکە بێنەوە با نەگاتە دەستی قورەیشیەکان، بەسەرپەرشتی ئیمامی عەلی پێغەمبەر (ﷺ) چەند سەحابەیەکی نارد وە پێغەمبەر فەرموی لەلای ئافرەتێکە لە ڕێگا دەڕوا بەرەو قورەیشیەکان، ئیمامی عەلی بەرایی لەو ئافرەتە گرت لەگەڵ سەحابەکانی تر پێیان گوت نامەکەمان بدێ کە لە یەکێک لە سەحابەکان دراوەتە تۆ بەرەو قورەیشیەکان بیبەی، ئەویش گوتی نامەم لەلا نیە، ئیمامی عەلی فەرموی سوێند بە الله ئەمری الله و پێغەمبەرە (ﷺ) پێمان دەدەی پێمان بدە پێمان نادەی دەتپشکنین هەتا نامەکە دەبەین دڵنیاین نامەت لەلایە و پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ)، دوایە دەریان هێنا لە هەندێک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ لەگەڵ کەزی خۆی لولی دابوو وەکو کەزی لێکرد بوو دەریان هێنا نامەکە لەو سەحابە بەڕێزەوە بوو کاتێ گەڕاندیانەوە لای پێغەمبەر (ﷺ)، حاتەب هات پێغەمبەر پێی فەرموو (ﷺ) بۆ واتکردوە حاتەب؟ فەرموی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) من کەسم نیە پشتیوانی ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانم بوبێ لەناو قورەیشیەکان گوتم بەڵکو ئەوە دەرفەتی ئەوەم بۆ بڕەخسێنێ ئەوان دڵیان پێم بسوتێ ئیشێکی وا بکەم شتەکانم بدەنەوە و ماڵ و منداڵ و خەڵکی من عەزیەت نەدەن ئێوە پشتیوانیتان هەیە سەحابەکانی تر لەناو ئەوان، پێغەمبەر ڕازی نەبوو (ﷺ) بەوە بەڵام

ئیمامی عومەریش لەلای هەڵیکێشا شمشێر فەرموی ئەی پێغەمبەری الله لێم گەڕێ با لەسەریدەم ئەوە نیفاقی تێدایە، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) ئای ئای ئەوە چی دەڵێی عومەر؟ ئەوە لە جەنگی بەدر بەشداری کردبوو نازانی خوای رب العالمین بەوانەی جەنگی بەدری گوتوە «اعْمَلُوا ما شِئْتُمْ» ئێوە هەرچی دەتانەوێ بیکەن «فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ[١]» من لە ئێوە خۆشبوم خوای رب العالمین فەرموی، فەرموی ئەوە هەڵەیەکە کردویەتی حاتەب و لێی خۆش دەبین، پێغەمبەر لێی خۆشبوو (ﷺ)، ئا ئەوە ئەوەش دەگەیەنێ زانایان دەفەرمون حاتەب بە خیانەتەوە نەیکردبوو ئیجتیهادی کرد ئیجتیهادێکی هەڵە بوو ڕاستە خوای رب العالمین لێی ئاگادار کردەوە هەم پێغەمبەر و (ﷺ) هەم خاوەنی نامەکە.

ئینجا پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دە ڕۆژ ڕۆیشتبوو لە مانگی ڕەمەزان کە بە ڕێگا کەوت بۆ ئەوەی بچێتە ناو مەککە پێغەمبەر (ﷺ) دیارە لە ڕێگادا لە (مر الظهران) کە شوێنێکە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە دوو پیاوان بۆیان دەستگیر کرد ئەبو سوفیان بوو ئەو دوو پیاوە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ پیاوێکی تر بوو لە قورەیشیەکان هەردوکیان هێنایە لای پێغەمبەر (ﷺ)، ئەبو سوفیان کە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) دڵی نەرم بوو بوو لەبەر ئەوەی ئەو هەموو لەشکرەی بینی و ئەو هەموو وەزعەی بینی و ئەو هەموو بەربەرەکانێیەی کرد باری موسڵمانان و پێغەمبەری نەبرد (ﷺ) پێغەمبەر کە داوای لێدەکا بێتە موسڵمان ئەبو سوفیان لەوێدا دەبێتە موسڵمان ئەوە ڕای پەسەند و تەواوە، وە ئیمامی عەباسی مامی پێغەمبەریش (ﷺ) بە خۆی و عائیلەکەی هەمویان هاتبونە دەر و پێشوازی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش لە ڕێگادا موسڵمان بوو وە بەگەڵ پێغەمبەر کەوت (ﷺ) پێغەمبەر دڵی یەکجار یەکجار خۆشبوو، ئینجا پێغەمبەر پەیمانی ئەوەی بەست لەگەڵ ئەبو سوفیان هەر کەسێک بچێتە ماڵی تۆ ئەبو سوفیان من نایکوژم، وە هەر کەسێکیش بچێتە ماڵی خۆی و دەرگا لەسەر

---

[١] صحيح البخاري (٣٠٠٧) (٣٠٨١) (٣٩٨٣)، صحيح مسلم (٢٤٩٤)، سنن أبي داود (٢٦٥٠).

خۆی دابخا نەیەتە دەر دوبارە نایكوژین و ئەمین بێ لە دەستی ئێمە، وە هەر كەسێكیش دەچێتە ماڵی الله و مزگەوت و (كعبة الله) ئا ئەوەیشیان ئەمینە و ئێمە نایكوژین و هیچی لێ ناكەین، هەندێک لەولاوە زۆر ترسان لەبەر ئەوەی زۆر ئازاری پێغەمبەر و موسڵمانانیان دابوو (ﷺ) لەوانە عەبدول عوزای كوڕی خەطەل عەبدوڵای كوڕی سەعدی كوڕی ئەبی سەرح وە عیكریمەی كوڕی ئەبو جەهل وە الحویرث بن نقیذ وە میقیەسی كوڕی صوبابە و هەباڕی كوڕی ئەسوەد و وە لە پاشان دوو كۆیلەكانی وە جاریەكانی ئەبی ئەخطەل كە یەكیان ناوی فەرطەنا بوو وە ئەویتر ناوی قورەیبە بوو هەموو جار ئەوانە گۆرانیان دەگوت بە جوێندان بە پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا لە پاشان سارای مەولاتی عبد المطلب و حارث بن طولات الخزاعي و كەعب بن زهیر و وحشي بن حرب كە ئیمامی حەمزەی شەهید كردبوو وە هیندی كچی عوتبە ئا ئەوانە فەرمان دەرچوو لەلای پێغەمبەر (ﷺ) خراپەی زۆریان كردبوو پێغەمبەر فەرموی ئەوانە عەفویان بۆ نیە، فەرموی سوێند بە الله ئەگەر بچنە پەنای پەردەی كەعبە و بە كەعبەیش خۆیان هەڵواسن هەر لەسەریان دەدەم، ئا ئەوانە هەڵهاتن و ڕایانكرد هەندێک لەوانە، لەوانە عیكریمە و هەندێكی تر ڕایانكرد بەرەو یەمەن بەڵام هاوسەری عیكریمە موسڵمان بوو ئوم حەكیم ئا ئەو ناردیەوە بەدوای عیكریمە و مۆڵەتی خواست لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) كە عەفوی بكات ئەمانەتی بداتێ دێتەوە دەبێتەوە موسڵمان، ئەویان بوە موسڵمان و هەندێكی تر لەوانە هیندیش هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دەبێتە موسڵمان و پێغەمبەر عەفوی دەكا وە وەحشیش بە هەمان شێوە دەبێتە موسڵمان و بەڵام هەندێكیان بە كافری مردن و كوژران نەبونە موسڵمان وە هەندێكیشیان بونە موسڵمانی زۆر چاک ئەوانەی ناومان هێنان.

جا لە پاشان پێغەمبەر چوە ناو مەككە بەو هێزە زۆرەوە هەندێک لە لەشكرەكەی پەرت كرد پێغەمبەر (ﷺ) بە دەوروبەری مەككە ڕێگا و بانەكانیان هەموو گرت جا پێغەمبەر

کە پێی نایە ناو مەککە پێغەمبەری پێشەوایە (ﷺ) لە هەموو عەبدان زیاتر عەبدایەتی بۆ الله ئەنجام داوە و کردویەتی لەبەر ئەوە پێغەمبەر ئەوە نەبێ وەکو هیچ سەرکردەیەکی تر ئەو هەموو لەشکرە زۆرەی لەگەڵە ئەو قورەیشیەی دەیخورێ و دەیبڕێ هەمویان سەرشۆڕن کافرەکان وە زۆربەشیان ئەوانەی تر بونە موسڵمان، پێغەمبەر دەچێتە خزمەت (کعبة الله) زانایان دەفەرمون دەزانن پێغەمبەر چۆن چوە ناو مەککە؟ دەڵێ سەری خۆی نەوی کرد و شەرمیکرد لە خوای رب العالمین کە خوای رب العالمین ئەو هەموو فەزڵ و کەرەمەی لەگەڵ کردوە ئەو هەموو ڕێز و پلە و پایەی لێناوە دەفەرمون سوێند بە الله پێغەمبەرمان بینی دور بە دوری عیمامە و مەندیلێکی ڕەشی لەسەر بوو پێغەمبەر (ﷺ) لەناو ئەو ڕەشایەتیە و جل و بەرگەی دەموچاوی دەدرەوشایەوە زۆر جوانتر لە مانگی چواردە ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) سەری خۆی لەسەر وڵاخەکە ئەوەندە نزم کردبوو ڕیشی کەوتبوە سەر پشتی وڵاخەکەی سەری بەرز نەدەکردەوە ئایەتەکانی قورئانی دەخوێندەوە حەمد و سوپاس و سەنای خوای رب العالمین ی دەکرد، هەتا گەیشتە ناو مەککە بۆ ئەوەی خوای رب العالمین ئەو جەنگ و جیهاد و هەوڵ و تێکۆشان و عیبادەتانەی لێ قبوڵ بکات و بە عەبدی زەلیلی خۆی قبوڵی بکات، بەڵێ پێغەمبەر خۆی زۆر زەلیل کردوە بۆ الله بەڵام لێرەوە ئەوەش ڕادەگەیەنین نابێ ئێمەی داعی یان مامۆستایان یان کەسێک ئەو ڕووداوانە دەگێڕێتەوە بڵێ ئێمە پێغەمبەر زەلیل بکەین بۆ الله، کەس لە دەسەڵاتی نیە پێغەمبەر زەلیلی بکا بە هیچ نەوعێک بەڵام پێغەمبەر بۆخۆی زۆر عابید بوە بۆ خوای رب العالمین عیبادەت یەعنی خۆ زەلیل کردن لەوپەڕی خۆ زەلیل کردن بۆخۆی پێغەمبەر (ﷺ) خۆی زەلیل کردوە بۆ خوای رب العالمین کەسی تر نابێ ئەو قسەی پێ بڵێ و وە ئەو قسەی بۆ بڵێ تەنها لەوەوە بگێڕدرێتەوە و ئاساییە و دروستە، کە پێغەمبەر خۆی خۆی زەلیل کردوە بۆ خوای رب العالمین کە عەبدی خوای رب العالمین بوە، جا پێغەمبەر (ﷺ) چوە ناو مەککە لەوێوە دڵی موسڵمانان داکەوت، بیلالی حەبەشی هێنا ئەو مەدالیای پێ بەخشی فەرموی

برۆ سەر (كعبة الله) ئەی بیلال، بیلال كەسێكی لە شێوە و شكڵ زۆر بەرچاو نەبوە بەڵام پڕبوە لە ئیمان جێی متمانەی پێغەمبەرە (ﷺ) بەرپرسی مالیەی تایبەتی پێغەمبەر بوو (ﷺ) ئیش و كارەكانی بازاڕ لە كڕین لە فرۆشتنی پێغەمبەر (ﷺ) بیلال بەرپرس بوو بۆی دەكرد، ئەو بیلالەی بە ڕەنگ ڕەشە بەڵام لە ئیماندا زۆر گەورە و سپی و تەواوە پێغەمبەر (ﷺ) لە ئیسلامدا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ هیچ جیاوازی نیە لەنێوان ڕەش و سپیدا بە ئیمان هەڵسەنگاندن دەكرێت بۆ مرۆڤ و بەنو ئادەمەكان مەدالیای زۆر گەورەی بە بیلال بەخشی فەرموی بەو قاچ و پێیانەت بیلال بەسەر (كعبة الله) بكەوە، بۆ یەكەم جار دەنگ هەڵببڕە بیلال گەورەیی و پاك و بێگەردی الله ڕابگەیەنە یەك بە دەنگت لەسەر (كعبة الله) بڵێ (الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن لا إله إلا الله، أشهد أن محمدا رسول الله، أشهد أن محمدا رسول الله، حي على الصلاة، حي على الصلاة، حي على الفلاح، حي على الفلاح، الله أكبر، الله أكبر، لا إله إلا الله) بیلال بەو دەنگەی ڕایگەیاند و مەككە هەموی لەرزی، مەككە هەموی لەگەڵ ناوی گەورەی خوای رب العالمين تاسا ئەوەی موسڵمانە لە هاڕژنی گریانیدا بە دڵخۆشی بە سەركەوتنەكەیان بەوەی كە (كعبة الله) ماڵی اللەیە و بوە هی موسڵمانان و چیتر بتی لەناو نامێنێ، موسڵمانان تەواو سەركەوتن لەوێ، پێغەمبەری الله ماندو بوە (ﷺ)، ئەو هەموو هەوڵ و كۆششەی كردوە ئارەقەی كردوە پێویستی بە پشودانێكی كەمە، لەبەر ئەوە پێغەمبەر دەچێتە ماڵی ئوم هانیء، لە ماڵی ئوم هانیء میوان دەبێ پێغەمبەر (ﷺ)، كاتێك دەبینێ ئوم هانیء دوو پیاو لە خزمانی خەزورانی خۆی پەناداوە لە كافر و موشریكەكان، گوتی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) ئەو دوو پیاوە خۆیان لە ماڵی من ناوە من ئەمانەتم پێ بەخشین تۆ چی دەڵێی؟ پێغەمبەر فەرموی «قد أجرنا من أجرتي يا أم هانيء» ئەوەی تۆ پەنات دابێ ئێمەش پەناماندا ئەی ئوم هانیء، لەبەر ئەوە زانایانی فیقهی دەفەرمون ئەگەر ئافرەتیش لەنێو موسڵماناندا كە موسڵمان بوو پەنای كەسێكی دا و كەسێكی كافر پەنای بۆ هێنا ئافرەتەكە پەنایدا

جێگای پەنادان بوو موسڵمانان و سەرکردەکان پێویستە پەناکەی قبوڵ بکەن و وەربگرن بە مەرجە شەرعیەکانەوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەر لە ماڵی ئوم هانیء چوە سەر کێوی سەفا پێغەمبەر (ﷺ)، لەوێوە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر وە ئەوانەی نوێش بون یەک بە یەک بە ئافرەت و بە پیاوانەوە هاتن بەیعەت لەگەڵ پێغەمبەر ببەستن (ﷺ)، بەیعەتیان بەست لەگەڵ پێغەمبەر بەڵام پێغەمبەر بۆ یەک جاریش دەستی نەنایە ناو دەستی ئافرەتە نامەحرەمەکان تەوقەیان لەگەڵ بکا و بەیعەتیان لەگەڵ ببەستێ بەس لەگەڵ پیاوەکان دەستی دەنایە ناو دەستیان ئا ئەوە و چەندین بەڵگەی تریش هەیە حەرامە تاوانە گوناحە ئافرەتانی نامەحرەم لەگەڵ پیاوانی نامەحرەم دەستیان لەناو دەستی یەکتر دابنێن ئەگەر بە هیچ نیازێکی خراپیش نەبێ تەوقە بکەن کەس ئەوەندەی پێغەمبەر (ﷺ) پاک و بەڕێز و دیندار نەبوە دەستی خۆی نەنایە ناو دەستی ئەو ئافرەتانەی کەوا نامەحرەم بون لەگەڵی، خوای رب العالمین بەڵێنەکەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هێنایەجێ، مەککە تەواو فەتح بوو موسڵمانان بە فەتحی مەککەوە و ئازادکردنی بونە دەسەڵاتێکی ڕەقەم لە مەنتیقەکە هەموو هێزەکانی دونیا حیسابیان بۆ کرد، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ڕویکردە موسڵمانەکان نەسیحەت و ئامۆژگاری کردن یەک بە یەک بتەکانیان شکاند بتپەرستی نەما لە ناو مەککەدا مەککە بوەوە جێگای بە تەنها الله پەرستی -جل شئنە- وەکو لە سەردەمی ئیبراهیم (ﷺ) هەر تەنها اللەی لێ دەپەرست ئیبراهیم و ئیسماعیل و دایکە هاجەرە هەر ئاوا موسڵمانان لەوێشدا تەنها اللەیان پەرست لەناو مەککەدا.

سەرکەوتنی گەورە ڕاگەیندرا و وە لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) جەنگی حونەینیش دەکا وە لە پاشان غەزوەی تەبوکیش دەکا پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بە کورتی باسیدەکەین، ئینجا (عام الأفد) دێ لەپاش فەتحی مەککە وەفدەکان کۆمەڵ بە کۆمەڵ دێنە لای پێغەمبەر (ﷺ) هەموو کاتێک وابوە، زۆر کەس هەیە دەڵێ باشە ئەگەر هێزی کافران زل هێز بن گەورەبن

چۆن دەبێ موسڵمانان ئەگەر هێزێکی وەکو ئەوان هێزی زل هێزی نەبێ بوێرێت ئیعلانی ئەوە بکات حوکمی ئیسلام دەکا؟ یان موسڵمانەکە چۆن دەبێ بوێرێت بڵێ من هەم لە مەیداندا؟ پێغەمبەر وابوو (ﷺ) ئەگەر موسڵمانەکان ڕاست بکەن لەگەڵ الله لە ڕێبازی پێغەمبەر لانەدەن (ﷺ) الله پشتگیریان لێدەکا، لە هەموو سەردەمێکیش وایە ئەگەر تۆ بویتە ڕەقەم و ناو وە پێت چەقاند ئەگەر لەپێناو خوای رب العالمین بێ الله پشتگیریت لێ دەکا و وە هێزەکانی دونیاش تەعامولت لەگەڵ دەکەن حیسابت بۆ دەکەن وەکو لەگەڵ پێغەمبەریان کرد (ﷺ) وەفدەکانیان دەهات بۆ ئەوەی دەنگوباسەکان بزانن و وە زۆریان بونە موسڵمان و موسڵمانان هێزیان زیادیکرد و ئینجا (حجة الوداع) دێ.

## جەنگی حونەین و تەبوك و بەراوردی کوژراوەکانی جەنگەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

ئەوەی دەمانەوێ باسی بکەین لە دوای فەتحی مەککە چەند ڕوداوێکی گرنگە ئەوەتان بۆ باس دەکەین، زۆر بە کورتی و پوختی جەنگی حونەین و جەنگی تەبوک و هەتا دەگەینە سەر عام الوفود، وە ئەو بەراوردەیش دەکەین ئەمڕۆ لەنێوان ئەو کوشتارانەی لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ڕویدا و وە لەگەڵ جەنگی جیهانی دوەم کاتێ کەوا ڕویدا کە جەنگێکی سەردەمی حیسابە و وە بە سەرکردایەتی زل هێزەکانی دونیا و کافر و بێ بڕواکان بوو، ئایە بزانین کامە جەنگ تینوو بون بە خوێن و چەندین کەسی تێدا کوژرا هی پێغەمبەر (ﷺ) بوو یانی هی کافر و بێ بڕواکان؟

جەنگی حونەین لە دەی شەوالی ساڵی هەشتەمی کۆچی کە لە کۆتا جەنگەکانی نێوان پێغەمبەر (ﷺ) و وە موشریکەکان حیساب دەکرێ، کە هەوازینەکان و ثەقیف لە دوای ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) مەککەی تەواو ئازاد کرد لە خۆیان ترسان گوتیان لە پاش مەککە هێرش دەکاتە سەر ئێمەش ئێمەش تەسفیە دەکات و حیسابمان بۆ دەکا، خۆیان کۆ کردەوە بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر پێغەمبەر (ﷺ) وە سەر موسڵمانان، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ)

خەڵکی وەگەڵ خۆیدا موسڵمانە نوێیەکانیش لە مەککە و لەشکری ڕێکخست و ئەو چوە بەرامبەریان، ئەوەبوو لە دۆڵی حونەین لەوێوە کەوتە بەرامبەر کافر و موشریکەکانی هەوازین و ثەقیف ئەوەی لەگەڵیاندا بون، کە سەرکردەی ئەوان گەنجێکی سی ساڵی بوو بەناوی مالیکی کوڕی عەوف وە پێغەمبەریش (ﷺ) سەرکردەی لەشکری موسڵمانان بوو، لەوێ کە ڕوبەڕوی یەک بونەوە ئەوەبوو موسڵمانەکان ژمارەیان زۆربوو لە یەک لە ڕیوایەتەکان دەڵێ دوازدە هەزار کەس بون لە پێشتردا ژمارەی ئەوەندە زۆریان بەخۆوە نەبینیبوو وە لە چەک و تفاقیش زۆر تریان پێبوو لە جەنگەکانی تر کاتێک لەوێ بە زوترین کات لە سەرەتای جەنگەکەوە بوە بای موسڵمانەکان و کافرەکان ئەوەیان لێ بەدیارکەوت هێواش هێواش دەشکێن، ئەوەبوو موسڵمانەکان غاری ئەوەیاندا غەنیمەکان کۆبکەنەوە و نازیان بە خۆیانەوە کرد بە شانازییەوە دەیانگوت ئەمڕۆ ئێمە لەشکرێکین زۆرین لە ژمارەدا چەک و تفاقی باشیشمان پێیە ئەگەر دوێنێ نەدەشکاین لە جەنگەکانی تری ڕابردو لەو جەنگە ڕەنگە هەر نەشکێین، خوای رب العالمین ئەوەی پێ باش نەبو ئەو نەوعە شانازیە ئینسان بە شان و شەوکەتی خۆیدا هەڵبڵێ پێی باشتربوو وە ئەوە تەواوتر بوو بیانگوتبا سەرکەوتنەکان هەموی لەلای الله بوە ئەگەر چەک و تفاقمان باش بوبێ و ژمارەمان زۆر بوبێ یان کەم بوبێ، جا لەبەر ئەوە بوو موسڵمانەکان لەپاش ئەوەی کەوا غەنیمە و شتیان کۆ کردەوە شکستیان بەسەرداهات، تەنها پێغەمبەر نەبێ (ﷺ) خۆی و چەندین چەکداری لە موهاجیرین و ئەنسار لە دەوروبەریەوە ثەباتیان هەبوو لەناو جەنگەکە مانەوە، کاتێک بڵاو بوەوە کە پێغەمبەر کوژراوە (ﷺ) بەڵام کافرەکان هەندێک کەوا زیاتر هاتنە پێش و موسڵمانەکان ئەوەی غەنیمە و یان چەک و شت هەڵیان گرتبوو ئەوانەشیان فڕەدا و ڕویان کردە پاشەکشێ، خوای رب العالمین دەفەرموێ ئەوە تاقیکردنەوەیەکی من بوو، ئینجا دەفەرموێ لە سوڕەتی (التوبة) خوای رب العالمین ئایەتی دابەزاند و فەرموی: ﴿لَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٖ وَيَوۡمَ حُنَيۡنٍ إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ فَلَمۡ

تُغۡنِ عَنكُمۡ شَيۡـٔٗا وَضَاقَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ ثُمَّ وَلَّيۡتُم مُّدۡبِرِينَ﴾ الله تعالی دەفەرموێ له زۆر شوێنان ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەی موسڵمانەکان ئێوەمان سەرخست بەسەر دوژمنانتانەوە بزانن سەرکەوتن واتە تەنها لەلای خوای رب العالمین بوە وە له جەنگی حونەینەوە کاتێک ئێوە شانازیتان بەخۆتانەوە کرد و موعجەب بون به خۆتان جێگای سەرسوڕمان بوو لەلای خۆتان ئەو هەموو چەک و تفاق و خەڵکە زۆرەتان لەگەڵە موفەسیرین دەفەرمون مەبەستی پێغەمبەر نیە (ﷺ) مەبەستی پێی موسڵمانەکان هەندێک وا بیریان کردەوە ئینجا خوای رب العالمین دەفەرموێ ئەو زۆریەی ئەو ڕۆژە هەتان بوو له هاناتان نەهات سەرتان بخا کاتێک شکستیتان بۆهات زەویتان لەسەر تەنگ کرایەوە ئەو کاتەی دەفەرموێ ئێوە پشتتان کرد له کافرەکان و ویستتان ڕابکەن ئەی موسڵمانەکانی ئاوا بیرتان دەکردەوە: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ﴾ جا له پاشان خوای رب العالمین دڵ ئارامی بەسەر پێغەمبەرەکەی موحەمەد دابەزاند (ﷺ) جێگیری کرد: ﴿وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ لەسەر ئەو بڕوادارانەش کە له بەرامبەر کافرەکان مانەوە و لنگیان چەقاند: ﴿وَأَنزَلَ جُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ [التوبة: ٢٥-٢٧] خوای رب العالمین دەفەرموێ هەندێک سەربازیشمان نارد واتە له فریشتەکان و ئەوانەی نادیاربون بە بەرچاوی ئێوە دیار نەبون کافرەکانمان عەزابدا بە تۆڵەیەک کە له کافرەکان بوەشێتەوە خوای رب العالمین هەموجار کە عەزابی پێداون.

کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) لنگی چەقاند و فەرموی «أنا النبيُّ لا كَذِبْ، أنا ابن عبدِ المُطَّلِبْ[١]» یەک بە دەنگی خۆی دەیفەرموو (ﷺ) ئا ئە من پێغەمبەرم و درۆ ناکەم و نەمکردوە وە من له نەوەی عەبدولموتەڵیبم و ماوم له ناوتانەوە ئینجا موسڵمانەکان بەهۆش خۆیان هاتنەوە و سەرکەوتنی کۆتایی لەو جەنگە بۆ موسڵمانان بوو، تەنانەت خوای رب العالمین له

[١] صحيح البخاري (٢٨٦٤) (٢٨٧٤) (٢٩٣٠)، صحيح مسلم (١٧٧٦)، سنن الترمذي (١٦٨٨).

سەحابەکانیشی قبوڵ نەکردوە ئەگەر تۆزێک موعجەب بوبن بە خۆیان نەک غروریەتیش بگرن کەواتە موسڵمان دەبێ هۆشیار و ئاگاداربێ بە چەک و تفاق وە بە هێز و خەڵکی دەوروبەری یان بە پارە و پول و مەنسەب و دەسەڵات نابێ شانازی بە خۆیەوە بکا دەبێ هەموی لە اللەوە بزانێ و پشت بە الله ببەستێ و هەموو فەزڵ و نیعمەتەکان خوای رب العالمین لەگەڵ موسڵمانانی کردوە و دەیکا.

ئینجا جەنگی عوسرە دێ کەوا جەنگی تەبوکی پێ دەگوترێ کاتێک کەوا ئەو جەنگەی ڕۆمییەکان کە زانیان لە دوای جەنگی حونەین تەواو کافرەکان هیچیان بەسەر یەکەوە نەما لە عەرەبەکان نەیانتوانی جارێکی تر بیریش لەوە بکەنەوە لەشکر کۆبکەنەوە بۆ دژایەتی پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام ڕۆمەکان وە دیانەکان ڕۆمەکان ئەوانەی واتە ئەوروپای ئێستا کەوا هاتبون هەندێک لە شامیان لەبەردەست بوو وڵاتەکانی عەرەبی ئێستا لە بەردەستی ئەوان بوو وە دیانەکانی ئەوێش کۆبونەوە بۆ ئەوەی لەشکر کێشیەکی تەواو بکەن، هەریقەل لەوە ترسا کە پێغەمبەر (ﷺ) زیاتر پەرە بسێنێت دەوڵەتەکەی و وە موسڵمانەکان زیاتر ببن و هێرشیان بکاتە سەر، ئەوەبوو لەشکرێکی زۆری ڕێکخست و هات لە دژایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بجەنگن، جا پێغەمبەر (ﷺ) لەشکری کۆکردەوە، بۆ ناوی لێنرا جەنگی عوسرە؟ لەبەر ئەوە ناوی لێنرا بارێکی قورسی هەبوو لەسەر موسڵمانان هەم کاتەکەی کاتێکی وابوو مانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی بوو کاتێکی زۆر گەرما بوو خەڵک نەدەحەواوە لە دەرێ لەو کاتەی لەشکر ببردرێتە عاقاری بارقورسیان بۆ دروست دەکا، وە بەیتول مال پارە و پولێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو لەشکر سازیەکەی بە جوانی بە چەک و تفاقێکی تەواو بە گوێرەی کافرەکان کەوا هاتونە ئامادەبن، لەبەر ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی «مَن جَهَّزَ جَيْشَ العُسْرَةِ فَلَهُ الجَنَّةُ» ئەی موسڵمانان هەریەک ئامادەبێ لە دەوڵەمەندەکان لەشکری جەنگی تەبوک و عوسرەم بۆ ڕێکبخا پارە بێنێ و

بیبەخشێ لەپێناو خوای رب العالمین موژدەی پێ دەدەم بەهەشت بۆ ئەوبێ، لەبەر ئەوە بوو عوسمانی کوڕی عەفان پاڵەوانی موسڵمانان لەڕوی بەخشین و وە لەڕوی حەیا و شەرمەوە ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزە دەڵێ هەزار دیناری هێنا و پێشکەشی کرد بەو لەشکرە و تا ئەو لەشکرەی پێ ڕێکێخسترا و لەپاش ئەوە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) « ما ضَرَّ عثمانُ ما عمل بعدَ اليومِ مرتينِ[1]» لەپاش ئەو لەشکر ڕێکخستنەی جەنگی عوسڕە و تەبوک کە عوسمان کردی و هەزار دیناریدا عوسمان هەرچی بکات تازە هیچ زەرەر و زیانی پێ ناگات و خوای رب العالمین لێی وەرگرت و لێی قبوڵ کرد.

بەڕێزان و خۆشەویستان ئەوەبوو کەوا کافر و موشریکەکان کۆبونەوە و خڕبونەوە هاتن پێغەمبەریش (ﷺ) لەشکرەکەی خۆی ئامادەکرد، کە لەشکری موسڵمانان ئا ئەو کاتە سی هەزار کەس کۆبونەوە هیچ جار ئەو ژمارە زۆرە کۆ نەبوبونەوە بە سەرکردایەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە دە هەزار لە ئەسپ و وڵاخی بەرزەیان پێبوو موسڵمانان ئەوەیان بەخۆیانەوە نەبینیبوو هەتا هاتنە تەبوک ئا لەوێدا بیست ڕۆژ مانەوە لە بەرامبەر ڕۆمەکان بەڵام فەرمانی خوای رب العالمین وابوو کەوا جەنگ ڕونەدا شەڕ ڕونەدا لەپاش ئەو بیست ڕۆژە موسڵمانەکان ئەو هەموو تەنگەبەری و ناخۆشی و گەرماییەیان بینی ئینجا گەڕانەوە.

بەڵام ئەو ڕووداوانەی گرنگە باسی بکەین کاتێ کە موسڵمانەکان گەڕانەوە ئەوەیە، لە ڕێگادا پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) فەرمان دەکا کە مزگەوتی (ضرار) کە هی مونافقەکانە و لەسەر ئەساسی نیفاق و تەفرەقە لە بەینی موسڵمانان بنیات نرابوو تێک بدرێ و بسوتێندرێ، ئێستا دێین بۆچونی زانایانتان بۆ دەڵێین ابن القيم الجوزية چۆن دەفەرموێ، هەندێک شوێن هەیە ئەگەر بەناوی عیبادەتیش وە بەناوی شوێنی باشیش و عینوانی باشیشی لێ بدرێ مادەم ئەوەی بنیاتیان ناوە و نیەتەکە تەفرەقەیە لە بەینی موسڵمانان وە

[1] سنن الترمذي (٣٧٠١)، مسند أحمد (٢٠٦٣٠).

کێشه دروست دەبێ و پەرتەوازەیی لێ دەکەوێتەوە موناففەکان لەسەر ئەساسی نیفاق دروستی بکەن ئەو کاتە ئەمیری موسڵمانان وەکو ئەو کاتەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەمیری موسڵمانان بوو بڕیاریدا بە ڕوخاندن و سوتاندنی، ئەوەبوو سەحابەکان چون و هەم ڕوخاندیان و هەم سوتاندیان بۆ ئەوەی ئەو تەفرەقە و پەرتەوازەییە لەناو موسڵمانان نەمێنێتەوە، وە ئەو سێ سەحابە بەڕێزەش کەوا گەڕانەوە لەو جەنگە بەبێ عوزر ڕاستگۆییان دەربڕی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆتاخوای رب العالمین ڕاستگۆییەکەی دەرخستن و وە لێیان خۆشبوو، جا ابن القیم الجوزیة دەفەرموێ ئا لەو جەنگەش بوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ موسڵمانەکان گەڕانەوە:

(طلع البدر علینا

من ثنیات الوداع

***

وجب الشکر علینا

ما دعـــا لله داع)

وەکو سرودێک و منداڵەکان و هەندێک لە گەنجەکانی شاری مەدینە بۆ پێغەمبەریان گوت (ﷺ) نەک لەو کاتەی کەوا هیجرەتی کردبێ چونکە ئەو کاتە بوو (ثنیات الوداع) کە شوێنێکە لە بەینی شام و مەدینە لەو دەرگا و ڕێگا پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە ناو مەدینە.

ابن القیم الجوزیة دەفەرموێ چەندین پەند و وانە ئا لەو جەنگە و وە لە ڕوخانی مزگەوتی (ضرار) وەردەگیرێ:

یەکەمیان ئەوەیە ئەگەر ئیمامی موسڵمانان سەرکردەی تەواوی موسڵمانان هەبوو ئیستینفاڕی کرد و گوتی یەڵا هەموتان وەرن بۆ شەڕ و جەنگ، واجب دەبێ دەبێتە (فرض

العین) لەسەر هەموو موسڵمانان بە دەنگی ئیمامەکەیان و پێشەواکەیان و سەرکردەکەیانەوە بچن، کاتێک پێغەمبەر وای فەرموو و وایکرد (ﷺ) هەمویان بە دەنگیەوە چون، سی هەزار لەشکر کۆبویەوە و وە دە هەزار سوارچاکی چاک.

ئینجا لە پاشان دەفەرموێ ئەگەر ڕۆیشتی بە شوێنێکدا ئەو شوێنە پێشتر گوناح و تاوان و زوڵمی لێکرابوو وەکو پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆیشتنی بۆ ئەو جەنگە لەو شوێنانەی کە زوڵم و تاوان و بتپەرستی پێشتر لێکرابوو خێرا لێی دەڕۆیشت، سونەتە بۆ ئێمەیش بەلای هەر قەسر و بەلای هەر بینایەک و بەلای هەر شوێنێکدا بڕۆین پێشتر زاڵم و ستەمکار هەیان بوبێ زوڵم و ستەمیان لەناو ئەنجام دابێ تاوان و گوناحی تێدا کرابێ یان شیرک و هاوبەشی تێدا کرابێ ئێمە خێرا بڕۆین چونکە ئەو نەوعە شوێنە شوێنی غەزەبە ئەگەری ئەوەی هەیە لە ناکاودا الله غەزەبی لە شوێنەکەش گرتبێ غەزەبی خۆی دابەزێنێ.

ئینجا لە پاشان ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە پێغەمبەر (ﷺ) ابن القیم دەفەرموێ (تحریق أمكنة المعصية التي يُعصى الله ورسوله فيها وهدمُها، كما حرَّق رسول (ﷺ) مسجد الضرار) دەفەرموێ ئەوە ئەوەی لێ وەردەگیرێ وەکو پەند و وانە ئەو شوێنانەی گوناح و تاوانی تێدا دەکرێ ئەگەر سەرکردەی موسڵمانان فەرمانیدا بە سوتاندنی یان ڕوخاندنی یان لەناو بردنی بە هەر شێوازێک چونکە مزگەوتی (ضرار) مزگەوتیش بوو چونکە مونافقەکان بنیاتیان نابوو بۆ تەفریقە و پەرتەوازیی بوو پەرتەوازە کردنی موسڵمانان بوو پێغەمبەر فەرمانیدا بە ڕوخاندن و سوتاندنی ئا ئەوەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ.

ئینجا لە پاشان دێینە سەر ئەوەی بزانین پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) تامەزرۆی خوێن ڕشتن بوە یان خەڵکەکانی تر تامەزرۆی خوێن ڕشتنن؟ تەماشا بکەن سەرنج بدەن لەو هەموو جەنگانەی ڕابردوو باسمان کرد وە هەندێکی تریش کە هەن هەر هەمویان زانایان دەفەرمون تێپەڕناکا لە (٦٣) جەنگ لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) کە ڕویدابێ، یان غەزوە بوە (٢٥)

هه‌تا (٢٧) له‌سه‌ر ئیختیلافی ڕیوایات غه‌زوه‌ بوه‌ و پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌خۆی گیانمان فیدای بێ به‌شداری کردوه‌، ئه‌وانی تریش هه‌مویان سه‌رییه‌ بوه‌ پێغه‌مبه‌ر ڕه‌وانه‌ی کردون (ﷺ) به‌س خۆی به‌شداری نه‌کردوه‌، جا له‌و شه‌ست و سێ جه‌نگه‌ی که‌وا ڕویدا پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) هه‌موو جارێک له‌پێشتردا فه‌رمانی ده‌دا به‌ له‌شکره‌که‌ی چ به‌خۆی له‌گه‌یبا یان له‌گه‌ڵی نه‌با ده‌ی فه‌رموو «اغْزُوا باسْمِ اللهِ» بڕۆن به‌ناوی الله‌ شه‌ڕ بکه‌ن و غه‌زا بکه‌ن «في سَبيلِ اللهِ» له‌پێناو خوای رب العالمین «قاتِلُوا مَن كَفَرَ باللَّهِ، اغْزُوا وَلا تَغُلُّوا، وَلا تَغْدِرُوا، وَلا تُمَثِّلُوا، وَلا تَقْتُلُوا وَلِيدًا» ده‌ی فه‌رموو بڕۆن شه‌ڕبکه‌ن و بیانکوژن ئه‌وانه‌ی کافرن بڕوایان به‌ الله‌ نیه‌ و به‌ربه‌ره‌کانێی موسڵمانان ده‌که‌ن به‌ڵام ئاگاداربن کاتێ غه‌نیمه‌ کۆده‌کرێته‌وه‌ دزی لێمه‌که‌ن و به‌بێ ئیمام و موسڵمانه‌کان مه‌یبه‌ن بۆ خۆتان غه‌در و خیانه‌ت نه‌که‌ن له‌گه‌ڵ کافره‌کانیش کاتێک لاشه‌ و جه‌سته‌ی ئه‌وانتان ده‌که‌وێته‌ به‌ر ده‌ست هه‌تکیان مه‌که‌ن وه‌ منداڵه‌کان مه‌کوژن «أَوْ امرأة» ئافره‌تانیان مه‌کوژن «ولا كبيراً فانياً» پیره‌مێرده‌کانیان که‌ به‌ته‌مه‌ندا چونه‌ مه‌یانکوژن «ولا منعزلاً بصومعة[١]» هه‌ریه‌ک له‌وانیش ئه‌گه‌ر ئه‌هلی کیتاب بون له‌ شوێنێکی دیاریکراو شوێنی په‌رستن بوو بۆ خۆیانیان دانابوو که‌نار گیر بوو بون به‌ حیسابی خۆیان اللهیان ده‌په‌رست ئا ئه‌وانیش مه‌کوژن.

پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌وه‌ فه‌رمانه‌کانی بوو بۆ جه‌نگه‌کان ئایه‌ حه‌زی به‌ خوێن ڕشتن بوه‌؟ نه‌خێر کافره‌کان حه‌زیان پێبوو به‌ڵام پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌مری اللهی پێبوو ته‌وحید و (لا إله إلا الله) ڕابگه‌یه‌نێ ئه‌وه‌ی کۆسپ بوبێ له‌ژێر ته‌وحید و ڕێگای ڕاگه‌یاندنی (لا إله إلا الله) ئا ئه‌وانه‌ی بانگ کردوه‌ و ده‌عوه‌ی له‌گه‌ڵ کردون ئه‌گه‌ر به‌ره‌و بانگه‌وازی ئیسلام نه‌هاتبن ئینجا کوشتاری له‌گه‌ڵ ئه‌نجام داون ئه‌گه‌ر (أهل الكتاب)یش بوبن جزیه‌یشی قبوڵ بوه‌ ئه‌گه‌ر به‌ کافری بمێننه‌وه‌ له‌ ژێر چه‌تری ده‌وڵه‌تی ئیسلامی.

---

[١] صحيح مسلم (١٧٣١)، سنن أبي داود (٢٦١٢) (٢٦١٣)، سنن الترمذي (١٤٠٨) (١٦١٧).

لەبەر ئەوە ابن القیم الجوزیة تەئکیدی لێ دەکاتەوە لە (زاد المعاد) دەفەرموێ یەکەم ئیشەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو جەنگەکان لەگەڵ خیانەت و خراپەکاری کافر و موشریک و جولەکە و دیانەکانیش لەگەڵی دەعوە و بانگەوازی بوە بەرەو (لا إله إلا الله) وە ڕونکردنەوەی ئیسلام بۆیان داوای لێکردون ببنە موسڵمان ئەگەر موسڵمان نەبوبن ئەهلی کیتاب بوبن جزیەی لەسەر داناون لە ژێر چەتری دەوڵەتی ئیسلام بژین بە حورِیەتی خۆیان وە پارێزکاریشیان لێبکرێ لە ماڵیان لە ناموسیان لە خوێنیان، وە ئەگەر کافر و موشریکەکانی تریش بوبان یان دەبا ببنە موسڵمان یان دەبا دەعوەی ئیسلامی قبوڵ بکەن.

وە عەبدوڵای کوڕی زەید دەفەرموێ «نَهَى النَّبِيُّ (ﷺ) عَنِ النُّهْبَى وَالْمُثْلَةِ[١]» دەفەرموێ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) قەدەغەی ئێمەی دەکرد کە بۆ جەنگەکانی دەناردین کە ئێمە زێدەڕەوی بکەین وە هەتکی جەنازە و مەیتی کافرەکان بکەین، کافرەکان بون هەتکی جەنازەی موسڵمانانیان دەکرد کە حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیب مامی پێغەمبەر (ﷺ) وە برای شیری لە جەنگی ئوحود سینەی هەڵدڕا و جەرگی دەرهات و وە هەتکیان کردبوو ئەو کافر و موشریکەکان پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی قەدەغە کرد لە موسڵمانان کاتێ کە کافرەکە دەمرێ لێیگەڕێن و بەڵکو لە ئیسلامدا دەفەرموێ بیانشارنەوە و ژێر خاکیان بکەن با جەنازەیان لە سەر زەوی نەکەوێ.

وە پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) «أشدُّ الناسِ عذابًا يومَ القيامةِ رجلٌ قتلَه نبيٌّ أو قتل نبيًّا» لە هەموو کەسێ لە قیامەتدا عەزابی قورستر و توند و تیژتر بۆ ئەو کەسانەیە کە کەسێک پێغەمبەرێک بیکوژێ، چونکە پێغەمبەران بە حەق خەڵک دەکوژن پێغەمبەران دڵ نەرمن بە ڕەحمن بەڵام کاتێ کەوا کار لە کار دەترازێ سەدا سەد کافر و موشریکەکە عینادە لەو کاتانەوە دەیانکوژن بە حەق لەبەر ئەوە هەر کەسێک پێغەمبەر بیکوژێ ئەوە عەزابی

[١] صحيح البخاري (٢٤٧٤) (٥٥١٦)، مسند أحمد (١٨٧٤٠) (١٨٧٤٢).

قورسترە لە کافرەکانی تر و لە خەڵکەکانی تر لە قیامەت وە هەر کەسێکیش پێغەمبەرێک بکوژێ کە جولەکەکان ناویان دەرکردوە بە گوێرەی موستەڵەحی قورئانی بە (قَتَلْتُ الأنبياءَ) بکوژانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بە سەدان و هەزاران پێغەمبەران مێژوو شاهێدە و قورئانیش ئەوەی سەلماندوە زانایان یەکدەنگن لەسەری کوشتویانە جولەکەکان لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، ئینجا دەفەرموێ «وإمامُ ضلالةٍ وممثلٌ من المُمثلينَ[1]» دەفەرموێ وە ئەو کەسانەش کەوا پێشەوایەتی گومڕایەتی دەکا و خەڵکی گومڕا دەکا وە لە پاشان ئەگەر کەسێک جەنازەیەک هەتک بکا لەپاش مردنەکەی ئا ئەوەش عەزابی زۆر توند و تیژە لە قیامەتدا لە خەڵکەکەی تر عەزابی توند و تیژترە.

ئینجا ئەبو هورەیرە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ڕۆژێکیان ئێمە بۆ جەنگێک ڕەوانە دەکرد لەگەڵ قورەیشیەکان فەرموی فڵان و فڵان لە قورەیشیەکان ئەگەر پێیان گەیشتن بیانسوتێنن، دەڵێ ئێمەش فەرمانی پێغەمبەرە (ﷺ) ویستمان بەڕێکەوین خۆمان ڕێکخست ئەگەر ئەو دوو کەسە ببینین بیان سوتێنین دەڵێ یەکسەر پێغەمبەر خێرا هاتەوە لامان (ﷺ) فەرموی «إني كنتُ أَمَرْتُكُم أن تَحرِقُوا فلانًا وفلانًا بالنارِ» من لەپێشتر فەرمانم بە ئێوەدا بە ئاگر فڵان و فڵان بسوتێنن لە دژایەتی کردن و عینادی کردن و قێزەونی ئیش و کار و شێوازەکانیان بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان «وإنَّ النارَ لا يُعذِّبُ بها إلا اللهُ[2]» بەڵام ئاگر ناتوانێ کەسێک کەسێکی پێ عەزاب بدا ئیلا خوای رب العالمين دەتوانێ بە ئاگر خەڵکەکان عەزاب بدا «فإن وجدتموها فَاقْتُلُوهُمَا[3]» پەشیمان بومەوە لەو قسەی بڵێم بیانسوتێنن ئەگەر پێیان گەیشتن تەنها بیانکوژن.

[1] أحمد شاكر، تخريج المسند لشاكر (٥/٣٣٣)، إسناده صحيح، أخرجه البزار (١٧٢٨) مختصراً، والطحاوي في ((شرح مشكل الاثار)) (٦)، والطبراني (١٠/٢٦٠) (١٠٤٩٧) باختلاف يسير.

[2] تێبینی: بگەڕێنەوە سەر سەحیحی بوخاری كتاب الجهاد والسير | باب: إذا حرق المشرك المسلم، هل يحرق؟

[3] صحيح البخاري (٢٩٥٤) (٣٠١٦)، سنن أبي داود (٢٦٧٣)، سنن الترمذي (١٥٧١).

کەواتە ئەوانەمان بۆ ئەوە خستەڕوو بزانین پێغەمبەر (ﷺ) چاوی لە کوشتن و خراپە قەتاوقەت نەبوە بەڵام کافرەکان ڕێگای ئەوەیان دەگرت کەوا ڕێگای سوڵح و ئاشتەوایی و موسڵمان بونایەتی نەمێنێ دەعوە و بانگەوازی تەواو ڕێگای لێبگیرێ ئەوەش بە فەرمانی اللەوە پێغەمبەر (ﷺ) قیتال و کوشتاری لەو پێناوە و بەو یاسا و ضەوابیتانەوە بۆی دابەزی و جێبەجێی کرد، لەبەر ئەوە دەردەکەوێ ئەوەی ئێمە وەرمانگرتوە لە کتابی (أخلاق الحرب) وە لە پاشان شێخ مەحمود میسری لە کیتابەکەی لەسەر سیرە نوسیویەتی ئەویش کورت و پوختتری کردوەتەوە و ئەویش هەر لەو پەرتوکە وەریگرتوە کە خاوەنی ئەو پەرتوکە دەڵێ لە کیتابەکانی سەحیحی بوخاری و موسلیم وە لە سونەنەکان وە لە مەسانیدەکان لەسەر ئیختیلافی ڕیوایەت لە کیتابەکانی سیرە دەڵێ تەحقیقم کردوە و بەدوادا چونم بۆ کردوە و کۆم کردوەتەوە دەرئەنجام ئەوەم بۆ دەرکەوتوە لە جەنگەکانی نێوان موسڵمانان و وە پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ کافر و موشریکەکان لە موسڵمانان تەنها (٢٦٢) کەس شەهید بوە لە هەموو جەنگەکان وە لە کافرەکان (١٠٢٢) کەسیان کوژراون، کۆی هەر هەموو کوژراوەکان بە موسڵمانەکان و بە کافرەکان دەکاتە (١٢٨٤) کوژراو لە (٦٣) جەنگدا کە ئەگەر نسبەکان حیساب بکەی دەڵێ حیسابم کردوە لە هەر جەنگێک چەند کافر بەشداری کردوە و چەند موسڵمان بەشداری کردوە بەڕێژەی سەدا یەک لە موسڵمانان کوژراون، لە سەدا یەکیان کوژراوە کە ڕێژەیەکی یەکجار کەمە لە کافرەکان لەبەر زۆر بونیان زیاتر بونە لە ژمارە لە سەدا دویان کوژراون، ئینجا دەڵێ لە نێوان ئەو دوو نسبەیە وەکو موعادەلاتێکی ڕیازاتی دەربیێنین سەدا یەک و نیو لە جەنگەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کوژراو هەبوە کە ناکاتە هیچ، بەڵام سەرنج بدەن و تەماشا بکەن تەنها لە جەنگی جیهانی یەکەم لە کاتێکدا ناچینەوە سەر مێژوی دور ئەگەر بچینەوە سەر مێژوی دور سەرنج بدەین لە تاریخی کۆن بۆمان دەردەکەوێ تەنها دیانەکان لە دژی دیانەکان کاثۆلیک لە دژی بروتستانت و وە کاثۆلیک لە دژی أرثوذکس وە ئەوانەش لە دژی

ئەوانەی تر مەدرەسە و کەنیسەکانی لەیەکتر جودا بون بە هەزاران خەڵکیان لە یەکتر کوشت بە قێزەونترین شێوازی کوشتن، هەتا میحرەقەیان هەبوو میحرەقە مەشهورە لە مێژوی دیانەکان و کافرەکان میحرەقە ئەوەبوو مەنجەڵێکی زۆر گەورە و زەبەلاحیان دروست کردبوو بە دەیەها خەڵک و سەدەها خەڵکی دەچوە ناو ئینجا ئاویان زۆر زۆر گەرم دەکرد ئاگریشیان لە بن هەڵدەکرد لە پلەی زۆر گەرمیدا یەکتریان دەهاوێشتە ناو بە سەدان کەس، تاریخ و مێژوی ئەوروپا زۆر سپی نیە هی کافرەکان مێژویان بخوێنەوە هەر لە مەسدەرەکانی خۆیان دەیسەلمێنێ لە ناموسدا ئەوەندە بێ ناموس بونە دەڵێ ئەگەر ژنەکانی خۆیانیان برا لە برا ئەمین نەبوە بەجێیان نەدەهێشت ئاخیری وایان کردبوو لە هەندێک لە ڕوداوەکان دەگێڕنەوە دەڵێ ئەو شمەکەی ژێرەوەی ئافرەتان ئێستا لەبەری دەکەن لە شێوازی ئەو لە ئاسنیان دروست کردبوو کونێکی زۆر بچوکی تێدابوو بە قوفڵ قوفڵیان دەدا هەتا دەچونە جەنگەکان و دەهاتنەوە بۆ ئەوەی برایەکانیان دەوروبەرەکانیان زینایان لەگەڵ نەکەن، ئەخلاق و ڕەوشتی ئەوان وابوو ئافرەتانیش یان وا ئەزیەت دەدا ناموس چون لەناو ئەوان شتێکی ئاسایی بوو تەنها دینی ئیسلام پاکە و مێژوی ئیسلام پاکە، سەرنج بدەن و تەماشا بکەن ناڵێین لە مێژوی کۆن جەنگی جیهانی کۆن کە ئەمریکا تێیدا بەشدار بوە بەریتانیای ئێستا شانازی بە دیموکراتیەتەکەی خۆی دەکا تێیدا بەشدار بوە فەڕەنسا کە خۆی بە دایکی دیموکراسیەت و شۆڕشی نوێ دادەنێ لەسەر ڕوی زەوی عەلمانیەتیەکی زۆر توندڕەوی تێدا هەیە ئەویش بەشدار بوە ئیتیحادی سۆفیەتی پێشان بەشدار بوو سینیش لەگەڵیدابوو ئەڵمانیاش لەگەڵیدا بوو ئیتاڵیا و یابانیش، بزانن لە نێوان ئەو دەوڵەتانە چەند کەس کوژرا؟ لەشکرەکانیان چەند بون؟ بە ماوەیەکی یەکجار کەم، سەرنج بدەن و تەماشا بکەن هەر خەیاڵیش قبوڵی ناکا بە ئاسانی لە سەدا سێ سەد و پەنجاو یەک کەس کوژرا یەعنی سێجار سێجاری زیادی بکە بەسەر جەیش و لەشکرەکان بەشداریان کرد چونکە لە مەدەنی لە ژن و پیاو و منداڵیشیان گوێ پێ نەدا کوشتیان ئا

ئەوەنده خەڵکه کوژرا، پازده ملیۆن و شەش سەد هەزار کەس له سەربازەکان بەشداری ئەو جەنگەیان کرد هی هەموو وڵاتەکان بەڵام دەزانن چەند کەس کوژرا؟ پەنجا و چوار ملیۆن و هەشت سەد هەزار کەس کوژرا له ماوەیەکی کەم و کورتی جەنگی جیهانی دوەم، له پێناو چی؟ له پێناو مەرامه گڵاوەکانی زل هێزەکان، یان قایدێک شتێکی نەگەشتوەته دڵ قومبەلەیەکی دەهێنا به شارێکیدا دەدا وەکو هێرۆ شیمای یابان و وه ئەو شار و شوێنەکانی تر که ئەمریکا لێیدابوو تەفر و تونای کردن، بەڵێ جەنگەکان ئەوه شاهێدی ئەوه دەدەن، ئەمریکا ئەوەنده پاک نیه کاتێک هاته عێراق ئێستاش خەڵک و جەماوەری فەلوجەی قورِ بەسەر پزیشکەکانی ئێرەش دەزانن بەو یۆرانیۆم و چەکه کیمیاییانەی قەدەغەکراوی دونیا که به دیکۆر ئومەمی موتەحیده بونی هەیه و داکۆکی له مافەکانی مرۆڤ دەکا هەموی درۆ و دەلەسەیه حیبری سەر کاغەزه لەبەر ئەوه هات لەوێ لێیدان، وه ئێستا و لا یەزال جێی نیگەرانی و گریانه بەڕاستی ئێمه چوینه لای پزیشکێکی ئافرەت لەگەڵ یەکێک له هاوسەرەکانمان هەرکه هاته دەرەوه دەگریا، گوتم لەبەرچی؟ تەنها مانگێک پێش ڕەمەزانی ئەمساڵ (واته ڕەمەزانی ٢٠١٤-٧-٢٤) گوتی لەبەر ئەوەی عایلەیەکی فەلوجه له ژورەوه بون گوتیان ئێمه هەڵهاتین و وا ئێستا له هەولێر دەژین دکتۆره به ژنەکەی گوت ئەو منداڵەی له سکتدایه مشەوەهە تەواو لەوه دڵنیابه به گوێرەی فەحسەکان دەرکەوتوه هەتا منداڵت ببێ هەمویان مشەوەهن، هەموی لەبەر ئەو کیمیاباران و یۆرانیۆمەی ئەمریکای موجریم و کافرەکان، له عێراق به ملیۆنەها کەس کوژرا لەپێناو حەز و ئارەزویەکی جۆرج دەبلیۆ بۆش که فعلەن بۆشه، لەپێناو ئارەزویەکی بردنی نەوت و خاک و وڵاتی موسڵمانان، ئەگەرنا ڕاستیان نەکرد خۆ دەیان توانی ئەگەر سەدام زاڵمه ئەو زوڵم و ستەمه به پاڵه پەستۆ و ڕێکەوتنی تر یان به لێدانی ئەو و دەوروبەرەکەی کۆتاییان پێ هێنابا، ئەی بۆ دەهاتن ئەوەیان دەکرد به ملیۆنەها کەسی کوشتوه ئەمریکا ئێستا؟ دەستی ئەمریکا سوره به خوێنی هەموو موسڵمانانی هەموو وڵاتەکان هەرکەسێک

له شوێنێک بکوژرێ بزانه فیتێکی ئەمریکای لەگەڵدایە، پێغەمبەر تینو بوو بە خوێنی خەڵک و ڕشتنی یان ئەمریکا و ئەوروپای ئێستا و کافرەکان؟ پێغەمبەر (ﷺ) دەوڵەتی بە تەواوەتی دامەزراند وە خەڵکی بە تەواوەتی حەساندەوە دەستی بەسەریدا دەهێنان لەگەڵ ئەوەدا ئەو ڕێژە کەمەی لە سەدا یەک و نیو کوژران بە موسڵمان و کافرەکان لە هەموو جەنگەکانی کە شەست و سێ جەنگ بوو لە ماوەی بیست و سێ ساڵی پێغەمبەرایەتی (ﷺ)، کافر و موشریکەکان لە ماوەیەکی کەم و کورتدا لە سەدا سێ سەد و پەنجاو یەک سێ جاران هێندەی لەشکر و جەیشەکانی خۆیان بە مەدەنی و منداڵ و ژنەوە کوشتیان، ئەوەی عەقڵی هەبێ تێدەگا و دەزانێ کێ خوێن ڕێژە، کێ تینوە بە خوێن؟ ئایە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک دەچوو ڕێزی دەنا لە منداڵەکانیان؟ ڕێزی دەنا لە ئافرەتەکانیان کە دەیگرتن هی موشریک و کافرەکان؟ لە ڕوداو و جەنگەکانی ڕابردودا بە تەواوەتی سەلماندمان کاتێک کەوا هاوسەرگیرایەتی لەگەڵ ئافرەتە بەرز و بەڕێزەکانی کافر و موشریکەکان دەکرد بەو هۆیەوە ئەخلاق و ڕەوشتی جوانی پێغەمبەریان دەبینی (ﷺ) هەمویان دەبونە موسڵمان و دڵ نەرم دەبون و دەیانزانی کەسێکی سادە و ئاسایی نیە، ئەوانەی ئەو تۆمەتانە بە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) هەڵدەبەستن ئەوانە دوژمنانی ئیسلامن کە دەڵێن موسڵمانان حەزیان بە خوێن ڕشتنە موسڵمانان حەزیان بە توند و تیژیە موسڵمانان حەزیان بە منداڵ و ئافرەت کوشتنە ئەوانە هەمویان درۆ و دەلەسەیە ڕێکخستن و قسەکانی ئیعلام و ڕاگەیاندنەکانە، کە ئیعلام و ڕاگەیاندنی هەموو دونیا زۆربەی هەرە زۆری لە سەدا نەوەت و نۆ و هەندێکی کەمێکی زۆر کەمیان نەبێ لە پێناو خزمەتی بەرژەوەندیەکانی جولەکە و وە زل هێزە کافرەکانی جیهان و دونیادان.

ئەی بۆ ناڵێن بە ستالین ستالین کەوا جەیشی سوری هەبوو کە سەرۆکی ئیتیحادی سۆفیەتی بوو وە لەپاش لینین هاتە سەر حوکم پیاوێکی دڵ ڕەقی خوێن ڕێژ کە ئەو ستالینە

دەیگوت ئەگەر هەموو دونیا مەشهورە و لێی دەگێڕنەوە بە شانازیەوە دەیگوت ئەگەر هەر هەموو دونیا بکەمە پێنج بەش یەک بەشی بکەمە شوعی و چوار بەشی قەتڵ و عام بکەم و بکوژم ئینجا ئۆغشنی دڵم دێ، ستالین خوێن ڕێژە، لینین خوێن ڕێژ بوو، وە ئەورووپا و ئەمریکا و کافرەکان خوێن ڕێژن، تینونە بە خوێنی خەڵکی لەسەر بەرژەوەندیەکی بچوکی خۆیان بە حیساب لە ئوممەی موتەحیدە و یان لە لەقتەکان دەیانگرن کە زۆر جێگای نیگەرانیە موسڵمان و داعیەکانیش هەندێک جار لە ئنتەرنێت و ئەوانە هەڵدەفریوێن شتێکی ئەوروپی دەهێننەوە بە نمونە بۆ خەڵکی ئا ئەو پشیلە چۆن دەست بەسەردا دەهێنێ ئەو سەگە چی لێدەکا، ئەوان خەریکن بە پشیلە و سەگەوە بە درۆ و دەلەسەوە ئەگەر کەسێک ڕەحمی لە دڵدا نەبێ مندالّی ناو لانک بکوژێ هەتا جیلی دەهاتوش لە شوێنێکی وەکو عێڕاق وای لێبکات منداڵەکانیان هەمویان بکوژرێن و مشەوەهبن منداڵی ڕاست و دروست نەمێنێ بە لێدانی یۆڕانیۆم و چەکە قورسەکان، ئا ئەوە چ نمونەیەکە دەست بەسەر پشیلەیەکدا دەهێنی و سەگێکی لە فلاّن جێ ڕزگار کرد و فیسارێک لە فلاّن جێ؟ ئەوە هەموی درۆ و دەلەسەیە، فەرموودەکەی پێغەمبەر هاتوەتەجێ (ﷺ) کە دەفەرموێ گەورەی ڕۆمەکان دەبینن یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت لەگەڵ خەڵکی خۆیان تا ڕادەیەک دادپەروەرن مافیان دەدەن بەس لەگەڵ دژ بە خۆیان زۆر دڵ ڕەقن خوێن ڕێژن، ئێستا وایە بەریتانیا لەگەڵ جەماوەری خۆی هەندێک جار هەندێک مافی بۆ دابین کردون فەرەنسا بە هەمان شێوە وە سوید وە ئەڵمانیا وە ئەمریکا بەڵام کاتێک هێرش دەکەنە سەر هەر وڵاتێکی غەیری خۆیان لە پێناو تەماح و دونیا و بەرژەوەندیە تەسکەکانی خۆیان قەتڵ و عامیان دەکەن زۆر بێ ویژدانن، کەواتە بۆتان ڕون بویەوە و پێغەمبەرمان با خۆش بوێ (ﷺ)، ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزە هەرچی کردویەتی فەرمانی الله بوە بە گوێرەی عەقڵ و مەنتیقیشەوە هەرچی کردویەتی لە شوێن و جێگای خۆی بوە کەسێک بوە: ﴿رَحمة لِّلعَـٰلَمِينَ﴾ [الأنبياء: ١٠٧] بوە تەنانەت شەڕ و جەنگەکانیشی ڕەحمەت بوە بۆ ئەوەی

خەڵک لە مانای (لا إله إلا الله) تێبگا و عەدالەت و دادپەروەری لە پاشان بێ بەرپا بوە و وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر دڵ ڕەقبا قەت عیکرەمەی کوڕی ئەبو جەهلی عەفوو نەدەکرد کە باوکی فیرعەونی ئومەت بوو بۆخۆشی هەتا فەتحی مەککە دژایەتی موسڵمانانی لەوپەڕی دژایەتی کرد بەڵام کاتێک هاوسەرەکەی هانا دەهێنێتە بەر پێغەمبەر (ﷺ) وەکو باسمان کرد پێغەمبەر عەفوی دەکا و لێی دەبورێ و دەبێتە موسڵمان، وەحش کە بکوژی مامی پێغەمبەر بوو (ﷺ) حەمزە کە چەندی خۆش دەویست مادەم دەبێتە موسڵمان پێغەمبەر لێی دەبورێ (ﷺ) وە لێی قبوڵ دەکا، جا پێویستە کەواتە بە درۆ و دەلەسەی ڕاگەیاندنەکان و وە نوسراوی کافر و موشریکەکان نەخەڵەتێین بۆمان ڕون بویەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) تینوو نەبوە بە خوێنی هیچ کەسێک بەڵکو ڕەحمەت و بەزەیی بوە بۆ هەموو خەڵکی وە ئێمە گیانمان دەبێ فیدای بکەین و بەرگری لە فەرمودە و وە لە حەدیسەکانی بکەین هەتا ماوین لەسەر زەوی.

## هەڵسوکەوتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ هەوسەر و منداڵەکانی

پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لە دوای ئەوەی لە جەنگی تەبوک بە تەواوەتی لوتی ڕۆمەکانی شکاند لەشکر و سەربازێکی زۆری لەگەڵدابوو کە خەڵکی ئەو ناوچەی جەزیرەی عەرەب وە دەوروبەرەکەی بە تەواوەتی بۆیان دەرکەوت کە گوتمان نزیکەی سی هەزار چەکدار لەگەڵ پێغەمبەردا بون (ﷺ) زانیان تازە جارێکی تر هیچ لەشکرێک لەشکری وای پێ کۆ نابێتەوە و ناتوانن بەرامبەر لەشکرەکەی پێغەمبەر بوەستن (ﷺ)، جا لەبەر ئەوە بوو زانایان دەفەرمون هێواش هێواش وەفدەکان دەهاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ لە ئیسلام گەیشتن و وە زۆربەشیان موسڵمان دەبون هەتا ئەو ساڵە ناوی لێنرا ساڵی وەفدەکان واتە وەفد و نوێنەری خەڵکەکان و تیرەکان و عەرەبەکان دەهاتنە لای پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، وە دیانەکانیش نەسرانیەکانیش ژمارەیان زۆر نەبوو هەم لە حیجاز و دەوروبەر لەبەر ئەوە

ناویان زۆر ناهێندرێ جاروبارێک نەبێ تەنها جولەکەکان ژمارەیان زۆر بوو لەناو مەدینە بون لە دەرەوە بون وەکو باسمانکرد پێغەمبەر چۆن (ﷺ) هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردن لە پاش ئەوەی کە ناپاکیش بون و خیانەتیان کرد لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەرئەنجامی خیانەتەکەیان تام کرد و بەسەریان هات.

بزانین ئەو پێغەمبەرە پێشەوایە (ﷺ) ئایە چۆن ژیاوە لەگەڵ دەوروبەری هەڵسوکەوت و ڕەوشتە بەرزەکانی لەگەڵ دەوروبەری چۆن بوە؟ چەند نمونەیەکی لێ بێنینەوە.

سەرەتا پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوسەرەکانی ئەو زاتە بەڕێزە باشترین هاوسەر بوو لە جیهاندا نمونەی نەبوە لە ڕوی باشی و ڕەوشت بەرزی وە هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ هاوسەر و خێزانەکانی ئایەتەکانی قورئانی سەد لە سەد جێبەجێ کردبوو لەبەر ئەوە بوو هەر ئەوەی بەسەر زماندا دەهات و ڕوی دەکردە موسڵمانەکان دەیفەرموو «اتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ[١]» لە الله بترسێن دەربارەی هاوسەر و وە ئافرەتەکان بە گشتی هەڵسوکەوتی جوانیان لەگەڵ بکەن، یان دەیفەرموو «وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا[٢]» من وەسیەتتان دەکەم ئاگاداربن لەگەڵ ئافرەتەکان باشبن، یان لە پاشان دەی فەرموو «إِنِّي أُحَرِّجُ عليكم حقَّ الضعيفينِ: اليتيمُ، والمرأةُ[٣]» من ئێوە بار قورس دەکەم ئیحراجتان دەکەم بە حەق و مافی دوو لاوازە بێ کەسەکە کە ئەویش هەتیوی بێ باوکە وە لەگەڵ ئافرەتان کە بێ دەسەڵاتن ئەی پیاوەکان واتە مافیان مەخۆن حەقیان مەخۆن مەڵێن لاوازن زەعیفن بێ دەسەڵاتن، ئینجا بۆخۆی گیانمان فیدای بێ (ﷺ) باشترین ڕەحم و بەزەیی و سۆزی هەبوو لەگەڵ هاوسەرەکانی تەماشا بکەن پێغەمبەر (ﷺ) یەکێک لە جارەکان کاتێ کەوا یەک لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ناوی زەینەبی کچی جەحشە لە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) لە

[١] سنن أبي داود (١٩٠٥).
[٢] صحيح البخاري (٥١٨٥).
[٣] الجامع الصغير (٢٦٣٦).

ژوورەکەی دایکە عائیشە میوان دەبێ دوای نوێژی مەغریب کاتێ کەوا پێغەمبەر (ﷺ) چرا و ڕوناکیەکیان لەماڵەوە هەڵکراوە لە دوای ئەوەی ئەو شەو سڕەی دایکە عائیشە بوە ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک تاریک دادێ و چراکە دەکوژێتەوە، ئەوە بەڵگەی ئەوەیە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر لە ژیانێکی خۆشی ڕەفاهیەتی دونیادا نەژیاون، ئینجا لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کەوا دایکە عائیشە لەپاڵی دانیشتبوو لەو تاریکەییەدا ژوری خۆیەتی و ماڵی خۆیەتی دایکە عائیشە هەڵدەستێ و زەینەب دێتە جێگایەکەی دادەنیشێ و پێغەمبەر هەستی پێ ناکا (ﷺ)، پێغەمبەریش بۆ دڵ خۆشکردنی دایکە عائیشە لەنێوان ژن و مێردەکان پێویستە ئەو بابەتە دەستە گەمە و دڵ خۆشکردنانە هەبێ نابێ دڵ ڕەقبن لەگەڵ یەکتر دەبێ ئیقتیدا بکەن بە پێغەمبەر (ﷺ) زانی تاریکە و کەس چاوی پێیوە دیار نیە بۆ ئەوەی غیرەیان بجوڵێ هەویەیەکانی تر دەستێکی لەسەر دەستی ئەو ئافرەتەی دانا لە تەنیشتی بوو وایزانی هەر عائیشەیە و لەوێ ماوە، دایکە زەینەبیش -رضي الله عنها- کە عائیشە نەبوو دایکە زەینەب بوو لە خۆشیان کە پێغەمبەر ئەو حیسابەی بۆ کردوە ئەویش لە هەڵایدا و ئاشکرای کرد، کاتێک دایکە عائیشە پێی زانی و توڕە بوو غیرەی هەویایەتی هەستا هاواری کرد بەسەر پێغەمبەرەوە (ﷺ) گوتی ئای ئای ئەوە لە ماڵەکەی منە خۆ سڕەی ئەویش نیە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) ئاگادار نەبوو ئەوە دایکە عائیشە نیە، دایکە عائیشە نەیبڕاندەوە و بە دەنگی بەرزەوە قسەی بەرزی کرد بەسەر پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر زانی شتەکە هەڵەیە و ڕویداوە خۆی بێدەنگ کرد (ﷺ)، لەوە نەرم و نیانتر چی؟ ئینجا دەنگی دایکە عائیشە چوە دەرەوەی حوجرەکەی، ئیمامی ئەبو بەکر لە ماڵ دەهات بۆ نوێژی عیشا بێتە مزگەوتەکەی ماڵی الله گوێی لە دەنگی دایکە عائیشە بوو لە دەرگای ژوورەکەی دایکە عائیشەیدا مۆڵەتی خواست، کە پێغەمبەر دڵی زۆر خۆشبوو ئەبو بەکری خەزوری لەو دەمە هات و گەیشتە ئەوێ کێشە و گیر و گرفتەکەی لە کۆڵ دەبێتەوە و بە تەواوەتی پێغەمبەر (ﷺ) زانی دایکە عائیشە ئینجا بێدەنگ دەبێ، ئیمامی ئەبو بەکر بە

دەنگێکی بەرز فەرموی سوێند بە الله پێغەمبەری الله (ﷺ) گوێبیست بوم عائیشە دەنگی بەرز کردبۆوە لەسەرت دەهاتم بۆ مزگەوتیماڵی الله، فەرموی ئەی عائیشە با بۆت بمێنێ، ئێستا وەرە پێغەمبەری الله لە خزمەتتدا با بچینە مزگەوت بێینەوە من دەزانم چی لە عائیشە دەکەم، دەڵێ دایکە عائیشە تەمەنیشی بچوک بوو لەرزی لە شوێنی خۆی خۆی بە باوەشی دایکە زاینەبیدا دا، گوتی زەینەب چیم لێ دەکەی؟ ئەبو بەکری سدیقی باوکمە سوێند بە الله دەیناسم چەند پێغەمبەری خۆشدەوێ (ﷺ) ئەگەر لەبەر خاتری الله تورەبێ و لەسەر پێغەمبەر نازانم چیم لێ دەکا، دەبێ نەمکوژێ؟ دەڵێ دایکە زەینەبیش ساردی کردەوە و دەستی بەسەردا هێنا و فەرموی ئەی عائیشە دڵ تەنگ مەبە پێغەمبەری الله لێ ناگەڕێ هیچت لێبکا (ﷺ)، ئەوە نەرم و نیانی پێغەمبەرە (ﷺ) لەگەڵ هاوسەرەکانی، ئەوە حیکمەتی پێغەمبەر بوو (ﷺ) بۆ فیتنە و ئاژاوە کەم کردنەوە و بچوک کردنەوە لە ماڵ و لەگەڵ دەوروبەرەکانی بۆ ئەوەی ئێمەش چاوی لێبکەین.

جارێکی تر کە لە سونەنی ئەبو داود هاتوە هەر لە ماڵی دایکە عائیشە -رضي الله عنها- یەک لە ئافرەتەکانی هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) (والله أعلم) هەندێک دەڵێن دایکە سەفیە بوە کە دەستاوی شیو لێنانی خۆشبوە، هەندێک دەڵێن دایکە زەینەبیش هەر وا بوە، کاتێ کەوا خواردنێکی ئامادە کردبوو پێی خۆش و چاک بوو بە دیاری لەماعونێکی بۆ پێغەمبەر نارد (ﷺ)، کاتێ کەوا دایکە عائیشە دەرگای کردەوە بە یەکێک لە جاریەکان ناردبوی دایکە عائیشە خواردنەکەی بینی گوتی ئەوە کێ ناردویەتی؟ گوتی بۆ نمونە دایکە سەفیە بۆ پێغەمبەری ناردوە (ﷺ)، گوتی دیارە ئەو حیساب بۆ من ناکا ئەی منیش ژن نیم لێرەدا پێغەمبەر لە من میوانە من نانی بۆ حازر دەکەم، یەکسەر قاپەکەی وەرگرت و بە عەرزیدا دا و شکا، شیوەکە ڕژا دەنگە دەنگ پەیدا بوو پێغەمبەر هاتە دەرەوە (ﷺ) فەرموی ئەوە چی ڕویداوە؟ جاریەکە گوتی ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) دایکە سەفیە ئەو خواردنەی

ڕەوانە کردبوو بۆ تۆ، دایکە عائیشەش بریدایەوە و شکاندی هەم قاپەکە هەم خواردنەکەش ڕژا و خەسار بوو، پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) یەک دەقە بوەستە ئەی جاریە، چوە ژورەوە دیارە بۆ هەر هەمویان گیانمان فیدای بێ ئەوە عەدالەت و دادپەروەری پێغەمبەر بوە (ﷺ) لەگەڵ هاوسەرەکانی بۆ هەر هەمویان لەو فەرمودە دەردەکەوێ قاپی لە یەک ڕەنگ کڕیوە قاپەکەی دایکە عائیشەی هێنا بە خاوێنی دایەوە جاریەکە، گوتی داوات لێدەکەم نەڵێیە دایکە سەفیەت دایکە عائیشە ئەو قاپەی شکاند و شێوەکەت ڕژا تەنها سەلامی منی پێ بگەیەنە و بڵێ پێغەمبەری الله فەرموی الله پاداشتی بداتەوە ئیشییێکی چاکی کرد، جاریەکەش فەرمانی پێغەمبەری جێبەجێ کرد (ﷺ)، کە دایکە عائیشەیش هاتەوە ژورەوە پێغەمبەر فەرموی لە تۆڵەی ئەوەی ڕقێکت هەستا و ڕق و غیرەکەشت شەرعی نەبوو قاپێکت خەسار کرد و شکاندت شێوەکەشت ڕژاند ئەوە قاپەکەت لە دەستدا عائیشە جارێکی تر ئەو قاپە لە ماڵی تۆ نیە و قاپەکەی تۆم داوە دایکە سەفیە و دایکە عائیشەیش پەشیمان بویەوە، ئەو ئافرەتانەی پێغەمبەر (ﷺ) باشی و تەواوییان لەوەدا بوو لە ئیمانەوە ئەگەر غیرەشیان دەجولا چەند چرکەیەک بوو زوو بەسەر خۆیاندا دەچونەوە لە هەڵەکان دەگەڕانەوە بەس مەبەستمان لەوەیە گەورەیی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسوکەوتی لەگەڵ ماڵ و منداڵ و عایلەکەی.

پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندە موتەوازیع بوە لەگەڵ هاوسەرەکانی ئەوەتا ابن عەباس بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) «إِذَا صَلَّى الصُّبْحَ جَلَسَ فِي مُصَلَّاهُ وجلس الناس حوله حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ ثم يدخل إلى نسائه إمرأة إمرأة يسلم عليهن[1]» پێغەمبەر ئەگەر نوێژی بەیانی دەکرد لەگەڵ سەحابەکان ابن عەباس دەفەرموێ -رضي الله عنهما- (ﷺ) دەفەرموێ لە پاشان دەمایەوە هەتا ڕۆژ هەڵدەهات لە مزگەوت لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی

[1] مجمع الزوائد (١١/٥).

لە یەک لە ڕیوایەتەکان هاتوە دەڵێ لێی دەپرسین، پێی دەگوتن ئایە هەریەک لە ئێوە خەونێکی بینیوە هەتا بۆی تەعبیر بکەم؟ ئەگەر کەسێک خەونی بینیبا لە سەحابەکان بۆیان دەگوت و ئەو بۆی لێک دەدانەوە، یان ئەگەر شتێکی گرنگ هەبا پێی ڕادەگەیاندن، ئەگەر بۆخۆشی خەونی بینیبا وەکو خەونە دور و درێژەکەی دیمەنەکانی ژیانی بەرزەخی کە لە بوخاریدا هاتوە تێیدا باس دەکا پێغەمبەر (ﷺ) یەک لە جارەکانی دوای نوێژی بەیانی بوە بۆ هاوەڵەکانی گێڕاوەتەوە، ئینجا ابن عەباس دەفەرموێ -رضي الله عنهما- کە ڕۆژ هەڵدەهات لەلای ئێمە دەڕۆیشت پێغەمبەر (ﷺ) یەک بە یەک لە دەرگای ماڵی هاوسەرەکانی دەدا لە حوجرە و ژورەکانیان سەلامی لێدەکردن ئینجا دەچووەوە ئەو شوێنەی کە مەبەستی بوو یان ئەو شوێنەی کەوا سرەی ئەو ئافرەتە بوو لەلای ئەو دەمایەوە ئاوابوو پێغەمبەر (ﷺ) وە دۆعای خەیری بۆ دەکردن وە لە ئەحواڵی دەپرسین.

وە لە پاشان ئەگەر چوبا بۆ جەنگ و سەفەرێک پێغەمبەر (ﷺ) قورعەی لە نێوان ئافرەتەکانی دەکرد ناوی کامەیان دەرچوبا ئەوەی لەگەڵ خۆی دەبرد، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) نمونەی یەکجار زۆرن بەس ئەوەی کەوا بمانەوێ شتێکی تر باسکەین لەگەڵ هاوسەرەکانی کە خۆشی خستوەتە دڵیان پێغەمبەر (ﷺ) هەندێک جار هەبوو قسەی خۆشی دەکرد وە قبوڵی بوو گاڵتەی شەرعی لە بازنەی سنوری شەرعیدا لە هاوسەرەکانی قبوڵ بکا لەگەڵ یەکتر ئەنجامی بدەن بەبەر چاوی ئەو، ئەوەتا یەک لە جارەکان دەفەرموێ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی «خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لأَهْلِهِ» باشترینی ئێوە باشترینتانە لەگەڵ هاوسەر و ماڵ و منداڵەکەی خۆی باشبێ «وَأَنَا خَيْرُكُمْ لأَهْلِي[١]» منیش لە ئێوە هەموتان باشترم بۆ هاوسەر و ماڵ و منداڵەکەی خۆم.

[١] سنن الترمذي (٣٨٩٥).

ئەوەتا گێڕدراوەیە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وە لە سیره مەوجوده و هاتوه کە ئەبو یەعلا بە ژماره (٤٤٩) کە فەرمودەناسان دەفەرمون سەنەدی حەسەنە، دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) جارێکیان لەلای من میوان بوو وە هەویەیەکەشم دایکی ئیمانداران سەودەی کچی زەمعەش لەلامان میوان بوو لە یەک ژور دانیشتبوین، دەڵێ من خواردنم دروست دەکرد ئەو ڕۆژە، دەڵێ ئەو ڕۆژەی کە خواردنم دروست دەکرد چ خواردنێک دەفەرموێ ئەو خواردنەم دروست دەکرد کەوا خەزیرەیان پێدەگوت، دەفەرموێت بۆ پێغەمبەرم هێنا و لەپێش سەودەشم دانا (ﷺ)، کە ئەوە خواردنێک بوە دەڵێ گۆشتمان ورد دەکرد ئەو گۆشتەی کە دەمان کردە قیمە و وردمان دەکرد هەندێک ئاومان تێدەکرد چەلاوی لێ پەیدا دەبوو کە پێرا دەگەیشت دەڵێ هەندێکمان لە ئاردی هەبا ئاردی هەر شتێکی با تێدەکرد تۆزێک لەگەڵی دەکوڵا و چەلاوەکەی تیرتر دەکرد ئەو خواردنە خەزیرەی پێدەگوترا هێنامانە خزمەت پێغەمبەر و (ﷺ) وە لەگەڵ سەودەی دایکی ئیمانداران بخوا، دەڵێ منیش ڕوم کردە سەودە و پێمگوت پێغەمبەر لە بەینی من و دایکە سەودە دانیشتبوو دایکە عائیشە دەفەرموێ -رضي الله عنهن- وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەڵێ منیش گوتمە سەودە دە بخۆ ئەوە خواردنێکی چاکە بۆم هێناوی دەڵێ سەودەش وا هەستم کرد حەزی پێ نەبوو بخوا «فأَبت فقلت طبختها له، فقلت لسودة والنبي بيني وبينها: كلي. فأبت» دەڵێ من لێم نابوو ئەو خواردنە بۆ پێغەمبەر و دایکە سەودە (ﷺ) -رضي الله عنها- بەس دایکە سەودە دەسی نەگەیاندێ و نەیخوارد، دەڵێ منیش گوتم تۆ یان دەیخۆی یان دەموچاوت پێ سواخ دەدەم، ئەی بۆ منتان ئەوەندە ماندو کردوە ئەو خواردنەم بۆ هێنای؟ دەڵێ پێغەمبەریش وا دانیشتوە (ﷺ)، دەڵێ دایکە سەودە دوبارە دەستی بۆ درێژ نەکرد و نەیخوارد، دەڵێ لە پاشان منیش ویستم قسەکەی خۆم بێنمەجێ دەستم لەناو شیوەکە نا هەندێک سارد بوو بوەوە ناو لەپم هەموو بەشیوەکە بوو بە دەموچاوی سەودەمدا هێنا هەردوکیان هاوسەری پێغەمبەرن (ﷺ)، دەڵێ بینیم پێغەمبەر

توڕە نەبوو (ﷺ) بە زەردەخەنەوە فەرموی سەودە لەپێش من تۆش تۆڵەی خۆت بکەوە ئازابە عائیشە وای لە تۆ کرد تۆش وەکو ئەو ئازابە هەموو دەموچاوی سواخ بدە بە خواردنەکە، دەڵێ بینیم پێغەمبەر دەستی سەودەی گرت و لەناو خواردنەکەی هەڵهێنا فەرموی دەی تۆڵەی خۆتی لێبکەوە، دەڵێ سەودەش منی گرت و بە دەموچاوی منیدا هێنا، دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) سونەتیانە گیانمان فیدای دەستی کرد بە پێکەنین و لە دیارمان پێکەنی و دڵی خۆش بوو دڵی ئێمەشی یەکجار خۆش کرد بەو پێکەنینەی خۆی پێغەمبەر (ﷺ).

پێغەمبەر ئاوا موتەوازیع و خاکی بوو لەگەڵ هاوسەر و عائیلەکەیدا لەگەڵ ئەوەدا پلە و پایەی ئەوەندە گەورە بوو پێغەمبەری الله بوو (ﷺ) لە هەموو مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان لەلای خوای رب العالمین لەسەر بۆچونی پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە پێغەمبەر بەرز و بەڕێزترە (ﷺ) تەنانەت لە عەرشی خوای رب العالمین یش پێغەمبەر (ﷺ) بەرز و بەڕێزتر و گەورەترە وە لە هەموو فریشتە و مەلائیکەتەکان لەسەر بۆچونی ڕاجیحی ئەهلی سونە و جەماعە پێغەمبەر (ﷺ) بەرز و بەڕێزتر و گەورەترە لەلای خوای رب العالمین، کۆتای قسان پێغەمبەر (ﷺ) هیچ کەس و شتێک نایگاتێ جگە لە خوای رب العالمین -جل شئنه- لە مەخلوقات و بەدیهێنراوەکان لە هەمویان بەرزتر و گەورەتر و بەڕێزتر و خۆشەویستترە لەلای خوای رب العالمین، ئینجا لە دونیاش گەورەی دەوڵەتێکی یەکجار گەورەبوو کە هەموو سام و هەیبەتیان لێ نیشتبوو کافر و موشریکەکان ئەوروپای ئەو کات و وە فارسەکان و کیسراش هەموو دەلەرزین لەبەر لەشکرەکانی پێغەمبەر لە کۆتایی ژیانی (ﷺ)، ئینجا ئاوا خاکیش بوە لەگەڵ هاوسەرەکانی و لەگەڵ ماڵ و منداڵی، خەڵکێک وا دەزانێ دینداری کاتێک دەیکا بۆ خەڵکی دەیکا (پەنا بە خوای رب العالمین) ئەگەر بە ڕۆژو دەبێ یان نوێژێکی زیاد دەکا یان زیکرێک دەکا یان

جەماعەت دەکا یان خێرێک دەکا یان مامۆستایە یان شتێک لە دین فێربوە لوتی بەرز دەبێتەوە لەگەڵ ماڵ و منداڵی وا دەزانێ دینداری لەوەدایە زەردەخەنەیەکیان لەگەڵ نەکا و سوعبەتێکیان لەگەڵ نەکا و ڕێزێکیان لێ نەنێت و ژیانێکی تەرفیهی شەرعیان بۆ ئامادە نەکا، پێغەمبەر هەندێک جار هەبوە (ﷺ) ڕای کردوە لەگەڵ دایکە عائیشە، دایکە عائیشە دەفەرموێ یەک لە جارەکان پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵەکانی لەگەڵمان بوو بۆ دەرچونێک بە پێشی خستن فەرموی وەرە عائیشە ئەگەر حەز دەکەی با پێش بڕکێی ڕاکردن بکەین کەسمان لێ دیار نیە و سەحابەکانیشمان لەپێش خۆمان ڕەوان کرد، دایکە عائیشە دەڵێ دڵم زۆر پێی خۆشبوو پێشبڕکێمان کرد، کاتێک من بەپێش پێغەمبەر کەوتمەوە (ﷺ) من تازە پێ ڕادەگەیشتم هێشتا گۆشتن نەبو بوم قەڵەو نەبو بوم، دەڵێ چەند ماوەیەکی پێچوو دوایی من گۆشتن بوم و قەڵەوتر بوو بوم و تەمەنم گەورەتر بوو بوو ئەمجارە لە دەرچونێکی تر پێغەمبەر ئاوای لەگەڵ کردم (ﷺ) پێغەمبەری الله لەسەر شنگ و قوەتی خۆی مابوو دەڵێ لێی بردمەوە، فەرموی عائیشە دڵت هیچ نەکا ئەوجارە لێت بردمەوە ئەم جارەش من بردمەوە جارێک بە جارێک و کەسمان لە کەس عائیشە، ئاوا دڵی هاوسەرەکانی خۆی خۆش دەکرد (ﷺ).

لە پاشان ئەنەس دەگێڕێتەوە دەفەرموێ سوێند بە الله پێغەمبەر (ﷺ) دە ساڵ لە خزمەتی بوم و لەگەڵی ژیام یەکجاریش نەبیندرا پێغەمبەر لە هاوسەرەکانی بدا وە لە خزمەتکارەکانی بدا یان قسەی دڵ تەنگی و ناخۆشی و زەحمەتی یان بەسەر بێنێ و یان دڵیان توند بکا، پێغەمبەر ئاوا بوو (ﷺ).

پێغەمبەر هەندێک جار گوێی لە قسەی هاوسەرەکەی ڕاگرتوە بۆمان گێڕانەوە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کەوا لە سوڵحی حودەیبیە ئوم سەلەمە -رضي الله عنها- کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) دەچێ پێیان دەڵێ بە هاوەڵەکان حەیوان و ئاژەڵەکانتان لێرە سەر ببڕن کەس بە قسەی

ناکا، جێبەجێی ناکەن بە کردار، دڵی توند دەبێ و دەچێتەوە ژێر ئەو خێوەتەی کە ئوم سەلەمەی هاوسەری لەوێیە، ئینجا ئوم سەلەمە -رضي الله عنها- دەبینێ پێغەمبەر (ﷺ) غەمگینە و کە بۆ ئوم سەلەمەی دەگێڕێتەوە ئوم سەلەمە -رضي الله عنها- ڕوو دەکاتە پێغەمبەر دەفەرموێ ئەگەر قسەیەک هەیە لێم وەربگری ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ) پێم وایە تۆ بڕۆ دڵی خۆت توند مەکە هاوەڵەکان بە قسەت دەکەن فەرمانت جێبەجێ دەکەن بەڵام پێیان وایە هێشتا مەجال قسەکردنی تێدا ماوە لەبەر ئەوە بڕۆ بە کردار و عەمەلی تۆ حەیوان و ئاژەڵەکەی خۆت لەبەرچاوی ئەوان سەربڕە بە دڵنیاییەوە ئەوکات دەزانن هیچی تێدا نەماوەتەوە بە قسەت دەکەن و ئیقتیدات پێ دەکەن و ئاژەڵەکانیان سەردەبڕن، دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) نەیگوت من قائیدم من پیاوم کچێ تۆ چی؟ بۆ تەداخولی ئیشی پیاوان دەکەی؟ ئا ئەو نەوعە پیاوانە بە دڵنیاییەوە لە ئیسلام نەگەیشتون ئەگەر موسڵمانیشبن، ئافرەتیش بۆی هەیە قسە بکا بۆی هەیە گوێشی لێ ڕابگری ئەگەر قسەکەی موافق بوو لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام وە دەچوە عەقڵت بە عەقڵی سەلیم ئەگەر جێبەجێت کرد هیچ کەم و هیچایەتی تێدا نیە بۆ پیاوەکەی، وەکو پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لەو ڕیوایەتە کە هاتوە لە سەحیحی بوخاری بە ژمارە (٢٧٣٢) کە بۆمان گێڕانەوە بە قسەی ئوم سەلەمەی کرد -رضي الله عنها- چوو ئاژەڵەکەی خۆی سەربڕی و سەحابەکان یەک لە دوای یەک چون ئاژەڵەکانیان سەربڕی لە دوای پێغەمبەر (ﷺ).

پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) خۆی زۆر جوان هەڵدێخست خۆی بۆن خۆش دەکرد خۆی پاک و خاوێن دەکرد بۆ هاوسەرەکانی وە وەهاشی پیشان دەدا بە خەڵکەکە دەبێ موسڵمان وابێ ئاوا مافی دەدان پێغەمبەر (ﷺ)، وە لە پاشان پێغەمبەر حەدیسی سەحیحە فەرمویەتی خەڵکی خۆ چڵکن کردن خۆت چڵکن کەی بەخۆت یان بۆن ئارەقەت لێبێ بەخۆت یان پرچت تێک بئاڵێ و بە شێوازێکی جوان و بەرچاو و دڵگر نەیەیە بەرچاوی خەڵکەکان و

هاوسەرەکانت خەڵکێک وا دەزانێ دینداری لەوەدایە لە مێژوی ئیسلامدا کاتێک تاقمێک پەیدابون بەناوی دونیا نەویستیەوە شمەک و جل و بەرگی وایان لەبەر دەکرد وایان هەڵسوکەوت دەکرد ئیسلام بەوە ڕازی نیە پێغەمبەر بەوە ڕازی نەبوو (ﷺ) لە هەموو خەڵکی سەر ڕوی زەوی بۆن خۆشتر بوە، لە هەموو شتێکی لە دونیای ئێمەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ «حُبِّبَت إليَّ من دُنياكم ثلاثة» دەفەرموێ سێ شت لە دونیای ئێوە لەلای من خۆشەویستە و دڵم پێی خۆشە، یەکەمیان فەرموی «الطيبُ[١]» بۆنی خۆش پێغەمبەر، لەبەر ئەوە بۆنی زۆر لە خۆی دەدا هەتا لە یەک لە ڕیوایەتەکان هاتوە لە وەسفی پێغەمبەر بۆمان باسکردن (ﷺ) هەندێک لکە موەکانی پێغەمبەر لەبەر بۆن زۆر بەکارهێنان و لێدانی سور هەڵگەڕابوو ڕەشایەتیەکەی نەما بوو سپیش نەبوو بوو چونکە بۆنی زۆر بەکار دەهێنا و لێیدەدا، ئەوە سونەتی پێغەمبەرە (ﷺ) هەردەم بۆن خۆش بوە و بۆنی خۆشی بەکار هێناوە، ئینجا دەبینن ئیمامی شافیعی لەبەر ئەوەیە و هەندێک لە زانایانی تر دەفەرمون هەر چەندێک پارە بە بۆن بدەی بۆنی خۆتی پێ خۆش بکەی ئیسرافی تێدا نیە وەکو شتەکانی تر کەوا دەیکڕی بۆ ئەوەی موسڵمانان و هاوسەرەکەت و وە ماڵ و منداڵت هەردەم بۆنی خۆشت لێ بکەن وەکو پێغەمبەر بۆنی خۆشی دەکرد (ﷺ)، دوەم شت لەو سێ شتانە دەفەرموێ ئافرەتان، ئافرەت جێگای دڵ خۆشیە لە ژیاندا نەک جێگای بێزاری لێکردن بێ ئیلا ئەو ئافرەتەی ڕێچکەی شەیتان دەگرێ ئەوان نا ئەگەرنا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی ئافرەتانیش جێی دڵ خۆشین، بەس دوایەکەش فەرموی من بیلبیلەی چاوم لە نوێژەکانە، واتە دڵم بە نوێژیش زۆر خۆش دەبێ لە دونیادا کە نوێژ کردن هەیە، ئینجا دەفەرموێ «إِذا أَرادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْتِيَ الجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ[٢]» ئەمرت پێدەکا پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر ئەوە هەندێک لە زانایانی فیقهی دەفەرمون غوسڵی جومعە واجبە دەڵێن چونکە ئەو

[١] العراقي، تخريج الإحياء للعراقي (٢/٤٠)، إسناده جيد، أخرجه النسائي (٣٩٣٩)، وأحمد (١٤٠٦٩) بنحوه.

[٢] صحيح البخاري (٨٧٧).

حەدیسە پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) هەریەک لە ئێوە دێتە مزگەوت بۆ نوێژی هەینی با خۆی بشوا «فَلْيَغْتَسِلْ» لامەکە لامی ئەمرە چوەتە سەر (فعل مضارع) (يَغْتَسِلْ) مەجزومی کردوە، لامی ئەمریش ئەگەر چوە سەر (فعل مضارع) و مەجزومی کرد قەرینەیەک نەبوو لای بدات لە ئەمریەتەکەی واجب دەبێ ئیشەکە جێبەجێ بکەی لەلای هەندێک لە زانایان، هەندێکی تریش دەفەرمون بۆ هاندانە و پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستی لەوە بوە سونەتە، کەواتە هەردوو بۆچونەکە هەیە گرنگ ئەوەیە موسڵمان دەبێ خۆی بشوا و خۆی بە پاک و خاوێنی ڕابگرێت و بۆن ئارەقەی لێ نەیە و بۆن خۆشی لێبکرێت وە جوان بێتە بەرچاو و دڵەکان.

ئینجا پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) ئەوەتا جارێک دایکە عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ «وَكانَ يَوْمُ عِيدٍ يَلْعَبُ فيه السُّودانُ بالدَّرَقِ والحِرابِ، فَإِمّا سَأَلْتُ النبيَ (ﷺ)، وإمّا قالَ: تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ؟[1]» دەڵێ یان من بوم پرسیارم لە پێغەمبەر کرد (ﷺ) تەواو بە بیرم نەماوە دەفەرموێ دایکە عائیشە یان پێغەمبەر خۆی بە منی گوت حەز و ئارەزوت بەوەیە دایکە عائیشە، دەڵێ منداڵەکان گەمەیان دەکرد بە شتی گەمەی شەڕە شمشێرانێ و وە ئەوەی لە قەڵغانەکان دەیدەنە بەر شمشێر لەگەڵ یەکتر منداڵەکانی حەبەشی گەمەیان دەکرد هی سودانی و حەبەشی گەمەیان دەکرد لەو شوێنەی کەوا ماڵی خوای رب العالمين و مزگەوت بوو ئەوها ڕێگای پێ دەدان پێغەمبەر (ﷺ) منداڵەکان پەروەردەبن بەس گەمەکەیان فائیدەی هەبوو بۆ گەورە بونیان بە شمشێر گەمەیان دەکرد تا لێی ڕابێن، منداڵی موسڵمانانیش ئاوا دەبێ پەروەردە بکرێ چونکە موسڵمان خۆی دەبێ پاڵەوان بێ منداڵەکانیشی پاڵەوان بن هەر لە بچوکیەوە حەزی ئەوەیان بێ کەوا چاونەترس بن بە پاڵەوانێتی و بەغیرەت گەورە ببن، دەڵێ بە منی گوت پێغەمبەر (ﷺ) دایکە عائیشە دەفەرموێ ئەگەر حەز دەکەی عائیشە با بچین تەماشایان بکەین، دەڵێ چوین لەوێ

[1] صحيح البخاري (٩٥٠).

پێغەمبەر (ﷺ) دیوارێک لەوێ بوو دەستەکانی خۆی لەسەر یەکتر دانا چەناگەی خۆی لەسەر دانابوو، دەڵێ منیش لە پشتەوە دەستم خستبوە سەر شانی پێغەمبەر (ﷺ) چەناکەی خۆم لەسەر دانابوو تەماشامان دەکرد و دڵی خۆش کردم پێغەمبەر (ﷺ)، مادەم وایە مانیع نیە موسڵمان ئەگەر خێزان و هاوسەری خۆی بە مەرجی شەرعی بگەڕێنێ و بیباتە دیار شتێک ئەگەر منداڵێک گەمەی دەکا یان بۆ سەفرە و سیاحەتێک مەرجە شەرعیەکانی تێدابێ و گوناح و تاوانی تێدا ئەنجام نەدرێت لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگیراوە.

وە لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەت زۆر حەزی بەوەیە گوێی لێ بگیرێ زۆربەی کێشەکانی ئێستا زانایان دەفەرمون بە تایبەت زانایانی (علم النفس)یش وا ڕادەگەیەنن زانایانی موسڵمانانیش لەنێوان ژن و مێرد ئەوەیە کەوا پیاوەکان نازانن تەحامولی چاک کە ژن پێویستیەتی و مافیەتی لەگەڵ ژنەکان بیکەن وە ژنەکانیش بە هەمان شێوە، پیاو لەگەڵ پیاوان ژیاوە تەحامولێکی پیاوانە لەگەڵ ژنی دەکا لەبەر ئەوە ژن ئەو نەوعە تەحامولەی قبوڵ نیە ژن حەزی لێیە تەحامولێک لە ژنان بوەشێتەوە لەگەڵی بکەی، بۆ نمونە لەو سەردەمانەش گوتراوە کێشەکان لەوەدایە زۆرجار ژن حەزی لێیە بە دور و درێژی هەر هەواڵێکی زانیوە بۆ مێردی خۆی بگێڕێتەوە پێیوایە نزیکترین کەسێتی هەر کێشە و گیر و گرفتێکت هەبێ گرنگ نیە لەلای ئەو ئەگەر تۆ چویەوە ماڵ ئەو هەواڵێکی زانیبێ و لەلای خۆی گرنگ بێ با لەلای تۆ گرنگیش نەبێ حەزی لێیە پیت بە پیت حەرف بە حەرف وشە بە وشە بۆت بگێڕێتەوە، جا پیاوەکەش ڕەنگە خۆی پێ ماندوبێ و ساحێب حەق بێ و گوێی لێ ڕاناگرێ و لەدەمی دەداتەوە ئەوە چیە حیکایەتی تۆ هەر تەواو نەبوو؟ هەر جارێک دێمەوە نابینی من ئارەقم کردوە ماندوم ئێستا کاتی ئەوەیە قسان دەگێڕیتەوە؟ ئا ئەوانە هەڵسوکەوتی پیاوانەی شەرعی نیە پێغەمبەر وانەبوە (ﷺ)، چەند دەقەیەک گوێی لێ ڕابگرە تەواو دڵی دادەکەوێ ئافرەتەکەت هەست دەکا تۆ بەسۆزی دڵ سۆزی

بۆی خۆشت دەویَ ئەویش مەراقی دڵی دادەکەویَ، پێغەمبەر گوێی ڕاگرتوە (ﷺ) دە تەماشا بکەن جارێکیان دایکە عائیشە دەفەرمویَ پێغەمبەری الله لەلای من دانیشتبوو (ﷺ) دەڵێ منیش سەرگوزشتەی یازدە ئافرەتی پێشانم بۆ گێڕایەوە لەگەڵ مێردەکانیان کە فەرمودەیەکی دور و درێژە بە فەرمودەی (أم زرع) مەشهورە مامۆستایان و خوێندەواران خوێندویانەتەوە لە زۆرێک لە کتێبەکانی سونەن و حەدیس ڕیوایەت کراوە و هاتوە وە چەندین پەند و وانەشی لێ دەرهاتوە و لێی وەرگیراوە هەندێک لە موحەدیس و فەرمودە ناسان بە تەنهایی کیتابیان لەسەر داناوە، باسی یازدە ژنی لەگەڵ یازدە مێردی هەڵسوکەوتیان چۆن بوە؟ وەسفیان چۆن بوە؟ چەندین لاپەڕەی کاغەزەکانی ئەو سەردەمەی داگیر کردوە ئەو فەرمودە، دایکە عائیشە هەموی بۆ پێغەمبەر گێڕاوە (ﷺ) گیانمان فیدای بێ دەفەرمویَ هیچ هەستم نەکرد پێغەمبەر (ﷺ) دڵی خۆی توند بکا یان بڵێ وەختم نیە عائیشە ئەو قسە دور و درێژە چیە دەیگێڕیتەوە؟ یان بڵێ ئەوە چیە تۆ بۆمن دەیڵێیی؟ سودی نیە من پێغەمبەری اللهم با من قسەت بۆ بکەم، ئینجا لە کۆتاییەکەی دەڵێ بە زەردەخەنەی هێنام پێغەمبەر (ﷺ)، دەڵێ چونکە لە فەرمودە و گێڕانەوەکە وایە کە ئەبو زەڕع پیاوێکی باشە لەگەڵ ئوم زەڕع، ئینجا لە کۆتاییەکەی پێغەمبەر پێی دەفەرمویَ (ﷺ) ئەی عائیشە ئەوەی تۆ گێڕاتەوە ڕاستە دەربارەی ئوم زەڕع و ئەبو زەڕع کەوا گێڕاتەوە ئەی عائیشە بەڵام گویَ لە من ڕابگرە من ئەوەندەی ئەبو زەڕع کە بۆ ئوم زەڕعی باش بوە بۆ تۆ باشم، وایە یان نا عائیشە؟ دەڵێ عائیشە فەرموی -رضي الله عنها- دەڵێ گوتم بەڵێ پێغەمبەری الله (ﷺ) تۆ لەویش باشتری و دەڵێ فەرموی بەڵام ئەبو زەڕع ئوم زەڕعی تەڵاقدا و من تەڵاقیشت نادەم، کەواتە باشترم هێشتا لە ئەبو زەڕع بۆت ئاوا دڵی هاوسەرەکەی خۆی خۆشکرد و پێغەمبەر (ﷺ) ئاوا بوە.

پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ منداڵەکانیش لەگەڵ نەوەکانیشی زۆر بە ڕەحم و بەزەیی بوە تەنانەت دەگێڕنەوە فاتیمەی کچی هەر جارێک هاتبێتەوە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) کە ماڵی لێی نزیک بوە و لە مەدینە بوە و هاوسەری ئیمامی عەلی بوە هەموو جار ئەگەر لە ساعاتێکی دووجار هاتبا ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر خۆشی دەویست دەیفەرموو «فَاطِمَةُ بَضْعَةٌ مِنِّي[١]» فاتیمە پارچەیەکە لە من، دایکە عائیشە دەفەرموێ وەڵاهی هەندێک جار هەبوە پێغەمبەرم بینیوە (ﷺ) فاتیمەی کچی لێی هاتوەتە ژورەوە وەکو میوانێکی زۆر بەڕێزی سەنگین لەبەری هەستاوەتەوە یەک پێ پێغەمبەر (ﷺ) بەپیریەوە چوە لە باوەشی خۆی گرتوە ئینجا فاتیمە بۆ ئیشێک چوەتە دەری ژورەکەی جارێکی تر هاتوەتەوە ژورەوە دوبارە پێغەمبەر لەبەری هەستاوە (ﷺ) توند لە باوەشی خۆی گرتوە ئەوە سۆزی پێغەمبەر بوو (ﷺ) بۆ منداڵەکانیشی.

وە لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) تەماشا بکەن و سەرنج بدەن جارێکیان ئومامە، ئومامە کە کچی زەینەب بوە کچیش بوە کوڕیش نەبوە زۆرکەس ئێستا ئەگەر کچێکی زۆر بچوکی خۆی لەگەڵی بێتە مزگەوت یان لەپاش ئەو بێتە مزگەوت داخوا چ دەقەوموێ چ شەڕ حەربێک دەقەومێ لەو ماڵەی پیاوەکە کە بچێتەوە؟ داخوا چۆن سەرزەنشتیان دەکا؟ پێغەمبەر لە نوێژ بوە (ﷺ) ئیمام بوە یەک لە سەحابەکان بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ پێغەمبەر چوە سوجدە و کڕنۆش بردن دەڵێ چەندین دەقەی پێچوو پێغەمبەر سەری بڵند نەکرد (ﷺ)، دەڵێ لە دڵی خۆمان گوتمان پێغەمبەر قەت ئەو سوجدەی ئەوەندە درێژ نەکردوەتەوە وەڵاهی ئیلا پێغەمبەری الله وەفاتی کردوە لەناو سوجدە، دەڵێ دڵمان زۆر پێیوەبوو هەمان بوو ویستمان سەرمان بڵندکەین دەبینین وا ئومامەی کچی زەینەب منداڵە بچوکە هاتوەتە ناو مزگەوت بە هەردوو لاقی ئاوا لەسەر ملی پێغەمبەر دانیشتوە (ﷺ)،

[١] صحيح البخاري (٣٧١٤).

دایک و باوکمان و خوٚمان فیدای پێغەمبەر بین (ﷺ) هەرکە سەری بڵند کرد پێغەمبەر فەرموی دەزانن چی بوو بوٚ سوجدەکەم وا تاخیر کرد؟ گوتیان نەخێر، فەرموی وەڵاهی دڵم نەهات ئومامەی نەوەم بوو هاتبوو دوو لینگانی لەسەر ملمدا هێنابوو بچوکە و منداڵە، دڵم نەهات لای بدەم و دڵی بشکێنم گوتم ئەوەندەی زیکرەکانم زیاد دەکەم لە کڕنوٚش و سوجدە بردنەکە، لە هەندێک لە ڕیوایەتەکانی تر دەڵێن حەسەن و حوسێنیش ئاوایان کردوە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)، وە لە ڕیوایەتی تر هەیە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوٚژی هەینی بوە لەسەر میمبەر بوە حەسەن یان حوسێن بەدیارکەوتوە لە مزگەوت ڕای کردوە بوٚلای باپیرەی کە پێغەمبەری اللەیە (ﷺ) بەناو خەڵکیدا هاتوە بەرەو میمبەرەکەی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر خوٚی لێ تورە نەکردن، نەیگوت فاتیمەی کچم ئەوە وەختە ناردوتە؟ من پێغەمبەری اللەم گەورەی هەموو موسڵمانەکانم الله ئەوەندە ڕێزی لێناوم، موتەوازیعانە قادرمە بە قادرمە کە سێ پایە بوە میمبەرەکەی هاتوەتە خوارەوە لە بەرچاوی خەڵکەکە حەسەن یان حوسێن لەسەر ئیختیلافی ڕیوایەتەکان هەڵی گرتوە لەسەر ملی خوٚی داناوە و چوەتەوە سەر میمبەری دەستی بە خوتبە کردوەتەوە، ئاوا بوو هەڵسوکەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ منداڵەکان و لەگەڵ دەوروبەری پێغەمبەر (ﷺ).

لە سەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوە یەکێک لە دەشتەکیەکان دێتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کە دەبینێ پێغەمبەر (ﷺ) باوەش بە منداڵەکان وەردەهێنێ سەحابەکان دەبینێ منداڵەکان ماچ دەکەن، دەڵێت ئەوە چیە پێغەمبەری الله (ﷺ) ئێوە منداڵانیش ماچ دەکەن؟ ئەو عەرەبیە دەشتەکیەی ئەوکات، پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) بەڵێ لە باوەشیان دەگرین وە ماچیشیان دەکەین، دەڵێ من لە ژیانم یەک منداڵی خوٚمم ماچ نەکردوە، پێغەمبەر ڕوی تێدەکا و دەفەرموێ (ﷺ) «أو أملِكُ لك أنْ نزَع اللهُ مِن قلبِك الرَّحمةَ؟[1]» جا من چیبکەم

[1] صحيح البخاري (٥٩٩٨)، صحيح مسلم (٢٣١٧)، سنن ابن ماجه (٣٦٦٥).

ئەگەر الله ڕەحم و سۆز و بەزەیی لە دڵی تۆ دەرهێنابێ؟ واتە ئەوەی منداڵ لە باوەش دەگرێ و ماچی دەکا پێ ناشکێتەوە پێغەمبەر وایکردوە (ﷺ) لەگەڵ سەحابەکان ئەوە نیشانەی ڕەحم و بەزەییەتی بە منداڵەکان و لەگەڵ منداڵەکان.

لە کۆتایەکەیدا دەڵێین پێغەمبەر جار وابوە (ﷺ) بەلای برای ئەنەسدا ڕۆیشتوە و ناوی ئەبو عومەیر بوە کاتێک گەمەی کردوە لەگەڵ باڵندەیەک وەکو بولبولی هەبوە ئینجا پێغەمبەر بەلایدا چوە (ﷺ) پێیگوتوە «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟[١]» بە پێکەنین و خۆشیەوە دەستی بۆ ڕەوان کردوە باوکی عومەیر وەکو زەلامێکی گەورە دواندویەتی لە کۆڵان بینویەتی ئەو باڵندە و تەیرەی لەگەڵە گەمەی لەگەڵ دەکا گوتی ئەوە چی دەکا باڵندە و تەیرەکەی تۆ؟ دەیدوێنی و قسەی لەگەڵ دەکەی؟ ئینجا تەماشا بکەن ئەوە تەوازوعی پێغەمبەر بوو (ﷺ) لە کۆڵانەکان هەر منداڵێکی ببینایە سەلامی لێدەکرد نەک منداڵەکان بشکێنێتەوە و یان خوانەخواستە لە مزگەوتدا دەریان بکا.

بەڕێزان با ئێمەش ئاوا باوەش بکەینەوە بۆ منداڵەکان فێرە تەربێت و ئەخلاقیان بکەین هەم لە ماڵ و وە هەم لە مزگەوتەکان و وە مامۆستایەکانیش سینەمان فراوان بێ بەڵکو منداڵەکانمان لە مزگەوت و عیبادەت و ئەخلاق ڕابێن و ئەو کاتە دایک و باوکەکانیش لەسەریانە بەڵام سنور شکێنی مزگەوتەکان نەکەن ئادابە شەرعیەکان تێک نەدەن منداڵی وابنێرن کە تەمیزی هەبێت و وە یان نەسیحەت و ئامۆژگاری کرابێ بتوانێ لەناو مزگەوتدا ئادابەکانی مزگەوت بپارێزێ ئا ئەوکاتە خێرمان دەگاتێ.

## حەجی ماڵ ئاوایی و نەخۆشی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

ئەوەی بۆتان باس دەکەین ڕاستە غەمێکی زۆری پێوەیە و بەڵام موسڵمان دەبێ تەسلیمی قەزا و قەدەری خوای رب العالمین بێ کە کۆتا ژیانی پێغەمبەرە (ﷺ).

[١] صحيح البخاري (٦١٢٩) (٦٢٠٣)، صحيح مسلم (٢١٥٠)، سنن أبي داود (٤٩٦٩).

پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) یەک حەجی لە ژیانیدا کردوه بۆ ماڵی خوای رب العالمین ئەویش پێی دەگوترێ (حجة الوداع) واته حەجی ماڵ ئاوایی، پێغەمبەر (ﷺ) لەو حەجەدا ئەوەی زۆر گرنگە بە کورت و پوختی بۆتان باسکەین ئەوەیە ژمارەیەکی یەکجار زۆری موسڵمانان لە هەموو شوێنەکان ئەوانەی بەرهەم و واته دروێنەی دەعوە و بانگەوازی پێغەمبەرە (ﷺ) لەو ڕۆژە دەرکەوت، کە سەد هەزار موسڵمان و سەحابی ڕویان کردە پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو شاری مەککە حەجی ماڵئاواییان لە خزمەت پێغەمبەر کرد (ﷺ)، ئەو ژمارە هەرە زۆرە و وە ئەو بەرهەمە پڕ خێر و بەرەکەتە دڵی پێغەمبەری زۆر خۆشکرد (ﷺ)، جا خاڵێکی تر لە (حجة الوداع) کە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بە ڕێک و پێکی حەجەکەی کرد بە بەرچاوی خەڵکەکەوە وە فەرموی ئەوەی ڕێ و شوێنی حەجە لە عیبادەت و پەرستشەکان لە عەمەل و کارەکان تەماشام بکەن و لێمی وەربگرن و ئێوەش لە ژیانتان و بۆ حەجەکانتان دوبارەی بکەنەوە، ئینجا فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە چەند فەرمودەیەکی یەکجار گرنگە لە وتارەکەی (حجة الوداع) دەردەکەوێ کە پێغەمبەر (ﷺ) لەوێ وتارێکی خوێندەوە، کە زانایانی ئیسلام و مێژونوسان دەفەرمون هەر (طالب العلمێک وە هەر ماموّستا و داعییەک وە هەر سەرکردەیەکی موسڵمان پێویستە لەسەری خوتبەکە و وتارەکەی پێغەمبەر (ﷺ) جوان بخوێنیتەوە و لێی تێبگا و هەردەم لەبەری بێ و دەرخی بێ و وە کار و ئیشی پێبکا، مەبادیئی زۆر گەورەی باسکرد پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت و وە عەقیدە و بیروبڕوای موسڵمانان و وە موسڵمانان هەڵسوکەوتیان چۆن بکەن و چیبکەن؟ ئێمە هەندێک لەقەتات و دیمەن وەردەگرین لە وتارەکەی پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر دەستی کرد بە وتار خوێندنەوە لە وتارەکەیدا فەرموی «إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) بزانن بەڕاستی و بەبێ گومان خوێنتان لەسەر یەکتر حەرامە ماڵتان لەسەر یەکتر حەرامە لە یەکتری ببەن و بستێنن وەکو ئەمڕۆ کەوا لەسەرتان حەرامە خوێنی تێدا بڕژێنن و لە

ژێر ئیحرامدان وه وەکو ئەو مانگه کە مانگی (ذو الحجة)یە خوێن ڕشتنی تێدا حەرامە و چەند خاڵێک هەیە لەسەرتان حەرام کراوه و نابێ لەو مانگەدا بیکەن بە تایبەت کە له ماڵی خوای رب العالمين ن، ئینجا له پاشان فەرموی وەکو ئەو وڵاتەی کەوا مەککەیە و کەعبەیە و حەرەمە کە لەسەرتان حەرام کراوه بە تایبەت کە لە ژێر ئیحرامدان ڕاوی تێدا بکەن و یان کوشتار و شەڕی تێدا ئەنجا بدرێ ئا ئەوهاش لەسەرتان حەرامە خوێنی یەکتر بڕژێنن، لەسەرتان حەرامە پارە له یەکتر بە ناحەق بستێنن و ببەن وه بە حەرام بیخۆن، ئینجا فەرموی «أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ» فەرموی بشزانن لەمڕۆوه ئەوەی نەفامیەت و نەزانین بوو له یاساکانی نەفامیەت و نەزانین و جەهالەت هی کوفر و شیرک کە له پێشتردا هەبوو له مەککە حوکمی پێ دەکرا و یان له مەدینە یان له هەر وڵاتێکی تر ئەوه من هەموم کۆ کردەوه و لەبن پێڵاو و پێی خۆمم دانا، بەو ئسلوبە پێغەمبەر فێری ئێمەی کرد (ﷺ) واتە ئێمەش کە موسڵمانین دەبێ پەند و وانەی ئەوەی لێ وەربگرین یەکتر نەکوژین بە ناحەق خوێنمان لەسەر یەک حەرامە، ماڵی یەکتر نەخۆین بە ناحەق لەسەر یەکتر حەرامە ماڵی یەکتر بخوا، وه له پاشان بزانین هەموو یاسایە دەستکردەکان و نەفامیەت له هەر سەردەمێک یاساکانی نەفامیەتی جەهالەتی ئەبو جەهلی نوێ بکرێتەوه ئێمەش دەبێ ئاشکرا بەبێ ترس وەکو پێغەمبەر (ﷺ) بڵێین یاسا دەستکردە نەفامیەکانی ئەبو جەهلی هەموو لەژێر پێڵاومانە و قەت کار و ئیشی پێ ناکەین و پێغەمبەرمان وای فەرموو (ﷺ)، ئینجا له پاشان پێغەمبەر فەرموی «وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ» وه خوێنەکانی له سەردەمی نەفامی ڕژاون و لەسەر یەکتر هەتانە ئا ئەوەشم نایە ژێر پێم و پێڵاومەوه واتە دامنا و نابێ لەسەر یەکتر هیچ حیساب بکەن کە لەپێشتر دانرابوو هەبوو، ئینجا یەک یەک پێیدا هاتە خوار خوێنی ئەوه لەسەر ئەوه یان ئەوه ڕیبای لەسەر فلانە ئا ئەوانە بزانن موسڵمانان هیچیان نەما و هەڵم وەشاندەوه و هەموم له ژێر پێم دانا و نابێ چیتر ئیشی پێ بکرێ، ئینجا فەرموی «فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ» له الله بترسێن دەربارەی ژنەکان

هەندێک جار ژن بەستە زمانن بێ دەسەڵاتن «فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ» لەبەر ئەوەی ئێوە ژنەکان هاوسەرتانن و هێناوتانن بە بەڵێنێک لەگەڵ خوای رب العالمین لەسەر وشەکانی خوای رب العالمین «وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ» بۆتان حەڵاڵ بوە لەگەڵیان جوت ببن لاشە و جسمیان بۆ ئێوە حەڵاڵ بوە بە وشە و وتە و فەرمانی خوای رب العالمین «وَلَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لَا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ» جا ئێوەش لەسەر ئەوان ئەوەتان بۆ هەیە کە ئەوان کەسێک نەهێننە سەر جێگای ئێوە و ماڵی ئێوە کە ئێوە پێتان خۆش نەبێ و ڕقتان لێی بێ «فَإِنْ فَعَلْنَ ذَلِكَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ» ئەگەر لە فەرمانتان دەرچون لە دوای ئەوەی زانایان دەفەرمون ڕێگای نەسیحەت و ئامۆژگاریت لەگەڵ گرتنەبەر ئینجا پشتت تێکردن لە سەرجێکردن لەگەڵیان هەر ڕازی نەبون و سەرپێچی ئەمرەکانی ئێوەیان کرد پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) لێیاندەن بەڵام لێدانێک ئاسەواری پێوە دیار نەبێ تەنها لوتبەرزیەکەی ئافرەتەکەی پێوە بشکێ و بزانێ زۆر بە دەسەڵات نیە و پیاو دەسەڵاتی زیاترە لە سەریەوە لێدانێک نەبێ شین و مۆری لە شوێنی خۆی بەجێ بێڵێ لێدانێک نەبێ لە دەموچاو و شوێنێکی وابێ زانایان لە کۆی فەرمودەکانی الله و پێغەمبەر وەریانگرتوە (ﷺ) شوێنێکی بشکێنێ و یان ئازار و ئەزیەتێکی وابێ لە پاشان هەر لەسەری و لەگەڵی بمێنێتەوە «وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ» وە لە سەرتانە پیاوەکان جل و بەرگی شەرعیانە بکڕن بۆ خێزانەکانتان وە لە سەرتانە ڕزق و ڕۆزییان بۆ دابین بکەن و نەفەقەیان بکێشن، لە پاشان پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) «وَقَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إِنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ؛ كِتَابُ اللَّهِ وَأَنْتُمْ تُسْأَلُونَ عَنِّي، فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ؟» فەرموی دوو شتیشم بۆ بەجێ هێشتن لەپاش خۆم بۆم بەجێ هێشتون ئەگەر ئێوە تەواو دەستی پێوە بگرن قەتاوقەت گومڕا نابن لەسەری بڕۆن سەرفراز دەبن یەکیان پەرتوکی الله کە قورئانە وە ئەو پرسیارانەی لە منیش دەیکەن وەڵامتان دەدەمەوە واتە فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، لە کۆتاییەکەی پێغەمبەر فەرموی ئەی خوای رب العالمین ئەوەی لەسەرم بوو لە نەسیحەت و ئامۆژگاری من

گەیاندم بە ئومەتەکەم ئەوەی پێت گوتبم پێغەمبەر (ﷺ) پەنجەی شەهادەی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و فەرموی یا الله ئەوەی بە منت ڕاگەیاندوە من بە ئومەتەکەی خۆمم ڕاگەیاند ئارەقەم لەپێناو ڕشت هەندێک جار خوێنیشم لێهات لە پێناو ئازاریشم بینی هیچ باکیشم نەبوو بە ڕێک و ڕەوانی هەر هەموم تێگەیاندن ئەی خوای رب العالمین «اللَّهُمَّ فاشْهَدِ، اللَّهُمَّ فاشْهَدْ[١]» سێجار فەرموی خوایە دە تۆش بۆم ببە شاهێدی لەسەر ئەو ڕاگەیاندنەم بە ئومەتەکەم کە هیچم تێدا نەهێشتوەتەوە و هەر هەموو شتێکم پێ ڕاگەیاندون.

کە ئەو حەجی ماڵئاوایی تەواو دەبێ بەڕاستی کاتێک دادێ ئێمە دڵمان تەنگ و ناخۆش دەبێ چونکە کاتێکە کە پێغەمبەر  ئاماژە دەکا (ﷺ) بەوەی کەوا نەخۆشی بۆ دێ، لە سەرەتادا بزانین چۆن پێغەمبەر (ﷺ) ئەرکی دەعوە و بانگەوازی تەواو پێغەمبەر ژیانی دونیای خۆشتر ناوێ لە ژیانی قیامەتی و لە خزمەت خوای رب العالمین لەبەر ئەوە چەندین نیشانە پەیدابون کە پێغەمبەر لە (حجة الوداع) گەڕایەوە کە پێغەمبەر دەیەوێ ماڵئاوایی تەواو لە ژیان و لە ئومەتەکەی بکا بگەڕێتەوە لای خۆشەویسترین زات لەلای کە اللەیە -جل شئنە- وە بە هەمیشەیی بکەوێتە خۆشیان هیچ تەنگەبەری و ناخۆشیەکەی بۆ نەمێنێتەوە، لێرەوە دەست پێدەکەین بەڕێزان و خۆشەویستان ڕاستە زەحمەت و ناخۆشە باسی لەناوچون و مردن و وەفاتی کەسێک کەوا لە گیانی خۆتت خۆشتر بوێ باسی بکەی زەحمەتە قورسە بەڵام هەموو قورسی و زەحمەتیەکان لە دیدگای قورئان و فەرمودە الله لەلات ئاسانی دەکا دەبێ بە قەزا و قەدەری الله تعالی ڕازی بین، بەڵێ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) لە فەرمودەی سەحیحدا هاتوە کە ئەلبانیش بە حەسەنی داناوە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێکیان دەستی موعازی کوڕی جەبەلی گرت موعازی خۆش دەویست لە دەرگای مزگەوتەکەی چوە دەر دەستی گوشی ڕەوانەی دەکرد بەرەو یەمەن فەرموی «يَا مُعَاذُ، إِنَّكَ

[١] صحيح البخاري (١٥٦٨) (١٥٧٠)، صحيح مسلم (١٢١٨) (١٢١٣) (١٢١٦)، سنن أبي داود (١٧٨٥) (١٧٨٧) (١٧٨٨).

عَسَى أَنْ لَا تَلْقَانِي بَعْدَ عَامِي هَذَا» له یەک له ڕیوایەتەکانیش دەفەرمون گوتیە موعاز شتێکت فێر دەکەم تۆ بیڵێوە لەپاش هەموو نوێژەکان ئەوەش ئەو زیکر و یادی خوای رب العالمین بوو کە ئەی موعاز تۆ بیڵێوە لە پاشان زیکرەکەی فێرکرد و دەستی توند گرت فەرموی ڕەنگە موعاز ئەوە ئەمجارە ڕەوانەت دەکەم بۆ یەمەن ڕەنگە ساڵێکی تر یان ماوەیەکی تر ئەگەر هاتیەوە بەرەو مەدینە ئەم جارە نەگەیەوە خزمەت پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) «أَوَ لَعَلَّكَ أَنْ تَمُرَّ بِمَسْجِدِي هَذَا وَقَبْرِي[١]» فەرموی ڕەنگە موعاز جارێکی تر تۆ بێیتەوە ناو شاری مەدینە کە دەست لە من بەر دەدەی و ئێستا دەڕۆی بۆ سەفەری یەمەن بەڵام پێغەمبەری الله بە زیندویەتی نەمابێتەوە لەناو شاری مەدینە ڕەنگە هەر بەلای مزگەوتەکەمدا بێیتەوە و وە بەلای گۆڕ و قەبرەکەمدا بێی، موعاز لە هاڕژنی گریانیدا زۆر گریا پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) ڕاویەکان هەندێکیان لە هەندێک لە ڕیوایەتەکان دەفەرمون ئا ئەوەندە موعاز گریا پێغەمبەر دڵی پێ سوتا (ﷺ) فەرموی بەسە بەسە موعاز، دەڵێ موعاز سەری لە باوەشی پێغەمبەرنا (ﷺ) ئینجا لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) کە وای بە موعاز گوت موعاز زانی پێغەمبەری پێشەوا نزیک بوەتەوە وەفات بکا و بگەڕێتەوە بۆلای خوای رب العالمین، وە هەر لە (حجة الوداع)ەکەیشدا پێغەمبەر ئاماژەیدا فەرموی «خُذُوا عني مَنَاسِكَكُمْ، لَعَلِّي لَا أَلقاكم بَعْدَ عَامِي هَذَا[٢]» فەرموی ئەی موسڵمان و ئومەتەکەم موسڵمانەکان لە من وەرگرن حەجەکەی ماڵی الله چۆن دەکرێ و ئەنجام دەدرێ ڕەنگە من ساڵێکی تر و جارێکی تر نەتوانم بتان بینمەوە و وە بمبیننەوە، ئەو ڕۆژە بوو کەوا تەواو دینی خوای رب العالمین چەسپی لەسەر ڕوی زەوی کار و ئیشی نەما پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر ئەوەیە جارێکیان هاتە سەر میمبەر و لەپاش (حجة الوداع) ڕوی کردە خەڵکەکە لە

---

[١] **مسند أحمد** (٢٢٠٥٢) (٢٢٠٥٣) (٢٢٠٥٤).

[٢] **القيسراني، ذخيرة الحفاظ** (١٢٦٧/٣)، **[فيه] أحمد بن بديل الأيامي ضعيف، أخرجه النسائي** (٣٠٦٢)، **والطحاوي في** ((**أحكام القرآن**)) (١٣٥٩)، **وابن عدي في** ((**الكامل في الضعفاء**)) (١٨٦/١) **باختلاف يسير.**

مه‌دینه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموی «إِنَّ اللَّهَ خَيَّرَ عَبْدًا بَيْنَ الدُّنْيَا وَبين ما عِنْدَهُ» خوای رب العالمین به‌نده‌یه‌كی خۆی سه‌رپشک كرد له‌نێوان ئه‌وه‌ی بچێته‌وه‌ لای خوای رب العالمین یان له‌ دونیادا بمێنێته‌وه‌ «فَاخْتَارَ ذَلِكَ الْعَبْدُ مَا عِنْدَ اللَّهِ[١]» من پێتان ده‌ڵێم ئومه‌ته‌كه‌م ئه‌و عه‌بد و به‌نده‌ی الله لای اللهی هه‌ڵبژارد و ده‌ڕوا، ئیمامی ئه‌بو به‌كر هه‌ركه‌ ئه‌و قسه‌ی كرد پێغه‌مبه‌ر له‌ هاڕژنی گریانیدا (ﷺ) ئیمامی ئه‌بو به‌كر -رضي الله عنه-. سه‌حابه‌كان ده‌ڵێن سه‌رمان سوڕما چونكه‌ ئێمه‌ وه‌كو ئه‌بو به‌كر تێنه‌گه‌یشتین له‌ قسه‌كه‌ی ئیمامی ئه‌بو به‌كر فه‌رموی ده‌زانن بۆ گریام ئه‌ی هاوه‌ڵه‌كان؟ له‌به‌ر ئه‌وه‌ گریام وه‌ڵاهی ئه‌و عه‌بد و به‌نده‌ی خوای رب العالمین سه‌رپشكی كردبوو دڵنیام موحه‌مه‌د و پێغه‌مبه‌ره‌ (ﷺ)، به‌س نایه‌وێ ڕاشكاوانه‌ پێمان بڵێ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌ویش لای اللهی هه‌ڵبژاردوه‌ و دیاره‌ ئێمه‌ی ناوێ چیتر و ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ لای خوای رب العالمین و دونیا به‌جێ دێڵێ، ئینجا ده‌فه‌رمون سه‌حابه‌كان زانیمان ئه‌بو به‌كری سدیق فه‌هم و تێگه‌یشتنی له‌ نه‌ص ده‌قه‌كان له‌ هه‌ر هه‌مومان زیاتره‌ و ڕێک و پێک تێده‌گا پێغه‌مبه‌ر چی ده‌وێت و چی ده‌فه‌رموێ (ﷺ)، ته‌ماشا بكه‌ن و سه‌رنج بده‌ن له‌ یه‌ک له‌ ڕیوایه‌ته‌كانی تریش هاتوه‌ كه‌ له‌ سه‌حیح (سيرة الرسول) یان (النبي) (ﷺ) كه‌ ئیبراهیم عه‌لی هێناویه‌تیه‌وه‌ و ته‌قویه‌ی ده‌كا به‌ چه‌ندین به‌ڵگه‌ و ڕێگایه‌كانی تر ده‌ڵێ وه‌رگیراوه‌، یه‌كێک له‌ مه‌ولاكانی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌و كاته‌ی پێغه‌مبه‌ر ده‌فه‌رموێ شه‌وێكیان وه‌ره‌ با له‌گه‌ڵم بچینه‌ سه‌ر قه‌برستانی به‌قیع فه‌رمانی خوای رب العالمین م پێكراوه‌، ده‌ڵێ تاریكه‌ شه‌وه‌ چوینه‌ سه‌ر گۆڕستانی به‌قیع له‌ ناوه‌ڕاست ڕاوه‌ستا پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) دۆعای بۆ كردن بۆ مردوه‌كانی قه‌برستانی به‌قیعی موسڵمانان فه‌رموی خوایه‌ لێیان ببوره‌ و لێیان خۆشبه‌ و ئا ئه‌وانه‌ موسڵمان بون هاوه‌ڵه‌كانی من بون، ده‌ڵێ له‌ پاشان ڕوی تێكردم ئه‌و مه‌ولایه‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌ڵێ پێغه‌مبه‌ر فه‌رموی خوای رب العالمین هه‌ڵبژاردنی دایه‌ ده‌ستی من بگه‌ڕێمه‌وه‌ لای الله و بچمه‌

[١] **صحيح البخاري** (٣٦٥٤) (٤٦٦) (٣٩٠٤)، **صحيح مسلم** (٢٣٨٢)، **سنن الترمذي** (٣٦٦٠).

بەهەشت یان عومرم هەندێکی تر درێژکا لە دونیا و کلیلەکانی خەزێنەی دونیام بداتێ؟ دەڵێ ئەو مەولایەش من دڵم خۆشبوو گوتم دەی پێغەمبەری الله (ﷺ) داواکەی ئەوە جێبەجێکە لەدونیا بمێنیتەوە و کلیلەکانت پێ بدرێ، فەرموی نەخێر من ئەوەم هەڵبژارد بگەڕێمەوە لای خوای رب العالمین و وە زوو بچمە بەهەشتەکەی بەسە لە دونیا چیتر نەژیم، ئینجا دایکە عائیشەیش بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ سەحابەکان گوتیان دایکە عائیشە پێغەمبەری الله سەرەتا نەخۆشیەکەی چۆن دەستی پێکرد؟ دایکە عائیشە دەفەرموێ وەڵاهی پێغەمبەر (ﷺ) جارێکیان لەگەڵ جەنازەیەک چوە سەر قەبرستانی بەقیع لە پاشان گەڕایەوە ماڵەوە بینی کەوا من سەرم دێشێ، دەڵێ منیش لەو سەر ئێشە گوتم «وَا رَأْسَاهْ» ئەی سەرم چەند دێشێ، پێغەمبەریش فەرموی (ﷺ) «بَلْ أَنَا عائشه وَا رَأْسَاهْ» منیش ئەی عائیشە سەرم دێشێ وەکو تۆ بە زیاتریشەوە، دەڵێ لە پاشان فەرموی «مَا ضَرَّكِ لَوْ مِتِّ قَبْلِي فَغَسَّلْتُكِ، وَكَفَّنْتُكِ، وصَلَّيْتُ عَلَيْكِ، وَدَفَنْتُكِ؟» دەڵێ گوتی عائیشە تۆ چیت لە چیدایە با هەر سەرت بێشێ هیچ زەرەر و زیانت پێ ناگەیەنێ بۆ تۆ چاکەیە ئەگەر تۆ لەپێش من مردی من دەتشۆم، ئەوە بەڵگەی سەحیحە لەلای ئەو زانایانەی کە دەڵێن ژن و مێرد دەتوانن یەکتر بشۆن کاتێک وەفات دەکەن چونکە حەدیسەکە سەحیحە، هەندێک لە زانایانیش دەڵێن ئەگەر ناچاری بوو ئەگەرنا با ئەوە نەکرێ و بە ناپەسەندی دادەنێن، ئینجا لە پاشانەکە دەفەرموێ دەتشۆم و من و کفنیشت دەکەم ئەی عائیشە ئەگەر تۆ لەپێش من مردی نوێژیشت لەسەر دەکەم بە دەستی خۆشم دەتشارمەوە، دایکە عائیشە دەفەرموێ «فقُلْتُ: كَأَنِّي بِكَ وَاللَّهِ لَوْ فَعَلْتَ ذَلِكَ لرَجَعْتَ إِلَى بَيْتِي، فَأَعْرَسْتَ فِيهِ بِبَعْضِ نِسَائِكَ[1]» دەڵێ منیش ژنانە وەڵامم دایەوە گوتم ئا ئا پێغەمبەری الله (ﷺ) هیچ عەیبی نیە بڕۆ بمشۆ و کفنیشم بکە و بیشم شارەوە کە لەسەر قەبرانیش هاتیتەوە وەرە لە ماڵ و ژورەکەی من

---

[1] **سنن الدارمي** (٨١)، **سنن ابن ماجه** (١٤٦٥)، **مسند أحمد** (٢٥١١٣) (٢٥٨٤١) (٢٥٩٠٨).

ژنێکی تر بێنە ئەوێ و لەگەڵت ببێتە هاوسەر و خێزانت، دەڵێ پێغەمبەر بەو سەرئێشەیشیەوە دەستی بە پێکەنین کرد (ﷺ).

ئینجا پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) کە ئەو ئاماژانەیدا حافیز ابن ڕەجەبی حەنبەلی دەفەرموێ سەرەتای نەخۆشیەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی سەفەردا، بوو وە لە پاشان کاتی نەخۆشیەکەی پێغەمبەر (ﷺ) سێزدە ڕۆژ بوو، وە لە پاشان ابن حەجەری عەسقەلانیش دەفەرموێ ئیمامی خەتابی فەرمویەتی ڕۆژی دوشەم بوو نەخۆشیەکەی پێغەمبەر دەستی پێکرد (ﷺ)، وە قیلێکیش دەڵێ ڕۆژی شەممە بوو، بەڵام وەفاتی پێغەمبەر بەبێ ئیختیلاف و جیاوازی ئیمامی خەطابی و ابن حەجەر و ئەوان فەرمویانە لە مانگی ڕەبیعی یەکەمدا بوو وە لە پاشان ڕۆژی شەممە بوو، جا ئەوە نیمچە ئیجماعێکی لەسەرە کە پێغەمبەریش (ﷺ) ئیجماعی تەواوی لەسەرە تەمەنی لەو کاتە شەست و سێ ساڵ بوو، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) کاتێک سەرەتای نەخۆشیەکەیەتی چەندین وتە و قسە دەکا کە پەند و وانەی زۆر گەورەی لێ وەردەگیرێ، یەک لەوان پێغەمبەر لەناو نەخۆشیەکەیدا (ﷺ) فەرموی «لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ، وَالنَّصَارَى؛ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ[1]» فەرموی لەعنەتی الله یان هەواڵ و خەبەرە واتە لەعنەتی الله لەسەر ئەوانە بوە کەوا جولەکەنە و دیانەکانن لەبەر ئەوەی گۆڕی پێغەمبەرەکانیان مزگەوتیان لەسەر کردوە، وە هەندێک لە زانایانیش دەفەرمون بەڵکو دۆعا بوە پێغەمبەر کردویەتی وشەکە ئینشائە و یەعنی ئەی خوای رب العالمین لەعنەت بکە لە جولەکە و دیانەکان ئەوانەی گۆڕی پێغەمبەرەکانیان مەرقەدی لەسەر دەکەن و وە لە پاشانەکە مزگەوتیان لەسەر کردوە، دایکە عائیشە دەفەرموێ ئەوە لەبەر ئەوە بوو پێغەمبەر فەرموی واتە ئاگاداربن ئەوە شتێکی دروست نیە مزگەوتەکان لەسەر قەبری پێغەمبەرانیش بکرێ (علیهم الصلاة والسلام)، وە لە پاشانەکە ئیمام ابن حجر

[1] صحيح البخاري (٤٣٦).

العسقلاني دەفەرموێ ئەوە ئەوەی لێ وەردەگیرێ پێغەمبەر هەستی کرد دەڕوا و وەفات دەکا نەوەک ئومەتەکەی وا بیر بکەنەوە مزگەوت لەسەر گۆڕی پێغەمبەر بکەن (ﷺ)، ئێستاش کە گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) کەوتوەتە ناو مزگەوت ئەوە بە ناچاری بوو کاتێک مزگەوت گەورە کرا زانایەکان فەرمویان ئەوە تایبەتە ئێمە بۆمان نیە گۆڕی پێغەمبەر هەڵکەنین لەوێدا وە مزگەوتیش ناچارین دەبێ گەورە بکرێ لە سەردەمی یەکێک لە خەلیفەکانی موسڵمانان، وایانکرد کەوا گۆڕەکە بکەوێتە ناو مزگەوت بەڵام پارێزراوبێ لەو بیدعە و خوڕافیاتانەی کە گەل و نەتەوەکانی جولەکەکان و دیانەکان بەرامبەر گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەیانکرد و بە دەوریدا دەسوڕانەوە و تەوافیان دەکرد، ئا ئەوانە ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ هەموی حەرامە تاوانە هەندێک جار سەریش دەکێشێ بۆ شیرک و کوفر.

ئینجا پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دایکە عائیشە دەفەرموێ هێواش هێواش ڕۆژ بە ڕۆژ نەخۆشتر دەکەوت سەری زیاتر دەئێشا تای قورس و گرانتری دەگرت، دەڵێ هەتا ڕۆژێکیان عەبدوڕەحمانی برام هاتە ژورەوە کوڕی ئەبو بەکری سدیق سیواکێکی لە دەستدا بوو دەڵێ منیش بوو بومە پشتیوان و ئەستوندە بۆ پێغەمبەر لە باوەشی خۆمم گرتبوو لە پشتی دانیشتبوم پێغەمبەر هیلاک بوو زەحمەتی بەسەردا هاتبوو دەڵێ بینیم کە تەماشای عەبدوڕەحمانی کرد سیواکەکەی لە دەستە و لە دەمە و بەکاری دەهێنێ، بینیم وای تەماشا کرد وا هەستم کرد پێغەمبەر حەزی لێیە سیواک لە دەمی دابنێت، دەڵێ گوتم تۆش سیواکت دەوێ ئەی پێغەمبەری الله (ﷺ)؟ دەڵێ بە سەر ئاماژەی بۆ کردم و فەرموی بەڵێ ئەی عائیشە منیش سیواکم دەوێ، دەڵێ سیواکەکەم هێنا و بە دەمی خۆم بۆم تەڕ کردەوە و ئینجا لە دەمی موبارەکی پێغەمبەرم دانا (ﷺ)، پێغەمبەر هەر سیواکەکەی لە دەمدا بوو

بەکاری دەهێنا هەتا ئەوکاتەی کەوا گیانی لەدەستدا و وەفاتی کرد سیواکەکەی هەر لە دەستدا بوو هەر بەکاری دەهێنا[١]، ئەوە گرنگی سیواکە.

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کەوا (ملك الموت) لێی میوان دەبێ کۆتا وشەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە دەبێ هەر دەیگوت «اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الْأَعْلَى، اللَّهُمَّ الرَّفِيقَ الْأَعْلَى[٢]» واتە ئەی خوای پەروەردگارم بمگەیەنە بە هاوەڵانی بەرز بە هاوەڵانی بەرز واتە بێمە ئاسمانەکان و خزمەت تۆ ئەی خوای رب العالمین، ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ پێغەمبەر (ﷺ) وای لێهات لە کۆتایەکەیدا ماوە ماوە لە هۆش خۆی دەچوو هەرکە بە هۆش خۆشی دەهاتەوە پێغەمبەر (ﷺ) بینی فاتیمەی کچی هاتە سەری فەرموی «وَا كَرْبَ أَبَتاه» ئەی هاوار بۆ ئەو قورسی و زەحمەتیە لەسەر باوکی خۆشەویستم، پێغەمبەریش فەرموی (ﷺ) ئەی فاتیمە دڵ لە دڵ مەدە «لَيْسَ عَلَى أَبِيكِ كَرْبٌ بَعْدَ الْيَوْمِ» هەر ئەوەندە زەحمەتی و ناخۆشیەم ماوە هەتا گیانم دەردەچێ لەوە دڵنیابە لەمڕۆوە هیچ زەحمەتی و ناخۆشی و بار قورسیەک لەسەر باوکت نەما ئەی فاتیمە، لە پاشانەکە دەفەرموێ «يَا أَبَتَاهْ[٣]» کە پێغەمبەر وەفات دەکا (ﷺ)، وە لە ڕیوایەتێکیشدا دەڵێ دایکە عائیشە -رضي الله عنها- دەفەرموێ بینیم فاتیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) جارێکیان پێغەمبەر سەری لەبن گوێچکەی دانا هەندێک قسەی بۆ کرد ئینجا فاتیمە تێر تێر گریا و لە هاڕژنی گریانیدا دەڵێ لە پاشانەکە چەند چرکەیەکی پێچوو هەندێک قسەی تری لەبن گوێچکەی کرد فاتیمە زەردەخەنەی هاتێ و پێکەنی، دەڵێ لە پاشان پێم گوت فاتیمە پێم بڵێ، فەرموی نهێنی پێغەمبەری الله ئاشکرا ناکەم دایکە عائیشە، دەڵێ لەپاش وەفاتی کرد پێی گوتم وەڵاهی تازە پێغەمبەر نەماوە نهێنیایەتی نەماوە ئەی عائیشەی دایکم جاری یەکەم پێغەمبەر سەری لە بن گوێچکەی

[١] صحيح البخاري (٤٤٤٩).

[٢] صحيح البخاري، باب دعاء النبي صلى الله عليه وسلم: "اللهم الرفيق الأعلى".

[٣] صحيح البخاري (٤٤٦٢) سنن النسائي (١٨٤٤)، سنن ابن ماجه (١٦٢٩) (١٦٣٠).

نام (ﷺ) فه‌رموی ئه‌ی فاتیمه‌ له‌وه‌ دڵنیابه‌ که‌وا نزیک بوه‌ته‌وه‌ باوکت ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ لای خوای رب العالمین و به‌جێتان ده‌هێڵێ، ده‌ڵێ منیش له‌ هاڕژنی گریانمدا باوکه‌ چۆن به‌جێمان ده‌هێڵی؟ ده‌ڵێ له‌ پاشانه‌که‌ سه‌ری له‌ بن گوێچکه‌ی نام جاری دووه‌م فه‌رموی دڵ ته‌نگ مه‌به‌ فاتیمه‌ نزیکیترین که‌س و منداڵه‌کانم له‌ ئه‌هلی به‌یتی من که‌ به‌ زوترین کات به‌ من بگه‌ن له‌ قیامه‌تدا له‌ پاش من بمرم تۆی ئه‌ی فاتیمه‌، ده‌ڵێ به‌وه‌ش دڵم زۆر خۆشبوو فه‌رموی تۆ گه‌وره‌ی ئافره‌تانی به‌هه‌شتیشی ئه‌ی فاتیمه‌، ده‌ڵێ به‌وه‌ دڵم زۆر خۆشبوو ده‌ستم کرد به‌ پێکه‌نین، به‌ڵێ مێژوو نوسان ده‌فه‌رمون شه‌ش مانگ له‌پاش وه‌فاتی پێغه‌مبه‌ر فاتیمه‌ -رضي الله عنها- پێغه‌مبه‌ریش (ﷺ) وه‌فاتیکرد و گه‌ڕایه‌وه‌ لای خوای رب العالمین.

ئینجا ئه‌نه‌س ده‌فه‌رموێ ئه‌و ڕۆژه‌ زۆر ته‌نگ بوو ده‌فه‌رموێ ئه‌و ڕۆژه‌ زۆر ته‌نگ بوو که‌ پێغه‌مبه‌ر تێیدا وه‌فاتیکرد و وه‌ نه‌خۆشبوو، ئه‌نه‌س ده‌فه‌رموێ «لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) الْمَدِينَةَ؛ أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ» ئه‌و ڕۆژه‌ی پێغه‌مبه‌ر هه‌نگاوی نایه‌ ناو شاری یه‌ثریب و مه‌دینه‌ ڕوناک بوه‌وه‌ پڕشنگدار بوو هه‌موو شوێنه‌کانی مه‌دینه‌ و هه‌موو شته‌کان ڕوناک بونه‌وه‌ به‌ڵام ئه‌و ڕۆژه‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) که‌وا ڕۆژی نه‌خۆشی بوو کۆتای ژیانی بوو «فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ؛ أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ[١]» مه‌دینه‌ ئه‌و ڕۆژه‌ی پێغه‌مبه‌ر تێیدا هه‌نگاوی هه‌ڵگرت و بگه‌ڕێته‌وه‌ لای الله و وه‌فات بکا تاریک بوو خامۆش بوو غه‌مگین بوو مه‌دینه‌ ئه‌نه‌س ده‌فه‌رموێ، ئینجا ئه‌نه‌س ده‌فه‌رموێ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) (ملك الموت) لێی میوان ده‌بێ له‌ چه‌ندین ڕیوایه‌ت هاتوه‌ و کۆتا وشه‌ی پێغه‌مبه‌ر ئه‌وه‌ ده‌بێ (ﷺ) «فِي الرَّفِيقِ الْأَعْلَى فِي الرَّفِيقِ الْأَعْلَى[٢]» ده‌چم به‌ره‌و لوتکه‌ به‌رزه‌کانی ئاسمانه‌کان له‌ناو فریشته‌کان و نزیکبونه‌وه‌ له‌ اللهی ڕه‌حمان، به‌ڵێ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) (ملك الموت) دێ بۆ کۆتا جار که‌ پێیان ده‌ڵێ: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾ [الزمر: ٣٠] خوای رب العالمین

[١] سنن الترمذي (٣٦١٨)، حسنن ابن ماجه (١٦٣١)، سنن الدارمي (٨٩).
[٢] صحيح البخاري، باب دعاء النبي صلى الله عليه وسلم: "اللهم الرفيق الأعلى".

براندیه‌وه‌ له‌ قورئاندا تۆش ده‌مری ئه‌ی موحه‌مه‌د (ﷺ) كافر و موشریكه‌كان و وه‌ موسڵمانه‌كانیش ده‌مرن دونیا بۆ كه‌س هه‌تا سه‌ر نیه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ شاعیری عه‌ره‌ب ده‌ڵێ:

(لَوْ كَانَت الدُنْيَا تَبقا لأَحد

لَكَانَ رَسُولُ الله فِيْهَا مُخَلَدا[1])

ئه‌گه‌ر دونیا بۆ كه‌س بماباوه‌ تا سه‌ر ده‌با پێغه‌مبه‌ری پێشه‌وا تێیدا هه‌میشه‌یی با و قه‌ت نه‌مردبا.

## وه‌فاتی پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) و ئه‌ركی ئه‌و له‌سه‌ر ئێمه‌

ئینجا پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) گیانی له‌ ده‌ست ده‌دا و وه‌فات ده‌كا دایكه‌ عائیشه‌ ده‌فه‌رموێ وه‌ڵاهی قورسایه‌تی كه‌وته‌ سه‌ر سینگم كه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) گیانی له‌ ده‌ستدا، كاتێک سه‌حابه‌كان هه‌واڵیان پێگه‌یشت هه‌موو چۆكیان شكا زانایان ده‌گێڕنه‌وه‌ و ده‌فه‌رمون به‌ ڕیوایه‌تی جۆراو جۆر هه‌موو یه‌ک ده‌نگن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ئیمامی ئه‌بو به‌كر له‌و كاته‌ له‌ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر نه‌بوه‌ (ﷺ) به‌ڵكو له‌ به‌رزاییه‌كان بوه‌ و له‌ ماڵ و شوێنی خۆی بوه‌، هه‌ركه‌ هه‌واڵی پێده‌گا خێرا خێرا سواری ئه‌سپێک ده‌بێ و دێ به‌ره‌و ماڵی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)، ده‌بینێ هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كان ئه‌وه‌ی هه‌واڵی پێگه‌یشتوه‌ و زوو گه‌یشتوه‌ ئیمامه‌كان و ڕاویه‌كان ده‌فه‌رمون هه‌یان بوو ده‌مان بینی له‌ سه‌حابه‌كان چۆكی شكابوو، چه‌ند ده‌مانگوت به‌رز به‌وه‌ پێشتر پاڵه‌وان بوو به‌رز ده‌بووه‌وه‌ و چۆكا و چۆک ده‌كه‌وته‌ عه‌رز، هه‌مان بوو ده‌ماندواند ئه‌وه‌ چیبوه‌ و چی قه‌وماوه‌؟ هیچ قسه‌یه‌كی نه‌بوو هه‌ر ده‌گریا، هه‌مان بوو كه‌وا ده‌ستی خۆی توند گرتبوو دامابوو سه‌دماوی گرتبوو، به‌ڵێ قورسه‌ و زه‌حمه‌ته‌ وه‌ زۆریش ناخۆشه‌ زاتێک له‌ خۆتت خۆشتر بوێ سه‌حابه‌كان كه‌ ڕاستگۆبون له‌گه‌ڵ ئیمان به‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌ ئیسلام له‌ گیانی خۆیانیان خۆشتر ده‌ویست له‌به‌ر ده‌ستت بڕوا و به‌جێت

[1] مجموعة القصائد الزهديات [عبد العزيز السلمان] ج: ١ ص: ٤٤٧.

بێڵێ ئەو ڕوناکیەی سەر ڕوی زەوی ڕوناک کردبۆوە ئێستا دەیەوێ بگەڕێتەوە لای خوای رب العالمین، لە پاشان پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) دایکە عائیشە -رضي الله عنها- دەفەرموێ کە پێغەمبەر وەفاتیکرد (ﷺ) ئیمامی ئەبو بەکر هاتە ژور، نەچوە لای هیچێک لە سەحابەکان هاتە سەر سەری پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوەی پێماندابوو دەموچاویشمان پێ داپۆشیبوو هەڵی گرت لە پاشان پێغەمبەری ماچکرد (ﷺ) فەرموی «بأَبي أنْتَ وأُمِّي، طِبْتَ حَيًّا ومَيِّتًا، والذي نَفْسِي بيَدِهِ، لا يُذِيقُكَ اللَّهُ المَوْتَتَيْنِ أبَدًا» دایکم و باوکم بەقوربانت بێ پێغەمبەری الله بەفیدات بم وەڵاهی لە ژیانتدا بۆن خۆشبوی لە کاتی لە ژیاندا ڕوو گەش بوی بەڵام مردن و وەفاتیشت بۆنت ڕوت هەر خۆشە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) دڵنیام سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بە دەستە ئیمامی ئەبو بەکر فەرموی دوو مردن و زەحمەتی و ناخۆشیت بۆ نابێ تازە تۆ دەرچوی لە دونیا ئەی پێغەمبەر (ﷺ) وە کەوتیە خۆشیەکان، جورئەتی ئەبو بەکر لەوەدا بوو لەبەر ئەوە کەسێک لە سەحابەکان پێی نەدەگەیشتن وە حیکمەت و لێزانینەکەشی هاتەوە ناو سەحابەکان چۆک و قەدەمی خۆی نەشکاند ڕاستە لە هەمویان بە دڵنیایی غەمگینتر بوە ئیمانی بەرزتر بوە بەس ئەوە ئەوە ناگەیەنێ پیاوی زۆر مەرد و گەورە ئەوانەی خاوەن حیکمەتن کار دەبێ بەڕێوە ببەن نابێ چۆک و قەدەمی خۆیان بشکێنن لە کاتی بەڵاو موسیبەتە زۆر گەورەکانیش، هاتەدەر بە چاوی فرمێسکاویەوە ڕویکردە سەحابەکان و فەرموی لێم کۆببنەوە، ئیمامی عومەریش لەولاوە دەڕۆیشت و دەهات و دەچوو وەکو کەسێک کەوا عەقڵی لە دەست دابێ دەیگوت ئەوەی بڵێ موحەمەد مردوە لێی قبوڵ ناکەم وەڵاهی موحەمەد نەمردوە و هەر لە ژیاندایە، ئیمامی ئەبو بەکر دڵی پێی سوتا و دەستی لە ملکرد سەحابەکان دەورەیان لێدا و ئیمامی ئەبو بەکر پێی گوتن «ومَن كانَ يَعْبُدُ اللَّهَ فإنَّ اللَّهَ حَيٌّ لا يَمُوتُ» ئەی موسڵمانان ئەگەر ئێوە اللەتان دەپەرست خوای رب العالمین هەمیشە زیندوە و قەت مردنی بەسەردا نایە «ومَن كانَ يَعْبُدُ مُحَمَّدًا (ﷺ) فإنَّ مُحَمَّدًا قدْ مَاتَ» ئەوەی هاتبوو موحەمەدیشی دەپەرست بزانن موحەمەد

مرۆڤێكه‌ و وه‌فاتیكرد و گه‌ڕایه‌وه‌ لای خوای رب العالمین ئینجا ئه‌و ئایه‌ته‌ی بۆ خوێندنه‌وه‌: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ أَفَإِين مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ شَيْـًٔا﴾ فه‌رموی ئه‌ی هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كان له‌وه‌ دڵنیاتان ده‌كه‌مه‌وه‌ ئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ری ده‌په‌رست پێغه‌مبه‌ر وه‌فاتی كرد و گه‌ڕایه‌وه‌ لای الله ئه‌وه‌ی اللهیش ده‌په‌رستێ خوای رب العالمین هه‌ر له‌ ژیاندایه‌ و هه‌میشه‌ییه‌ و قه‌ت كۆتایی به‌سه‌ردا نایه‌ ئینجا بزانن الله فه‌رمویه‌تی موحه‌مه‌د ته‌نها ڕه‌وانه‌كراوی منه‌ خوای رب العالمین ده‌فه‌رموێ پێغه‌مبه‌ری منه‌ له‌پێش ئه‌و پێغه‌مبه‌ران هاتن و وه‌فاتیان كرد و ڕۆیشتیشن جا ئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌گه‌ر مرد الله ده‌فه‌رموێ یان كوژرا له‌ناوتان گه‌ڕایه‌وه‌ لای من ئایه‌ ئێوه‌ پشت ده‌كه‌ن له‌ ئاینی ئیسلام و ڕێبازه‌كه‌ی موحه‌مه‌د (ﷺ): ﴿وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ﴾ هه‌ریه‌ك له‌ ئێوه‌ ئه‌گه‌ر پشت بكا له‌ دینی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) هیچ زیان ناگه‌یه‌نێ به‌ خوای رب العالمین الله خوایه‌تی خۆی هه‌ر ده‌كا: ﴿وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ[1]﴾ [آل عمران: ١٤٤] خوای رب العالمین ئه‌وانه‌ش شوكرانه‌ بژێرن و له‌سه‌ر ڕێبازی الله و پێغه‌مبه‌ر لاناده‌ن (ﷺ) پاداشتیان ده‌داته‌وه‌ پاداشتی شوكرانه‌بژێریان.

جا له‌ پاشان دایكه‌ عائیشه‌ ده‌فه‌رموێ جه‌نازه‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ر له‌ ژوره‌كه‌ی من بوو (ﷺ) ده‌فه‌رموێ هه‌ركه‌ هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كان هاتنه‌وه‌ سه‌ر خۆیان ویستیان كه‌وا پێغه‌مبه‌ر بشۆن (ﷺ) سه‌ریان سوڕما له‌وه‌ی ئایه‌ شمه‌ك و جل و به‌رگی له‌به‌ر بكه‌نه‌وه‌ یان هه‌ر به‌ شمه‌ك و جل و به‌رگ بیشۆن زۆر شه‌رمیان ده‌كرد له‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)، ده‌ڵێ له‌و كاته‌ من ئه‌وانم ده‌بینی و ته‌ماشام ده‌كردن، كه‌ له‌ ڕیوایه‌تێكی حه‌سه‌ن هاتوه‌ له‌ موسنه‌دی ئیمامی ئه‌حمه‌د له‌ سونه‌نی ئه‌بو داود وه‌ زانایان ده‌فه‌رمون سه‌نه‌ده‌كه‌ی به‌هێزه‌ و قبوڵكراوه‌ ئه‌لبانیش له‌ (أحكام الجنائز) به‌ حه‌سه‌نی داناوه‌، دایكه‌ عائیشه‌ ده‌فه‌رموێ گوێم له‌ ده‌نگه‌ ده‌نگی

[1] صحيح البخاري (١٢٤٢).

سەحابەکان بوو کە لە بەینی خۆیان دەیانگوت ئایە جل و بەرگی لەبەر بکەینەوە لەبەر پێغەمبەر (ﷺ) یانە نا؟ دەڵێ کاتێک بینیم خەویان بەسەردا هات لەناکاو لەو قسانەدا بون بینیم هەریەکەیان چەناکە و ڕیشەکەی کەوتە سەر سینگی هەر بە پێوە و دانیشتن هەریەکەیان خەوێکی چەند چرکەییان بەسەرداهات، دەڵێ لەو خەوەدا من گوێبیست بوم دەنگێک هات لە دەرەوەی ژورەکە بە هەر هەموویانی گوت و فەرمانی پێکردن نەمانزانی ئەو دەنگە هی کێیە و کێ بوە، دەڵێ فەرموی ئەو دەنگە نا نەکەن جل و بەرگ لەبەر پێغەمبەر بکەنەوە (ﷺ) نابێ عەورەتی پێغەمبەر بەدیارکەوێ (ﷺ) ئا ئاوا بە شمەک و جل و بەرگەکەی بیشۆن، دەڵێ ئینجا هاوەڵەکان کە بە خەبەر هاتن ئا لەو خەوەدا کە چەند چرکەیەک بوو دەڵێ ئینجا دەستیان کرد بە شۆردنی پێغەمبەر (ﷺ) گیانمان فیدای بێ، دەفەرموێ بە شمەکەوە شوشتیان ئا ئەوانەی شوشتیان ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بوو ئیمامی عەباس بوو لەبەر ئەوە سونەتە ئێستاش تا قیامەتێ خەڵکە نزیکە میراتگرەکان مردوەکەی خۆیان بشۆن ئەولاتر و باشتر و سونەتی ترە ئەگەر ئەوان نەیاندەزانی و نەبون ئینجا خەڵکی تر بابێ بیشوا لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی عەباس و دوو کوڕی ئیمامی عەباس فەضل و قەثم وە لە پاشانەکە ئیمامی عەلی و وە ئوسامەی کوڕی زەید کە ئەوانە خەڵکی نزیکی پێغەمبەر بون (ﷺ) گیانمان فیدای پێغەمبەربێ پێغەمبەریان شوشت (ﷺ)، هەڵگێڕ و وەرگێڕیان کرد و بە جوانییان شوشت جا لە پاشان کفنیان هێنا بە سێ کفن کفنیان کرد، دایکە عائیشە دەفەرموێ لە پاشان من پرسیم چۆنتان پێغەمبەر کفن کرد (ﷺ)؟ دەڵێن سێ پارچە شمەکمان هێنا و تێمان وەرگرت و لە پاشان ئەوە بوەتە سونەتێک تا قیامەت سێ پارچە کفن بێنی و لەمردویەوە بئاڵێنی، دەڵێ بەبێ ئەوەی قەمیسی بۆ بکەین و عیمامەی بۆ بکەین و هیچێک لەوانە کە ئەوانە زیادکراون ئەسڵەن سونەتی تەواو ئەوەیە کەوا ئینسان سێ پارچە شمەک پێغەمبەر (ﷺ) تێیدا وەرگیراوە و تەواو لە سەری هەتا بنی پێی شاراوە بوە بەو شمەک و جل و بەرگانە.

پێغەمبەر تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو بیست و سێ ساڵی لە پێغەمبەرایەتی بەڕێکردبوو وە چل ساڵیش پێش پێغەمبەرایەتی، سێ سزدە ساڵ چەند مانگێک کەم لە مەککە بوو دەعوە و بانگەوازی دەکرد پێغەمبەر (ﷺ) جیل و نەوەیەکی خاوەن عەقیدە و بیروبڕوای پێگەیاند، لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دە ساڵیش لە مەدینە کە کۆی هەموو پێغەمبەرایەتی بیست و سێ ساڵ بوو ژیا لەوێندەرێش بە دەعوە و بانگەوازی و جەنگ و جیهاد کردن و کوشتار لەپێناو خوای رب العالمین هەموو ژیانی خۆی بردە سەر، لە دونیادا حەسانەوەی نەبوو هەموی هەڵگرتبوو بۆ قیامەت و خزمەت خوای رب العالمین ئا لەوێوە پێیوە حەسایەوە سوپاس بۆ خوای رب العالمین.

ئایە ئەرکی پێغەمبەر لەسەر شانی ئێمە (ﷺ) ئێمە ئاوا باسمانکرد بە کورتی و پوختی سۆز و خۆشەویستیمان زۆر بۆی هەیە و وە بۆی زیاد دەکا کاتێ کەوا باسی دەکەین بەڵام ئەرکی سەرشانی ئێمە بەرامبەر ئەو زاتە بەرز و بەڕێزە بۆ ئەوەی الله لێمان ڕازی بێ چیە؟

یەکەمیان پێش هەموو شتێک دەبێ ئێمە ئیمانێکی تەواومان پێ هێنابێ بەبێ شەک و گومان، ئەوەی گومان بێ نابێ لە دڵتدا هەبێ کە ئەو پێغەمبەری اللهیە (ﷺ) وە کۆتای پێغەمبەرانە وە پێغەمبەر لە هەموو مەخلوقات و بونەوەرەکان بەرز و بەڕێزترە لەلای خوای رب العالمین لەسەر بۆچونی پەسەندی ئەهلی سونە و جەماعە، وە پێت ڕاستبێ ئەوەی پێغەمبەر فەرمویەتی سەدا سەد وەریگری و قبوڵی بکەی شوێنکەوتوی ببی ئیمانێکی وابێ، کە خوای رب العالمین دەفەرموێ: ﴿قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا﴾ ئەی موحەمەد بڵێ خەڵکەکە (ﷺ) ئەی مەردوم و خەڵکینە من ڕەوانەکراوی اللهم بۆلای ئێوە هەموتان و بە تێکڕا بەبێ جیاوازی: ﴿ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئەو خوایەی کە خاوەنی ڕاستەقینەی ئاسمانەکان و زەوییە: ﴿لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ پێیان بڵێ هیچ پەرستراوێکی حەق و ڕەوا نییە جگە لە الله هەر ئەوە دەژێنێ و

دەمرێنێ جا ئێوە ئیمان و بڕوا بێنن بە الله وە بە پێغەمبەرەکەی الله: ﴿ٱلنَّبِیِّ ٱلۡأُمِّیِّ ٱلَّذِی یُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَـٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾ [الأعراف: ١٥٨] خوای رب العالمین دەفەرموێ پێیان بڵێ ئیمان بێنن بە الله و بە پێغەمبەری الله ئەو پێغەمبەرەی کە نەخوێندەوار بوە لەوپەڕی زانیاریش زانستی لەلابوە ئەو پێغەمبەرەی بڕوای هەبوە بە الله بە وشە و دەربڕینەکانی خوای رب العالمین و کەلیماتی الله وە شوێنی بکەون بەڵکو ڕێنوێنیتان ببێ، لە فەرمودەی سەحیحیشدا پێغەمبەر دەفەرموێ (ﷺ) «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَا يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ يَهُودِيٌّ أَو نَصْرَانِيٌّ، ثُمَّ يَمُوتُ، وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَّا كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ[١]» پێغەمبەر فەرموی (ﷺ) سوێند بەو خوایەی کە نەفس و گیانی منی بە دەستە هیچ کەسێک نیە گوێبیستی من بوبێ و هەواڵی منی پێ گەیشتبێ جا ئەو کەسە لە ئومەتەکان جولەکەبێ یان دییان و نەسرانیش بێ بمرێت لەسەر ئەوەی کە بڕوا بە من نەهێنێ ئا ئەو کەسە ئیلا دەچێتە دۆزەخەوە و وە هەمیشەیی دەبێ لە ئاگری جەهەننەم و دۆزەخ، واتە هەمویان دەبێ بڕوا بێنن بە پێغەمبەر (ﷺ) ئێمەش دەبێ ئەو بڕواییەمان بە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) هەبێ.

لە پاش ئەوەی کە بڕوامان وا پێهێنا دەبێ ئێمە خۆشمان بوێ بە خۆشویستنێک نە زیادەڕەوی تێدابێ و نە کەمتەر خەمی ئیسلام وەسەتیەتە نە پێغەمبەر وا لێبکەین بیهێنینە ئاستی خوای رب العالمین لەبەر ئەوەیە زانایان دەفەرمون خۆشویستنی پێغەمبەر (ﷺ) خەتەرناکە ترسناکە ئەگەر لێی نەزانی و لێی ورد نەبیتەوە، هەیە ئەوەندەی خۆشدەوێ و تێپەڕ دەکا لە خۆشەویستیەکەی دەیباتە ئاستی الله ئەوە شیرکە و کوفرە پەنا بە خوای رب العالمین هەر بەخۆی پێغەمبەر فەرمویەتی (ﷺ) «لَا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابن مَرْيَمَ[٢]» فەرموی زێدەڕەوی مەکەن لە خۆشویستنی من و یان بمپەرستن و بمکەنە کوڕی

[١] صحيح مسلم (١٥٣)، مسند أحمد (٨٢٠٣) (٨٦٠٩).

[٢] صحيح البخاري (٣٤٤٥) (٦٨٣٠)، سنن الدارمي (٢٨٢٦)، مسند أحمد (١٥٤) (١٦٤) (٣٣١).

الله وەکو ئەوەی نەسرانیەکان عیسای کوڕی مەریەمیان وا لێکرد بەڵکو من تەنها بەندەی اللهم و ڕەسول و ڕەوانەکراوی خوای رب العالمین م، لە پاشان نابێ کەمتەر خەمیشت هەبێ لە خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ)، لە پاش ئەوەی اللهت سەد لە سەد خۆشەویست دڵی هەموو پڕ کردیەوە لەبەر خاتری الله پلەیەک نزمتر لە خۆشەویستی الله دەبێ بۆ پێغەمبەری پێشەوابێ (ﷺ) ئەگەرنا ئیمانت قبوڵ نابێ وە ئیمانەکەت خەلەلی تێ دەکەوێ وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی «لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ[١]» گوتی ئێوە بڕواتان نیە و یان تەواو نیە هەتا منتان خۆشتر نەوێ لە هەموو خەڵکی تەنانەت لە دایک و باوکتان و لە منداڵەکان و لە هەر هەموو مەردوم و خەڵکی دەبێ منتان خۆشتر بوێ، جا زانایان دەفەرمون دەبێ تێکەڵ بی لەگەڵ ئەو خۆشەویستیە ئەوەش نیشانەیە بۆ ئەوەی خۆت تاقی بکەیتەوە ئایە پێغەمبەرت (ﷺ) لە دایک و باوکت و لە خۆت خۆشتر ویستوە و لە خەڵکیت خۆشتر ویستوە؟ ئەگەر بێ ڕێزییەک لەگەڵ پێغەمبەر کرا (ﷺ) بە وەڵام هاتی بەپێی توانات یان بە دەست یان بە زمان یان لە دڵەوە پێت ناخۆشتر بوو لەوەی بێ ڕێزییەک بە دایک و باوکت دەکرێ لەسەر پێغەمبەر بە جوابتر بوی لەوەی لەسەر دایک و باوکت یان لەسەر خۆت یان لەسەر خەڵکی و لایەنەکەت ئا ئەوە نیشانەیە ئەو کاتە پێغەمبەرت خۆشتر ویستوە (ﷺ) لەوانە، بەڵام ئەگەر قسە بە باوک و دایکت گوترا بە وەڵام هاتی ئەگەر قسە بە خۆت گوترا تەحەمولت نەکرد بە لایەنەکەت گوترا و بە خەڵکی گوترا تەحەمولت نەکرد بەڵام هی پێغەمبەر تەحەمولت کرد و گوتت هیچم لە دەست نایە، بە دڵنیاییەوە زانایان دەفەرمون بزانە تۆ پێغەمبەرت خۆشتر نەویستوە لەو شتانەی ناومان هێنان کە ئەوانت بەپێش خست بۆ ئەوەی کە لەسەریان بە وەڵام هاتی، پێغەمبەر ئەو زاتە بوو (ﷺ) هەموو سەحابەکان لە

[١] صحيح البخاري (١٥)، صحيح مسلم (٤٤)، سنن النسائي (٥٠١٣) (٥٠١٤).

گیانی خۆیان خۆشتریان دەویست تەنانەت شاخی ئوحود و چیایەکانیش خۆشیان دەویست فەرموی «أُحُدٌ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ[1]».

ئینجا گەلێک زۆرن ئەو شتانەی کەوا بە بەڵگە بیهێنینەوە بۆ خۆشەویستی سەحابەکان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) بەس هەر ئەوەندە بەسە ئەوەندەتان پێ دەڵێین کەوا ئیمامی عەلی لەو تەمەنە کچکۆکەی خۆیدا خۆی گیان فیدای پێغەمبەر کرد (ﷺ) لەبەر ئیمانی بە پێغەمبەر و خۆشویستنی بۆ ئەو، کاتێک لە هیجرەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر جێگاکەی ئەو خەوت، وە لە پاشان نەسیبەی کەعبی ئەنساری لە جەنگی ئوحود دا بۆمان گێڕانەوە کە دوازدە برینی تێبوو برینێکی گەورەی لە ملیش بوو بوو خۆی و هاوسەرەکەی و دوو کوڕەکەی کەوا بە عائیلەوە چ پاسەوانیەکیان لە پێغەمبەر کرد (ﷺ)، ئا ئەوانە هەموی خۆشەویستی پێغەمبەرە (ﷺ) لەلای هاوەڵە بەڕێزەکانی، سەرنج بدەن کاتێ کەوا هەریقەل دەپرسێت لە ئەبو سوفیان کە هاوەڵەکانی موحەمەدیان خۆشدەوێ و خەڵکەکەی لە دەوروبەرین، گوتی بەڵێ حۆشەویستیەکی وا کەس کەسی ئاوا خۆش نەویستوە وە ئاوا ئەبو سوفیان چوبوە ناو مێشکی و دەیگێڕاوە وە نوێنەرەکانی قوڕەیشیش لە سوڵحی حودەیبیە بۆمان باسکردن ئەوەیان گوت.

ئینجا خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) بەوە دەسەلمێندرێ کاتێک تۆ ئەوەی ئەو فەرمانی پێکردوە ئەو جێبەجێ بکەی، کەواتە ئەرکێکی تری پێغەمبەر (ﷺ) (طاعته في كل ما أمر) ئەوەی پێغەمبەر فەرمانی پێدای دەست بەجێ بەبێ ئاو ناو بۆ مادەم حەدیسەکە سەحیح بێ ئیجماعی زانایانی لەسەربێ دەبێ جێبەجێی بکەی بەبێ ئەوەی ڕەتی بکەیتەوە، هەموو شتەکانی تر ئەگەر دژ بون لەگەڵ فەرمودەکە و داوای پێغەمبەر (ﷺ) وەلاینێی تەنها پێغەمبەرت (ﷺ) لە هەموو کەس و شتەکان خۆشتر بوێ و ئیطاعەی بکەی و ئەمرەکانی

---

[1] **صحيح البخاري** (١٤٨١) (١٨٧٢) (٣٧٩١)، **صحيح مسلم** (١٣٩٢)، **سنن أبي داود** (٣٠٧٩).

جێبه‌جێ بکه‌ی، الله تعالى فه‌رمویه‌تی -جل شئنه- له‌ قورئانی پیرۆزدا ئه‌مر و فه‌رمانی ئه‌وه‌ ئه‌وه‌ نه‌بێ شتێکی سونه‌تی بێ که‌ ده‌فه‌رموێت خوای رب العالمین: ﴿أَطِيعُوا ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا ٱلرَّسُولَ وَأُولِي ٱلۡأَمۡرِ﴾ [النساء: ٥٩] گوێڕایه‌ڵی فه‌رمانه‌کانی الله و پێغه‌مبه‌ری الله بکه‌ن واته‌ له‌ دوای گوێڕایه‌ڵی فه‌رمانی الله الله ناوی پێغه‌مبه‌ری هێنا (ﷺ) وه‌ پێغه‌مبه‌ریش فه‌رموی «مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبَى[١]» هه‌ریه‌ک گوێڕایه‌ڵی فه‌رمانه‌کانی من بکا ده‌چێته‌ به‌هه‌شت ئه‌وه‌ی که‌وا گوێڕایه‌ڵی نه‌کا پشتی کردوه‌ به‌ خۆی له‌ به‌هه‌شت ناچێته‌ به‌هه‌شت، یان فه‌رموی «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ[٢]» ئه‌وه‌ی گوێڕایه‌ڵی ئه‌مر و فه‌رمانه‌کانی منی کرد ئه‌وه‌ به‌ دڵنیاییه‌وه‌ فه‌رمانی اللهی جێبه‌جێ کردوه‌ ئه‌وه‌ی سه‌رپێچی فه‌رمانه‌کانی منی کرد سه‌رپێچی فه‌رمانه‌کانی الله تعالى ی کردوه‌.

له‌ پاشان ده‌بێ ئێمه‌ شوێنی سونه‌ته‌کانی بکه‌وین سونه‌ته‌کانی زیندوکه‌ینه‌وه‌ ئه‌وه‌ نیشانه‌ی خۆشویستن و ئیمان هه‌بونه‌ به‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)، به‌بێ شه‌رم و ترس ئه‌و کاته‌ پێغه‌مبه‌ر هه‌رچی کردوه‌ له‌ ژیانیدا بۆ ئێمه‌ سونه‌ته‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی سونه‌ت پێناسه‌که‌ی ئه‌وه‌یه‌ (ما أضيف إلى النبي (ﷺ) من قول أو فعل أو تقرير أو صفة) یان (ما صدر عن النبي (ﷺ)) هه‌ردوکیان هه‌ریه‌ک مانایه‌، ئه‌وه‌ی پاڵ بدرێته‌ لای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) یان له‌ پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ ده‌رچوبێ له‌ قسه‌ و گوتن له‌ فیعل و کردار یان له‌ دان پێداهێنانی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) یان له‌ خه‌سڵه‌ت و سیفه‌ته‌کانی ئه‌وانه‌ هه‌مویان سونه‌ته‌ بۆ ئێمه‌ جێبه‌جێی بکه‌ین و وه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) سونه‌ت و ئه‌مره‌کانی له‌پێشتربێ له‌ هه‌موو شته‌کانی تر له‌لای ئێمه‌.

وه‌ له‌ پاشان پێغه‌مبه‌رمان (ﷺ) له‌لا زۆر گه‌وره‌ و مه‌زن بێ ئه‌خلاق و ڕه‌وشته‌کانی وان له‌گه‌ڵ ده‌وروبه‌رمان ماڵ و منداڵ و هاوسه‌رمان ده‌ر و دراوسێ و جیرانمان وه‌ خه‌ڵکی و

[١] صحيح البخاري (٧٢٨٠)، مسند أحمد (٨٧٢٨).

[٢] صحيح البخاري (٢٩٥٧) (٧١٣٧)، صحيح مسلم (١٨٣٥) (١٨٤١)، سنن أبي داود (٢٧٥٧).

بازاڕ له هەموو شوێنەکان وەکو ئەو هەڵسوکەوت بکەین ئەو کاتە بەڕاستی ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر بە پێغەمبەر ئەنجام داوە (ﷺ).

وە لە پاشان دەعوە و بانگەوازیەکە بگەیەنین کەمتەر خەمی نەکەین، بۆچی ئەگەر شتێک بێ حەز و ئارەزوی دونیات بێ یان تۆ لایەنێک بی یان تیجارەت و پارە و پول بێ دیعایەی بۆ دەکەی لە مەجلیسەکان قسەی بۆ دەکەی؟ ئەوە زۆر گەورەترە و ئەوکات ئیمان و خۆشەویستیت بۆ پێغەمبەر دەردەکەوێ (ﷺ)، کە لە کۆڕ و مەجلیسەکان هەردەم ناوی ئەو بێنی تا سەڵاواتی لەسەر لێبدرێ وە لە پاشان هەردەم سونەتەکانی ئەو بە خەڵکی بڵێیەوە شەرمی لێ نەکەی حەدیسەکانی بگێڕیتەوە هەر شتێکت دەربارەی زانی بە خەڵکی بگەیەنی.

لە کۆتایدا بەڕێزان و خۆشەویستان حەزمان لێیە ئەوەتان بۆ باس بکەین بەرگری هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و وە موسڵمانان کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) ناخۆشی بەسەر هاتوە و یان بەسەری دێت لە هەر شوێن و جێگایەک وە ئێستاش لە پاش وەفاتی خۆی و سونەتەکەی ئەرکی ئێمە چیە و دەبێ چیبکەین بۆ پێغەمبەر (ﷺ)؟ سەرەتا ئەوە دەڵێین لە ئەوەلەوە پێمان ڕاگەیاندن وە بۆتان دەرکەوت دوژمنانی ئیسلام ڕق لە دڵەکان لە کۆنەوە دژایەتی پێغەمبەریان کردوە (ﷺ) جولەکەکان دیانەکان کافرەکان موشریکەکان ئازار و ئەزیەتیان داوە بەڵام هاوەڵە بەڕێزەکان ئەرکی سەرشانی خۆیان بە تەواوەتی ئەدا دەکرد بەوەی کەوا ئەگەر شمشێر تیرێک ڕمێک هەرچی وەشێنرابا و هاتبا بەرەو ڕوی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوان گیانی خۆیان بە کردار فیدای پێغەمبەر کردبوو و دەکرد دەیاندایە بەری و باس پێغەمبەر ئازار و ئەزیەت نەبینێ (ﷺ)، بەڵگەکان زۆرن بەڵام بە کورتی ئێمە کورتی دەکەینەوە لەو چەند خاڵەدا.

یەکەم الله تعالى دەفەرموێ: ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ﴾ [التوبة: ٤٠] ئێمە منەت نەکەین کاتێک یەکێک ئەگەر سوکایەتی بە پێغەمبەر کرد (ﷺ) ئێمە بە وەڵام هاتین دوو قسەمان لەسەر کرد یان لە پێناو خوای رب العالمین هەندێک جار بۆکس و دەستمان وەشاند لەو کەسانەی کەوا سوکایەتی بە الله و پێغەمبەر دەکەن (ﷺ) خۆ ئەگەر ئێمەش پێغەمبەر سەر نەخەین بە دڵنیاییەوە الله پێغەمبەری سەرخستوە (ﷺ) هیچێک لەو کەم نابێتەوە بەڵام بۆ ئێمە قازانجە ئەرکی سەر شانمانە ئەدای دەکەین بۆ ئەوەی ڕوو سوربین لە مەیدانی حەشر و حیسابدا بەرامبەر خوای رب العالمین.

ئینجا چەند نمونەیەکتان بۆ دەهێنینەوە لەو نمونانەی کە بەرگریکردن لە پێغەمبەر (ﷺ) تەماشا بکەن پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، دەگێڕێتەوە دەڵێ عوتبەی کوڕی ئەبو لەهەب کاتێ کەوا یەک لە کچەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لێی مارە کرابوو ئینجا دێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) قسەی ناشیاو و ناشرینی پێ دەڵێ لەسەر پێشنیارەکە و داوا کردنی ئەبو لەهەبی باوکی ئینجا لەناو خەڵکدا دەڵێ کچەکەی تۆم ناوێ موحەمەد ئا ئەوە تەڵاقم دا لە هەندێک ڕیوایەت دەڵێن تفی کرد لە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر فەرموی «اللهم سلط عليه كلبا من كلابك» پێغەمبەر تورە بوو (ﷺ) بەسەر خۆیدا شکایەوە گیانمان فیدای بێ فەرموی خوایە لەبەرت دەپاڕێمەوە سەگێک لە سەگەکانی خۆت زاڵبکەی بەسەر عوتبە، تۆڵەی منی لێ بستێنیتەوە کە ئاوا ئازارم دەدا لە پێناو تۆ ئەی خوای رب العالمین، بزانن و کاتێ کەوا عوروەی کوڕی زوبێر دەگێڕێتەوە دەفەرموێ ئەبو لەهەب لەماڵەوە حەجانی نەما هەرکە زانی موحەمەد ئەو دۆعایەی کردوە لە عوتبەی کوڕی، جارێک لە جارەکان کاتێ کەوا دەڕۆن بەرەو یەک لە سەفەرەکان ئەبو لەهەب دەڵێ تخوا ئاگاتان لە عوتبەی کوڕم بێ لەبەر ئەوەی موحەمەد دۆعای لێکردوە، لەنێو خەڵکەکەدا عوتبە دەنوێنن شەوێک لە شەوە تاریکەکان خوای رب العالمین دۆعاکەی پێغەمبەر دەهێنێتەجێ (ﷺ)، لە یەک لە

ڕیوایەتەکان دەڵێ شێرێکی برسی هات گەڕا بەناو هەموو ئەوانەی نوستبون ئەوانەی بە ئاگاشبون لێی ترسان و کشانەوە پاش هەموی بۆن دەکردن هەتا گەیشتە سەر عوتبە دەستی لەوان نەدا عوتبەی گرت بە دەمە گەورەکەی و نەڕاندی لەسەر سەری ئینجا گرتی و پارچە پارچەی کرد کەس نەیتوانی عوتبە لەبەر دەستی ئەو شێرە دەربێنێ، شێرەکە جوندی و سەربازی ونی اللەیە ئەوەی دۆعاشی کردوە پێغەمبەری پێشەوایە (ﷺ) دۆعاکەی گیرابوو لە دوژمنی الله عوتبەی کوڕی ئەبو لەهەب لەنێو ئەو هەموو خەڵکەدا الله وا بەرگری و دیفاعی لێکرد و خوای رب العالمین ئەوی ڕسوا کرد.

وە لە پاشان بەڕێزان و خۆشەویستان سەرنج بدەن و تەماشا بکەن لە زۆرێک لە سەردەمەکان ئەگەر سوکایەتی کرابێ بە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەری پێشەوا خوای رب العالمین بەرگری خۆی لێ دەکا بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە ئێمەی موسڵمانان ئەرکی سەرشانمان سوک ببێ ئێمە بڵێین تەواو دەستمان هێنا و لە چۆکمان وەر بێنین و هیچمان پێ ناکرێ و یان ئەگەر پێشمان بکرێ ئەوە تەواو الله بەرگری لێ دەکا و کردی، ئەرکی ئێمە ئەوەیە دەبێ بەپێی توانا ئەوە بۆچونی زانایانی ئەهلی سونە و جەماعەیە هەرکەسێک سوکایەتی کرد بە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) نابێ بە هیچ شێوازێک ئێمە لێی قبوڵ بکەین بەپێی تواناکان دەبێ تۆڵەی لێ بستێنینەوە، ئەگەر لە تواناتدا هەبوو جورئەتت نواند لە هەر کوڕ و مەجلسێک لە هەر بازاڕ و ڕێگایەک لە هەر شوێنێک ئەگەر زۆرینەی خەڵکەکەی ئەوێش بێ بڕوا بون کەسێک سوکایەتی کرد بە الله و پێغەمبەر (ﷺ) هیچ بێ حیکمەتی نیە ئەگەر جورئەتت لەپێناو الله هەڵبستێ هەتا بۆکس و مست دەگرێ لە دەمی ئەو کەسەی بدەی وەلەو کانە ددانەکانیشی هەر هەموو بشکێنی، ئەوە غیرەتە و ئیمانە ئەگەر هەتبێ لەپێناو خوای رب العالمین ئا ئەو کاتە وەکو ئیمامی ئەبو بەکر لە فینحاسی کرد کاتێک جولەکە بوو کە لە دەمیدا و پێغەمبەر تۆڵەی لێ نەستاندەوە (ﷺ)،

وه وەکو یەکێک لەو سەحابانەی نابینا بوو کە هاوسەرەکەی خۆی لە شەودا بە حەڕبە کوشت چونکە سوکایەتی و جوێنی بە پێغەمبەر دەدا (ﷺ) وە پێی دەکرد، پێغەمبەر فەرموی خوێنی ئەو ئافرەتە هەدەرە تۆڵەی لە سەحابەکە نەستاندەوە، دەبێ ئێمە وابین ئەگەر پێت بکرێ هیچ بێ حیکمەتی نیە بە دڵنیا الله پشتگیریت لێ دەکا ئەوە بۆچونی سەواب و تەواوە مەڵێ وەڵا ئاخر موسڵمانان زەرەر دەکەن من زەرەر دەکەم دەگیرێم دەمکوژن ئەوانە هیچیان نەڵێی غیرەتت تەواوە، ئەگەر پێت کراو زانیت کەسەکە بێ ئەدەبەوە قسەیەک بە پێغەمبەری پێشەوا دەڵێ (ﷺ) هەتا مست دەیگرێ لە دەمی بدە و یان بە هەر شتێکی پێت بوو دەتوانی لێی بدەی تۆڵەی الله و پێغەمبەری لێ بستێنیتەوە (ﷺ) ئەوە غیرەتێکی سەحابیانیت هەیە و ئیمانەکەت لێت قبوڵ دەبێت و بە دڵنیاییەوەش الله پشتگیریت دەکا هیچ کەسێک نەبوە لەوانەی بەرگرییان لە پێغەمبەر کردبێ (ﷺ) خوای رب العالمین ئەوی دابێتە دەست دوژمنان و بتوانن هیچی بەسەر بێنن، ئەگەر بە دەست پێت نەکرا بە زمان بە وەڵام وەرە ئەگەر بە زمان پێت نەکرا نەکەی ئەمان لەو مەجلیس و کۆڕ و لەلای ئەو کەسانە بمێنیتەوە کە سوکایەتی و بێڕێزی بەرامبەر بە الله و پێغەمبەری الله دەکەن (ﷺ) بە زوترین کات کۆڕ و مەجلیسەکە بەجێ بێڵە و دڵت هەڵ بقرچێ و لەبەر خوای خۆت بپارێوە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) وایان بۆ کردوە.

دوو نمونەی بچوک و لەبەر ئەوەی کاتمان کەم بە دەست ماوە:

تەماشا بکەن باپیرە سەڵاحەدینی ئەیوبی باپیرەی کوردەکان کە جێی شانازییە سەرکردەیەک بوە جێگای ئەوەیە خۆمانی پێ هەڵدەینەوە وەکو ئەو سەرکردە و کەسانی تری مێژوو نەبوە پێت شەرمبێ ناویان بێنی زوڵم و ستەمیان کردبێ لەو کاتەی سەرکردە بونە یان ڕێباز و ڕێگای پێغەمبەریان بەردابێ (ﷺ) بەدوای هەواو هەوەس و ئارەزو و کوفر و شیرک کەوتبن، سەڵاحەدینی ئەیوبی نەخۆشە و لەناو جێگادا کەوتوە سەرکردەی

موسڵمانانە ابن كثیر لە (البداية والنهاية) هێناویێتی مێژوو نوسەکانی تریش ئەو ڕوداوە ڕوداوێکی زەق و ئاشکرای ژیانی سەڵاحەدینی ئەیوبیە، کە سەڵاحەدینی ئەیوبی خۆی گیان فیدا کردبوو بۆ ئاینی ئیسلام و گەڕانەوەی حوکمی ئیسلام و وە لە پاشان ڕوخاندنی فاتیمیەکانی شیعەی ڕافیزە لە پاشان ڕزگار کردنی (بيت المقدس) بۆ جاری دوەم ئیمامی عومەر لە مێژوی ئیسلامەوە ئەو مەدالیای پێ بەخشرا و بە دەستی هێنا ئینجا گیانی خۆشی فیدا کردبوو بۆ پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ)، لەناو جێگادا کەوتوە هەواڵیان بۆ هێنا گوتیان ئەی سەڵاحەدین ئەڕنات کە یەکێکە لە دیانە کافرەکان زۆر پیسە و خوێن ڕێژە دڵ ڕەقە بەرامبەر بە موسڵمانان لە کاروانی حاجیەکانی میسر کاتێک ڕۆیشتونە و هی هەندێک شوێنی تریش زۆرجاری تر کە بەرەو مەککە دەچن ڕێگایان پێ دەگرێ کاتێک چەک و شتێکی وایان لەلا نیە سەری بڕیون و دەیانکوژێ بەڵام ئەمجارە لە هەموو جاران جیاوازترە، گوتی چیبوە سەڵاحەدین؟ گوتی ئەڕنات حاجیەکانی هێنا گوتی دەچنە ماڵی الله؟ ئێوە شوێنکەوتەی محمد المصطفی ن (ﷺ)؟ بە گەمە پێکردنەوە، پێی گوتن ئەوە من لێرە شمشێرم دەرهێناوە ئەڕنات ئەگەر دەتانەوێ با موحەمەد مادەم شوێنکەوتەی ئەون بێ لێرە ڕزگارتان کا لەبەر دەستی من بە پێکەنینەوە یەک یەک لە سەری دەدان و سوکایەتی کرد بە پێغەمبەر (ﷺ)، باپیرە سەڵاحەدین لەناو تاو لەرزدا بوو هەستاوە لەسەر جێگاکەی خۆی ئارەقەی کردبوو زۆر شەرمی کرد لە خوای رب العالمين ئەو یەکێکە لە سەرکردەکانی موسڵمانان لە پاشان هاواری کرد سەڵاحەدینی ئەیوبی گوتی ئەی خوای رب العالمين بە گریانەوە یا الله یا ذا الجلال والإكرام نەزربێ لەسەر سەڵاحەدینی ئەیوبی ئەگەر چاکم بکەیتەوە لەو نەخۆشیەم من لەشکر کێشی بکەم وەعدت پێدەدەم خودایە ئەگەر چاکبومەوە و نەزربێ لەسەرم بچم دەورەی ئەڕنات بگرم بە دەستی خۆم بیگرم تۆڵەی الله و پێغەمبەری اللەی لێ بستێنمەوە لەسەری بدەم و عەفوی نەکەم، باپیرە سەڵاحەدین نەزرێکی وایکرد خوای رب العالمين دەست بەجێ شیفای بۆ نارد چونکە ئەو مەردبوو

ڕاستگۆبوو له نەزرەکەیدا، هەیە نەزر دەکا پاش ئەوەی ئیشەکەی لێ دێتەجێ پەشیمان دەبێتەوە، سەڵاحەدین لەو کەسانە نەبوو ئەگەر گیانیشی له دەست دابا لەشکری ڕێکخست پێش فەتحکردنی قودس کاتێک ئەڕناتی دەکەوێتە دەست له جەنگە گەورەکەی پێشی ئەوەی کەوا قودس ڕزگار بکا دەفەرموێتە برازاکەی و وە سەر لەشکرەکانی تر وە قائید قواتەکانی خۆی دەفەرموێ من نەزرم کردوه لەبەر الله دەمەوێ هەوڵ بدەن ئەی سەربازە چاکەکان ئەڕناتم به دەست بۆ بگرن و بیهێننە بەرامبەرم، ئەوانیش سەڵاحەدینیان زۆر خۆش دەویست چونکە سەڵاحەدین وە نەبێ پارەی داکردبێ له ماڵەوە وە بخوا و گەندەڵی بکات و ڕۆڵە و کوڕەکانی خەڵکی به کوشت بدات و بەخۆشی له ماڵەوە لێی دانیشتبێ جاروبارێک بێت تەسریحێک بدا، نا ئاوا نەبوو سەڵاحەدین بۆخۆی له پێشەوەی جەنگەکان بوو کوڕەکەی خۆی کە تازە پێڕاگەیشتبوو مێرد منداڵە بوو خودەی لەسەر نابوو شمشێری پێ بەستابوو قایدی هەرە شەڕە تەنگەکان و شەڕەکانی قورس بوو برازاکانی خۆی دەنارده پێشەوە دەیگوت ئێوە با بکوژرێن سەرفرازییە سەرکەوتنە پێشی خەڵکەکەی تر، سەڵاحەدین ئەو پیاوە بەرز و بەڕێزە هەموو خۆشیان دەویست فەرموی ئەی سوڵتانی موسڵمانان سوێندبێ به الله هەموومان هەوڵی ئەوەت بۆ دەدەین نەزرەکەت له دەست نەچێ ئەڕناتت به دەست بۆ بگرین، فەرمانی الله وابوو ئەڕناتی گێلی نەفامی نەزانی ڕق له دڵ ئەوەی سوکایەتی کرد به پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ) کەوتە دەستی موسڵمانەکان به دیل گیرا هێنایانە پێش سەڵاحەدینی ئەیوبی،ساڵی پار له ژیاننامە و چیرۆکی سەڵەحەدینی ئەیوبی به درێژی بۆمان باسکردن ئەم ساڵیش ئێستا دەیڵێینەوە به کورتی کاتێک سەڵاحەدین چەند سەرکرده و پاشایەکیشیان هی نەسرانیەکان گیران داوای ئاویان کرد و لەمێژ بوو ئاویان نەگەشتبویە، هەرکە ئاویان هێنا یەک له سەرکرده و پاشاکان ئاوی بەسەر دەمی خۆیەوە کرد سەڵاحەدین هەتا ئاوڕی سوڕاندەوە ئاوەکەی دایە ئەڕناتیش کاتێک سەڵاحەدین چاوی کەوت بەوەی ئەڕنات ئەوەی نەزری کردوه له پێناو الله بیکوژێ و سوکایەتی به پێغەمبەر

کردوە (ﷺ) ئاوی موسڵمانان لەسەر دەمێتی دەیەوێ بیخواتەوە ڕوی کردە پاشاکە گوتی ئەو ئاوەت بۆچی دایە ئەڕنات؟ من تەنها بۆ تۆ ئاوەکەم هێنابوو ئەڕنات هیچ عەهد و بەڵێنێکی لەگەڵ ئێمەدا نیە ئەڕنات بە جەنگاوەر حیساب نیە ئەڕنات ئەو پیاوەیە سوکایەتی بە پێغەمبەری پێشەوا کردوە (ﷺ) بۆم وەرە دەرەوە ئەڕنات، دەڵێ ئەڕنات ڕەنگی سپی هەڵگەڕا ئێرەی گرت سەلاحەدین و دووجار ڕای هەژاند پێی گوت دە بڵێ (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله) هەر ئەوە قوتارت دەکا ئەگەر ئەوەش ناڵێی من حیسابێکی ترت لەگەڵ دەکەم، ئەڕنات عینادی کرد و ئەوەی نەگوت، سەلاحەدینی ئەیوبی بەغیرەتی باپیرەی کوردان سینگی ڕا هەژاند و پێیگوت ئەڕنات ئەو کاتەی تۆ سەی بێ غیرەت بوی هیچ نەبوی کە سەری ئەوانەی دەچونە حەج و حاجیەکانت دەبڕی لەبەر ئەوەی ئەوان بێ چەک بون لەشکر نەبون کاتێک دەتگوت موحەمەد لە کوێیە با بێ ڕزگارتانکا؟ ئەوا من نوێنەرەکەی موحەمەدم منی نارد ئەڕنات، ئێستا ببینن بە بەرچاوی ئەو خەڵکەیەوە هەڵیکێشا شمشێری سەلاحەدینی ئەیوبی فەرموی (بسم الله، الله أكبر) خوایە ئەوە تۆڵەی پێغەمبەرەکەت لە ئەڕنات دەکەمەوە لە سەریدا، سەری ئەڕنات پەڕی لەبەر چاوی هەر هەموو خەڵکەکە، فەرموی ئەوەندەش بەس نیە سەلاحەدین نامەیەکی نوسی دەستبەجێ هەر لەوێ سەری ئەڕناتی لولدا لەناو نامەکە بۆ هەموو ئەوانی تری نارد لە کافر و موشریکەکانی دەوروبەری وڵاتی موسڵمانان گوتی بیخوێننەوە هەرکەسێک بێ ڕێزی و سوکایەتی بەرامبەر پێغەمبەرەکەمان بکا (ﷺ) ئەوە حاڵی دەبێ وەکو سەری ئەڕنات دەبێ سەری لە لاشەی جیا بکرێتەوە، کورد ئەوها بەغیرەت بون پێشان ئەوها بە شوجاعەت بون کورد ئەوها ڕێک و پێک بون و پێغەمبەریان خۆش دەویست ماڵی قورس و هاوار بۆ خۆمان ئەمڕۆ بۆ وامان لێهاتوە کەوا لە ڕێبازەکەی پێغەمبەر لادەدەین (ﷺ)؟ باپیرە سەلاحەدین جێگای شانازییە.

له کۆتایدا هی دوەم بە کورتی تەتەر و مەغۆلەکان خۆ هە ئەوە نیە پیاو و مرۆڤەکان بەرگرییان لە پێغەمبەر کردبێ (ﷺ) پێغەمبەر کەسێکی ئاسایی نەبوە، خوای رب العالمین لە هەموو کەس خۆشتری ویستوە، چۆن پشتی بەردەدا خوای رب العالمین؟ بۆ ئێمە شەرەف و پلە و پایەیە لەسەر پێغەمبەری الله ئەگەر بە وەڵام بێین لێمان بدرێ بیشکوژرێین سجنیش بکرێین هەرچیمان بەسەربێ هێشتا هەر کەمە، پێغەمبەرێک کە الله تعالی ئەوەندەی خۆش ویستبێ -جل شئنه-، لەسەردەمی تەتەر و مەغۆلەکان مەعلومی بەرێزتانە تەتەر و مەغۆل کە وڵاتی موسڵمانانیان گرت هەندێکیان بونە موسڵمان وە هەندێکیان بە کافری مانەوە و هەندێک دیان بون و هەندێک جولەکە بون وە دەستورەکەی جەنگیز خان نوسی وەکو یاسا دەستکردەکانی ئێستا و دەستورەکانی ئێستا تێکەڵی کردبوو وەکو شۆربای دەروێش هەندێکی هێنابوو لە جولەکایەتی هەندێک لە دیانایەتی هەندێک لە کوفر و شیرک هەندێک لە هەواو ئارەزوی خۆی هەندێکی لە ئیسلام وەگەڵ یەکیدابوو دەیگوت ئەوە یاسا و دەستورتانە حوکمی وڵاتەکانی پێ بکەن وەکو یاسا و دەستکردەکانی ئێستا کە ابن کثیر هێناویەتیەوە -رحمه الله- دەفەرموێ ناوی یاسیق بوو دەستورەکەی جەنگیز خان، ئەو کاتە ابن کثیر دەفەرموێ ئەوەی ئیش و کار بکا بە یاسیقی وەکو هی جەنگیزخان وەیان بڕواشی پێی هەبێ یان ئیش و کاری پێبکا لە ئیسلام دەردەچێ و کافر دەبێ چ ئەو کەسە قازی و حاکم بێ چ مەحکوم و ژێر دەستەبێ، نابێ یاساکانی ئاوا ئیشیان پێ بکرێ و دەبێ پشتیان تێبکرێ چونکە کوفرە و لە ئیسلام دەرچونە، ئینجا دەڵێ یەکێک لە دیانەکان و لەوانەی هەڵگەڕابونەوە لە ئیسلام کۆبوبونەوە تەتەر و مەغۆلەکان لە شوێنێکی وڵاتانی شەرقی لای خۆراسان و ئەولا سەگێکیشیان بەستبویەوە لەو شوێنەی کە ئەوان لێی کۆ بوبونەوە ابن حجر هێناویەتیەوە -رحمه الله- ئەو ڕوداوە لە مێژوو دەگێڕێتەوە ابن حەجەری عەسقەلانی وە ئەویش لە هەندێک مێژونوسی تری وەرگرتوە، دەڵێ کاتێک کۆبوونەوە هەندێک لە قەشەکان وە هەندێک لە دیانەکان تەتەر و

مەغۆلەکانیان هاندا سوکایەتی بە پێغەمبەر بکەن (ﷺ)، دەڵێ لەوێ وەستابون یەکێک لەوان هاواری کرد گوتی موحەمەد درۆزنە پەنا بە خوای رب العالمین گوتی یەک لە درۆکانی ئەوەیە، یەکیان وایگوت یەکیان وایگوت یەکێکیشیان هەر وایگوت و جوێنێکی پیسی بە پێغەمبەردا (ﷺ)، دەڵێ سەگەکە کاتێک لێی مورِ بوەوە و چاوی سور کردەوە، دەڵێ گوتیان باشە ئەوە لەبەرچی ئەو سەگە وا دەکا؟ گوتیان ئەوە هیچ نیە سەگێکی درِە لەبەر ئەوەی تۆ دەستت بەرز کردەوە کە قسەت بە موحەمەد گوت (ﷺ) لەبەر ئەوە ئیشارِەتی بینی وایزانی لەگەڵ سەگەکەتە، گوتی دە باشە ئەگەر هەر وابێ هەندێکیش گوتیان ناوەڵا دەمت تێک بنێ قسە بە موحەمەد مەڵێ بەخوای با سەگەکەش بە جواب نەیە، جاری دوەم و سێیەم وازی نەهێنا ئەو بێدینە، کاتێک سەگەکە بەسترابۆوە ئەو زانایانە دەفەرمون سەگەگە مرِاندی پەتەکەی خۆی پساند خۆی هاوێشت وەکو بەچکە شێرێک نەک سەگ لەپێناو خوای رب العالمین خۆی لە قر قرتۆکی ئەو کەسەی کرد جوێنی بە پێغەمبەردا (ﷺ) خستیە سەر پشت ئینجا نینۆکەکانی لێ گیر کرد هەموو گەرو و قر قرتۆکی دەرهێنا، هەموو ئەوانی تر رِایانکرد و هەڵهاتن، گوتیان پێمانگوت پێمانگوت قسە بە موحەمەد مەڵێ بە خوای سەگیش لەسەر موحەمەد بە جوابە و بە وەڵامە، خوای رب العالمین ئەگەر ئێمە ئەو ئەرکە پێی هەڵنەستین هەموو جار دیفاع لە پێغەمبەر بکەین (ﷺ) لەلای الله ئاسانە زۆر شت سەربازی ونی خوای رب العالمین ە، سەگێک وا لێدەکا بەرگری بکا لە پێغەمبەری پێشەوا (ﷺ).

گیانمان فیدای پێغەمبەربێ (ﷺ) ناخۆشە بەجێی دێڵین بەڵام ژیان هەر وایە بەرِێزان و خۆشەویستان بیر لەوە بکەینەوە کەوا هەمومان کۆتایی دێ بە ژیانمان ئاوا وەکو سەرەتای رِەمەزان هاتین لە خزمەت پێغەمبەر بوین (ﷺ) الله تەمەنی باقی کردین هەتا ئەمرِۆ (٢٩) رِەمەزان بەڵام دڵنیابن هەموو ژیانی دونیاشمان وایە رِۆژێک دادێ ئاوا ماڵئاوایی دەکەین

